# ناسنامەی کتێب

ناوی کتیب: کەشکۆڵی ئاوارەکان
بابەت: رۆمان
نووسینی: پێشڕەو کەریم احمد
پێداچوونەوەی: پ.ی.د نەجم ئەڵوەنی
دیزاینی بەرگ و ناوەوە: ئیبراهیم ساڵح
چاپی یەکەم: ٢٠٢٠

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانەگشتییەکان
ژمارەی سپاردنی (٦١)ی ساڵی ٢٠٢٠ی پێدراوە.

# کەشکۆڵی ئاوارەکان

## دەرگای یەکەم

## ئەستێرەکان لە کوێوە هەڵدێن

لە بەر دەرگای نەخۆشخانەی "سانت مۆریس" کوردەکان یەکە یەکە دەهاتن و بە غەمبارییەوە سڵاو و سەرەخۆشییان لە یەکتری دەکرد. نەتدەزانی برای کامەیانە کۆچی دوایی کردووە. مامۆستا جوبەیەکی رەشی لەبەرکردبوو قورئانێکی بەدەستەوە بوو لە تەک مامە قەشە راوەستا بوو. مامە قەشەش خاچێکی لە ملی خۆی کردبوو بەرگی رەشی قەشایەتی پۆشی بوو. نازانم مامە قەشە و مامۆستا باسی چییان دەکرد. ئەوەندەی بزانم مامە قەشە لە نێو پەڕی ئینجیلەکەی دەستی دا، پەڕێکی دەرهێنا و دایە دەستی مامۆستا ئەویش چاوێکی پێداخشاند و دایەوە مامە قەشە. وا دیار بوو نامەکەی دەداوە دەستی مامۆستا و مامۆستاش دەیگوت نا بەخوا تۆ خۆت دەیخوێنیتەوە. پاش بینە و بەرەیەکی زۆر مامە قەشە نامەکەی وەرگرتەوە و خستییەوە نێو پەڕی ئینجیلەکەی دەستی، ئیتر هەر دوو لا بێدەنگ بوون. لەم کاتەدا دەرگا رەشە داخراوەکەی بەرامبەرمان کرایەوە. دەتگوت هێڵی نێوان مردن و ژیانە، نێوانی هەردوو جیهان دەرگایەک بوو ئەویش کەوتە سەر پشت. کاکە ئازاد دەتگوت تازە خەوی لێکەوتووە، دەستەکانی لەسەر سینگی دانا بوو. وا دیار بوو زەردەخەنە تەنک و ئاساییەکەی کە هەردەم هاوەڵی لێوەکانی بوو، ئامادە نەبوو وا بە ئاسانی ئازاد جێ بێڵێ. هەر بە شێوەی جاری جاران خەندە لەسەر لێوەکانی راکشا بوو. پیاوێک تەرمەکەی تا ناوندی ساڵۆنەکە هێنا و

پشتاو پشت گەڕاوە و دەرگا ڕەشەکەی داخستەوە. هەر لەکاتی کردنەوەی دەرگایەکە مامۆستا هاواری کرد "الله اکبر... الله اکبر"...."علی روح الفقید الفاتحە" وادیار بوو لە فاتیحایەک بەولاوە هیچ فاتیحای تری بۆ نەچوو. مامە قەشەش لەسەر شێوەی خۆی فاتیحایەکی بۆ نارد. مامۆستا چەند ئایەتێکی لە قورئانی پیرۆز خوێندەوە. مامە قەشەش، ئینجیلەکەی دەستی کردەوە و کاغەزەکەی لە ناو دەرهێنا و سەیری هەمووومانی کرد. بە دەنگێکی نەرم و هێمنانە گوتی:

ـ کاکە ئازاد کە لە کوردستان هاتمەوە دایکت ئەم نامەیەی پێ سپاردم، پێشی ڕاسپاردم کە نەیدەم بە کەس جگە لە خۆت ئەوا منیش لە بەر چاوی برادەران و دۆستان ئەوەی لەسەرمە، ئەنجامی دەدەم، بۆیە ئێستاکە لە نێوانی من و تۆ و خودا دا بۆتی دەخوێنمەوە تا ئەو وامە گرانە لە ئەستۆی خۆم نەهێڵمەوە و بیگەێنمە جێ.

وا دیار بوو ئازاد نامەیەکی بۆ دایکی نووسی بوو و تۆزێک پارەشی بۆ نارد بوو. لە نامەکەدا داوای لێ کرد بوو کەماڵەکەی خۆیان بۆیاخ کەنەوە. دایکی لە وەڵام دا بۆی نووسی بوو :

ڕۆڵەی شیرینم چەندم پێ خۆشە باس و خواسی ڕۆژانی ڕابوردووت بۆ بگێڕمەوە. چەندم پێ خۆشە بۆت بدوێم، لەسەرت بدوێم، لەگەڵت بدوێم، لە هەموو شوێنێک باست بکەم. لە دڵما تۆ نەتیشکیت بەرت لێ بگیرێت نەدەنگیت مەودات هەبێت، تۆ ئەڤینێکی ڕاڤەنەکراوی خودایيت لە دڵما ڕواویت و ڕەگەکانت داکوتاوە. ڕەگەکانت بوونەتە دەماری خوێنبەر و لەشم بە ژیان ئاو دەدەن.

گیانەکەم، ئازاد ئەی ئاواتی ڕابوردو و داهاتووم، لە ژیان دا هەر تۆم هەیە، وێنەم بۆ مەنێرە، وەرەوە لام تا چاوانم ڕوونببنەوە. تا ژیانم بە دەسەوسانی کردیگار جارێکی تر لە نوێوە دەستپێکەمەوە. ڕۆڵە شت نییە نەشێت چەرخی گەردوونیش دەتوانێت بە پێچەوانەی خۆی خولی بەراواژ داتەوە و بگەڕێتەوە سەر خاڵی سەرەتایی "سەرەتا" یەک تکام لای بزوێنەری

گەردوونە، ئەم جارەیان بونەوەر بە وشەی خۆشەویستی دایە حەوا بەگەڕبێنێتەوە. واتا چەرخی گەردون بە خۆشەویستی دایک دەستپێکاتەوە.

ڕۆلەی شیرینم ئەی بێ وەفا، وێنەیەکت بۆ ناردووم، دەڵێی دایە نەوەکا نەمناسیتەوە، ئادگارم هەمووی گۆڕاوە. تۆزی غەریبی لە روخسارم نیشتووە، نە ڕەنگم و نە دەنگم بە جاری جاران ناچنەوە. لە چاو کاروباری کوردستان، ئا لێرانە نازانم چۆنت بۆ ڕاڤە بکەم وەک بڵێی بەندێکی ئازادم. لە کوردستان لەم گرد بۆ ئەو گرد، لەم شاخ بۆ ئەو شاخ رام دەکرد. ئالێرانە لە دالانی ژێرزەمینی ئەم میترۆیە بۆ دالانی ژێرزەمینی میترۆیەکی تر. لە کوردستان دەچوومە سەر شاخەکان لە پیفۆک و کوارگ و بەڕو و مازوو ..... دەگەڕام. ئا لێرانە ئەم بەر و ئەو بەری پاریس دەکەم تا دۆستک ببینم و قاوەیەکی لەگەڵ بخۆمەوە. لە کوردستان پاشی ئەم هەموو ڕاکردنە ماندوویێتیم پێوە دیار نەبوو. ئالێرانە لە نێو زگی میترۆی ئەژدیها ئاسا دادەنیشم ئینجا دێمە دەرەوە، دەڵێی بە دەکەس لێیانداوم. هەموو ئەندامی لەشم دێشێت. دایە گەر باسی ماندوبوونی هەندەرانت بۆ بکەم هەرگیز کۆتایی نایەت. ڕۆڵە ئازاد گیان واتدەزانی نەمدەزانی ماندویت، ئەی پێم نەدەگوتی دەڵێی سەگی پێسۆتیت لە ماڵەوە دانانیشیت. ئەی یەکسەر ماستاوێکم بۆ نەدەکردی و سەیری ناو چاوتم دەکرد، تا ماستاوەکەت تەواو دەکرد. نازانم چۆنی راڤەکەم هەر تنۆکێک ماستاوی سارد کە لە گەروتا دەچووە خوارەوە، هەستم بە خۆشییەکەی دەکرد. چێژم لێ وەردەگرت دەتگوت دەروونم بە شتێک ئاودەدرا گەلێک لە ماستاوەکەی کە تۆ دەتخواردەوە خۆشتر بوو. ئێستەش هەر شێتی ئەم چێژەم، دەمەوێت ببیتەوە کۆرپەکەی جاران و بکەویتەوە بن دەستی خۆم تا چێژی ئەو چێژە بێتەوە ناو دەمم، ناو هەستم ، ناو دەروونم. سۆز و بەزەیی خودا هێند گەورەیە، دەزانم لەم خۆشییە بێبەریم ناکات و پێتم شاد دەکاتەوە.

کوڕم لە نامەکەت دا دەڵێیت دایە ئەوە تۆزێک پارەم بۆت ناردووە ئەگەر پێتبکرێت ماڵەکە بۆیاغ بکەوە، بە تایبەتی هۆدەکان؛ یان وازیان لێ بێنە تا خۆم دێمەوە، ئینجا خۆم بڕیار دەدەم، چۆن بۆیاخ بکرێن. ئاخ... ڕۆڵەگیان

جەرگی دایک لەکوێ و بیر و ئەندێشەی کوڕ لەکوێ. ئەم دوو شتە هەرگیز ناگەن بە یەک. ڕۆڵە ئازادگیان دێتە یادت تۆ و سەرکەوت شەهید، ڕاستەیەکتان دەهێنا و لە سەر سەری یەکتری داتاندەنا و هێڵێکتان دەکێشا و ناوی خۆتان لە ژێری دەنووسی لەگەڵ ڕۆژ و مانگ و ساڵەکەی. ئینجا پاشی چەند مانگێکی دیکە هەمیسان خۆتان دەپێواوە، بە هەمان شێوە جارێکی تر کردارەکەتان دووبارە دەکردەوە. ڕۆڵە ئازاد لە بەژن و باڵای سەرکەوت هەر ئەم چەند هێڵەم بۆ ماوەتەوە، تۆش دەتەوێت بە فڵچەی بۆیاغ ئەوەشم لەبەر چاو نەهێڵیت؟ بۆی هەیە بۆیاغ خانووی خەڵکی خۆش بکات، بەڵام هەرگیز ناتوانێت شادی بخاتە ماڵی من. بە پێچەوانەی بیری تۆ فڵچەیەک دەتوانێت مێژوویەک لەبەر چاوم ڕەشکاتەوە. کوڕم، دیوارێکی کۆن گەر بۆیاغێکی ڕەشهەڵگەڕاوی پێوەبێت دیارە پەنجە مۆری بیرەوەریەکیی دوور و درێژی بەخۆیەوە گرتووە. هەر هێڵێکی سەر ئەم دیوارە سەرەنجامی بێعاریەکی تۆ و سەرکەوتی براتە. بەرامبەر هەر دیوارێکی ماڵەوە دادەنیشم بە سەعات شوێنی خۆم بەجێ ناهێڵم، وەک بڵێی لە سینەما دانیشتووم و دەگەڕێمەوە بۆ ڕۆژەکانی شادی، کە ئەوساکە لام وا بوو ڕۆژانێکی ڕەشن و بەسەر دەچن. ئاخ ڕۆڵە ئەو ڕۆژانەش بەسەر چوون. ئەو ڕۆژانە کە کەس نانی پێ نەکردبام نانی ئێوارانمان نەبوو. دێتە یادت داری قەڵاش کراوی زستانمان لە کوێ دادەنا؟ پێش چەند ڕۆژێک ئەوێم پاکدەکردەوە وەک دەستەوەستان سێکوچکەکەی جاری جارانم دۆزییەوە. چۆن لەبیرت نییە؟ ئەوەی دانولەمان لەسەر دەکوڵاند. هاتەوە یادم سەرکەوت تازە گاگۆڵەی دەکرد و چوار ددانی هاتبوو ئەم سێکوچکەیەم دانابوو شیوم بۆتان لێدەنا. ئیستاش لە بیرمە هێدی هێدی ئاگرەکەم خۆش دەکرد سەرکەوت بە گاگۆڵە هات و دامێنی کراسەکەمی گرت، منیش بە ئەسپایی هەڵمگرت و لە باوەشم کرد. گا... گا... گا... و دا... دا... دا... ئەو ڕۆژەم لە یاد سڕابووەوە دەتگوت لە سەر ئەم سێکوچکەیە تۆمار کراون. نازانم چۆن ئەوڕۆژە ڕووم لە خودا کرد و گوتم خودایە دەنگی ئەم مناڵە دەڵێیت دەنگی فریشتەیە، دەبێت ڕۆژێک یەکێک بتوانێت ئەم بێ تاوانە ئازار بدات. خودایە ئەم منداڵە ئەمانەتە تۆ پێمت

سپاردووە، منیش پێتی دەسپێرمەوە و بیپارێزە. نازانم ئایشێی حەمە سوور لەگەڵ کێ قسەی دەکرد، بەڵام من گوێم لێبوو کە گوتی ئینجا بیکەرە دیاری و بیدە کوردستان. موچوڕکێک بە لەشم داهات گوتم خودایە منداڵی منیش دەبن بە خۆراکی گیروگرفتی کورد؟... گوتم نەخێر مەلائیکەتەکانی ئاسمان گوێیان لە دەنگی سەرکەوتە و گوێیان لە دەنگی ئایشەخان نابێت. سەرکەوتم بەخێو کرد، گەورە بوو هەر وامدەزانی ساواکەی جاری جارانە، ئا ئەو ڕۆژەی بردیان بەرەو پەتی سێدارە، هاوارم کرد چۆن منداڵی شیرەخۆرە لە سێدارە دەدەن؟ گوتیان ساوای چی؟ تەمەنی هەژدە ساڵە. داوای ئازادیی کوردستان دەکات. ئەم تاوان بارە وشەی کوردستانی لەسەر دەستی خۆی کوتاوە. هەر ئەم وشەیە بەسە بۆ ئەوەی لە سێدارە بدرێت. گوتم ئەوە تەسکەرەی ساڵی ۱۹۷۰ لە دایک بووە ئێستەش ساڵی ۱۹۸۷، بە چ پێوەرێک دەبێت بە هەژدە؟ گوتیان دختۆری فەرمی بڕیاری داوە. ئەو ڕۆژەی کە تەرمی سەرکەوتیان دامەوە چەند پێویستیم بە باوکی خودا لێخۆش بووت هەبوو. چەند پێویستیم بە تۆ هەبوو. سەر بە سینگت کەم تێر بگریم، بەڵام چووم سەرم بە کێلەکەی باوکت کرد و تێر گریام. لە یادت نییە تەمەنت دوو ساڵ و نیو بوو، باوکت کارێزی بەسەردا ڕما و کۆچی دوایی کرد. ڕۆڵە بە هەتیوی و هەژاری، بە نانکەری گەورەم کردن. سەرکەوتم بەخشی بە کوردستان تۆشم بەخشی بە فەرەنسا. هەرنەبێت تۆ لە فەرەنسا ژیانت پارێزراوە، بۆیە غەمی تۆم نییە.

ڕۆڵە ئازاد گەر نووسەر بام بەرامبەر ئەم سێکوچکە ڕەشە دەمتوانی چەندین پەڕی سپی ڕەشهەڵگەڕێنم، و لە دیواری ماڵەکەمان ڕەش تریان کەم، جەرگی بوونەوەر کون بکەم. بەڵام ئاخ ئاگری سۆزی دڵم لە کوێیە و دەست و پێنووسم لەکوێ. گەر پێت خۆشبێت باسی داستانی ئەم سێکوچکەیەت بۆ دەگێڕمەوە.

ڕۆژێک لە ڕۆژان سەردەمێک لە شادی دا لە دایک بوو. تا لێت تێک نەچێت ئەو سەردەمە خۆی ئەو ڕۆژە بوو کە تۆ لە دایک بووی. من و باوکت ناومان لێنا ڕۆژی ئازاد. هەر لە سەرەتاوە لە بەر چاوی من و باوکت بووی

به لاویک وەک خۆر ئاسا لە گۆشەیەکی ماڵەکەمان هەڵگیرسای، لە سایەی ئەم شادییە، باوکت سێکوچکەییێکی کرد بە دیاری و خستمانە ناو ئاگردانی ماڵەکەمان. ئەم سێکوچکەیە، خۆر و مانگ و زەمینی پێکەوە بەستەوە. تۆ رۆژەکە بوویت، باوکت مانگەکە بوو، منیش هەر وەک زەمین لایەکم رەش لایکم سپی لە دەورەی سێکوچکەکە دەسوڕامەوە. بە شادیەکی ئەوتۆ لام وابوو ئەم شادییە هەرگیز ئاوانابێت کە خواردنم لەسەر ئەم سێکوچکەیە بۆتان لێدەنا. لەنکاوێک مانگ ئاوا بوو نەهاتەوە. منی نەسرەو وەک زەمین لە دەورەی ئەم سێکوچکەیە هەر دەسوڕامەوە. ئا لەوساوە تاکو ئێستا لەبەر خۆشەویستیت هێدی هێدی دەتوێمەوە. تۆ خۆری منیت نامەوێ لێم ئاوابیت. ئینجا ئەی رۆژی پیرۆز من بیابانم و حەز لە سووتانێ دەکەم، چەند گەرمبیت و لێم نزیکبیت ئەوەندە لەسایەت دا پشوو دەدەم. کە ئاوا دەبیت، لەسەر ئەژنۆ تابەیانی دادەنیشم کڕنوش دەبەم تا جارێکی تر چاوانم پێت ڕووندەبێتەوە.

لەو کاتەی مامە قەشە نامەکەی دەخوێندەوە کوڕێکی باڵا بەرزی فەرەنسی بە ناوی ئەلێکساندەر هاتە ژورەوە وادیار بوو بەشی زۆری کوردەکان دەیانناسی. چوو لە تەک مامە قەشە وەستا. کە مامە قەشە قسەی خۆی تەواو کرد، ئەلێکساندەر ڕووی لە تەرمەکەی ئازاد کرد و گوتی : ئەی دۆستی شیرینم؛ چەند سەربەرز بووم بە فەرەنسا کە پێکەوە باسی سیاسەتمان دەکرد. باسی نەهێشتنی بێکاریمان دەکرد، بە شێوەیەکی گشتی باسی پێشکەوتنی فەرەنسامان دەکرد. چەند شادومان بووم بەوەی کە کەسێکی بیانی بە ئەندێشەیەکی فراوان بیر لە پێشکەوتنی فەرەنسا دەکاتەوە. خۆزیا بەشی زۆری فەرەنسییەکان ئاشنای بیری تۆبان، چونکە تۆ ئاشنای بیری فەرەنسی بوویت، بۆیە بە شێوەیەکی جوان بیرت لە پێشکەوتنی فەرەنسا دەکردەوە. خۆزیا رەگەزپەرستەکان ئاشنای بیری تۆبان، و بیانزانیایە تۆ چەند فەرەنسات خۆشدەویست، ئەم خۆشەوویستیە دەیتوانی ئەوانیش بە بیر و باوەڕی خۆیان دا بێنێتەوە. ئیمڕۆکەش بەشەرمەوە سەردادەنوێنم بە ناوی هەموو فەرەنساوە داوای لێبوردنت لێ دەکەم. لە

بەردەمت رادەوەستم تا هەموو فەرەنسا داوای لێبووردن لە دایکت بکات.
چونکە فەرەنسا خاکی پەناهەندانە و دایکت ئیمانی بە فەڕەنسا هەبووە کە ژیانت دەپارێزێ، بەڵام داخی گرانم بەدەردی کورد گۆتەنی چەم بێ چەقەڵ نابێت، وڵاتەکەی ئێمەش بە داخەوە رەگەزپەرستی تیایە.
ـ سالار لەبەر خۆیەوە گوتی : لەسەدی هەژدەی رەگەزپەرستن.
ـ بەداخەوەم، بەڵام دەبێت هەوڵ بدەین کە ئەو کەسانەی بەم کارە هەڵساون بخرێنە بەردەم دادگا، تا سزای خۆیان وەرگرن.
ـ سالار گوتی ئینجا بە دایکی ئازاد چی ئەگەر دادوەرێکی رەگەزپەرست شەش مانگ سزای رەگزپەرستێک بدات؟
ـ نا کاک سالار دەبێت ئیمانمان بە دادوەری فەرەنسا هەبێت، ئەگەر شتێکی وا رووبدات ئەوا دادگەی بەرزتر هەیە.
ـ سالار گوتی : ئینجا لە کۆتایی دا بە شێتی لە قەڵەم دەدەن و لە بەندیخانەش دەری دەهێنن.
ـ مامۆستا هەڵی داێ و هاواری کرد: اللهم صلی علی سیدنا محمد. برام کاک سالار ئێستا کاتی وت و وێژی وا نییە، هەرکەسەی لەسەر بیر و باوەڕی خۆی بمێنێت تا رۆژی دادگا. ئەوەی گرنگە ئێستا خوداحافیزی لە کاک ئازاد بکەین و بینێرینەوە وڵاتەکەی باب و باپیرانمان.

****

لەم پاریسە مەزنە دا ماڵی کاک ئازاد کەوتبووە پەنایەکی ئەم شارە کەونە و لە نهۆمی پێنجەمی باڵەخانەیەکی کەون نیشتەجێ بوو بوو، وا دیار بوو ماڵەکەیان گەلێک تەسک و ناهەمواربێت، بەڵام ئەم خانووەش هەر لە خوا بە زیاد بێت، دەنا کوا لە پاریس خانوو وەدەست دەکەوێت. دەبێت کارێکی باشت هەبێت، تا خانوویەکی باشت وەدەست کەوێت. ئەگینا دەبێت چاوەڕێی هەل و مەرجێکی چاکتر بکەیت تا خانوویەکی چاکترت بە دەستکەوێت. لەبەر ئەم هۆیە کاک ئازاد کڕ و بێ دەنگ دەستی بە کڵاوی خۆیەوە گرتبوو تا با نەیبات، بۆیە گۆشەیەکی سالۆنەکەی بۆ خۆی جیا کردبووەوە، لەوێ کۆمپیوتەر و تەلیفۆنی ماڵەوەی لێ دانابوو ، هەروەها فەرماندەی تەلەفیزیۆنەکەشی لە ژێر دەستی خۆی دادەنا نەکا دەنگ و باسێکی لە دەست بچێ.

ئەگەر کاک ئازاد بیویستایە گۆشەکەی خۆی جێبهێڵێ، دەبوایە بەسەر یاری مندالەکانی دا باز بدات ئەگینا نەیدەتوانی تێپەڕێت. لە کاتی هاتنەوەشی دا بە بۆڵە بۆڵ دەگەڕاوە بۆ کونجەکەی خۆی. هەر کە دەگەیشتەوە سەر کورسییەکەی ئیتر هیچی لە بیر نەدەما و دەکەوتەوە ناو جیهانی کار و بیر و ئەندێشەکانی خۆی. جارو باریش بە دەنگە زلەکەی خۆی و بە هێمنی دەی گوت :

- ئەرێ سکالا گیان ! چایەک قاوەیەکی گەرممان نییە؟

سکاڵاش ئەوەندە ئازادی خۆشدەویست، هەرگیز رێگای نەدەدا چا یان قاوە لە نێوانی ژەمەکان دا بخواتەوە. هەرجارەی بیانویەکی بۆ دەدۆزیەوە تا قاوە و چای نەداتێ. هەندێک جار شەربەتێکی بۆ دەکرد و دەیگوت من لە دختۆرم پرسیوە. بۆیە دەزانم شەربەت لە چای بە سوودترە. پیاوەکە! ئەمەش چووەتە ئەقڵم، بۆیە لەبەر خاتری من ئەم شەربەتە بخۆوە. ئەرێ ئازاد گیان دێتە یادت دەتگوت گەر ژەهری مارم دەیتێ دەیخۆمەوە. ئای... کوڕە ئەوە شەربەتی مێوژت دەدەمێ بیخۆیتەوە، دیارە ئیتر منت خۆشناوێ. ئەگەر کاتی قسەی خۆشی نەبوایە ئەوا بە دەنگێکی نەرم دەیگوت :

- ئەرێ پیاوەکە! دە تۆزێک ئارامت بێت، هەر نیو سەعاتی تر دان بە خۆتا بگرە، خواردنەکە ئامادە دەبێت و پاشدان چا یان قاوەیەکت بۆ دەکەم. بێجگە لە مەش ئەم هەموە چا و قاوەیە بۆ دڵت باش نییە، ئای گیانەکەم ئەی ناڵێیت دڵم داوە بە تۆ ؟

لە راستی دا کاک ئازاد هەرگیز بیری لە مردن نەدەکردەوە، زۆر حەزی لە ژیان دەکرد و زۆر گەش بین بوو ، تا رادەیەک گەر گوێت لێی را گرتبا وات دەزانی دونیا شامی شەریفە. خۆ ئەگەر باسی شەهیدێکی بکردایە ئەوا هەرگیز بە رابووردوو باسی نەدەکرد. ئەگەر نەتزانیبایە کە باس کراو شەهید بووە، پرسیارت لێ دەکرد ئەی ئێستە ئەم دۆستەت لە کوێیە؟ بە سەرسامییەوە سەیری دەکردی و دەیگوت لە کوێیە؟ لە باوەشی کوردستانە.

کاک ئازاد پیاوێکی سادە و بێ پێچ و پەنا بوو، بە واتەی رابوواردن زۆر بەدوای چێژی ژیان نەدەکەوت و زۆریش نەدەچووە نێو باس و خواسی خەڵکی تر. کە باسی یەکێکیان دەکرد خۆی بە شتێکەوە خەریک دەکرد. جار و باریش، نەوەکا بڵێن گوێی لێمان نییە سەری هاڵدەبڕی و بێ ئەوەی بزانێ باسی چی دەکەن زەردەخەنەیەکی دەهێنا خۆی. بە پێچەوانەوە ئەگەر باسی قارەمانییەتی یەکێکیان بکردایە، ئەوا وازی لە هەموو شتێک دەهێنا و وەک منالٌ چۆن گوێیان بۆ چیرۆکی داپیرەیان رادەگرن ئەوا ئەویش بەم شێوەیە سەرنجی دەدا دەمی داستان بێژ، تەنانەت پێلووی نە دەتروکاند.

کاک ئازاد لە کوردستان مامۆستا بوو، لە خوێندنەوە و نووسین بەولاوە هیچی تری نە دەزانی. لە نامەی نهێنی پێشمەرگەی ناو شار بەولاوە واتا لە پسووله نووسین بەولاوە هیچ جۆرە نووسینێکی تری نەدەزانی. بەڵام نامە ئاگرینەکانی لەلای هاورکانی دەنگی دابووەوە. ئەوانەی دەیانزانی کە دەست و پێنووسێکی جوانی هەیە پێیان دەگوت: ئەرێ کاک ئازاد بۆ وتارێکمان بۆ نانووسی. یەکسەر وەک سەربازێک یەخەی خۆی رێکدەخست و دەستێکی بەسەری خۆی دادەهێنا و شانەکانی وەک وەرزشکارێک دەجوولاندەوە و چاوی دەبڕیە ناو چاوی هاورێکەی و دەیگوت لە سەر چی بنووسم؟ هەندێک دۆستی هەبوو حەزیان لە گاڵتە بوو، وەک سالار، ئەویش هەندێک

جار دەی گوت لە سەر پەڕی کاغەز بنووسە. خوا نەتگریٚ خۆت لە شویٚنی ڕۆژنامەفرۆشی کاردەکەی و بە ئیٚمە دەڵیٚی لە سەر چی بنووسم؟ لەم هەموو گیروگرفتانەی لە دونیا دا هەن، بابەتیٚک نادۆزیتەوە تا لە سەری بنووسیت؟

کاک ئازاد لە میٚشکی خۆی دا دەیگوت : "بابەت زۆرن بەڵام من لە کوردستان دوورم، ئاخ ملی شکاوم بابەت هەیە و کەرەستەش زۆرە لیٚ هەویٚنەکەیان کوردستانە ئەویش زۆر لیٚم دوورە، نازانم بۆچ نابن بە وتاریٚک و لە سەر ڕووی ڕۆژنامەیەک شویٚنی خۆیان ناکەنەوە".

بە شیٚوەیەکی گشتی کاک ئازاد زانایەکی گەورە نەبوو، دەتوانم بڵیٚم ڕەوشەنبیر بوو. بەڵام دەربارەی ناوی شەهیدان و جەنگ و پیٚکدادانەکان فەرهەنگیٚکی بیٚ هاوتا بوو. هەموو شتیٚکی دەربارەی پیٚشمەرگەکان و سوپاسالارانی ئەو سەردەمە دەزانیٚ. گەرەک بە گەرەک و کۆڵان بە کۆڵان شاری سلیٚمانی شارەزا بوو، خەڵکەکەشی زۆری دەناسی، دەتگوت دەیان ساڵە کاری تەکسی لە شاری سلیٚمانی کردووە.

پیٚشمەرگەکانی شاخ هەرشتیٚک ڕوویبدایە ئەوا کاک ئازادیان بە نامە ئاگادار دەکردەوە و ئەویش نامەکانی پاش چەند جار خویٚندنەوە ئەزبەر دەکرد و دەیسووتاندن نەوەکا بکەونە دەستی دوژمن. زۆر جار بە دزییەوە ماڵە شەهیدەکانی بەسەر دەکردەوە. باس و خواسی ئەوانیشی بە دوور و دریٚژی دەپرسی و ئەزبەر دەکرد. بەم شیٚوەیە کاک ئازاد ببوو بە فەرهەنگیٚکی بیٚ هاوتا. جیاوازیی ئەم فەرهەنگە و فەرهەنگەکانی تر لەوە دا بوو، فەرهەنگەکانی تر پەڕاوی داخراو بوون بەڵام کاک ئازاد فەرهەنگیٚکی کراوە بوو، بیٚ ماندوبوون و بیٚ کەم و زیاد ئەوەی دەیزانی دەیگیٚڕاوە.

کوردەکانی پاریس کاک ئازادیان خۆشدەویست، ئەوانەی کە یەکتریان خۆش نەدەویست ئەوا لە لای کاک ئازاد پیٚکدەگەیشتن و قاوەیان لە لا دەخواردەوە و مشت و مڕی خۆشیان هەر لای ئەو دریٚژە پیٚ دەدا. زۆر جاریش دەیانکرد بە دادوەر تا ناوبژییان بکات. بەڵام کە کار دەکەوتە سیاسەت ئەو خۆی خۆی تیٚهەڵ دەکوتا لیٚ بەلیٚ کەس گویٚی نەدەدایێ. ئەویش پیاویٚک بوو حەزی لەوەدەکرد گویٚی لیٚڕاگرن، بۆیە بیٚدەنگ دەبوو، کڕ

و کپ سەرنجی دەدا هەموو لایەک وەک بڵێی بە دەوری دادوەرییەکەی خۆی رازیبێت وا بوو، بۆیە وەک ناوبژیوانیی تۆپی پێ سەرنجی دەدا هەموو جوولانەوەیەکیان. جارو بار وتو وێژ زۆر تیژ دەبوو ئەوەندەیان نەدەما کە لێکبدەن و بیکەن بە شەڕ، ئا لێرانە هانایان دەهێناوە بەر کاک ئازاد. کاک ئازادیش بە دڵێکی گەورە و باوکانەوە بە چاوە تیژەکانییەوە سەیری هەموویانی دەکرد وەک بڵێی دەیویست ئەوەیان پێڕابگەیێنێ کە بێ ئەو هیچیان پێ ناکرێ، ئینجا هەر مەجبوری ئەو دەبنەوە. بە گران و سەنگینی وەک باوکێکی لەسەر خۆی بێ دەسەڵات، بیرە سیاسییەکانی خۆی بە خێرایی دادەڕشت و بە شەرتێک دڵی کەسیان نەڕەنجێنێ. ئینجا سەری دەهەژاند تا شەرم لە خۆیان بکەن و جارێکی تر قسە لە قسەی ئەودا نەکەن. هەرچەندە خۆی لە لای دۆستەکانی بە سەرکەوتوو پیشان دەدا بەڵام لە ناخی دا دەسووتا و تا ئێسکەکانیشی هاواریان دەکرد ئیتر بەسە برادەری ئەوانە مەکە، هەموو رۆژێک هەمان بنێشت دەجوونەوە. بەڵام ئەم راستییەی هەرگیز بە راشکاوی دەرنەدەبڕی. بۆیە بە ناچاری دادوەرییەکەی بەجێ دەهێنا و وای دەکرد کە کەس نیگەران نە بێت و هەر دوو لا بە گوناهبار و سەرکەوتوو لە گرفتەکە بێنێتە دەرەوە. ئەوەندە لە سیاسەت دڵی لێیان شکا بوو ئیتر نەیدەویست بەرەی بەرهەڵستی لە دژیان بکاتەوە. یانیش بکەوێتە بەرەیەک لەگەڵ هەندێکیان دژی ئەوانەی تر. جا بەم شێوەیە کاتی بێ کاری خۆی لەگەڵیان دەبردە سەر. بۆخۆشی دەیگوت، کاکە ئێرە پاریسە خۆ کوردستان نییە بە زەوقی خۆت برادەر هەڵبژێریت. هەر ئەم چەند کوردەنە زمانی کوردی و دۆزی کوردستان کۆمان دەکاتەوە. لە کوردستان پیاو بە کەیفی خۆی دۆست هەڵدەبژێرێ و دۆستیش هەڵیدەبژێرن. بەڵام لێرە هەمووی چەند کوردێکن بتەوێ و نەتەوێ هەر ئەوەندەن.

ئازاد هەندێک جار کە درەنگ دەهاتەوە ماڵەوە ئەگەر شتێکی ناهەمواری لە دۆستەکانی خۆی دیبا ئەوا زۆر بە خەمباری و بێ قسە یەکسەر رووی لە چێشتخانەی ماڵەوە دەکرد و بە ئەسپایی قاوەیەکی

خەستی بۆ خۆی دەکرد و هەر لە چێشتخانەکەش قاوەکەی بە هێمنی دەخواردەوە، ئینجا دەهاتە ناو سالۆنەکە؛ یان تەلەڤیزیۆنەکەی پێ دەکرد یانیش کۆمپیوتەرەکەی. بەم شێوەیە شەوبوێری خۆی دەکرد، بەڵام ئەگەر بە هەڵکەوت سکاڵا ئازادی دیبا ئەوا قاوە دەنۆشی، ئەویش چەند وانەیەکی پێ دەدا، ئینجا قاوەکەی لێدەستاند و لێی دەرژاند. سکاڵا بە دەنگێکی نزم دەیگوت :

ـ ئەرێ پیاوەکە لە بەر خاتری من و منداڵەکان، من چایەکی گوڵە بەیبونت بۆ دەکەم تا هێور بیتەوە منیش لەگەڵت دادەنیشم و پێکەوە دەیخۆینەوە.

ـ ئەرێ پیاوەکە تا ئێستا لە کوێ بووی، خۆ ئێرەش پێشمەرگایەتی ناو شار نییە لێمی بشاریتەوە. ئەرێ قەت ناڵێیت تۆ جوانیت.

ـ سکاڵا گیان لێمگەرێ قاوەکەم بخۆمەوە، ئەگەر لێمگەڕێیت ئەوا جوانیت. ئەگەر رێشم نەدەیت تۆ بەس کە دەخەویت و قسەناکەیت جوانیت.

ـ دەبا قەت جوان نەبم، و خوای دەکرد قەت جوان نەدەبوم. بەڵام ناهێڵم باوکی ئومێد و لانە بەم شەوە قاوە بخواتەوە. بەڵێ هەر دەبێ پێم بڵێیت لە کوێ بووی؟ دەنا قسەشت لە گەڵ ناکەم.

ـ دە کچێ دەچمە کوێ؟ کا هیچ شوێنێکم هەیە؟ هەر لە گەڵ سالار و سامان و میران و کوڕەکانی تر بووم، وەک ئاسایی هەموو کاتێک شەڕیانە، خۆزیا نەچوبام و تۆزێک لێکیان بدابا ئینجا تێدەگەیشتن. نازانم من چ کارم بەم سەریەشەوە هەیە؟ سەرم نایەشێت پرێسکەی لێ دەبەستم.

ـ کوڕە تا ئێستە ئاقڵ نەبووی ئەوانە وەک پەندەکە دەڵێ گۆشتی یەکتری دەخۆن ئێسکی یەکتری ناشکێنن. تۆ بۆچ دڵت لەسەر وانە ئازار دەدەیت و خۆت دەرەنجێنیت، وەرە خۆشاوێکی خۆشناوانەم بۆ ئامادە کردووی با تۆزێک سەهۆڵی تێکەم، هەر لە خۆشاوی شەقڵاوەش خۆشتر دەبێ.

سکاڵا هەردەم سولاحییەکی پڕ لە خۆشاوی لە ماڵەوە هەبوو، بۆیە لە کاتی وا دا یەکسەر دوو پەرداخی جوانی لەسەر سینی دادەنا و هەردووکیانی پڕ لە خۆشاو دەکرد و دوو پارچە بەفری بچووکی لە سەهۆڵبەند دەردەهێنا و بە ئەسپایەکی ژنانەوە سەهۆڵەکانی دەخستە ناو پەرداخەکانەوە و لە

بەردەم ئازادی دادەنا و چاوی دەبڕیە ناو چاوی و دەستی لە ژێر چەناگەی خۆی دادەنا. چاوی لە ئازاد دەکرد و برۆکانی بەرز دەکردەوە و بە ناز و دەنگێکی سەرکەوتووانەوە دەیگوت :

ـ ئینجا هەناوت فێنک کەوە و باس و خواسی ئەو دانیشتنەناموبارەکەی خۆتم بۆ بگێڕەوە.

ـ کچێ باسی چیت بۆ بکەم، هەموو رۆژێک هەمان تاس و هەمان حەمام نییە؟ ئەگەر بتەوێ پشوو بدەم باسی ئومێد و لانەم بۆ بکە، باسی پێویستییەکانی خۆتم بۆ بکە، چ کارت بە دانیشتنی بەد فەڕی منەوە هەیە؟ وا دیارە چویتە ئاراشگا وا بە نایابی خۆت ئارایش داوە، ئەم هەموو تیفتیفەیە بۆ ئەوەیە سەرت بنێتە سەر سەرین. کچێ بە زەردەشت، لە تۆ جوانترم نە دەست کەوتووە و نە دەست دەکەوێ. ئیتر چ پێویستیت بە ئاراشگا هەیە. دە دەستت لە ژێر ئەم گەردەنە درێژە دەربێنە. ئاسوودەبە لە تۆ بەولاوە ئیتر کەس بەمن رازی نابێت، منیش لە تۆ بەولاوە کەسی دیکەم ناوێت. نازانم بۆ لە سەیرکردنت تێرنابم، کە بەرامبەرمیت وا دەزانم لێم دووریت، کە لێم دووردەبیت لە نێو دڵمایت، وا دەزانم لە نێو خوێنمایت. ئەم دڵەی من لە نەخشە و پەیکەرێک بەولاوە شوێنی هیچی تری تیا نابێتەوە؛ کە ئەویش نیشتمانی کورد و پەیکەرەکەی تۆیە، پێکەوە کۆڵەگەیان داکوتاوە . بڕواتبێت لە ژیاندا پێویستیم بە وێنەی تۆ نییە، بۆیە دەستم کامێرە ناگرێت وێنەت بگرم. سکاڵا گیان موژانگت نە رەش بکە نە تیژت بکە دەستکاری شاکاری سروشت مەکە. تۆ بەم شێوەیە جوانیت وەک چۆن سروشت تۆی بە دیاری داتاشیوە و داوە بە من. دەستکاری کاری سروشت مەکە. بە جوانی سروشتیی خۆت دڵمت تێک و پێک داوە. هیچ شوێنێک لەو دڵەی من لە تیرە بارانت بە ساخی دەرنەچووە. سکاڵا گیان ئەی ناسکۆڵەکەم لێت تێرنابم زۆر لێم دووریت وەرە لام دانیشە با تۆزێک بۆنی سینگت کەم، چێژی خۆشاوەکە هەربە مەزەی لێوەکانی تۆ خۆشە.

هەموو جارێک پاش وت و وێژێکی دوور و درێژ دەستی سکاڵای بەرەو خۆی رادەکێشا و وەک بووکەشووشە لە سەر کۆشی خۆی دادەنا.

ئیتر هەر دوو لا بێ دەنگ دەبوون. هەندێک جار ئازاد سکاڵای لە باوەش دەکرد و بەرەو ژوری نووستن رایدەپێچا و دەیبرد. هەندێک جار سکاڵا بە بن گوێی ئازادا دەیچرپاند، کورە خوا نەتگرێ چرای چێشتخانەمان لە بیر چوو بکوژێنینەوە. دەبا سەعاتێکی تریش پێبێ بەو دوو سێ فرەنگەش ماڵمان بەرباد نابێ. هەر چرکەیەک لە گەڵ تۆ سەد هەزار ئەوەندە دەهێنێ.

****

که ئازاد بەیانیان لە خەو هەڵدەستا، بە پەلە خورێنی خۆی دەکرد که ئەویش بریتی بوو لە قاوەیەک و پارچە نانێکی بە کەرە، هەر لە گەڵ قاوە خواردنەوەش خۆی دەگۆڕی تا بە یەکەم میترۆ را بگات. لە هەندێک کەس وا بوو ئازاد کارێکی باشی بەدەست کەوتووە و لە نزیکەوە ئاگای لە رووداوەکانی جیهان هەیە، بۆیە هەندێک ئێرەییان پێ دەبرد، لایان وا بوو دەچێ لە پەڕاوگە دادەنیشێ و ئیتر بۆ خۆی دەست بە خوێندنەوە دەکات و سەرە مانگانیش شەش هەزار فرەنگی هەیە. بێ ئاگا بوون لە وەی کە کاتی ئەوەی نییە نەک هەر ناوەرۆکی وتارەکان بزانێ، بەڵکو پێ را نەدەگەیشت سەردێڕی هەواڵەکانیش بخوێنێتەوە، لەبەر فرۆشتنی رۆژنامە و گۆڤارەکان و رێکوپێک کردنیان. هەرکە دەرفەتێکی بۆ هەڵدەکەوت زوو زوو چاوێکی بە رۆژنامەی "لۆ مۆند" یان "لیبیراسیۆن" دا دەخشاند، بە خێرایی سەیری ناوی کورد یان کوردستانی دەکرد، ئەگەر هیچی بە بەر چاو نەکەوتبا ئەوا یەکسەر سەیرێکی رۆژنامەی "لومانیتێ"ی دەکرد، تا لە گیر و گرفتی چینایەتی کۆمەڵگای فەرەنسی بێ ئاگا نەبێت.

- بابە، بابە تەلیفۆنە (ئومێد هاواری کرد).

- کوڕی خۆم گوێم لێیە دە تەلیفۆنەکە هەڵگرە و بزانە کێیە؟

- بابە مامە سالارە، دەڵێ ئەگەر بابە کارێکی هەبێت ئەوا دوایی تەلیفۆنی بۆ دەکەمەوە. نا... باشم... دەچمە خوێندنگە... نا هیچ دیاریم ناوێ بەڵام ئەگەر بتوانیت لە کوردستانەوە چیرۆکی رۆستەمی زاڵم بۆ بێنی ئەوا زۆرم پێ خۆش دەبێ، چونکە دۆستەکانم هەرقەل و باتمانیان هەیە، خوا حافیز ئەوا بابە هات.

- دەبرۆ کورم ئینجا یاری خۆت بکە.

بەڵێ کاکە سالار گیان ئەوە تۆی، کورە بەخوا لە پێرێوە ئەوا چوار پێنج جار تەلیفۆنم بۆت کردووە ، بەڵام هەر بۆم نەدەکرا لە ماڵەوە بتگرم، ئینجا پیاوی باش ئەوا بۆخۆت تەلیفۆنت کرد.

ـ تۆ واز لەم قسانە بێنە، پێم خۆشە لە "سانت ـ میشێل" بتبینم و لەوێ لە قاوەخانەیەک بۆخۆمان قاوەیەک دە خۆینەوە و چەند شتێکیشم هەیە پێم خۆشە پێکەوە لە سەریان بدوێین.
ـ ئینجا بۆ نایێتە ماڵەوە و پێکەوە کفتەیەی سلێمانی دەخۆین و بە خێری تۆش چاییکی سەنگینی خۆمانەی لە سەر دەکەین.
ـ کفتە بێ و کفتەی سلێمانی بێت و بەدەستی خاتوو سکاڵای کۆیی بکرێت، لە ناو ئەم خێزانە خنجیلانەیەی تۆ دا بوخرێت، لەو بڕوایەدام کە نرخی هەرگیز تەواو نابێت، بەڵام داوای لێبووردن دەکەم پێم خۆشە بۆ ماوەی دوو کاتژمێر پێکەوە دانشین، و پێکەوە لە سەر چەند شتێکی گرنگ بدوێین.
ـ لە ڕێی خودا و پێغەمبەران دەبێ ئەم شتە گرنگەی تۆ چی بێت، لە کفتەکەی سکاڵا گرنگ تر بێت.
ـ بە تەلیفۆن قسەی لە سەر ناکرێ، گەر پێت بکرێ سەعات سێ لە سانت ـ میشێل یەکتر دەبینین، باشە.
ـ باشە، دەی باشە، سەعات سێ لە لای قەڵبەزەکە، یەکتر دەبینین.

لە کاتژمێری سێی تەواو لە لای قەڵبەزەکە یەکتریان دیت. ئەوەی بزانم سالار زۆر بە پەلە بوو وا دیار بوو کە زۆر لە مێژیش بوو چاوەڕێی ئازادی دەکرد، بۆیە بە خێرایی تۆقەی لەگەڵ ئازاد کرد و گوتی :
ـ با بچینە قاوەخانەیەکی چۆل تا بە ئەسپایی و لە سەرە خۆ باسی ئەم گیروگرفتە بکەین.
ـ ئەگەر ئەوەندە گرنگ بێ دەبا خۆمان لە نزیکترین قاوەخانە بپەستین و نەجاتم دە، چی بووە تەقیم.

لەنکاوێک لە سەر ئەم شەقامە مەزنە ئۆتۆمۆبیلێک ستۆپی گرت. پشیلەیەکی بچووکی پانکردەوە، و ڕاوەستا، بەڵام لێخوڕ تێگەیشت درەنگە، بۆیە تەوژمی دایە و تیژ تیژ بۆی تێتەقاند وەک بڵێی نە بای دیبێ نە باران.
ـ سەیری ئەم ناکەس بەچەیە بکە، "ئازاد شڵەژا" هاواری کرد ژمارەکەت دەدەم بە پۆلیس.

ـ کاکە ئینجا پشیلەی خۆت بۆ بەرەڵای ناو جادە دەکەی "یەکێک لە پیادەکانی سەر جادە هاواری کردە سەر ئازاد" تۆ خەریک بووی چەند کەسێک بە کوشت دەی، کەستان دیوە پشیلە بەڕەڵای ناو جادە بکات.
ـ کاکە ئەمە کوا پشیلەی منە، "ئازاد روی لە کابرا کرد" من لە تەمەنما پشیلەم نەبووە، بەڵام هەر پێم ناخۆشە ئاژەڵێک بەم شێوەیە بکوژرێ، بۆیە وا لەم شوفێرە پەست بووم.
سالار سەیرێکی ئازادی کرد و پەلی راکێشا و وتی :
ـ چییە پەژارەمان کەمە، مامە خەمە خەمی نە بوو، ... با بڕۆین تاقەتی پۆلیسمان نییە، ئینجا بتەوێ و نەتەوێ ئیمڕۆ کۆتایی ژیانی ئەم پشیلەیە بوو، بە دەردی کابرا گۆتەنی هەر ئەوەندەی بۆ نووسرا بوو.
ـ ئازاد ئەوەندەی تر تورە بوو، بەڵام بە دوای سالار کەوت و پەنجەی ئاماژەی بۆ درێژ کرد و گوتی :
ـ زۆر بەداخەوەم لەگەڵ تۆ هاتمە دەرەوە، تۆ گوناه دەخەیتە هەستۆی بێچووە پشیلەیەکی داماو کە هیچ لە تەکنەلۆجیای مرۆڤ تێناگات و نە دەشتوانێت تێبگات. بەم شێوەیە دەتەوێ بڵێیت خودا هەر ئەوەندەی بۆ نووسی بوو. نەک لێخور لێخوڕێکی خراپ بوو. بەداخەوەم هەست بێ لە لەشی تۆ دا نییە.
ـ نا کاکە ئازاد، پێمناخۆشە بەم شێوەیە تێمبگەیت، بڕواتبێت بۆچوونەکەت راست نییە. چونکە نامەوێ تووشی گێچەڵ بین، برام کەس لە ناو دڵی کەس دا نییە. پیاو لە تەمەنیا ژنێکی خۆشدەوێ و لەبەر ئەم خۆشەویستییەش واز لە نازو و جوانی و چێژی هەموو ژنانی تر دەهێنێ. من دەمویست فەرهەنگەکەی تۆ وشەی ئەم داستانەی تێدانەبێت، بەڵام ئەوە ناچارم دەکەی بۆتی بگێڕمەوە. بەرامبەرت دان بە بێ دەسەڵاتی خۆم دا بنێم، تا تۆش لە فەرهەنگە نەنوسراوەکەی خۆت تۆماری کەیت. من مارەییم لەگەڵ پەژارەیەکا بڕیوە. ئیتر شوێنی هیچ پەژارەیەکی تر لەو دڵەی کە تۆ دەڵێیت لە ئارا دا نییە و نابێتەوە. گەر بە دڵم ئاشنابیت پەژارەی سەد ئەوەندە گەورەتریشت لە یاد دەباتەوە.

له شاری کەرکووک، کات نیوەڕۆ بوو قرچەی هاوین رۆژ لە ناوەندی ئاسمان دا راوەستا بوو. چرپە لە هیچ لایەک نە دەهات، تاوەکو چۆلەکەکانیش خۆیان لە بەر سێبەری گەڵاکان حەشار دابوو. دەتگوت پاساری گەرمیان نین، نا، نا باڵندەکانیش دەیانزانی ترسێک باڵی کێشاوەتە سەر شارە دێرینەکەی کوردستان، نا دەتگوت دەیانزانی ئێستاکە شتێک روودەدات. بۆی هەیە ویستبێتیان گەواهی بۆ مێژوو بدەن. هەر بۆیەش گشتیان لە شوێنی خۆیان دا کشومات راوەستابوون. بای نەدەهات تا گەڵا ببزوێنێ، هیچ شتێک، هیچ کەسێک نە بوو بوێرێ ئەم کشوماتییە بشڵەژێنێ لە شیرینی بچکلانەی چوارساڵان بەولاوە؛ کە بە دەنگە ناسکەکەی بانگی دایکی کرد، وەک بڵێی خودا ویستی ئەم کچە بچکۆلانەیە، باڵی کشوماتی بشکێنێ:
- دایە دایە گیان بە تەنیا جلی خۆم گۆڕی، دایە دە سەرت بەرزەوەکە کراسە سپییەکەم لە بەر کردووە، دە سەیرم کە بزانە چەند جوانم.
دایکی بە زەردەخەنەییکەوە سەیری شیرینی کرد و گوتی :
- کچم شیرین بە ساقەتبم بەیانی جەژنی قوربانە کراسەکەت پیس نەکەیت.
- نا دایە بەڵێنی کچی ژیر و جوان بێ پیسی ناکەم "بەدەم راکردنەوە هاواری کرد نا دایە هەر دەمەوێ پیشانی دەستەخوشکەکانمی بدەم. ئەوە دوایین رستەی شیرینی بچکۆلانە بوو. بێ ئەوەی چاوەڕێی وەڵامی دایکی بکات، بەدەم راکردنەوە دەرگای حەوشەی کردەوە. بێ ئاگا بوو لە دەرهێنانی فەرمانی سەربازی کە هات و چۆی قەدەخە کرد بوو واتە بە زمانی داگیرکەران "منع التجول". شیرین بە ئاستەم لە سەر سەکۆی پێش دەرگا راوەستا، گوللەیەک سینگە ناسکەکەی کون کرد. شیرین لە بەر دەرگای ماڵی خۆیان  کە راهات بوو یاری لێ بکات: کەوت؛ خوێنە ئاڵەکەی سەکۆکەی سوور کرد.

منیش بە راکردنەوە چووم و شیرینم پەلکێش کرد و لە باوەشی خۆم نا و هێدی هێدی بەرەو هەیوانەکەم هێناوە. شیرین بێ ئەوەی ورتەی لە دەم بێتە دەرەوە، چاوە گەشەکانی کردەوە "بابە، بابەگیان ئیتر هەناسەم بۆ هەڵناکێشرێ، بەهێزترین بابەی دونیا، بابە کە شوێنێکم دێشێ ماچی دەکەی

یەکسەر چاک دەبێتەوە، دە ئێستەش زووکە سینگم ماچکە با زوو چاک بێتەوە. بابە گیان زۆرم خۆشدەوێی، بە خوا بابە خەتای من نەبوو کەوتم، بابە یارمەتیم دە سینگم دێشێ" بەڵام ئەم قسانە لە دەمی شیرینی بچکۆلانە نەهاتنە دەرەوە. بەس من دەمتوانی لە چاوە گەشەکانی بچکۆلانەکەی خۆم بیانخوێنمەوە. دێتە یادم کە فڕێمدەدا ئاسمان و دەمگرتەوە، هاواری دەکرد؛ بابە تۆ بەهێزترین بابەی دونیای هەموو رۆژێک ئەم رستەیەی دووپات دەکردەوە. گەر پەنجەشی ئازاری ببا رایدەکردە لام و دەیگوت بابە ماچیکە، خەتای دەرگەکە بوو خۆی لە پەنجەم دا.

هێمنی تێکچوو، چۆلەکەکان ئاسمانیان رەش کرد، دایکە بیست و چوار ساڵەکەی ئەتگوت نەو بووکە لە ئاشخانەکە بە بەروانکەی سپییەوە هاتە دەرەوە. چاوی بە کچەکەی کەوت لە هەمێزی باوکیا خوێن تک تک لێی دەچۆڕێتەوە، و باوکە بێدەسەڵات و بێچارەکەی سام گرتوویەتی و حەپەساوە. بەفرینی خۆشەویستم، داکی شیرین هەردوو دەستی بۆ ئاسمان بەرز کردەوە و تا تواناي تێدا بوو هاواری کرد:

ئۆۆۆهـ ! ئەی خودای گەورە، بەم هەموو بێدادییەی کە دەیبینین و ڕودەدات، لێیان بێ ئاگا نیت چۆن دەتوانیت شانازی بە خۆتەوە بکەیت؟ لە راستیدا بەفرین هەر دەیویست قسەبکات، دەتگوت دەیویست هاوسێکانی کۆببنەوە، بەڵام لە دەنگی بەفرین و تەپە تەپی پۆستاڵ بەولاوە گوێت لە دەنگی کەسی تر نەدە بوو. وا دیار بوو بەفرین نەی دەوێرا لە کچە بچکۆلانەکەی خۆی بێتە پێشەوە. دەشێت نەیویستبێت بزانێ کچەکەی چی بەسەر هاتووە. بەڕاستی کاتێکی دژوار بوو، بۆ ئەم ژنە بەستەزمانە. ئیتر چۆکەکانی خیانەتیان لێ کرد و کەوتە سەر ئەژنۆ و هێدی هێدی بەرەو شیرین دەخشی، باوەشی دەکردەوە تا شیرین لە باوەشی خۆی بکات. تێگەیشتم شیرینم بەرەو بەفرین برد و لە هەمێزیم دانا.

شیرینی بچکۆلانە چاوەکانی وەک دوو ئەستێرەی گەش دەجریوانەوە، دایە ئەمجارەش لێم ببورە. دایە، دایە گیان بەڵێنی کچی جوان بێت، ئەم جارەیان دوایین جارە ئیتر هەرگیز کراسی خۆم پیس ناکەم و لە قسەت

دەرناچم، بەڵام هاورێی خۆشەویستم، ئەم جارەشیان، قسەبێت لە دەمی ئەم بچکۆلانەیە نەهاتە دەرەوە. گەر دایکی و باوکی لەوێ نە بوونایە کەس نەی دەتوانی ئەم وشانە لە دوو ئەستێرەکەی شیرین دا بخوێنێتەوە. پێڵووەکانی شیرین بە ئەسپایی هاتنە خوارەوە بوون بە پەردەی ئەزەل لە نێوانی دونیا و ئەو دوو ئەستێرەیە دا. لە باوەشی گەرمی پڕ سۆزی دایکی، شیرین کۆچی کرد، بۆ ناو باوەشی سارد و سڕی نەمانی بێ کۆتایی. هەر لەم کاتە دا سێ سەربازی بێ بەزەیی وەژوورەوە کەوتن :

- ئەی یاخی بووان بۆ دەرگەتان کراوەتەوە؟ "فەرماندە پیسکەکەیان بە توڕەییەوە هاواری کرد" ئەی نازانن کەس بۆی نییە لە کەرکووک بجوولێتەوە.

بە پێکەنینیەوە سەیری سەربازەکەی کرد و گوتی :

- ئەم نێچیرەت بۆمان راو کرد، گوتم ئێستە مارێکی گەورەت بۆمان کوشتوە.

- سەروەرم بێچووە مار گەورەبێت نابێت بە کرم، سەروەرم گەر هەموو مارە مێیەکان بکوژین ئیتر رزگارمان دەبێت لە ماری بێ ئامان و شاری کەرکووکیشمان لە یاخیبووان پاکدەکەینەوە.

هەر لەم قسانە دا بوو گوللەیەکی لە بەفرین دا و ئەفسەرەکەی پێی گوت ئافەرین گەر گشتمان ئازایەتی و خوێن ساردی تۆمان هەبوایە ئیستە لە مێژ بوو کەرکووک ببوو بە شارێکی عەرەب، وا دیاربوو چۆن بە شێوەیەکی چەواشە مێژووی کەرکووکیان تێگەیاندبوو دەیویست بە زۆرداری بیسەپێنێ. رووی تێکردم و گوتی :

- بیاننێژە، بەڵام گەر پێتخۆش بێت، سەریان لێدەیت و چەپکە گوڵێکیان لەسەر دانێیت، نەکەیت لە شاری کەرکووک بیاننێژیت، چونکە ئیتر ناهێڵین تاکە گڵکۆیەکیشتان لە شاری کارخیا دا بمێنێت.گەر وانەکەین ئێوە کەرکووکمان بۆ جێناهێڵن. کەرکووک دەبێ ببێت بە شارێکی عەرەب. ئیتر بڕۆ مەیتەکانت بنێژە، تا تۆشم بە قوربانی گوللەیەک نەکردووە. من کە ناتکوژم وا مەزانە بەزەییم پێت دا دێتەوە، بەزەییم بە سەربازەکانم دا دێتەوە کە گواستنەوەی سێ کەلەشیان دەکەوێتە ئەستۆ. تێگەیشتیت؟ نامەوێت چاوم بە چاوت کەوێتەوە.

ئاخ من ئازایەتی ئەوەم نەبوو پێی بڵێم راستە کەرکووک لە وشەی کارخیاوە هاتووە ; لە یادتان نەچێت کارخیا و کاردۆخیا واتای نیشتمانی کوردان دەدەن.

کە سەیری بەفرینم کرد دیتم چەناگەی لە خاک چەقاندووە، چاوەکانی دانەخستووە، دەستەکانی وەک بڵێی بۆ پاڕانەوە کرابوونەوە، خوداوەندیش وای دانابوو شیرینی ستەم لێکراو بەم دوو دەستە ناسکانە بسپێرێت. وامدەزانی ئالێرانە ژیان وەک دیاردەیەک لە شوێنی خۆی هەڵپڕوکاوە و ئیتر جارێکی تر زیندوو نابێتەوە. نەمریش بێ ژیان وشەیەکی بێ مانابیە. پاش ئەم دیمەنە تێگەیشتم پاڕانەوەش لە کردگار دەبێتە کارێکی بێ سوود، چونکە کەس بە پاڕانەوە زیندوو نەبووتەوە. بۆیەش بڕواتبێت دەستەکانی بەفرینیش بۆ پاڕانەوە نەکرابوونەوە. هەر یارە خۆشویستەکەیی و کچە بچکۆلانەکەی دەیانزانی بۆ دەستی وا کراوەتەوە و باوەشی بۆ کێ کردووەتەوە. ئیتر تۆ لەو بڕوایەدایت ئەم ژنە بە زمانی ئەو دڕندانە وستبێتی وشەیەک ئاراستەی ئەو خودایە بکات؟ منیش بەرامبەر بەفرینی خۆشەویستم درێژ بووم و چاوم لە نێو ئەو دوو چاوە پڕشینگدارە بڕی و گوتم، تا درەنگ نەبووە بەفرین گیان دەزوو هەڵسە نوێژەکەت بکە. بەفرین لێم ببورە گەر تا ئێستە هەر دووکمان بڕوامان بە پەیامی نێنراوی ئەم دڕندانە هەبوو. پاش ئەم بەسەرهاتە تۆ ئازادیت لە سەر بڕوای خۆت بمێنیت. بەڵام ئەوەی پەیوەندی بە منەوە هەبێت پەیمان بێت لە ئیمڕۆ بەولاوە لە سەر ئایینی ئەوانە نەمێنم. ئینجا بە ئەسپایی شیرینم لە سەر دەستی دایکی داناوە و گوتم: پەیمان بێت شیرین گیان لە پاش تۆ هەموو منالێکم خۆشبوێت. بەفرینی خۆشەویستم، پێشی پێنج ساڵ چەند شادومان بووین، ئا لێرانە هەر بەم شێوەیە راکشابووین. چاوت لە ناو چاوم بڕی بوو دەتگوت گەر خودای گەورە منداڵێکمان پێ ببەخشێ چیرۆکی گورگ و بزنەکەی بۆ دەگێڕمەوە. ئەی گیانەکەم چەندم پێ خۆشە جارێکی تر بە دەنگە ناسکەکەت گوێم لەم چیرۆکە بێتەوە، دە شیرین گیان دیسان هاوار کەوە بڵێ، دایە بزنەکە ئازا بوو، "ئا کچم

دایە و بابە هەموو کاتێک ئازانە." لەنکاوێک نازانم چۆن هاوارم کرد تا کچم بەس من ترسنۆکم، چونکە لە پاشی ئێوە، دەژیم.

سالار چاوی لە ئاسمان بڕی بوو، وابزانم ووڕێنەی دەکرد، لە بەر خۆیەوە پرسیاری دەکرد و وەڵامی خۆی دەداوە. چۆن دەتەوێ لە یادمچێتەوە؟ نا، نا هەموو شتەکانم لە یادە. بە تایبەتی دوایین نیگای ئەم شیرینە بچکۆلانەیە کە بووەتە پارچەیەک لە من و لێم جیا نابێتەوە. چۆن دەتەوێت لە یادی کەم: ئەو نیگایە لە هەموو شوێنێکە، لە چاوی هەموو منالێکدا دا دەبینم، بڕواتبێ خۆشم نیگاری لە چاوی منالان دا دەکێشم، تا لە یادم دا نوێ بێتەوە. بۆی هەیە بڵێیت بۆ لە یادی خۆتی نابەیتەوە؟ نا، نا، چۆن فەرامۆشیکەم. من خۆم لە ناو ئەم نیگایە دا دەژیم، کە لەم جیهانە دا نەماوە. لە سەر رووی ئەم زەمینە هەر لە یادی من دا دەژیێ و منیش لە ناخی دا تواومەتەوە. گەر لە یادی خۆمی نەهێلم بوونی خۆم بە دەستی خۆم دەسرمەوە. ئێستا لە بەر چاومە چۆن لە ژێر خاکی کەرکووک لە باوەشی دایکی خۆی دا و لە باوەشی دایکی کەرکووک، دوور لە قەبرستانی ئیسلام و فەلە و جوولەکە، لە گەڵ دایکیا سەریان بە بەردێک کردووە و پێکەوە راکشاون. بەندەت: منی بێ دەسەلاتیش چیرۆکەکەیانم بە دوور و درێژی نووسییەوە و لە ناو شوشەیەکم دانا و زۆر بە باشی سەری شوشەکەم داخست و لە باوەشی شیرینم دانا و شیرینم خستە باوەشی دایکی و هەر بە تەنیا سەری گڵکۆیەکەیانم ناوە. ئینجا خۆم چووم بووم بە پێشمەرگە.

ئازاد قسەی بە سالار بڕی. تۆ لە تۆڵە ناگەڕێیت؟

- نەخێر من لە تۆڵە ناگەڕێم. تۆڵە واتای وایە کە تۆ هەمان شانۆگەری بنووسیتەوە، پێشکەش بە جیهانی کەیتەوە، (بەم شێوەیە من خۆم خۆم لە دەست دەدەم). ئەوانەی کە ئەم کارەیان کرد، لە کوفە بە توێنوەتی سەری نەوە شیرەخۆرەکەی پێغەمبەری خۆیان پەڕاند. ئەم کارە لە خوێنی ئەم نەتەوە دایە. دەتەوێ بکەوێتە خوێنی منیش. سەیرکە سەدام ئەو هەمووە دڕندەییەی کرد یەک وڵاتی عەرەبی پێی نەگوت پشتی چاوت برۆیە. چونکە ئەم کردەوانە لەلایان شتێکی ئاسایین و لە خوێنی هەمویان دا هەیە. کە پێیان

دەڵێین بە کیمیاوی قڕمان دەکەن! دەڵێن ئەی گەر داوای جیابوونەوە بکەن وا تێدەگەن گوڵتان بەسەردا دەبارێنن. بە مافی خۆمانی دەزانین هەموو توانامان بەکاربێنین تا عێراق بە یەک پارچەیی بمێنێتەوە.

دۆستی شیرینم سوێندت بۆ دەخۆم ئەو ئازارەی لە دڵی من دایە، نامەوێ دوژمنیشم ئەم ئازارە بچێژێ. من لە تۆڵە ناگەڕێم: بڕواتبێ تا ئێستاش هەر لەو زەردەخەنە شیرینەی سەر لێوی شیرینی بچکۆلانە دەگەڕێم کە پێشی ماڵئاوایی لە سەر لێوەکانی بوو. زەردەخەنەی مۆنالیزا ناگاتە چۆکانی ئەو زەردەخەنە بێ تاوانەی ئەم کێژە ستەم لێکراوە. نازانم ئەم زەردەخەنەیە نە دوا نازی شیرین بوو بەسەر دایکی دا کرد یان پاڕانەوە بوو بۆ لێبووردن، یان ئەوە زەردەخەنەی شادومانی بوو چونکە دایکی لێی بووردبوو. ئەویش وەک هەر بووکێک بە خۆی و کراسی سپی و تاکە گوڵێکی سوور کە بە سینگییەوە نووسابوو و ناوپەلی ئاڵی دەتگوت چەپکە گوڵی بوکێنییە شەوق دەداتەوە. خەناوکە جوانەکەی ملی کە دایکی لە زەنگیانە و مۆری بۆ کچە جوانەکەی هۆنی بووەوە. تێکەڵ بە خوێنی ئاڵی ئەو پەرییە ببوو. هەر قلە زەنگیانەیەک دەتگوت لەعل و یاقوتن لەسەر سینگی ئەو بووکە بچکۆلانەیە چاوەڕێی شاییان دەکرد. ئەم بووکە جوانە بەم ساکارییەی کە بۆم گێڕایتەوە خۆی ئامادە کرد بوو بۆ نێو باوەشی سارد و سڕی نادیار.

دونیا لە بەر چاوی ئازاد تاریک بوو، ئیتر نەی دەزانی چی بکات، بەڵام بە هێمنی بە سالاری گوت :

- ئامۆژگاریت دەکەم کە بگرییت، لە وە باشترە کە لە ناو دڵی خۆتی دا بیڵیتەوە.

- داوای لێبوردن دەکەم، گریان دیاردەیێکی ژیانە، بەڵام من هەر بوونم هەیە وئیتر ناژییم. سەیری شیرین کە، بێ دەنگ خۆی لە باوەشی باوکیا کڕ کرد بوو، تا دوایین هەناسەی ژیا و تا پێش گەردەن ئازادی چاوەکانی دەتگوت دوو ئەستێرەی پڕشنگدارن لە نێو ئاسمانی ژیان دا دەجریوانەوە. لە ئاوی ژیان بەولاوە فرمێسک بێت لە چاوانی نەدەهاتە خوارەوە. هاوڕێی شیرینم پێش ئەوەی ئەو نیگایەی کە من هێلانەم لە ناو دا کردووە بفڕێ بۆ جیهانی

نەناسراو، دەتگوت چۆلەکەیە دەیەوێ بۆ یاری باڵ بگرێ، داخی گرانم باڵی گرت و منی بە نیوە چڵی بەجێهێشت. گیانمی برد و لەشمی بۆ ئێش و ئازار لەم جیهانە هێشتەوە.

با سەرت نەیێشێنم پاشی جەنگی کەنداو لە ۰۳/۲۱ هێرشمان کردە سەر شاری کەرکووک و لە دەستی داگیرکەران رزگارمان کرد. پاش کۆتایی رزگارکردنی هەموو شارەکە هەر پێشمەرگەیەکی کەرکوکوی چەند پێشمەرگەیەکی لە گەڵ خۆی بردەوە ماڵەوە بۆ نان خواردن، لە هەموو لایەک شایی و سەیران بوو. منیش بە هێمنی و کڕ و کپ خۆم لە دۆستانم شاردەوە و وەک جاری جاران بەرەو ماڵی خۆمان کەوتمەوە ڕێ. بە ماندویەتی و برینداری تا بەردەرگای ماڵی خۆمان رانەوەستام، کە گەیشتمەوە بەر دەرگای خۆمان سەرم سوڕما، دیتم کچێکی بچکۆلانە لە سەر هەمان سەکۆ دانیشتووە، کە منی بە زامداری دیت گوتی :

ـ مامە مەچوە ئەم ماڵەوە دەڵێن جنی تیایە و دەست ئەوەشێنن.

ـ کچم مەترسە جن دەست لە پێشمەرگە ناوەشێنن. دەرگام کردەوە، چیت بۆ بگێڕمەوە، کات ڕاناوەستێ، ئەم ماڵە لە یاسا بە دەر بوو کات لە ناوی دا راوەستا بوو. ئا لێرانە هەموو شتێک وەک خۆی لە شوێنی خۆی دا مابووەوە، باخچە خنجیلانەکە دار تووەکەی بەفرین بەسەری دەکەوت و دەی هەژاند و شیرین هاواری دەکرد دایە توو دەبارێ. دەنگی خۆم دەنگی دەداوە "کچێ شێت و شورێ ئاگات لە خۆت بێت نەکەوی". دەنگی بەفرین لە هەمان شوێن دا دەهاتەوە: "گیانە ئەم هەموو هاوار هاوارەت لە چییە، گەر منت خۆشبوێ وەرە بن دارەکە و بمگرەوە." ئینجا لەبەر خۆیەوە دەیگوت "هەی کەوی و کەوی و کەوی، ئاگات لە خۆت بێ و نەکەوی". بەفرین جارێ پشتی هەر بە دیواری هەیوانەکە دا دابوو، ئەو دەنگە هاتەوە گوێم کە دەیگوت :

ـ سالار گیان برۆ مامانم بۆ بانگ کە ژانم لێیە. دیوارەکە هیچی لێنەگۆڕا بوو لە دەقی خۆی مابووەوە. چۆن دەرگایەکانم داخستبوو هەر وەک خۆیان داخرابوون. وەک ئاسایی خۆم بە چێشتخانەکەدا کردەوە بەڵام ئەم جارەیان، مەنجەڵەکانی پێشی جەژن چۆن لە سەر ئاگر بوون لە شوێنی خۆیان نە

جولابونەوە، بەلاّم چێشتخانەی بێ بەفرین دەبێ چۆن بێت، ئاگرێکی سارد و سڕ.

کچێ بەفرین گیان هیچت ئامادە نەکردووە؟ دەنا دەمویست دوو سێ پێشمەرگەش لەگەڵ خۆم بێنمەوە ماڵەوە. ئەمجارەیان بەفرین بڕیاری دا وەلاّمم نەداتەوە. منیش چومە ژوری شیرین، گوێم لە تەپەتەپی پێی شیرین بوو، بەو لا و بەو لا دا رای دەکرد. لەنکاوێک بووکەشووشەکەیم دۆزییەوە و منیش چۆکم داداوە و بەرامبەری دانیشتم، گوتم ئەوە بۆ وەک هەتیو بە تەنیا دانشتوویت چییە کەس نییە یاریت لە گەڵ بکات، گرتم و لە باوەشم کرد و رامگوشی گوتم کوا شیرین؟ لە گەڵ جولەی دەستم چاوەکانی دەتروکاند، ئەوەندەم زانی تنۆکە فرمێسکێک لە سەر کوڵمەی راوەستاوە. ئەم ئەسرینە دەتگوت دەریای بێ پایانە هەرچی ئەندێشە و بیری پاکی مرۆڤایەتی هەیە لە نێوی دا تواببووەوە. لە نکاوێک دەنگێکی نەرم و نیان هاتەوە بەر گوێم و گوتی: گیانە لە کاتی شەهید بونم نەگریایت ئێستاکە فرمێسکم بۆ دەرێژی؟ دەک لە منت نەکەوێ نەکا بۆ برینی خۆت بگری. وابزانم حەپەسام ،گوتم: نا بەفرین گیان هەست بە زامی خۆم ناکەم، برینی ئێوە منی کوشتووە. دەنگێکی تر هات و بێداری کردمەوە، بە هێزترین بابەی دونیا، چۆن لە نێو خەونەکانی من دا بەهێزیت، دەمەوێ هەر وا بمێنیتەوە و نە چەمێیتەوە. بەفرین گوتی، سالار تۆڵەی ئێمە ئازادیی کوردستانە، تۆ لە ئیستەوە دەستت بە گریان کردووە؟ گوتم.

- بەڵێنە ئەی کچینە، خەونەکانتان بێنمە دی ئینجا ئەشکتان بۆ برێژم.

- ئازاد گوتی سالار گیان شۆڕشگێڕ دەبێت دڵی هێند گورەبێت جێگای پەژارەی هەموو لێقەماوەکانی تیا ببێتەوە. بۆیە دەبێت بەرگری لە هەموو بێ دەسەلاّتەکان بکەین. لێ هەموو کاتێک ڕووالەت ئاوێنەی ناوەرۆک نییە بۆیە هەرگیز نابێ لەسەر ڕووالەت ناوەرۆک لە دەست بدەین. سالار یەکێکی وەک تۆ و یەکێکی وەک من چ کارێکمان بەم ولاّتە هەیە...؟ گەر نەتەوەی کوردیش وەک نەتەوەکانی تر سەرکردەی چاکی دەبوو، بۆ رۆڵەکانی بەم شێوەیە ریسوا و دەربەدەر دەبوون؟ لەم جیهانە فراوانە، ولاّت نەماوە کوردی

پەناهەندەی تێدانەبێ. لەوانە لە سەدا پەنجایان لە دژی شەڕی براکوژی هەڵاتوون. سەدی بیستیش دوای ئەم سەدی پەنجایە کەوتوون، ئەوانەی تریش هەندێکیان لە بێ سەروبەری ئەم دوو ئیدارە بێ مشورەی پارتی و یەکێتی هەڵاتوون. سەرکردەکانیشمان لە خوا بەزیاد بێ هەریەکەی وەک بەردی سەر دوندی چیا بە ئاسوودەییەوە سەیری بەردەکانی ژێر پێی خۆیان دەکەن. بەردەکانی ژێر پێیان وەک برا شانیان داوەتە یەک و سەرکردەکانیان بە کورسییەکانیانەوە بەرز کردووەتەوە. هەر یەک لە سەرکردەکانیش لە سەر کورسییەکانیان تا چاو بڕ بکات سەیری ئاسۆ دەکەن: بۆ هەر سێبەرێک چیرۆکێک دادەنێن، بۆ هەر لووتکەیەک داستانێک دادەڕێژن. خۆشیان بە پاڵەوانی هەموو داستانەکان دادەنێن.

پاش هۆنینەوەی داستانەکان وەک شازادەی بێ پەژارە، پێ دەخەنە سەر پێ؛ وەک بڵێیت نە خۆیان هیچ ژانێکیان چێژتووە، نە باسی هیچ پەژارەیەکیش بە بن گوێیان دا چرپاوە. ئەوکەسەی کە دیدەی هەر ئاشنای فرمێسکی خۆشی بێت، کە چاوی بە ئەسرینی پر لە پەژارەی مرۆڤێکی لێقەوماو دەکەوێت، ئەم ئەسرینە نەک کاری تێناکات بەڵکو بە بێ گوناه پێکەنین دەیگرێ و بە دڵێکی شادەوە بەلایدا رادەبورێ. بە پێچەوانەوەش هەمان مرۆڤی لێقەوماو کە چاوی بە ئەسرینی شادی هەمان کەس دەکەوێ گریانی راستەقینە دەیگرێ. بۆیە ئێمەی لێقەوماو کە سەیری پێکەنینی سەرکردەکانمان دەکەین، گریانمان دێ.

- داوای لێبووردن دەکەم ئەی راستی لە کوێیە؟

- راستی لە دەرەوەی مرۆڤە. هەرچەندە راستی لە دەرەوەی ئێمەیە، پێنج هەستەکە لایەنەکی راستیمان پیشان دەدەن، بەڵام هەرگیز ناگەنە ناوەرۆکی راستی، چونکە هەرکەسەی بە پێی توانای خۆی هەست بە راستی دەکات. چۆن وێنەیەک لە ئاوێنەیەک دا دەبینین هەمان وێنە لە ئاوێنەیەکی تردا نابینینەوە. بۆی هەیە هەردووکمان هەمان وێنە ببینین بەڵام بە هەمان شێوە هەمان وێنە نابینین. ئەوە لە لایەک، لە لایەکی ترەوە هەموو جیهان لە ئاوێنەیەک دا رەنگ ناداتەوە. ئینجا لە وەش زیاتر دەروونی مرۆڤ

ڕەنگدانەوەی ئاوێنەیی تەنی بەرامبەر خۆی نییە. ئەم وێنانەی کە لە سەر ئاوێنە تێدەپەڕن هیچ شوێنەوارێک لە سەر ڕووی ئاوێنەکە جێ ناهێڵن. بەڵام هەر وێنەیەک کە بە دەروونی ئێمەدا تێدەپەڕێت شوێنەوارێک لە پاش خۆی جێ دێڵێت.

سەرکردە دەبێت ئاوێنەی دەروونی نەتەوەیەک بێت تا ببێت بە سەرکردەی ڕاسەقینەی ئەو نەتەوەیە. ڕاستە سەرکردەکانی ئێمە ئاوێنەن، بەڵام ئاوێنەیەکی لێخنن، بۆیە ئەم نەتەوە پاکەیان لێخن کردوە. لە جیاتی ئەوەی لە سەر وانەی فیداکاری و لە خۆ بووردن بڕۆن و بەردەوام بن، فێری تاڵان و تاڵان کارییان کردن. مافیان داوە بە RR واتا هێزی "ڕاو و ڕووت" ماڵی کەسانی تر تاڵان بکەن: ئەگەر ئەو کەسانە مەیل داری پارتی دەسەڵاتدار نەبن. ئەم هەموو کردەوە نا کوردانەی کە کردوویانە لە سەر ئاوێنەی دەروونی نەتەوە وا بە ئاسانی تێناپەڕێت. چونکە ئاوێنەی دەروون ناهێڵێ هیچ وێنەیەک بێ شوێنەوار بەسەریدا تێپەرێت: بە گوێرەی ئەم شوێنەوارانە مێشک دەتوانێ وێنەی نوێ شیبکاتەوە. ئەگەر ڕووداوێک لەم ڕووداوانە بە شێوەیەکی کاریگەر ڕوویداتەوە، ئەم شوێنەوارانە لە توانایاندایە دڵی کۆمەڵ بوروژێننەوە و تەخت و تاراجی سەرکردەیەک وەرگەڕێنن. زۆر جار شیکردنەوە ئەوە ناگەیەنێ کە لە خودی کردارەکە بگەیت، بەڵکو ئەم شیکردنەوەیە دەتوانێت بتگەڕێنێتەوە بۆ ناو ئەو بازنەیەی کە ڕووداوەکە شیدەکاتەوە، ئینجا وەک بازنەیەکی لێک دا نەبڕاو لەناویان دا ئەژێیتەوە. وت و وێژ و هەڵسوکەوتی ئەو سەردەمە و شان و بازوو و لێهاتوویی یان جوانی جاری جاران، پێکەنینی بێ کۆتایی گشتیان دەبنەوە یەک و دێنەوە ناو لەش و دێنە دووان. ئەمەش وزەیەک بە لەش دەبەخشێت ئینجا باش یان خراپ. ئەمەش دوو سەرئەنجامان پێ دەبەخشێ: مل کەچی یان سەرپێچی، پاشەکشە یان پێشکەوتن، پێکەنین یان گریان، ئەمانەش دەمێننەوە سەر بار و دۆخی دەروونی ئەو کاتەی کە ڕووداوەکەی تێدا شیدەکرێتەوە. بڕواتبێت هەندێک پەژارە لە کاتی ڕوودانی ڕووداوێکی دڵتەزێن سەرهەڵنادات، پەژارەی وا هەیە پێش هەزاران ساڵ پێشی بوونمان سەری هەڵداوە، لە کاتی

ڕووداوەکە هەر سەرهەڵدەداتەوە و تەشەنە دەکاتەوە دەنا هیچی نوێ لە ئارادا نییە. ترسی ئازارێکی زۆر، داهاتوویەکی نا دیار لە هەندێک کردار دەمان ڕەوێننەوە تا نزیک نەبینەوە لە سەرئەنجاممان واتە مردن. یان لە دەستدانی شتێکی زۆر گینگ. بۆ نموونە بەردی سەر لوتکە هەر لەوە دەترسێ کە غلۆربێتەوە بۆ داوێنی چیا، سەرکردەکانمان لەوە دەترسن دەسەڵاتیان لە دەست بچێت. بۆی هەیە سەیرت پێ بێت بەڵام گەر مردن خەوێک بوایە بڕواتَ بێت کەس خەمی بۆ نە دەخوارد. سەرکردەکانیشمان لایان وایە دەسەڵات ژیانە. برام گەر ئەم هەموو دزی و تاڵانکارییە بە ئاسانی تێپەڕیبوایە، کەس قسەی لە سەر نەدەکرد، بەڵام کێ دزیی باشی کردبێ لە داهاتودا، دەبنە پاڵپشت بۆ دزە گەورەکان، ئینجا ئەوان فەرمانڕەوایی دەگرنە دەستیان و چواردەوریان بە دزی لێهاتوو دەچنن. ئینجا بەداخەوەم لە داهاتوو دا گەر دەوڵەتیشمان هەبێت، دەوڵەتەکەمان لە دەوڵەتی تورکیا باشتر نابێت، گەر خراپتر نەبێت، وای لێ دێت کە بەبێ واستە و بەرتیل هیچ کارێک نەڕوات و بە بێ دزیش هیچ کەس نەبێت بە وەزیر.

- کاک ئازاد دە تۆ واز لەم قسانە بێنە، سالار دەیویست لەم قسانەی دوورکاتەوە تا چیرۆکەکەی تەواو بکات. وام دەزانی کەرکووک ئازاد بوو. بۆیە بەتەما بووم بگریم. وەک دەبینیت جارێ زۆرمان ماوە، کەرکووک ئازاد بکەین، گریانیش لە گەروما پەنگی خواردووەتەوە، گەر نەیتەقێنمەوە دەمتەقێنێتەوە، بەسەر ئەوانەی کە کەرکووکیان فرۆشت. بەتایبەتی پاش هەڵێ هاتەکەی ئەم دواییە، پێشمەرگایەتیشم لە بەر چاو کەوت. چونکە دەمانتوانی بەرگری لە ناوچە ئازادکراوەکان بکەین، دەشمانتوانی ئازارێکی زۆر بگەێنینە هێزەکانی دوژمن. من لەم بڕوایەدام کە فەرمانی هەڵێ هات لە دەرەوە بەسەر سەرکردایەتی کورد دا سەپێنرا، ئەم فەرمانە نهێنییە لە فەرمانەکەی ساڵی ١٩٧٥ پیستر بوو.

- ئەرێ سالار، تۆ منت بۆ هێنا دەرەوە، بە نیازی کام قاوەخانەیت، "ئازاد بە زەردەخەنەیەکی تاڵەوە رووی لە سالار کرد" با بچین قاوەیەک بخۆینەوە وەختە مێشکم بتەقێ.

هەر بەدەم قسەکردنەوە ئەوەندەیان زانی گەیشنە باخچەی لوکسمبورگ، سالار گوتی. :
. خۆ ئەوەندەی نەمابوو لە یادم بچێ، باش بوو بە یادت دا هێنامەوە با تۆزێک بگەڕێینەوە ئا لەو قاوەخانەی ئەولا کچێک چاوەڕێمانە.
ئازاد بە پێکەنینەوە گوتی :
. خوا نەتگرێ تۆ .منت لە باوەشی دایکی منالآن هێناوەتە دەرەوە، چونکە ژوانت لە گەڵ کچێکا هەیە، ئینجا بەمن چی؟
. زۆر سەیرە ئەوانەی کە ژنیان هەیە لە زگورتییەکان چاوچنۆک ترن. دەبهێڵە قسەکەم تەواو کەم، هەی خوا نەتگرێ ئینجا هەڵی دەیە.
. ئازاد بە پێکەنینەوە قسەی پێ بڕی. دەباشە دەی قسەکەت تەواوکە، ئەوا من دەمم داخست.
. کاکە ئازاد کچێک بە ناوی (تەنیا) تازە لە کوردستانەوە گەیشتووەتە پاریس، منیش هێناومەتە ماڵەوە. خۆت دەزانی من کابرایەکی تەنیام، ناتوانم لە دوو سێ رۆژ بەولاوە کچێک لای خۆم گل بدەمەوە. بە تایبەتی کچێکی وا جوان و ناسک و هەرزەکار، بێ ئەوەی بیەوێ دڵی پیاو دەڕفێنێ. منیش وەک خۆت دەزانی مارەییم لە ئازادی کەرکووک بڕیوە. پەیمانم داوەتە دوو کۆرپەکەی دڵم تا کەرکووک ئازاد نەبێ جێگای سێیەم ژن لەم دڵەی من دا نەبێتەوە. ئینجا خۆت بڕیار بدە، دەتوانی بیبەیتە لای خۆت تا جێ و رێیەکی بۆ دەدۆزینەوە؟
. سالار خۆت ئاگات لە گوزەرانی من هەیە، ژینگەکەی من هەر دوو ژورە، ژوورێکی منالآن و ژووری نوستنی ئێمەی تێدایە، بە هەر شێوەیەک بێت شوێنێکی بۆ دەکەمەوە، بەڵام دەبێ زوو خانوویەکی بۆ دابین کەین، چونکە منیش ماڵەکەم زۆر تەسک و نا هەموارە.
. باشە ئەوە کورێک هەیە، بە ناوی شاسوار وا بزانم تۆ دەیناسی، پار هاتە فەرەنسا و چوو بۆ شاری گرینۆبل ئەوە مانگ و نیوێکە هاتووەتەوە پاریس ستۆدیۆێکی بچوکی دۆزیوەتەوە. ئەوەی بزانم دەیەوێ ماڵەکەی بگوازێتەوە، وا دیارە شتێکی باشتری بە دەست کەوتووە. بەڵام وەک خۆت دەزانی دەبێ

پێشی سێ مانگ بە خاوەن خانووەکە رابگەیێنێ کە دەیەوێ خانووەکە جێبهێڵێ; ئینجا ئێمە دەچینە لای و بە خاوەن خانووەکە دەڵێین خانووەکەمان بداتێ. تۆزێک رۆیشتن و چوونە قاوەخانەیەک، کچێکی بە مەزەندە تەمەن بیست ساڵان دانیشت بوو کوڕێکی نزیکەی تەمەن بیست و حەوت ساڵێکی رێک و پێک بەرامبەری دانیشت بوو قسەیان دەکرد.
ـ ئەو کچەی کە بەرامبەرمانە ناوی تەنیایە "سالار بە سەر سوورمانێکەوە گوتی" وا دیارە بە دوو رۆژ فێری فەرەنسی بووە، هەردووکیان لە مێزەکە چوونە پێشەوە و سالار داوای لێبووردنی لە هەردووکیان کرد و گوتی :

ـ خۆ دڵتەنگتان ناکەین گەر لە سەر مێزەکەتان دانیشین، تەنیا یەکسەر هەڵسا و دەستی بۆ ئازاد رکێشا و تۆقەی لە گەڵ کرد، سالار گوتی تەنیا خان ئەوە کاک ئازادە. کورەکە دەستی بۆ ئازاد راکێشا و گوتی، ئەلێکساندەر، دوایی بە هەمان شێوە دەستی دا سالاریش و دەستی تەنیای گوشی بە ئینگلیزی پێی گوت، ئەوە ژمارەی تەلیفۆنمە زۆرم پێ خۆش دەبێت گەر زەنگێکم بۆ لێبدەیت، بە زەردەخەنەیەکەوە داوای لێبووردنی لە هەموو لایەک کرد و زۆر بەڕێزەوە خۆی کێشاوە و رۆیشت.
ـ سالار زۆر بە شەرمەوە گوتی :
ـ تەنیا خان ئاگات لە خۆت بێ تەلیفۆن بۆ هەموو کەسێک مەکە، پاریس زۆر گەورەیە و کەس بە کەس نییە. خەڵکی وا لە ئەوروپا هەن، سیمایان زۆر رێک و پێکە، بەڵام هەمو شتێک قسە خۆشی و قۆزی نییە. هەر چەندە مافیشم نییە ئەم قسانەت پێ بڵێم، بەڵام من وەک براگەورەیەک پێت دەڵێم. پاش ئەوەش خۆت سەربەستیت.

تەنیا رووی لە سالار کرد، بێ ئەوەی سەیری نێو چاوی بکات، وەک نیمچە گلەیەک دەیویست بە چاو بە سالار رابگەیێنێ و بڵێ گەر بە خوشکی خۆتت دانابام لە ماڵێ خۆت دەرت نەدەکردم. خۆشت بە برا گەورە دادەنێی. دەبا وابێ، بەڵام داخی گرانم وا دیارە لە ئەوروپاش کچە کورد هەردەبێ

گوێڕایەڵ بێت، جارێ با وا بێت تا دەست و پێم دەکرێتەوە. بە دەنگە چپەدووەکەی خۆیەوە گوتی :
- کاک سالار تۆ هەر براگەورەی، لە ژیانم دا زۆرم پێ خۆش بوو براگەورەم هەبێت، ئەوا تۆم کرد بە براگەورەی خۆم، هەرچی بڵێی لە قسەت دەرناچم. دەزانم تۆ چاکەی منت دەوێ؛ بەڵام گەر مەخسەدت کاک ئەلێکساندەر بێ ئەوڕۆژەی کە لە ئینستیتوی کورد یەکترمان بینی ئەو کوڕەش لەوێ بوو و لە وێ یەکترمان ناسی، گەر دۆستی کورد بێ نابێ پیاوی خراپ بێت.
- بۆی هەیە وەک دۆستی کورد خراپ نەبێت، بەڵام ئاگات لە خۆت بێت پیاو هەر پیاون و تامەزرۆی گۆشتی خاون.
تەنیا بە پێکەنینیوە سەیری هەردووکیانی کرد و گوتی :
- ئێمەی ژن هیچمان لە دەست نایەت، خۆ گۆشتی خۆشمان ناکوڵێنین. بەڵام بڕواتانبێت من لە ناسنامەی خۆم بێبەری نیم هەردەم وەک کچە کوردێک و وەکِ ژنێک دەمێنینەوە و رەفتار دەکەم.
لە دڵی خۆشی دا دەیگوت، پلکم دەیگوت پیاو هەردەم بەرامبەر بە ژن لاواز بووە و هەر بە لاوازیش دەمێنێتەوە. گرفتەکە لەوەدایە کە پیاو خۆیان بە سەروەری ژنان زانیوە و دەزانن، بۆیە  هەست بە لاوازی خۆیان ناکەن. پیاوینە! سەروەریتان بەسەر چاومان؛ گەر هەڵە نەبم ئەوەی ژێردەست بێت هەرگیز نابێت بە سەروەر، پیاوی کورد سەروەری وڵاتەکەی خۆشتان نین، سەیرێکی خۆتان بکەن گەر منی بێ دەسەڵات نەبم خۆتان بە سەروەری کێ دەزانن؟
- باشە بە راستی نامەوێت بەم شێوەیە تێمبگەیت، بەڵام گەر خودا تەمەن دات رۆژێک لە رۆژان لەم هەڵوێستەی من دەگەیت "سالار وا دیار بوو کە زۆر بە پەلە بێت" تەنیا خان وەک خۆت دیتت من هەر یەک پێخەفم هەیە و من لە بەیانییەوە لە کارم تا ئێوارە و ئێوارانیش دەچمە دەرەوە و تا درەنگ نایەمەوەماڵەوە بەڵام لە خوا بە زیاد بێ ماڵی کاک ئازاد ئاوەدانە و ژن و منداڵی هەیە و رۆژ تا ئێوارە بەتەنیا نابیت. بە شەویش ئومێد و لانە لێتناگەڕێن بخەویت. ئەوەندە قسەیان خۆشە پیاو هەر پێی خۆشە گوێی لێیان

راگرێ و له گه‌ڵیانا بدوێ و یارییان له گه‌ڵ بکات. دوای ئه‌مه‌ش له مامۆستا باشتر فێری زمانی فه‌ڕه‌نسیت ده‌که‌ن، خه‌یاڵی ته‌نیا فڕی بۆ لایکی دیکه، بۆیه گوێی له سالار نه بوو چی ده‌ڵێت.
ئازاد به پێکه‌نینێکی منالآنه‌وه رووی له ته‌نیا کرد و هه‌ردوو ده‌ستی به‌رز کردەوه و گوتی :
- جا گه‌ر پێمان رازی ده‌بن؛ ئه‌وا ده‌رگای دیوه‌خانه بچووکه‌که‌مان کراوه‌ته‌وه. گه‌ر پێتخۆشبێت ده‌با به‌ڕێ که‌وین تا زووه جانتاکه‌ت بێنین و یا خوا به‌خێر بێیت، ماڵ ماڵی خۆته، و یه‌ک و دووی لێ مه‌که با هه‌ڵسین و ناوی خوای لێبێنین.
ته‌نیا زۆر به گه‌رمی سوپاسی سالاری کرد که ئه‌م چه‌ند شه‌وه له سه‌ر به‌تانیه‌ک خه‌وتووه و شوێنه‌که‌ی خۆی بۆ ئه‌و به جێهێشتووه. چه‌ند جارێکیش زۆر به دڵ ته‌زێنییه‌وه گوتی :
- گه‌ر شوێنت هه‌بایه هه‌رگیز ماڵی تۆم جێ نه‌ده‌هێشت به‌لاّم چی بکه‌م چارم ناچاره.
کچێک و کوڕێک به‌رامبه‌ریان دانیشتبوون ده‌میان له نێو ده‌می یه‌کتری نابوو به هیچ شێوه‌یه‌ک لێک جیا نه‌ده‌بونه‌وه، ده‌تگوت خه‌ویان لێکه‌وتووه. وا دیار بوو ته‌نیا سه‌یری به‌م دیمه‌نه ده‌هات و هه‌ر سه‌یری ده‌کردن. جارو بار مرچه‌یه‌ک له ده‌میان ده‌هاته ده‌ره‌وه، ئیتر ته‌نیا هه‌ناسه‌ی له‌به‌ر خۆی ده‌بڕی، و سه‌یرێکی ده‌ور و پشتی خۆی ده‌کرد؛ وا دیار بوو که‌س نه چاوی لێ ده‌کردن نه گوێیان له مرچه‌کانیان بوو، نه سه‌رنجیانیشی راده‌کێشا، هه‌ریه‌که‌ی خه‌ریکی وتووێژی خۆی بوو. ئه‌ویش ئه‌م دیمه‌نه‌ی زۆر پێ سه‌یر بوو و له ناخه‌وه ئاژاوه‌یه‌کی له ده‌روونی دا به‌رپا کرد، تای ته‌رازووی خواستی ژنایه‌تی و ره‌وشتی رۆژهه‌لاّتی لێک ترازاند. هه‌رچه‌نده ئه‌م دیمه‌نه شۆڕشێکی له کانگای دڵی ئه‌م هه‌رزه‌کاره نابووه‌وه، به‌لاّم به رواڵه‌ت دانی به‌خۆی دا گرتبوو وای پیشان نه‌ده‌دا که په‌شۆکابێت. به‌لاّم چاوه زیره‌که‌کانی ئازاد چاوی پێشمه‌رگه‌ی ناو شار زۆر له دان به خۆ گرتنی کچێکی ته‌مه‌ن

بیست سالآن زیرەک تر بوو. کاک ئازاد تا سەرنجی تەنیا راکێشێتەوە بۆ لای خۆی فینجانی قاوەکەی خۆی وەرگێڕا و گوتی :

ـ تەنیا خان لە چاوەکانت را دیارن کە دەزانیت قاوە بخوێنیتەوە، لێ بێ سوود بوو. تەنیا سەیری فینجانەکەی کرد و پێکەنی و گوتی :

ـ کاک ئازاد تۆ هیچت لە دڵ دا نییە چونکە ئەم قاوەیە بێ ترپە. دیسان سەرنجی تەنیا کەوتەوە سەر ئەم کچ و کوڕە، ئەم تەماشاکردنە بێ گوناهە لەم هەرزەکارە بە هێز تر بوو. ئازاد رووی لە سالار کرد و گوتی :

ـ دە هەڵسە با بچین جانتایەکەی بێنین و پێکەوە شیوی ئێوارە دەخۆین، مناڵەکانیش زۆریان پێخۆشە بتبینن. پارەکەیان دا و بەڕێکەوتن بەرەو ماڵی سالار کە لەو ناوە زۆر دور نەبوو. سالار کلیلەکەی دا بە تەنیا و گوتی :

ـ برۆ شتەکانت بێنە ئێمە لێرە چاوەڕێتین. پێنج خولەکی پێنەچوو تەنیا بە خۆیی و جانتایەکی بچوک لە ماڵەوە هاتە دەرەوە ئەو جانتایە لە دوو تا سێ کیلۆ پتر نەدەبوو. ئازاد بە پێکەنینەوە گوتی :

ـ لام وابوو ئیستە شان و پیلمان بە جانتای تەنیا خان دێتە خوارەوە، بەڵام باشە بارمان سوکە. تەنیا بە تاسەیەکەوە گوتی :

ـ کاک ئازاد هەموو رابووردوم و یادگارم لەم کەشکۆڵە بچووکەدایە.

ئازاد بە پێکەنینەوە قسەی پێ بڕیی و گوتی :

ـ دەبێ وێنەی منداڵیتی تیابێت؟

ـ نەخێر هەموو ژیانم لەم کەشکۆڵە بچووکەدایە، ئیتر نامەوێ باسی بکەم.

ئازاد تۆزێک شڵەژا و ویستی باسەکە بگۆڕێ بۆ باسێکی تر بە ئەسپایی گوتی دەباشە من زەنگێک بۆ سکالآ لێ دەدەم تا خۆی ئامادەکات، چونکە پێم نەگوتووە کە میوانمان دێت. بە تایبەتی کچێکی ناسکی جوانی وەک تەنیا خان.

سالار گوتی :

ـ کاک ئازاد ئەگەر رێگام بدەی من رووخسەت دەخوازم، چونکە هەندێک کار و بارم هەیە دەبێ جێ بە جێیانکەم، بەڵام لە دڵی خۆیدا دەیگوت، من گفتم بە

ئومێد و لانە دابوو کە یاریەکی خۆمانەیان بۆ بێنم. بەڵام هیچم بەدەستەوە نییە، جا بە چ چاو و ڕوویێک بچم بۆ لایان و چییان پێ بڵێم؟ بڵێم جارێکی تر بۆتانی دەهێنم؟

ئازاد بە هیچ شێوەیەک ڕازی نەبوو، سالار خۆی لەم بانگکردنە بکێشێتەوە. تەنیا لە سالاری پرسی ئەرێ منداڵەکانی کاک ئازاد تەمەنیان چەندە. سالار بە دزیەوە گوتی :

- ئومێد چوار ساڵانە و لانەش شەش ساڵانە.

تەنیا یەکسەر چاوی گێڕا شتێک بۆ زارۆکان بکڕێ. هەر بەرامبەر ماڵی کاک سالار ڕۆژنامەفرۆشێکی لێ بوو کە تۆزێک مژمژەی دانا بوو. بۆیە تەنیا بێ یەک و دوو ڕایکردە لایی و دوو مژمژەی سووری هەڵبژارد و بە دەست لە کابرای گەیاند کە دەکاتە چەند، و پارەکەی دانا و بە خێرایی هاتەوە لایان.

ئازاد وایدەزانی کە دڵی تەنیای شکاندووە، بۆیە وەک پەسن و پێهەڵگوتنێکی دڵپاکانە ڕووی لە تەنیا کرد و گوتی :

- ئێمە پاشی سێ چوار ساڵ ئینجا فێربووین ڕۆژنامەی فەرەنسی بخوێنینەوە، سەیری تەنیا خانکە لەم تەمەنە ناسکە لەجیاتی خۆی بە شتی لاوەکییەوە خەریک بکات، چۆن شەنگە بیری بەرەو مەڕەکانی لەنجە دەکات. تەنیاش بەم شێوەیە بەرەو ڕۆژنامە و بیر و ئەندێشەی فەرەنسی دەڕوات.

- خۆزیا وا بوایە، کاکە ئازاد من بەرەو ڕۆژنامەکان نەچوم، وەک دەڵێن کەس لە دەردی کەس ئاگادار نییە. منیش کە چاوم بە نوقڵێکی سوور دەکەوێت دەگەڕێمەوە تەمەنی شەش ساڵیم. کە تەمەنم شەش ساڵان بوو بەسەرهاتێکم بەسەر هاتووە ئێستا گەر ڕێگام بدەن بۆتانی دەگێڕمەوە. نازانم بۆ تەمەن لە چوار و شەش ساڵی ڕاناوەستێ؟ دەڵێن ساڵ بە ساڵ خۆزگەم بە پار، من دەڵێم ساڵ بە ساڵ خۆزگەم بەو ڕۆژەی... خۆزگەم بەو ڕۆژەی...؛ ئاخ هەندێک جار، بۆ هەندێک کەس وا هەڵدەکەوێ کەوا ڕابوردوو دەبێ بە ئاواتێک و خواستێک. ئەو کەسانەی بەدوای خۆشی ڕابردوو دەکەون لە قوژبن و سووچەکانی دێر زەمان دەگەڕێن تا چێژ و بۆی ژیانی ئێستاکەی لێ دەربێنن تا چێژێکی بێ کۆتایی لە دەمی ڕابوردوو وەربگرن بەم شێوەیە

چێژی ژیيانیش له لايان دەبێتە چێژێکی بێ کۆتايی. تەمەنی شەش ساڵیم دێرزەمانێکە و تێپەڕیوە، بەڵام لە شوێنی خۆی وەک نەبزێوێک چەقیوە. ئا بەم جۆرە خۆزگە لە دوای خۆزگە دێت، کاتی ئێستە بۆ بەيانی دەبێتە خۆزگەیێک بۆ دوێنێکە. بەڵام رابووردووی من لە چەقێکا راوەستاوە، میلی سەردەمی جاری جارانی من لە ئێوارەيەکا کاتژمێری دەستمی راگرتووە. لەو ساکەوە چەقیوە و بۆ پێشەوە ناچێ تا بڵێم خۆزگەم بەوەی پێشوو، يەک خۆزگەشم هەيە دەڵێم خۆزگە ئەم بەسەرهاتە رووینەدابایە. رابووردووی کەسانی تر ملوانکە و بازن و خڵخاڵن، رابووردووی من زینجیر و کۆتی دەست و پێمن تێم ئاڵاون لێم بەر نابن. چۆن خۆزگەی گوشادان بە ئاهێکی ساردەوە دێتەوە يادیان و بە گەرمی باوەشیان بۆی دەکەنەوە؛ بە ئاهو هەناسەی سارد پێشوازی لە خۆزگەی ئەو خۆزیا نە بوایەی خۆم دەکەم و بە ئەسرینی چاوانم دەيانشۆمەوە و لە شوێنی خۆيان بە تارايەکی کەسک و سوور دایاندەپۆشمەوە. نەبادا تۆزی رۆژگاریان لێ بنیشێ و زوو زوو تاراکەيان پێدادەدەمەوە نەکا سەرمايانبێت، نەوەکا فرمێسکی چاوانم بەسەریان دا بڕژێن. چەند خۆزگەی خۆزگە داران لە لايان شیرینە، ئەم کۆت و زنجیرە لەلای من ئەوەندە و ئەوەندەی تریشی بێتە سەر لە خڵخاڵ و بازنی ئەوان شیرینترن. با بە کورتی و بە کوردی خۆمتان پێ بناسێنم، من چ کوارگێکم، تاک و تەنیا لەم زەمینە بەرینەدا بە بێ رەگ وەک قارچکی پاش بروسکە سەرم هەڵدا و خۆم دۆزییەوە، بە بێ لانە لەم دەست بۆ ئەو دەست، بڕواتان بێت ماڵم هەبوو، ئێوارەيەک کاتژمێری دەستم شکا، لەو ساکەوە هەر سەيری کاتژمێری دەستم دەکەمەوە، هەمان رووداو خۆی بەسەرما دەسەپێنێتەوە. "بەر دەرگای ماڵی خۆمان" "چۆن نوقڵەکانی حەمەی برام لە نێو خۆڵەکەی بەر دەرگای ماڵی خۆمان هەڵگرتەوە."

رۆژ ئەوەندەی نە ما بوو ئاوابێت، وەک بازنەيەکی سوور خەریک بوو لە سەر لووتکەی چیای سەفین بنشێتەوە. کەژاڵی دايکم کە دايکی دوو مناڵ بوو. تەمەنی حەمەی برام چوار ساڵان بوو و منیش دوو ساڵ لە برام گەورەتر بووم. برا بچوکەکەم کە ناوی محەمەد بوو ئەوەندە ئەسمەر و

خوێن شیرین بوو، لە خۆشەویستییان باوکم و دایکم هەر بە حەمە عارەب بانگیان دەکرد. دایکم بەرامبەر بەو ڕۆژە حەپەسا. حەمە عارەب یاری دەکرد، منیش خەریکی ئەلف و بێ بووم. دایکم گوتی :
- کچی گەورەم وەرە شتێکت پێ بڵێم. منیش لێی چوومە پێشەوە و گوتم دایە نقوڵت پێیە؟ ئا، ئا نوقڵم پێیە، کچم سەیرێکی ئەم ڕۆژە بکە بزانە بۆنی خوێن ناکەی؟
- نا دایە بۆ بۆنی خوێن چۆنە؟
بە سەرسامییەوە سەیری کردم و گوتی :
- کچم ئا ئەم ڕۆژە سوورەت دیوە؟ کە ڕۆژ وا سوور بوو، ئیتر خوێن دەڕژێ. هەڵسە حەمە عارەب ببە و بڕۆ بۆ ماڵی پڕشنگ.
- نا دایە ناچمە ماڵی پلە پڕشنگم، ئیمڕۆ دولبەری کچی زمانی لێ دەرهێنام و گاڵتەی پێکردم، منیش ئیتر قەت قسەی لەگەڵ ناکەم.
دایکم لە نێو قەدی نوێنەکان تورەگەیەکی بچوکی دەرهێنا تۆزێک نوقوڵی تێدا بوو. بەشێکی دا بە محەمەد و بەشێکی دا بە من و گوتی ئەم چەند شەکرۆکەیەش بدە بە دولبەر و ئاشتبنەوە، باشە؟ کچم وەرە ماچێکم دەیە و من و محەمەدی لە باوەش گرت و دەستی کرد بە گریان، لە بەر خۆشیەوە دەیگوت، خۆشم نازانم بۆچ دەگریم بەلام بەدەست خۆم نییە و گریانم دێت، خۆزیا بچووبای لە بازار بابەت دیبا تا ئەویش لە ماڵەوە نە خەوتبا، دڵم ئۆقرە ناگرێ ئێوە بڕۆن، من بۆ خۆم باوکتان دەدۆزمەوە تا لە ماڵەوە نەخەوێت.
- دایە ئینجا لەگەڵمان وەرە و پێکەوە دەچینە ماڵی پلە پڕشنگ، وەک ئەو جارە کە چوبوینە ماڵی کاک ئەحمەد باوکم خۆی هات لە دوامان گەڕا و ئێمەی دۆزییەوە، بابە زۆر زیرەکە هەموو شتێک دەزانێ.
- کچم زووکەن بڕۆن خەمی منتان نەبێت، إنشاء الله هیچ نابێت، کتێبەکانت لەگەڵ خۆت ببە بەیانی زوو بڕۆ بۆ خوێندنگە، نیوەڕۆ بە ئیزنی خوا یەکتر دەبینینەوە، دەبڕۆ کچی گەورەم دەستی برات بەرمەدە.

تاکوو ئیستاش چاوە رەشە گەورە و پڕ لە ئەسرینەکانی دایکم، لە بەر چاوم ون نابن. کە سەیری کردم جارێ راوەستاوم، بە زەردەخەنەیەکەوە چاوە پڕ لە فرمێسکەکانی سڕیەوە و گوتی کچم تا ئێستاش هەر لێرە راوەستاوی، ئەگەر بابەت دیت بڵێ بابچینە ماڵی پلە پڕشنگ دوایی منیش لە دوواتان دێم. منیش پەلی عارەبم گرت و بە راکردن رۆیشتم. زۆر لە ماڵەوە دوور نە کەوتبوومەوە دیتم باوکم بە بەرگی کرێکارییەوە بەرەو ماڵەوە دێتەوە، محەمەد خۆی راپچڕاند و خۆی گەیاندە باوەشی بابە منیش گوتم بابە ئیمڕۆ لە ماڵی پلە پڕشنگ بانگ کراوین، کچم بابچم سەردرم "جلی کارە کە لەسەر جلی پاک لەبەری دەکەن" بگۆڕم ئینجا پێکەوە دەچین. ئەوەندەم زانی باوکم بە راکردن بەرەو ماڵەوە رای کرد، کە ئاوڕم داوە دیتم زیلێکی سەربازی لە لای دەرگامان راوەستاوە و پەلی دایکم رادەکێشن بۆ ناو زیلەکە، باوکم خۆی گەیاندێ ویستی دایکم لە ناو پەلی سەربازەکان رزگار بکات عارەبیش بەدوای باوکم کەوت. بەڵام سەربازەکان دایکم و باوکمیان سواری زیلەکە کرد و عارەبیان فڕێدا ناو زیلەکە، باوکم پاڵێکی بە محەمەدی برامەوە نا و لە ترومبێلەکە فڕێیدا خوارەوە. وابزانم باوکم دەیگوت ئەوە کوڕی من نییە، چونکە عارەب دەگریا و دەیگوت بابە زانیان ئەوە منالی وانە بۆیە فڕێیان داوە ناو زیلەکە. وا دیار بوو عارەب دەگریا، بۆیە سەربازێکیان بە پۆستالەکەی یەک پێلەقەی لێدا و ئیتر گوێم لە دەنگی گریانی محەمەد نەما. ترومبێلەکە بەلامدا تێپەڕی، دیتم باوکم دایکم و محەمەدی لە باوەش کردبوو. وا دیار بوو چاوی لە من دەگێڕا، ئینجا نازانم منی دیت یان نا، بەڵام ترومبێلەکە رۆیشت. منیش بەرەو ماڵ گەڕامەوە، سێ شەکرۆکەی کە دایکم دابوی پێمان لە دەستی حەمە کەوتبوونە خوارەوە. منیش هەرسێکیانم هەڵگرتەوە و چومەوە ژوورەوە تورەگەکەی دایکم کە لە لای ئیستکانەکان دایناموو هەڵگرتەوە و شەکرۆکەکانم بۆ حەمەی برام لە ناو تورەگەکە نایەوە. دایکم دەیزانی بابە زۆر حەز لە چای سەنگین دەکات. چایەکە لە سەر سەماوەرەکەی کە من پڕ ئاوم کرد بوو لە مێژ بوو دێمی کێشا بوو. بۆیە دایە پێشی شیو خواردن چایەکی بۆ بابە تێدەکرد و بابە رادیۆ بچوکەکەی

دەهێنا و گوێی لە گۆرانی رادەگرت تا دایە شیوەکەی دەهێنا بەر دەممان. ئینجا ئەوەی هەبایە دەمانخوارد. وەک دێتە بیرم دواییش باوکم ئانیشکی دادەنا سەر بالیفەکەی کە دوێنێ شەو سەرم پێکرد بوو. ئا...ئا، هاتەوە یادم کە دایکم نوقڵەکانی داینێ، نوقڵێکی سووری تیابوو ئەویش بەبەر من کەوت حەمەی برام گریا و داوای نوقلە سوورەکەی دەکرد، منیش نوقلەکەم نەدایێ، بەڵام ئەو شەوە، کە سەیری نوقڵەکەم دەکرد؛ دەگریام چاویشم بە بالیفەکەی باوکم دەسڕییەوە، سەماوەرەکەش هەر گیزەی دەهات، رادیۆکەش لە شوێنی خۆی بەبێ دەنگ پشوی دابوو، وەک بێدەنگی ئیمڕۆکەی جیهان بەرانبەر بە تاوانی ئەنفال، بە هەمان شێوەش رادیۆیەکە لە سەر ئەم دەنگ و باسە کڕ بوبوو.

****

نازانم چۆن خەوم لێ کەوت؛ لە خەوم دا دایکم و باوکم دیت لە باخچەیەکی سەوزی بەرین دەستی حەمەیان گرتبوو و پێکەوە پیاسەیان دەکرد. هاوارم کرد دایە بابە حەمە کەس وەڵامی نەدامەوە، گوتم ئەی ناتانەوێ لەگەڵتانا پیاسە بکەم. هەر حەمە گوتی نوقلەکانم بۆ هەڵگرە، توخوا ئەگەر نوقڵە سوورەکەشت نەخواردووە بۆمی بێنە ئێرانە. لە خەو راچڵەکیم و هەڵسام، دیتم بەیانییە، سەماوەرەکە سارد بۆتەوە نە دایکم دیارە نە کەس، دەتگوت ئەمماڵە قەت کەسێ تیا نە ژیاوە. وەک ئاسایی چونکە دایکم پێی گوتبووم برۆ بۆ مەکتەب تا لێم تورە نەبێت، هەڵسام و پەڕاوەکانم هەڵگرت و چوومە خوێندنگە. نیوەرۆ ئەوەندەم برسی بوو، بە راکردن هاتمەوە ماڵەوە. چونکە دوێنێ دایە پێیگوتبووم "نیوەڕۆ بە ئیزنی خوا یەکتر دەبینینەوە" هاتمەوە ماڵ، ماڵ چ ماڵ چۆل و هۆل، تەماشام دەکرد سەماوەرەکە هەر لە شوێنی خۆیەتی...، کەس دەستی لێ نەداوە...، لە بەرخۆمەوە دەمگوت دیارە نەهاتوونەتەوە. ئینجا دەستم کرد بە گریان. لە چێشتخانەکە هاتمە دەرەوە و بانگم دەکرد دایە حەمە عارەب لە کوێن. یا ئەیشێ هاتە دەرەوە و پەلی گرتم و بردمیە ماڵی خۆیان و لە گەڵ مناڵەکانی خۆی قاپێک نیسکێنەی بۆ تێکردم و گوتی کچم مەگریێ دایە و بابە دێنەوە. کە قاپەکەی خۆم تەواو کرد سەرم هەڵبڕی دیتم، یا ئایشێ چاوی پڕ لە گریانە و سەیرم دەکات؛. ئەوساکە هەستم پێ دەکرد شتێک روویداوە، بەڵام چییە؟ نەم دەزانی. وا دیار بوو یا ئایشێ هەستی پێکرد کە تێر نەبووم بۆیە تۆزێکی تریشی بۆ تێکردم. ئینجا لێی پرسیم کچم دوێنێ لە کوێ خەوتی؟ پێم گوت لە ماڵەوە بە تەنیا خەوتم، و خەوێکی زۆر خۆشم دیت، و خەوەکەم بۆ گێڕاوە دەستی کرد بە گریان، گوتی کچم إنشاء الله جێگایان بەهەشتی بەرین دەبێ، چونکە زۆر بێ گوناهن، باوکت و دایکت سەریان بچووبا نوێژیان نەدەچوو، زمان و دەست و دامێنیان پاک بوو. خودایە کەس لە کاری تۆ تێناگات، ئێمەی بەندە ناشتوانین دەست لە کاری تۆ وەردەین. خودایە دەبێت گوناهمان چیبێت بەم دەردەمان دەبەیت. گوناهی ئێمە ئەوەندەیە کە موسوڵمانین، بەدەستی موسوڵمانان بەم دەردەمان دەبەی؟ یەکەم جارم بوو ببیستم کە یەکێک وا بە ئاشکرا توک لە سەدام بکات

و بڵێت: سەدام تەختت وەرگەڕێ، سەدام ماڵت کوێر و هۆربێتەوە، سەدام جەرگت بسووتێ وەک چۆن جەرگی ئەم خەڵکەت سووتاند، خودای گەورە ووجاغی سەدام کوێرکەیتەوە، خودایە تۆ بەسەبری ئەما بە زەبری تۆڵەی ئەم کوردە بێ گوناهە لەو تاوانبارە بکەوە. خودایە لەدەست ئەم دوژمنانە نەجاتمان دەی تا ئیمانمان نوێ بێتەوە. ئینجا یا ئایشێ رووی لە من کرد و گوتی :

ـ کچم پێکەوە دەچینە ماڵی پلکت بابزانم پلکت دەڵێ چی. منیان بردە ماڵی پلە پرشنگم ئەویش وەک کچی خۆی گەورەی کردم.

ئەو رۆژە بۆمن رۆژێکی سەیر بوو، هەر ئەورۆژەیە درێژدەبێتەوە و ئاوانابێت و نابڕێتەوە، هەموو شتێکی لە شوێنی خۆی راگرتووە. بێ ئەوەی بمەوێ ئەو رۆژە کاتژمێری دەستمی وەستاند و لە کار خست. ئەو رۆژە ئاوانابێت چونکە من دایە و بابە و حەمەم هەبوو. ئاوانابێت چونکە هەر لەو رۆژەش دا دەبێت پێکبگەینەوە. گەر درۆی تیانەبێت هەرچی کاتژمێری دونیا هەیە بە راکردن دەڕۆن، کاتژمێرێکی لێدەرچێت لە شوێنی خۆی وەستاوە، ئەویش کاتژمێری منالیمە. ئەوەی سەیرە ئەوەی تریان نازانم چۆن دەسوڕێتەوە یەکسەر نەیهێشت بە منالی خۆم رابگەم. بێ ئەوەی لۆچ بکەوێتە دەم و چاوم پیر بووم. هەستم دەکرد منالەکانی هاوتەمەنم منالی منن، وام هەست دەکرد حەمەی براشم کوڕی من بوو، دایکیشم کچی من بووە. ئێستاش لە پیرەمێردێکی بەساڵا چوو دەگەڕێم دەستی بە سەرم دا بێنی وەک ئەو رۆژانەی کە باوکم دەستی بەسەرم دادەهێنا. هەموو کاتێک بیرۆکەیەک وازم لێناهێنێت وەک رەشەبا بە بەردەمما دێت و دەچێت. وادەزانم لەم ژینەدا من بیرۆکەیەکی نەنووسراوم وەک تەپ و تۆزی ژێر پێی سوارێک وام، کە بە گوندێک دا تێدەپەڕێت. خەڵکی گوند سەیری سواری تێپەڕیو دەکەن. باوەشێنی خۆشیان دەکەن تا تەپ و تۆزیان لێ نەنیشێ. منیش تەپ و تۆزێکی زیادم، هەرکەسەی خۆی باوەشێن دەکات تا لێی نەنیشم. ئەو پیاوانەی کە بە باوکم دەشێن خۆیان باوەشێن دەکەن و لێم دوردەکەونەوە. من بە ئاواتەوەم پڕ بە دەنگی خۆم هاوار بکەم و بڵێم من لە جیاتی شانەی

ڕەق و تەق لە دەستێکی بە چەمەنتۆ سوتاو دەگەڕێم پرچمی پێ شانەکەم. داخی گرانم کەس لە کچی هەتیو ناگات، کەس لە منی بریندار ناگات.

سالار و ئازاد نوقەیان لە خۆ بڕی بوو، ئەوەندەیان نەمابوو گوێیان بخەنە ناو دەمی تەنیا نەبادا وشەیەکیان گوێ لێنەبێ. هەر ئەوەندەیان زانی گەیشتنە لای دەرگایماڵەوە. پێش ئەوەی لە دەرگا بدەن لانە دەرگای بۆ کردنەوە. دایە بابە لەگەڵ دادەیەک و مامە سالارە. لانە یەکسەر ئەم لا و ئەو لای سالاری ماچ کرد و هاواری کرد ئومێد مامە سالارە، بەڵام ئومێد خەریکی یاری خۆی بوو بۆیە گوێی لێ نەبوو مامە سالار هاتووە یان نەء. هەرسێک بە ئەسپایی هاتنە ژوورەوە و سکاڵاش لە ژوری خەوتن هاتە دەرەوە. دیاربوو خەریک بوو خۆی ئارایش دەدا، خۆی جوان بکات تا پێشوازی لە میوانان بکات. یەکسەر باوەشی بۆ تەنیا کردەوە و ئەم لا و ئەو لای ماچ کرد و تۆقەیەکی گەرمیشی لە گەڵ سالار کرد و لە هۆڵەکە دایینیشاندن و بە پێکەنینەوە رووی لە ئازاد کرد و پێیگوت، بەخێربێیتەوە کاکی گەڕۆک، ئەی کێ بوو ئەم بەیانییە گوتی دەچم شیر بۆ زارۆکان دەکڕم؟ ما شاء الله خاوەنی قسەی خۆتی، توخوا کاک سالار سەیری دەست و پەنجەم کە بە کاری ناو ماڵ و شت کڕینەوە دەڵێی دەست و پەنجەی پیرێژنی هەزار ساڵەیە. توخوا ئەوە خۆشەویستییە؟ سالار قسەی پێ بڕی، دەی دەی گلەیی مەکە هەموو رۆژێکی خوا دایناوە کاک ئازاد دەچێ بۆ بازاڕ، ئەم لێقەوماوە هەر ئیمڕۆکە نەچووە بۆ بازاڕ، سکاڵا خان وەختە بیخوات. سکاڵاش دای لە قاقای پێکەنین و گوتی، شەرتبێ ئیمڕۆکە بە برسییەتی بتنێرمەوە ماڵەوە، هەموو رۆژێک دڵم پێتدەسووتا، ئیتر قەت دڵم پێتناسووتێ، ئەگەر دۆستی وەک تۆم هەبێت، دوژمنم بۆ چییە؟ ئەرێ ئازاد گیان با لە یادم نەچێت ئیمڕۆ چێنەرم لە بازاڕ دیت و گوتی تۆ چێنەر و سەپانت بانگ کردووە.

- ئازاد بە سارد و سڕییەکەوە، گوتی :

- باشە باشە دەبا بێن چی تیایە. ئەوانیش لێقەوماو و بێکەسن، داخوا چەند ساڵە کفتە و شۆربایان نەخواردووە. کچێ سکاڵا گیان باش بزانە منداڵی

خراپ نییە، گەر منداڵ خراپ بوو، ئەوا باوک و دایک خراپن. ئێمەش دەبێت ئەم خەڵکە لە خۆمان نزیک کەینەوە ئەوەی پێمانکرا پەروەردەیکەین ئەوا پەروەردەی دەکەین، ئەوەی نەشکرا خواحافیزی بێت.
- سکاڵا زۆر زۆری پێناخۆش بوو کە بیستی چێنەر و سەپان دێن بۆ لایان، بۆیە بە راشکاویەوە بە ئازادی گوت.
- ئازاد ئەو جارە خۆت گوتت ئیتر ناهێڵم ئەوانە پێ بخەنە ماڵی من. ئیستەش وا بە ئاسانی بانگیان دەکەیتە ماڵەوە. چێنەر چاوی بە هەر ژنێک بکەوێ دەیەوێ بچێتە ژێر کراسەکەی. خۆ سەپانیش مرۆڤ پێی شەرمە باسی بکات. جارێ سکاڵا رستەکەی خۆی تەواو نەکرد بوو زەنگی دەرگا لێدرا. دەک بەزیای خێرم نە کرد ئەوە گەیشتنێ. ئازاد خۆت خزمەتیانکە، من و تەنیا دەچینە هۆدەی خەوتن، تۆش چی دەکەی بیکە. ئازاد بە راکردن چوو دەرگای کردەوە. مامۆستا یاخوا بەخێربێیت . سەید ئەحمەد لە لای گەنجەکانی پاریس بە مامۆستا ناسرابوو.
سکاڵا یەکسەر چووە بن گوێی تەنیا و پێی گوت ئێستە چیرۆکی ئەم زاتەت بۆ دەگێڕمەوە ئەم چیرۆکە درۆی تێدانییە، ئەو رۆژە سەید ئەحمەد خۆی بۆ من و ئازادی گێڕاوە. سکاڵا و تەنیا بەخێرهاتنیان کرد و چوون بۆ ئاشپەزخانە و دەستیان کرد بە ئامادەکردنی خواردن. ئازاد ناوە ناوە دەهات تۆزێک یارمەتی دەدان و دەگەڕاوە هۆڵەکە. سکاڵا لەبەر گێڕانەوەی چیرۆکی سەید ئەحمەد ئاگای لە هیچ نەبوو. مامۆستا بۆی گێراینەوە و گوتی:
رۆژێک پیری پیران لە نێومان دا دانشت بوو، ئەوساکە من شاگردێکی پێشکەوتووی پیری پیران بووم، پێی گوتین.
- ئەوا هەموو شتێکم بۆ روون کردنەوە، "طەریقەتەکەمان" رێبازێکە هەموو لایەکی ژیان دەگرێتەوە، پاشی ژیانیشمان دەزانین چیمان بەسەر دێ و لە کوێ یەکتر دەدۆزینەوە. ئیتر بە تەمای خودا بڕۆن و رێنمایی ئەو پەیڕەوە بکرن کە بۆم داناون، فێڵ و فندی تێدا نییە، بەڵکو لووتکەی بڕوایە بە خودای گەورە، ئێوەش بڕۆن و بێ پەروا لە پێناوی خۆشەویستی خودای گەورە ئەم پەیڕەوە بڵاو کەنەوە.

مامۆستا دەڵێ بە پیرم گوت.
- من یەک لە بارەخۆم ئامادەم لە پاش ئاوابونی گیانی پیرۆزتان ڕێچکە پیرۆزەکەتان بڵاوکەمەوە، چونکە من خۆم بە بەشێک دەزانم لەم ڕێچکەیە. گەر ئەم ڕێنماییەم لێ ون بێت ڕێگای ناسینی خودام لێ گومدەبێ. سەروەرم بۆچ تۆ دەرۆیت ئەی نازانیت پەیامبەرانی پێشی تۆ چییان لە پاش بە جێ ماوە؟ ئەی ناڵێیت کە پەیامبەر دەروات، شاگردەکانی ناوی بەد دەکەن.
- چونکە بە توند و تیژی پەیڕەوی ڕێنماییەکانی دەکەن. شاگردانم توندڕەو مەبن میانڕەو بن، خۆشەویستی لە دڵتانا ئاوا نابێت.
خولە چاوڕەش ئەویش یەکێک بوو لە شاگردانی پیری پیران بە سەرسامییەوە گوتی :
- ئەی پیری پیران هەتیومان مەکە جێمان مەهێڵە، چونکە فەرمودەی تۆیە دەڵێیت، چیمان لە سەرگوزشتەی پەیامبەران بۆ بەجێ ماوە. تەم و مژ ڕێبازەکانیانی ون کردووە. گەر بیرو باوەریان شیکەینەوە، لە سکاڵا و پارانەوە بەو لاوە هیچی ترمان بۆ بە جێ نەماوە. لە سەرگوزشتەکانیان وا بەدیار دەکەوێ کە وێرد و پاڕانەوەیان و هانایان بۆ بەر خودا هەر لە پێناوی خواستی دیاریکراوی ڕۆژانەیان بووە. ئێمەش ڕاهاتووین لاساییان بکەینەوە، لە پاش هەموو نوێژێک خواستی ڕۆژانەمان بە پاڕانەوە بە کردگار ڕابگەیەنین. وەک بڵێی ئەم خودا گەورەیە لە گیروگرفتەکانمان بێ ئاگایە.
- پیری پیران دەیگوت :
- لە یادتان نەچێت حەزرەتی ئەییوب لە خودا نەپاڕاوە تا لە نەخۆشییەکەی رزگاریکات. بەڵکو لە خودا پەرستی بەردەوام بوو بێ ئەوەی بە یادی خودا دا بێنێتەوە کە نەخۆش و کەنەفتە.
مامۆستا گێڕایەوە و گوتی من بە گریانەوە بە پیری پیرانم گوت :
- مامۆستا ئەی نووری هەردوو چاوانم، بێ سەرپەرشتکار لەم جیهانە بێبەزەییە جێمان مەهێڵە و مەڕۆ، تۆزێکیتریش فێری پەیڕەوی خۆشەویستیمان بکە، چونکە تاوەکو ئێستەش من لە خوا دەترسم، ئەم ترس و لەرزە وەک پیرۆزتان دەڵێت دوورکردنەوەیە لە پەیڕەوی خودا ناسین.

تۆزێکی تر بۆمان بژیێ تا رزگارمانکەیت لە چوارگۆشەی پەیڕەوی بە ناو پەیامبەران وەک دەفەرموویت ئەویش : هانا و هاوار و لاسایی و ترسە.
. رۆڵە، جارێ ترس هەر دەمێنێ. چونکە ترس پێکارێکی "دوگمەی بە کارهێنانی ئامێر" مێشکە، ئەم پێکارەش بە شێوەیەکی سەربەخۆ وەک هەموو پێکارەکانی تری مێشک کاردەکات، هۆشیارانە و بەبێ هۆشی وەک دڕندە لە پێناوی ژیان دەجەنگێ و ژیان دەپارێزێ و خۆی بەدەستەوە نادات. دەمێک پێشی مردن ئەویش پەکی دەکەوێ هێز و توانای خۆی لە دەست دەدات، ئینجا بە ناچاری خۆی دەداتە دەست، لەشیش بە ئاسودەیی پێشوازی لە نەمانی خۆی دەکات. ئەی رۆڵەکانم پەیامی من ئەوەیە، مرۆڤ دەبێت شەیدای ژیانبێت وئەڤین شوێنی کینە بگرێتەوە، ترسیش ببێتە خۆشەویستی.
خولەی چاوڕەش، سەیری نێو چاوی پیری پیرانی کرد و پرسی :
ئەی کینە  لە کوێ لە دایک دەبێت؟
. ئەویش لە جەرگی خۆشەویستی و لە توندڕەوی و ناتێگەیشتن لە دایک دەبێت. لە هیچ شتێک توندڕەو مەبن، ئەگەر ئەم تونڕەوییە لە پێناوی خۆشەویستی خوداش بێت، وازی لێ بێنن. کینەتان لە گەورەترین تاوانباریش نەبێت، چونکە کینە دوژمنی خۆشەویستییە. خۆشەویستی توانایە و کینەش بێ هێزیی و لاوازییە. گەر گەورەترین تاوانبار کەوتە ژێردەستتان مەیکوژن. لێبوردن بەشەکی سەرەکییە لە پتەوی ئیمان بە خودای گەورە، بۆیە لێبوردن پێکهاتەی خۆشەویستییە.
. ئەی سەدام دەبێ خۆشەویستی چی لە دڵدابێت؟ چ جەرگ سوتاوێک دەتوانێ لەو دڕندەیە ببوورێ؟ ئەو لاوەی لە تەمەنی مناڵییەوە، یەکە ئاواتی ئەوەبووە بڵێ بابە، چۆن دەتوانێ لەو خوێنڕێژە ببوورێ؟
. گەورەترین دیکتاتۆر رۆحی خۆی خۆشدەوێ، رۆحی هەر کەسێکمان بەشێکە لە رۆحی خودا، کەوا بوو دیکتاتۆریش پڕە لە خۆشەویستی خودا، با خۆشی ئەم وەعییەی نەبێت، رۆح وامی خودایە لەلامانە، بۆیە دەبێ لێی گەڕێن تا بۆ خۆی دەیباتەوە. دەسکاری کاری خودا مەکەن.

ـ سەید ئەحمەد دەیگوت من بە سەرسامییەوە سەیری مامۆستام دەکرد، وەک پاڕانەوەیەک پێم گوت :
ـ ئەی پیری پیران با سەدام لەم هاوسەنگییە دەربێنین، چونکە ئەوە دڕندەیە لە بەرگی ئادەمیزاد دا دەژیێ. ئەم دڕندەیە دەبێ خۆشەویستی چی لە دڵدابێت؟ کە ئەم هەمووِ کوردە بێ گوناهە لە ژێر ئاڵای "الله اکبر" قڕ دەکات و زیندە بە چاڵیان دەکات. دوای ئەمەش ئەم کردارانە ئیمانی کورد بە ئیسلام لاواز دەکەن، چونکە زۆرینەی کورد لەو بڕوایە دان کە کوشتنی بە کۆمەڵ لە خوێنی عەرەب دایە. گەر ئەم بیرۆکەیە دووربوایە لە بیر و بۆچونی عەرەب هەرنەبێ دەنگێکی راستەقینە لە دەوڵەتێکی عەرەبەوە هەڵدەستا و بەرهەڵستی لە کردەوە ناپاکەکانی دەکرد و بە گژی دادەهاتەوە و دەچووە ناو چاوی و پێی دەگوت عەرەب لێت بێبەرییە. عەرەبێک ناڵێت ئەرێ سەدام لە ژێر ئاڵای"الله اکبر" چۆن نەتەوەیکی موسوڵمان قڕ دەکەی؟ ئەی موسوڵمانان برای یەکتری نین؟
ـ هەر سەردەمێک خودا نەتەوەیەک هەڵدەبژێرێ، ئەم جارەیان خودا نەتەوەی کوردی هەڵبژارد نەک بیکات بە وانە، بەڵکو بیکات بە قوربانی تا گوناهی مرۆڤایەتی بە خوێنی پیرۆزی شەهیدانی کورد بشواتەوە. خودا چەند حەزرەتی عیسای خۆشدەویست بەڵام بە خوێنی ئەو گوناهی مرۆڤایەتی شوشتەوە. ئا ئەم جارەشیان بە ئێش و ئازار و ئەشکەنجەدانی کورد جیهان بەرەو بڕوا بە خودا دەباتەوە.
ـ گەر رەوا "الحق" خۆشەویستی بێت دەبێ کینە نەهێڵێت.
ـ لای تۆ وایە خودا کینەی لەو بەرخە بووە کە بۆ ئیبراهیم درودی خودای لە سەربێت نارد و ئیبراهیم سوپاسی خودای کرد و کێردی لە ملی نا. کینەبێت لە رەوا دا نییە، رەوا هەمووی خۆشەویستییە. ئێوە واز لەم قسانە بێنن، گەر دەتانەوێ لەسەر پەیڕەوی من بڕۆن، عەرەب لەبیرکەن نەوەکا کینەتان لێیان هەڵبستێ و لە پەیڕەوی من لادەن. گەر کینەتان لە دڵدابێت، بیر لە تۆڵە دەکەنەوە، تۆڵە کردنەوەش پێویستی بە شمشێری تیژە. هەرگیز بیر و

باوەڕتان بە نوکی شمشێر بڵاونەکەنەوە. کەی شمشێرەکەتان کول بوون، شمشێر و بیروباوەڕەکەتان ژەنگ هەڵدەهێنن.
- ئەی نابێت نەهێلین شمشێرمان کول بێت، و هەموو کاتێک لە پێناوی خۆشەویستی خودا، لە جیهادا بین ؟
- بیر و باوەڕی بە شمشێر سەپاو لە نووکی شمشێرەکە تێپەڕنابێت. وەک دەزانن شومشێری کول پێویستی بە تیژکردنەوە هەیە چەند شمشێرت تیژکەیتەوە بەو ڕێژەیەش شمشێرەکەتان بچوکدەبێتەوە بە ڕێژەی بچوکی شمشێرەکەتان دەسەڵاتتان کەم دەبێتەوە، کەمی دەسەڵاتیش بیر و باوەڕی دەسەڵاتدار لە ناو دەبات. با بیرتیژی شوێنی شمشێرتیژی بگرێتەوە و خۆشەویستی شوێنی دەسەڵات بگرێتەوە، نەوەکا دەسەڵات لاتان شیرین بێت. هەر بۆیە هەندێک بیر و باوەڕ تەمەن کورتن، بیر و دەسەڵاتی خۆشەویستیش بێ کۆتاییە. چەند بڕواتان بە بوونی خۆشەویستی بێت، ئەوەندەش خۆشەویستی پێکارەکەی بە جۆش دەکەوێت، هێز و توانای بە کار دەخات، تا لێبووردن لە دایک دەبێت، ئا ئەوساکە هێدی هێدی کینە دەچێتە ناو کفنی خۆی، وەک کۆسپێک لە ڕێگای خۆشەویستی دا نامێنێ، ئیتر ڕێگای خۆشەویستی بەرەو بەهەشت دەکرێتەوە. جا گەر بڕواتان بە منە بڕۆن بە خوداتان دەسپێرم.

ئێستاکە لێمگەڕێن با گەشتێک بە ژیانی خۆم دا بکەمەوە. من وامدەزانی پێویستیم بەم گەشتە نییە. سەیرکەن چەند بچووکم دەست و پێم سەرمایەتی، ئەوا دایکم کەزییەکانی وەک دوو گوڵینگەی ئاوریشم بە سەرم دا شۆڕبونەتەوە لە ڕومەتەکانم دەدەن. ئەوا دایکم هێدی هێدی لێفەکەم پێ دادەدات، زەردەخەنەیەک لە سەر لێوی پیری پیران بە ئاستەم تێپەڕی و پشتی وەک کەوان کوورکردەوە. وا بزانم باوەشی بۆ دایکی دەکردەوە. بە چەپەدوو دەیگوت، دایە جارێ خوداوەندم نە دەناسی بە خۆشەویستی تۆ گەورە بووم. دایە بۆنی بسکت بۆنی مسکە، لام دانیشە با دەستەکانت ماچ بکەم. دایە دێتە یادت بەم دەستانە دەستت بە سەرم دا دەهێنا، جاروباریش هەر بەو دەستانە لێتدەدام. دایە لە یادتە بە منداڵی لێم تورە دەبوویت،

هەڕەشەت لێ دەکردم و سوێندت دەخوارد دەتگوت سزاتدەدەم. منیش لە ترسا رامدەکردە دەرەوە و کاتی نانخواردن خۆم بەگەڵ برادەرێکم دەدا و دەچوومە ماڵیان، لە وێ دەوریەکیان لە بەردەمم دادەنا وەک منالەکانی ئەوان خواردنی خۆم دەخوارد. ئێستەش دەڵێم: دایە گەرگوناهم کردبێت لێم بدە با گوناهم پاکبێتەوە. ئەوا سەبر سەبرە ترس وازم لێدەهێنێ و دەگەڕێمەوە باوەشی دایکم.

- ئەی پیری پیران خواستێکت هەیە تا لە راژەتدابین؟

- تۆ بڵێیت شەوەزەنگ لە دڵی من تاریکتربێت، تۆ بڵێیت رۆژی رووناک لە دڵی من روناکتربێت. رۆڵەکانم لەیادتان نەچێت لە پێناوی خۆشەویستی بوو، دەنگی گەورە "بیگ بانگ" هات و بوونەوەری لەرزاند و هەژاندەوە. دوایی لە سەر هۆی بەرپابوونی خۆی کڕ بوو، کپ بوو، کش و ماتی بێکۆتایی بەسەر جیهانی ئێمەدا زاڵ بوو. واتا خۆشەویستی ئەزەلی باڵی بەسەر جیهانی ئێمە دا کێشا. خۆشەویستی ئەوەندە مەزنە لە توانای هەموو کەسێک دا نییە هەستی پێبکات و بیبینێت، بۆیە ئەی رۆلەکانم پێتان دەڵێم گەر ئێوە بتوانن تاریکی شەو و رووناکی رۆژ ببینن دیارە هەستیان پێ دەکەن. بەڵام مەزنی و بێ سنووریی تاریک و روونی دڵی من واتان لێ دەکات نە ببینن و نە هەستیشی پێ بکەن، چونکە تاریکیی و روونیی دڵی من لە یەک کولانکە دا شوێنی خۆیان کردووەتەوە. رۆلەکانم چەند گەورەبن ئەوەندە بچووک بە گەورەکراوی دەبینن، چەند بچووکیش بن گەورە بە بچوک کراوی دەبینن. دڵی من لەوپەری بچوکی و گەورەیی دایە نە بە گەورەیی نە بە بچووکی دەتوانن ببینن، چونکە دڵم بۆتە پارچەیێک لە خۆشەویستی خوداوەند. ڕۆلەکانم مرۆڤ لەتوانای دا نییە نە گوێی لە دەنگی گەورە، نە لە دەنگی گەلێک بچووک بێت، بۆیە دەنگەکان لە سەر هۆی بەرپابوونیان کڕ دەبنەوە، چونکە لە هەستی ئێمەدا بوونیان نییە. شاگردانم ئێوە شالاوی ئاگری تاریکتان دیوە؟ وەرن میوانی دڵی من بن ئاشنابن بە شالاوی پڕ بڵێسەی خۆشەویستی دەروونم، چونکە دەزانم پاشی نەمانم وشەکانم بە خاوی دەمێننەوە. لەسەر هۆی خۆیان کڕدەبنەوە، دەبن بە کەرەستەی کاڵی بیری

باش و بیری خراپ، ئا ئەمەیە تاریک و روونیی دڵی من. گەر بتانەوێت ئاسمان ئێوەی خۆشبوێت ئافریدەکانی خوداتان خۆشبوێت، ئاسمان وەک کۆلکەزێڕینە کڕنۆشتان بۆ دەبات.

ئا لەم کاتەدا یەکێک بە راکردنەوە خۆی لە ژووری تەکیە کوتا و بە پەلە خۆی لە پشت حەسیرە هەڵپەسێراوەکانی لای دەرگا شاردەوە و هەناسەی لە خۆی بڕی. چەند چرکەیەک جارێ پێڕانەگەیشتبوین هیچی لێ بپرسین، چەند سەربازێک بە پۆستاڵەوە بەسەر بەرماڵەکانی تەکیە کەوتن و سەربازێکیان هاواری کرد؛ گوتی ئەوەتا لە ترسی مردن خۆی لە ژێر لێفە ناوە. سەربازەکە لە ترسی ئەوەی نەوەکا کابرای هەڵاتو چەکەکەی فڕێنەدابێت و لە ژێر لێفەکەوە تەقەیان لێ بکات. دەست پێشخەری کرد و یەکسەر دەستڕێژێکی لە پیری پیران کرد و بێ ئەوەی سەیری نێچیرە کوژراوەکەیان بکەن، چونە دەرەوە، چونکە وا دیار بوو نێچیرەکەی خۆیان دەناسی، بۆیە پاشەو پاش گەڕانەوە و تەکیە کەوتەوە ئارامییەکەی پێشوی، بەڵام پیری پیران بۆ هەتا هەتایە چاوی لێکنا. منیش یەکسەر بە گریانەوە ئەم چەند دێڕەم بۆ هات و ئێستەش هەر لەبیرمن، بۆیە بۆتانی دەخوێنمەوە:

پیری من.

هەرکە ئەستێرەت هەڵات

تۆ شەوەزەنگت بەزاند

ئەستێرە

سەریان دانەواند

لەشکری رووناکی سەرکەوت

شەو بوو بە رۆژ و تێکشکا

تۆ و تاڤ دوو لای زەمینیان گرتەوە

ناوی تاریکیتان لە فەرهەنگا سڕییەوە

ئاوا مەبە، پیری پیرانم، ئاوامەبە

جارێ سوپاسالاری بیری تۆ نیم

لە بیریی قووڵی تۆ دا ئەلف و بێ نیم

من دەترسم شەو بێتەوە زاڵبێتەوە
لە نێوانی دوو سوپادا لەشکری من تێکشکێ

ئازاد بە ئەسپایی هاتە مەتبەخ و گوتی :

ـ ئەرێ کچینە ئەم چایە بوو بە سەروپێ؟

سکاڵا دای لە قاقای پێکەنین و گوتی :

ـ بە خوا هەر لەبیرمان نەمابوو، باش بوو بە یادت دا هێنایەوە.

لەو کاتەی کە سکاڵا چیرۆکی پیری پیرانی بۆ تەنیا دەگێڕاوە. مامۆستا بۆ ئازاد و سالار سەرقاڵی گێڕانەوەی چیرۆکی سەپان بوو. دەیگوت ئینجا پەرژین‌بێ لە رووتان با ئەرزی حاڵتان کەم، ئەم کوڕەم زۆر خۆشدەوێت، بەڵام کردەوە و شێوەی هەڵس و کەوتی وای لێدەکەن کە شایەستەی مەجلسی پیاوان نەبن. ئەم سەپانە خوشکێکی هەبوو بە ناوی فاتێ، هەزار رەحمەتی لێبێت، دڵی چوبووە کوڕێک، دەیزانی ئەم کوڕە لە دار و دەستەی پیاوانی سەدامە. فاتێ بە دزیەوە لەگەڵی دەچووە دەرەوە. تا رۆژێک ئەم کوڕە دەرمانێکی پێدابوو سڕی کردبوو ئینجا خۆی و چەند کەسێکی تر، هەرچی خوا پێی ناخۆشە لەگەڵیان کردبوو. لە هەمان کاتیش دا بە ڤیدیۆ وێنەیان گرتبوو. ئینجا پاش ئەوەی سڕییەکە بەری دا بوو، ڤیدیۆیەکەیان بۆ لێدابووەوە. لەپاش ئەم کارەساتە دڵتەزێنە داوایان لێ کردبوو لە ریزەکانی موخابەرات دژی پێشمەرگە کاریان لەگەڵ بکات. ئەویش لە جیاتی ئەوەی خۆی نەدات بە دەستەوە و خیانەت لە نەتەوەکەی خۆی نەکات، رازی ببوو لەگەڵیان کاری سیخوڕی بکات. بە قسەی خۆی فاتێ پاش ئەم کارەساتەش ئەو کوڕەی هەر خۆشویستووە.

ئازاد بە مامۆستای گوت :

ـ ئەی کەس نەبوو شتێک بۆ ئەم کچە بەستەزمانە روونکاتەوە؟

ـ کاک ئازاد دەڵێن خشەویستی کوێرە، ئەم کچە لە پێناوی خۆشەویستی ئەو دا ئامادە بووە هەموو شتێک بکات. من لەگەڵ دایکی قسەم کرد، گوتی :

ـ پێمگووتووە ئەو کارەی ئەو کورە لە دژی تۆ پێیکردوویەتی گوزارەی خۆشەویستی پێوە نییە و دژ بە پەیڕەوی خۆشەویستی خودایە. ئەو ساکە لە وەڵام دا بە دایکی گوتبوو ئەو لە دژی من ئەو کارەی نەکردووە بەڵکو لە پێناوی من ئەم کارەی ئەنجانداوە، تا پاکم کاتەوە. چونکە ژن بە دولبەری و ملکەچی بۆ خۆشەویستەکەی پاکدەبێتەوە. چەند بتوانێت تامەزرۆی برادەرەکانی یارەکەی بشکێنێ ئەوەندە لای خودا خۆشەویستر دەبێت. کە وا بوو ئەوە پەیڕەوی خۆشەویستی خودایە.

مامۆستا سەری بادا و گوتی :

ـ وەک دەبینن ئەوە بیر و باوەڕی ماسۆنییەکانە. ماسۆنییەکان دەڵێن: پەنجەرەی ماڵەوەتان بۆ ماوەی ساڵێک مەسڕنەوە، ئینجا پەڕۆیەکی تەڕ بە دیوێکی پەنجەرەکەدا بێنن، سەیرێکی پارچە پەڕۆیەکە بکەن. بە چاوی خۆتان ئەبینن کۆمەڵێک پیسی لە دیوێکی پەنجەرەکە پاک کردووەتەوە. لە هەمان کات دا چاوێک بە پەنجەرەکەدا بخشێنەوە، لە جیاتی ئەوەی بە ڕێژەی هەڵگرتنی پیسییەکەی پاک بێتەوە، بە پێچەوانەوە لەبەر چاوتان ئەوەندەی تر پیستر دەبێت. وەک بۆمان دەردەکەوێت ئەم پیسییە چەواشەیە و لە راستی دورمان دەخاتەوە. بەڵام گەر گوێ نەدەینێ و هەر خەریکی پاککردنەوەی پەنجەرەکەبین ئەوا لە کۆتایی دا جامەکە ئەوەندە پاک دەبێتەوە ئیتر چاو هەست بە بونی جامەکە ناکات.

مامۆستا "ئازاد بە ئەسپایی گوتی" بەڕاستی بۆچونی ماسۆنییەکان بەرامبەر بە ژن وایە؟

ـ کاک ئازاد ئەی چۆن نازانیت حیزبی بەعس دوو حیزبن لە نێو حیزبێک دا؛ یەکێکیان ناوکی حیزبەکەیە کە ماسۆنین. دووەمیان جەماوەری رەش و رووتە.

بەم شێوەیە فاتێ ئامینەی خوشکی راکێشابوو بۆ ناو ئەم بازنە بۆگەنە. بە هەمان شێوەش فاتێ و ئامین بووبوون بە داردەستی رەفیق

حیزبییە  بەعسییەکان. هەر ئەم فاتێیەش دەرمانی دا بوو بە دایکی خۆی و دایکی بە هەمان دەرد بردبوو. بەم جۆرە هەر سێ ژن دەستیان بە کاری بۆگەن کردبوو و بووبوون بە رکێفی دەستی پیاوانی سەدام. ئەم سەپانە و باوکیان لە ماڵەوە قیمەتیان نەما بوو. ژنەکان مشووری ماڵەوەیان بە دەستەوە گرت بوو. حیزبی بەعسیش بە دزییەوە پارەی بەسەریان دا دەرژاند. ئەم کچانەش بە فێڵی ئەڤینەوە ژووانیان دابوو بە چەند پێشمەرگەیەکی هاوسێیان و بە کوشتیان دابوون.

****

رۆژێک پێش چێشتان دەروێشانی پیری پیران بازنەی خۆشەویستیمان بەست بوو، ناوی خودامان دەهێنا و گەورەمان دەکرد. پەیامبەرانی خودامان دەژمارد و کرنۆشمان بۆ یەزدان دەبرد. لە نکاوێک کچێک هات و لە ناوەندی بازنەکەمان دانیشت و گوتی:

- دەک خودا بەقوربانی مەرقەدی پیری پیرانم کات، دەک بەساقەی گۆڕە پیرۆزەکەیبم، لە بەر خاتری مەرقەدی پیری پیران لە بازنەی خۆتان دەرم مەکەن، هەر لەبەر خاتری پەیڕەوی ئەم زاتە لە خۆتانم دوورمەکەنەوە. ئیمانم بە کردگار مەزنە و دڵم پڕ لە کینەیە، گەر ئێوە بە راستی شاگردی پیری پیرانن، سینگم لە کینە پاککەنەوە خۆشەویستی لە ناودا بچێنن، تا رۆحم پاکبێتەوە، دەک رۆحم بە قوربانتان بێت.

ئێمەش بە پاکی خۆمان وەرمان گرت. لە نێو بازنەی زیکر دەرمان هێنا و بە هێوری لێمان پرسی کە چی دەوێ. تێگەیشتین کە دەیەوێ ببێت بە مریدی پیری پیران. بڕیارمان دا وەریبگرین، بە پەیمانێک کە هەموو رۆژی هەینی بێت بۆ تەکییە و دەبێت دایکی و باوکیشی رازیبن. پێمانگوت باوکت لە گەڵ خۆتا بێنە مزگەوت، ئەگینا قەبوڵت ناکەین. لە مزگەوت بە ئامادەبوونی باوکت یان برات دەتوانیت وانەی پیری پیران لە جێگری رێبازی پیری پیران وەرگریت. پاش ئەم وانانە گەر شایەستە بیت دەتوانیت بازنەیەکی ژنان پێکبێنیت. هەر بۆیەش فاتێی رەحمەتی، بە گریان و سکاڵا و پاڕانەوە دەستی جێگری رێبازی پیری ماچ کرد و بە کڕنۆش بردن لەنێو یارانی زیکر هاتە دەرەوە و تەکییەی جێهێشت.

رۆژی هەینی باوکی هات و دەستی جێگری پیری ماچ کرد و گوتی :

- گۆشت و ئێسکم بۆ هێناون، ئێسکی مەشکێنن گلەییم نابێ، نازانم لە کوێ گوێی لە رێبازی پیری پیران بووە، شێتی ئەم رێبازە بووە، ئینجا ئەوەی چوو بە مێشکیا فێری بکەن و خێرتان دەگاتێ. چونکە کچەکانم بێ سنوور ئازاری خەڵکی دەدەن. جا بەقسەی خۆی دەیەوێ بێتە لاتان تا جێگای کینە بە خۆشەویستی پڕکاتەوە. ئەگەر بە پیشتیوانی خودا و زاتی پیری پیران پێتان بکرێت ئەم پەیامە بە جێبێنن خودا هەر لێرەوە تا رۆژی قیامەت خێرتان

دەنووسێ. بەم کارە ئاینییە بێ هاوتایەتان مرۆڤایتی لە ئافاتێک پاکدەکەنەوە کە دەرمانەکەی لە هیچ کەلێنێکی دونیا دەستناکەوێت، دەک بە وێردی چاک و پیران بێت، ئەم دڵە پڕ لە غەل و زیانەی ئەم کچە پاکبێتەوە.

بەم شێوەیە فاتێ ماوەیەکی باش، نزیکەی دوو، سێ مانگێک هەفتەی جارێێک دەهات بۆ لامان، بەڵام هەر ئەو جارە بوو کە باوکیمان دیت، ئیتر باوکی نەهاتەوە بۆ لامان. فاتێ هەردەم لەگەڵ دایکی دەهات، دایکی لە پەنایەک خۆی مات دەکرد و پێچەیەکی ئەستووری دەگرتەوە و هەرگیز دەم و چاویمان نەدەدیت.

رۆژێک هەڤاڵ هات. هەڤاڵ ئەو پێشمەرگە یە بوو کە رۆژی گەردەن ئازادی پیری پیران خۆی لە پاش حەسیرەکان شاردەوە. هەر لە پاش ئەو رووداوە ئەو کوڕە بوو بوو بە دۆستی گیانی بە گیانیمان، بۆیە بێ پێچ و پەنا قسەی لەگەڵ دەکردین، پێی گوتم.

- بیستومە فاتێ خۆی لێتان نزیک کردووەتەوە و دەیەوێت رێچکەی پیری پیران وەرگرێ، ئەمە راستە یان نا؟

- گوتم راستە، بۆ ئەم پرسیارە دەکەیت، شتێکت بیستووە؟ کە ناومان بەد بکات.

- نەخێر دەروێش، بەڵام فاتێ نایەت وانە بخوێنێت، بەڵکو بە دوای من دا دەگەڕێت و دەیەوێت تەڵەم بۆ دانێتەوە، ئەوە چەند مانگە بە دوای سەری من دا وێڵە. دەروێش گیان، فاتێ هاوسێمانە هەر لە منداڵییەوە دەیناسم. یاریمان پێکەوە کردووە، لە قوتابخانەی سەرەتایی پێێکەوە بووین، ئەو چوو بۆ بەغدا و دانیشتگای تەواو کرد و منیش بووم بە پێشمەرگە. لە دۆستایەتی بەولاوە قەت ناکۆکیمان نەبووە. باوکی کابراەکی کاسبە و رێزی لێ دەگیرێ زۆر برادەری باوکیشمە. هەر بە برادەریش ئەم نهێنییەی لە لای باوکم درکاندووە کە گوایە ئەم ژنانەی لەدەست دەرچووە، بە قسەی خۆشی بێت، بە باوکمی گوتووە  کە هیچی لە دەست نەماوە و هیچیشی لەگەڵیان پێ ناکرێت، بۆیە مام سمایل گەلێک شادە بە داواکاری فاتێ کە گوایە خۆشەویستی خودا کەوتووەتە دڵیەوە. لە سەر رێنماییەکانی پیری پیران دەیەوێت فێری رێبازی

خۆشەویستی خودابیبێت. ئەم خواستەش بووەتە جێگای شادمانی مام سمایل و گەلێکیش دڵی ئەو پیرەمێردەی خۆش کردووە. بڕواتبێت من نامەوێ دڵی مام سمایل بشکێنم.

دەروێش، رۆژی کارەساتەکەی پیری پیران بە بەهەشتی بەرین شاد بوو. من ژووانم لەگەڵ ئەم فاتێیە دا هەبوو. کە خۆم گەیاندە جێژووانێ لە جیاتی فاتێی دولبەرم کە بە چەند نامەیەک و هەزار پاڕانەوە منی راکێشا بوو بۆ ئەم ژووانە کێ ببینم باشە؟ هەڤاڵ لێوەکانی لەسەر یەک دانا و سەری تۆزێک بادا، بە تاسە و پەژارەیەکی زۆرەوە پاش هەناسەیەکی دوور و درێژ، درێژەی بە بەسەرهاتەکەی خۆی دا. کە گەیشتمە سەری کۆڵانەکەیان دەمانچەکەم سوار کرد و لە بەر پشتێندەکەم ناوە و بە ئەسپایی بەرەو بەر دەرگایماڵیان کەوتمە رێ. وەک بڕیارمان دابوو دەبوایە تی دەرگایەکە بەکراوەیی بهێڵێتەوە، لە دوورەوە هەستم پێ کرد دەرگاکە هێدی هێدی دادەخرێ. منیش ئەوەم بە هەند وەرگرت، بۆیە دەمانچەکەم بەدەستەوە گرت و بە ئەسپایی چوومە ژورەوە. حەوشەکەیان تاریک بوو، یەکسەر چوومە ئەو هۆدەیەی کە بۆی دەستنیشان کردبووم. هەرکە گەیشتمە ژوورەکە لەنکاوێک چرا داگیرسا و لە هێکڕا چەند کەسێک دایان لە قاقای پێکەنین و دەنگی پێکەنینیان دونیای پڕ کرد. وا دیار بوو ئەوان لایان وا بوو گوڵم بەدەستەوەیە، بۆیە خۆیان ئامادە کرد بوو کە وەک مشکی ژێردەست پشیلە یاریم پێ بکەن و پێم رابوێرن، بۆیە فاتێی نیوە رووت لە نێو چەند ئەفسەرێکدا دانشتبوو. قاقایەکی لێدا و چاوی بەدەمانچەی دەستم کەوت و حەپاسا. منیش بێ یەک و دوو دەستم بە تەقە کرد. ئەوەی کە بزانم سێ ئەفسەرم لەوێ بەرداوە و بە راکردن هاتمە دەرەوە. وا دیار بوو سەربازەکانی حەوشە ئامادەی تەقە نەبوون چونکە وایان دانابوو کە ناتوانم دەست بکەمەوە، بۆیە خۆیان بۆ نێچیرێکی ئاسان ئامادە کردبوو. وایان دانابوو بێ ماندووبوون بە تەڵەکەیانەوە ببم. بۆیە کە رامکردە دەرەوە لە بەر تاریکی حەوشەکە نەیانزانی کێ بوو رایکردە دەرەوە. بەم شێوەیە وەک بەرزەکی بانان دڵم لە ناو دەستی خۆم نا و تێمتەقاند. دوای دەمێکی باش

سەربازەکان بە تەقە کردن بەدوام کەوتن تا گەیشتمە بەر دەگای مزگەوت و ئەوەی تریش خۆت باش ئاگات لێیەتی.

ئەوەی راستی بێت بەسەرهاتی هەڤاڵ بۆ من و دەروێشەکانی تریش گرفتێکی نوێ بوو، بۆیە خۆم پێ نەگیرا و لەبەر خۆمەوە گوتم، پیری پیران، بکوژ دوژمنێک بوو لێمان دوور بوو. بکوژ کوژرا، ئەم جارەیان بکوژ لە خوێن و گۆشتی ئێمەیە لە نێومان دا دەژیێ نانی رۆژانەمان لەگەڵ بەش دەکات، بەلام دۆستەکانمان کەس پێی ناڵێت تۆ بکوژی گشت پێی دەڵێن ئەی پاڵەوان. ئێمەش پاڵەوانی خۆمان وەک گلێنەی چاومان دەپارێزین، چونکە پاڵەوانی ئێمە بکوژی دوژمنەکەمانە. ئەی پیرم گەر تۆ وەک جاری جاران لە نێومان دابایت وەلامت چی دەبوو؟ بە بڕوای من گەر لە حزورت دانشتبام دەتفەرموو، من دژی یاسای کوشتنم، لە جیاتی یاسای کوشتن، یاسای بەندی تەمەن لە لای من باشترە. تا نەکەوینە بازنەی، بکوژ کوژرا بکوژ پاڵەوانە و لەگەڵمانا دەژیێ.

هەڤاڵ هاواری کرد، دەروێش.... لەنکاوێک لە شوێنی خۆی سڕ بوو، وەک بڵێی بە هۆش خۆی هاتەوە و راچڵەکی و چاوی لەنێو چاوم بڕی، بە پەژارەیەکی قوڵەوە گوتی :

- باشە فەرمانی کوشتنت نەدام، فەرمانی بەندی هەتا هەتایت بە سەرم دا سەپاند. دەروێش گیان، لە یادت نەچێت من کە چوم بۆ ئەوێ وام دەزانی خۆشەویستی چاوەڕێم دەکات، دڵم بۆ خۆشەویستی کرابووەوە، نەک بۆ کینە، چووم ژیان لە باوەشکەم نەک مردن، بۆیە دڵنیابە کە بۆ کوشتن نەچووبووم. دەروێش گیان لە داهاتودا بۆت روونەبێتەوە کە فاتێ دوژمنە و نەک هەر بە دوای سەری من دا وێڵە بەڵکو بەدوای سەری هەموومان دا وێڵە. دەروێش تفەنگی بکوژەکانی پیری پیران، تفەنگی کوشتن و داپلۆسین و داگیرکردنن. جیوازی نێوان تفەنگی شانی من و شانی وان ئەوەیە کە تفەنگی من تفەنگی تۆڵە و بەرگری و ئازادییە. ئێستەش بە خوات دەسپێرم، گەر رێگام بدەیت بڕۆم لە چاکەت دەرناچم.

پاش ماوەیەکی دوور و درێژ بازنەی زکرمان بەستبوو، لە نکاوێک هەڤاڵ بە شەرمەوە هاتە ژورەوە و لە بەردەگا دانیشت، چووم بۆلای گوتم هەڤاڵ خێرە بەم نیوەڕۆیە هاتوویتە لامان؟ ئەی نازانیت بۆ تۆ باش نییە؟ ئەگەر بتگرن لە سێدارەت دەدەن.

- گەر خودا یاربێت خێرە، من هەرگیز لە کاری بەد ناگەڕێم. دەروێش گیان ملم لە پەتی سێدارە ناترسێ و دڵم لە گوللەی دوژمن راناکات. تا دڵنیا بیت لە رێی خوا ئەگەر چاوت بە سواڵکەرەکەی بەر دەرگای مزگەوت کەوت ئەم چەند دینارەی لە جیاتی من، بدەیە بزانە شوێن دەرۆزەی خۆی جێ دێڵێ.

منیش بە دوای کەوتم، کوڕە هەڤال ئەوە بڕە پارەییکی گەلێک زۆرە.

هەڤاڵ گەڕاوە و گوتی:

- ئەم پارەیە بۆ جەنابتان زۆرە، بەلێ بۆ ئەو بەشی مەزەی سەر مێزی ئیمشۆکەی ناکات.

- ئەگەر وابێت بۆ پارەی دەدەیتێ، گەر نەیدەیت بە منالێکی برسی گوناهیشت دەکاتێ.

- گەر خودا یاربێت ئیمشۆکە هەموو شتێک تێدەگەیت. ئێستاکە بە خودات دەسپێرم.

دونیا بوو بە شەو، پاش نوێژی عیشایێ، دەروێشەکان خەریکی زیکر و فیکری خۆمان بووین. لەنکاو دوو پێشمەرگە بە ئەسپایی هاتنە ژوورەوە، سلاویان کرد و لە لای دەرگا راوەستان. منیش بە ساردیەکی دەروێشانە لێیان چوومە پێشەوە، بەخێرهاتنم کردن. یەکێکیان بە شەرمەوە سەری هەڵبڕی و گوتی :

- دەروێش هاتوینەتە حزورت، چونکە هەڤاڵ گوتی ئەگەر تەشریفی ئیمشۆکە پێی بکرێت بفەرمووێتە ماڵی سەید نەزیف، ئەوا خودا خێری دەنووسێ، چونکە کاری خێرمان پێیەتی.

منیش هەر بەسەر وەڵامم دانەوە و رازی بوونی خۆم پیشاندان. هەردووکیان بە چپە خودا حافیزیان کرد و چوونە دەرەوە. منیش پاش ئەوان بەڕێ کەوتم بۆ ماڵی سەید نەزیف، هەستم بە جموجۆڵێکی سەیر دەکرد،

پیاوەکانی بە تەکما تێدەپەڕین و ئەوانەی کە لە سەری کۆڵانەکان وەستابوون وا پێدەچوو کە هەر هەموویان چەکداربن، جگە لە مەش هیچیانم نەدەناسی. بۆیە بە کرێی خۆم بە ماڵی سەید نەزیف دا کرد. دایکی سەید پێشوازی کردم و پاش بەخێر هاتن، بەرەو هۆدەرییێکی لاچەپی بردم و گوتی هەر هەموویان لێرانەن و بەجێی هێشتم و بەرەو دیوی ئەولا رۆشت. منیش چومە ژوورەوە. استخفر الله سێ ژن بەبێ سەرپۆش و بە بەرگێکی تەنک کە هەموو لەشیان لەناوی دا دیار بوو بەرامبەر دەرگا دانیشت بوون. منیش بە خێرایی چاوم بە دانیشتوانی هۆدەکە دا گێڕا و هەڤالم بە بەر چاو کەوت گوتم :

- ئەی زەندیق منت بۆ تاقیکردنەوە هێناوەتە ئێرە؟

- نەخێر دەروێش، تۆمان بانگ کردووە بۆ چەند پرسیارێک. گەر کەرەمکەیت: جەنابتان لەم سێ ژنە کامەیان دەناسن.

- جارێ بەتانییێکیان پێدادەن، ئینجا پێتان دەڵێم کە هیچیانم نەدیوە.

- باشە ئەی ئەم کوڕە قۆزە.

- ئەوەشیان ناناسم.

ئینجا هەڤال بە قسە هات و گوتی، با لەم کچە جوانەوە دەست پێ بکەین و ڕووی لە کچێکیان کرد. کچەکەش بە دەنگێکی پڕ لە گریانەوە گوتی :

- هەڤاڵ گیان وای لێ هات ناوم بپرسیت؟

گوێم لە دەنگی فاتێ بوو ئینجا ناسیمەوە، یەکسەر سەرم هەڵبڕی، لە ژیانم دا یەکەم جارم بوو بەم شێوەیە چاو ببڕمە نێو چاوی ئافرەتێک و جوانی ژن سەرنجم رابکێشێ و بەم جۆرە تیری نیگایەک لە دڵم بدات و شوێنەواری نەسڕێتەوە، چاوم بەو شوێنانە کەوت کە چاو پێی دەکەوێت بێدەنگی دەست پێدەکات. خۆم لە بێدەنگی خۆم ترسام. چونکە بێدەنگی بردمیەوە ناو خودی خۆم، لەوە ترسام کە لە خودی خۆم بێمەدەرەوە. بۆیە کەس لە بێدەنگی ناترسێت لە تەقینەوەی بێدەنگی دەترسن. ئوم لەشە تاوانبارە دادەپۆشن تا دەمی گڕکانەکە نەکرێتەوە. داپۆشینی لەش هیچ لە لەش کەم ناکاتەوە بەڵکو لە تاوانەکانی دوورمان دەکاتەوە. چونکە پاش ئەوەی چاو چێژی خۆی لە ئەندامی دیتراو وەردەگرێ ئینجا ئەندامەکانی تری لەش داوای چێژی خۆیان

دەکەن. ئا لێرانە ململانێی نێوانی خواست و یاسا دەسپێدەکات، گەر خواست بەسەر کەوت، بێدەنگی دەزرینگێتەوە، دەمی گڕکانەکەش دەکرێتەوە، ئینجا ئەندامەکانی تری لەش پەردەی ئابڕوو دەدڕێنن.

ئیتر وەک بڵێیت ترسم لە زینای چاولێکردن شکا. خوداوندی گەورە زۆر بە ڕەحمە، بۆیە زوو بە خۆمدا هاتمەوە و ئەندامەکانی لەشم سزادا. ئەم سزایەم سەپاندە سەر ئەندامە لاسارەکانی لەشم کە دەیانویست بە پێچەوانەی خواستی خودم ئەندامانی لەشم بەرەو چێژێکی تر بەرن. بە پێچەوانەوە جوانی دەستکردی کردیگار، بە سەرسووڕمانێکەوە لە دڵمدا بەرجەستە بوو. بە چەشنێک نیگارکێشی و جوانکاری کردیگارم لە دەسەوەستانی کێشانی ئەم دوو چاوانەدا دەدیت. لە دڵی خۆمدا دەمگوت "الاحسان بالکمال" "چاکە تێکڕابێت چاکەیە" واتە چاکە دەبێت هەتا سەر بێت. خودایە گەر ئەم دوو چاوە ئەوەندە جوانبن ئەی جوانیەکەی بە تێکڕایی دەبێت چۆنبێت؟ لەنکاوێک فاتێ پشتی بە دیواردا و هەردوو شەمامەی پتەو و گۆشتن و بەرزی بە فەرمانی خودایی بە دیار کەوتن، باڵا بەرز و کەمەر باریک. هەرچیتان پێبڵێم ناگاتە جوانی نینۆکی ئەم ئافرەتە، پاش دیتنی ئەم ژنە بڕوام پتەو بوو بە بێ سنوری توانای خودا. رووم لە هەڤاڵ کرد، هەرچەندە بە مەزەندە وەڵامەکەم دەزانی بەس پێم باش بوو کە گفت و گۆ بکەمەوە. خۆم تۆزێک تورە کرد و گوتم، باشە ئەم حورمانەتان بۆ هێناوەتە ئێرە؟

هەڤاڵ وەڵامی نەدامەوە، پێشمەرگەیرکی بانگ کرد و گوتی ڤیدیۆیەکان بێنە، شریتەکانی لێ وەرگرت و تەلەڤیزیۆنەکەی پێکرد. ناوی بەڵگەکە بە زمانی عەرەبی نووسرابوو، "مەکۆی تاوانبار هەڤاڵ" یەکسەر تەکیەی پیری پیرانی پیشاندا. یەک بە یەک وێنەی هەموومانیان گرتبوو، وادیار بوو دایکی فاتێ وێنەکانی ژورەوەی گرتبێ، لە دەرەوەش دەرۆزەکەرەکەی بەر دەگا وێنەی هەموو نوێژکەرەکانی گرتبوو. لە کۆتایی فلیمەکە وێنەی هەڤاڵیشیان گرتبوو، بۆیە سوالکەرەکە لە بەڵگەکەدا هاوار دەکات و دەڵێ ئەمەش تاوانبار هەڤاڵە لەگەڵ "سید ئەحمەد" دا دەدوێ وابزانم ئیتر پێویست بە بەڵگەی تر ناکات بۆ سزادانیان. ئینجا هەڤاڵ رووی لە من

کرد و گوتی باش بوو زوو پێراگەیشتین دەنا هەر بەیانی هەموتان دەگیران و بێ سەر و شوێن دەکران. منیش گوتم هەڤاڵ جارێ هیچ روینەداوە، هەموشمان لە ژیاندایین، لێبوردن بەشێکە لە ناسینی خودا، خودا ناسین بێ لێبوردن نابێ، هەستم پێکردبوو کە نییەتی پێشمەرگەکان بەرانبەر دوژمنەکانیان باش نییە، بۆیە دەمویست هێوریان کەمەوە.

- دەروێش لێمان مەبە بە مەلای خەتێ، دەک خودا بتپارێزێ و قەت نەیبینیت، جارێ وێزەی دوژمنانت نەدیوە، بۆیە دەتەوێت سوێندیان بدەین و بەرەڵایانکەین، ئەی نەتبیستووە تۆبەی گورگ مەرگە، داوای لێبووردن دەکەم گورگی کەنعانیشم بۆ مەکە بە مەسەل.

لەنکاوێک ملازم ثائر هەڵی دایێ و گوتی، گەر رێگام بدەن چەند قسەیەکم هەیە.

- گوتم فەرموو.

- من ئێستە گەیشتمە بڕوایەک کە بیر و باوەڕی هەڤاڵ و برادەرەکانی وەک بیر و بروای جەنابتان نییە، بەڵام ئەمە هیچ لە کێشەکە ناگۆڕێ، بەڵکو لای من کێشەکە ئاڵۆزتر دەکات. چونکە بیر و باوەڕێک کە هەڵگری پەیامی ئیسلام بێت لەسەر پەیڕەوی خۆشەویستی بڕوات، چۆن لەگەڵ چەکداران یەک دەگرێتەوە؟ گەر تێکەڵکاری لە نێوانی چەک و خۆشەویستی پەیابێت بە بڕوای من ئەوە خیانەتە لە پەیامەکە. بەم شێوەیە تۆ پەیڕەوی پیری پیرانت وەلاناوە. قورئانی پیرۆز پڕە لە وشەی جیهاد لە پێناوی خودا. پیری داناش زۆر بە قووڵی لە پەنا و پێچی قورئان گەیشت بوو، بۆیە ئاڵای خۆشەویستی و یەکسانی هەڵگرت بوو وەک جیهاد لە پێناوی خودا. خودی پیرۆزی ئەم ئاڵایەی بە ئێوە سپارد تا بە پاکی خۆی بەرزی کەنەوە، نەک تفەنگێکی لەسەر نەخشکەن.

من رێز لە پێشمەرگە دەگرم، چونکە من خۆم چەکدارم. چۆن ئەوان لە پەیامی پیرۆزی تۆ دوورن منیش بە هەمان شێوە لە پەیامی پیرۆزتان دوورم. جەنابتان باش دەزانن ئەوانە نوێژ ناکەن و دژی زمانی عەرەبین کە قورئانی پیرۆزی پێ هاتووەتە خوارەوە. من سەیرم بەوە دێت چۆن جەنابتان

دەستان لەگەڵ ئەم کافرانە کردووە بە یەک، یان چۆن چاویان لێ دەپۆشن. گەر بە هەڵەدا نەچوبم تۆ بە رەگەز عەرەبیت، جگە لەمەش لە بەرزترین رەگەزی عەرەبیت، چونکە لە نەوەی پێغەمبەریت "د". پێغەمبەریش لە بەرزترین رەگەزی ئینسانە. پاش ئەوەی دەستان لەگەڵ ئەم چەکدارە کافرانە تێکەڵ کرد وازتان لە بەرزترین رەگەزی ئینسان هێنا دەبێت جەزاتان لای خودا چی بێت؟

- جەزای من دەبێت چی بێت؟ من لە چاکە و ئامۆژگاری چاک بەولاوە، گەر ئەوانە خراپبن، هیچ خراپەیەکی ترم نییە. بە پێچەوانەی تێگەیشتنی تۆ بۆ قورئان: لە لای من هەموو مرۆڤایەتی لە بەرەی ئادەم و حەوان، بۆیە من بە پەیڕەوی قورئان، هەموویانم وەک یەک خۆشدەوێ و جیاوازی لە نێوانی نەتەوەیەک و نەتەوەیەکی تر ناکەم، چونکە خودا کوێلە گوێڕایەڵەکانی خۆی وەک یەک خۆشدەوێت.

هەڤاڵ خۆی پێنەگیرا و گوتی :

- جەنابی زابت گەر بە هەڵەدا نەچوبم تۆ رۆژ تا ئێوارە نوێژ دەکەیت و بەرماڵەکەت بەرنادەیت. هەر لەسەر هەمان بەرماڵیش پێک و مەزەی خۆت ریز دەکەیت و کچە سۆزانییەکانیش لەم سفرەیە بێ بەش ناکەیت. بەم شێوەیە جەنابت باسی ئیسلامم بۆ دەکەیت؟ ئەی ئەگەر بیری تۆ بەم جۆرەبێت ئەی چۆن تۆ فاتیمەت خۆشدەوێ؟

دایکی فاتێ سەیری فاتێی کرد و گوتی، کچم توش، کردین و سەرمانت لە قوڕنا، ئەوەی چوو تێپەڕی و بەسەرچوو،ئەوەی شکاش بە هیچ چاکنابێتەوە، وا دیارە شادی مەودای کورتە، ئاخ کچم ئامینە تۆش کەوتبوویتە ئەڤینی ملازم ئیحسانەوە و دەتویست منداڵی بۆ بێنیت؟ ئەوانیش باسی رەگەز دەکەن و ئەڤینی تۆیان لا هیچە.

منیش خۆم پێنەگیرا و رووم لە دایکیان کرد و گوتم :

- تکاتان لێدەکەم بەم کردارەی خۆتان مەڵێن خۆشەویستی، چونکە ئەم کردارە کارێکی بەدفەڕە و دوورە لە خۆشەویستی. هەموو شتێک لە نێو خۆشەویستی دا لە دایک دەبێت، بێ خۆشەویستی زایین دەبێت بە خواستێکی

ئاژەڵی لە پەرەسەندنی رەگەز بەو لاوە ناتوانێ هیچ گوزارەیەکی تر ببەخشێ.
جا بۆیە ئەگەر ئامینەی کچت منداڵی لە یەکێک ببێت کە تەفرەی بدات و هەڵیبخەڵەتێنێت، ئەم منداڵە هەرگیز نابێت بە منداڵی خۆشەویستی.
- دایکیان رووی تێکردم و گوتی :
- منیش وەک جەنابتان لە خۆشەویستی دەگەم. وەک خۆت دەزانیت کوردستان ئەوروپا نییە ئەگەر ژنێک خلیسکا، لە بەر زمانی خەڵکی ناتوانێت هەڵسێتەوە ئەگەر بیەوێت هەڵسێتەوە، خەڵکەکە لێی ناگەرێن هەڵسێتەوە.
دەزانم بە پەیرەوی ئیسلام دەبێت هەرسێکمان رەجم بکرێین. تکاتان لێ دەکەم بمان کوژن بەس مەڵێن بۆ ئەم ژنانەمان کوشت.
- پێم گوت تۆ زۆر بە هەڵە لە ئیسلام گەیشتوویت دەربارەی رەجم کردن ئەگەر تۆ بە کەیفی خۆت و بۆ رابواردنی خۆت بەم کارە هەڵسابیت و بێ ئەوەی مێردەکەت بزانێ خیانەتت لێکردبێ ئەوا تۆ حەقی رەجمت هەیە، بەڵام کچەکانت، چونکە مێردیان نییە حەقی رەجمیان نییە. ئەم ئەفسەرانەی لەگەڵتانن گەر ژنیان هەبێت ئەوا دەبێت رەجم بکرێن.
- فاتێ گوتی :
- ئینجا گەر خودا ئەوەی پێ خۆشبێت رەجممانکەن. خواست و یاسای خودا شتێکە و ئەم لەش و هەست و نەستەی بە ئێمەشی بەخشیوە شتێکی ترە و زۆر لێکدوورن.
گوتم خواستی خودا یاسایەکە پێویستە لەسەرمان پەیرەوی بکەین.
- ئەوەی من تێیبگەم ئێمە تاوانباری خواستێکین کە بەسەرماندا سەپێندراوە. گەر ئەم خواستە خودایی بێت، باوەرت بێ ئەندێشەی ئێمە یاسای سەر زەمینی هێناوەتە ئاراوە. بۆیە ژیان بێ پێکگەیشتنی خواست لە ئارادا نامێنێت، بەڵام ئەڤین نقیشکی ژیانی ئادەمیزادە. بونەوەر بێ ژیانی مرۆڤ بێ گوزارەیە. ژیانی مرۆڤێکی بێ ئەندێشە و رامان ژیانێکی ئاژەڵییە. ئەندێشە و رامانیش بێ ئەڤین شتێکی بۆش و بێکەلکە. دەرویش ژن زەمینە بێ گوناه و بێ توانایە چی لێبچێنن بێ خواستی خۆی ئەوەی لێ شین دەبێت. زەمین دژ بە هەموو شتێکە و هەموو شتێکیش رادەکێشێت تا ئەو رادەیەی لەگەڵ خۆی

دەیانگونجێنێ، ئەم دژایەتییە وامان لێدەکات لەیەکتر نزیک بینەوە. نزیک بوونەوەش سەرەتای خواستە. پارچەیەک زەوی دەبێت بە باخچەیەک بە سەدان جۆر گوڵی لێ شین دەبێت. پیاوینە هێور بنەوە چەند لە خاک نزیک بنەوە لە گەڵ خاک دا دەبن بە یەک و لەنێویدا دەتوێینەوە. ئەم توانەوەیەش دژایەتی نێوان دوو تەنی جیاواز دەکوژێ. رووەک لە کوێ شین بوو هەرلەوێش لە شوێنی خۆی ووشک دەبێتەوە، لەسەر هەمان زەمینیش دەبێتەوە تۆ و خۆراک.
هەڤال گوتی :
- بۆیە دەتویست بە کوشتمدەیت تا لەبەر دەمتا ببم بە تۆ و خۆراک؟
کاک سامان پێشمەرگەیەکی باڵا بوو هەرچەندە نەمدەزانی چ پلەیەکی هەیە ئەوەندەی بزانم دەیویست زوو تاوان بارەکان دادگەیی بکرێن و بڕیارەکەش زوو بە زوو جێ بە جێ بکرێ وەک بلێی حال گرتی و دەستی بە ورێنە کرد، بە دەنگێکی بەرز گوتی، ئێتر چیتان دەوێ ئەم شەش کەسە بە دەیان پێشمەرگەیان کوشتووە. تێناگەم لەسەر کوشتنی پێشمەرگە دادگەییان دەکەن یان لە سەر زینا؟ من یەک لە بارەخۆم نامەوێت لە سەر زینا دادگەییان بکەم. من پێشمەرگەم و پەیوەندیم بە ژێردۆخینی کەسەوە نییە. من یەک شت دەزانم هەر کوردێک خیانەتی لە کورد و کوردستان کرد دەبێ بە سزای خۆی بگات. هەر دوژمنێکیش پێی لە سەر خاکی کوردستان دانا دەبێت سەری پان بکرێتەوە. بۆیە ئێتر نامەوێت باسی ژێر دۆخینم بۆ بکەن.
عەرزی حاڵتانکەم گەلێک ترسام کە لەبەر چاوی من بەندەی خودا بکوژرێن بێ ئەوەی خۆیان هەست بە تاوانی خۆیان بکەن. جگە لەمەش هەستم پێدەکرد تازە وتووێژ گەرم دەبێت، و هێدی هێدی ئاسۆی راستی روون دەبێتەوە. کاک سامانیش لەم کاتە ناسکەدا بەتەمایە ببێتە بەربەستێکی تاریک و چڕ لە نێوانی گومکراو و دۆزراوە دا، بۆیە گوتم کاک سامان ئێمە باسی ژێر دۆخین ناکەین ئێمە باسی پەیوەندی دڵ و مێشک دەکەین، ئەگەر بتەوێت گفتوگۆ لە ناو بێشکەدا بکوژیت ئەوا پێت دەڵێم مەبە هۆی کوشتنی

ووتوویژ چونکە کە پەیڤێک دەکوژرێ، چریکەیەکی بێ دەنگ ئەستونی بوون دەهەژێنێ،...

هەستم پێ کرد سامان دەمێک ورِما و هەناسەیەکی ساردی هەڵکێشا و بە هێمنی رووی تێ کردم و سەری تۆزێک هەژاند و گوتی. دەرویش من دەزانم بێدەنگی چ سامناکیەکی هەیە: لە هاژەی لافاو و گڤەی رەشەبا و چریکەی بێ دەسەلاتان بە تەوژمترە. ئەوانەی کە تۆ باسی خۆشەویستییان لەگەڵ دەکەی هەر ئەوانەن بە دەیان ئەڤینداریان بەکوشت داوە. سامان کەوتە جیهانێکی تر، رووی لە دیلەکان کرد و پێی گوتن ئەی پیاوکوژینە نەتاندەزانی رۆژێک دێت چوار دەورتان دەبێت بە بیابانێکی کاکی بە کاکی لە ناویدا هاواردەکەن. دەنگتان بە پانی و بەرینی بیابان دەرِوات، بەڵام هەرگیز دەنگ ناداتەوە. بەگوێرەی پەیرِەوی بەدرِەویتان، بەزەیی مرۆڤایەتی لە ئاستتان دادەخرێت. نەتاندەزانی رۆژێک دێت هەموو لایەکتان لێ دەگیرێت؟ وا تاندەزانی فاشیستەکانی دونیا بە هاناتان دێن. ئەوانیش لێتان بە دەنگ نایێن چونکە ئێوە و سەروەرەکانتان دەبن بە کڵاوی بابردوو، دەبن بە وانە بۆ هەر کەسێک بیەوێت نەتەوەیەک لەناو ببات. ئینجا سامان بە دەنگێکی سەربازی رەق گوتی ئێستە ئەی شەهیدان ئێوە لە کوێن، وەرن سەیرێکیان بکەن کە ئێوەیان دەکوشت باسی کینەیان لەگەڵ دەکردن. ئێستە لە دادگەی شۆرِشگێرِی باسی ئەڤینیان بۆ دەکەین.

منیش بە سامانم گوت، تکات لێدەکەم رێگایان بدە؛ با وەڵام دەنەوە باپرسیاری بێ وەڵام و کرِ و کپی سارد و سرِ نەکەوێتە نێوانتانەوە. بێ وەلامی شەهیدانی کوردستان و دەنگدانەوەی پرسیارەکانی ناو چوار دیوار، دەنگی هۆ... هۆ... یاران، هۆ... هۆ... کوردینە، بە هانامان وەرن . رۆژێک دێت ئەم بێدەنگییەی کە نەیتوانی بگاتە گوێی جەللادەکان و لەنێو چوار دیوار و ساپیتەیەک و زەمینی زیندانێکی قووڵ دەربچێت، جگەری بوونەوەر کون دەکات. با بێ دەنگی، بێ وەلامی، بێ گفت و گۆیی ئەم درِندانەش نەکەوێتە هەمان خانەی ئەم بێدەنگییەوە. لێیان گەرِێن بابڵێن بۆچ بەم کارانە هەڵسان،

بۆچ پیری پیرانیان شەهید کرد؟ ئینجا بڕیاری شۆڕشگێڕانەی خۆتان بەسەریاندا بسەپێنن.

ملازم ثائر وەک بڵێیت دەرگایەکی لێ کراوە، بە سەر سوڕمانێکەوە گوتی، من لەگەڵتام چریکەی بێ دەنگ زۆر سامناکە. هەر بێدەنگی ئەو زیندانیانە بوو منی دژ بە کورد کردە دڕندە. دەنا ئێمەی عەرەب کوردمان وەک جگەری خۆمان خۆشدەوێ. چۆن باوک منالّی خۆی خۆشدەوێ، ئێمەش بەم شێوەیە کوردمان خۆشدەوێ و دەمانەوێ وەک دوو برا ببین بەیەک و بەزمانی پەیامبەری ئاخر زەمان بدوێن. چیتان لە ئۆتۆنۆمی داوە وەرنە باوەشی نەتەوەی عەرەب. داوای بەهەشتی فراوان بۆ ئەو کەسانە دەکەم کە بێ گوناه بە دەستی ئێمە کوژراون. بڕواتانبێت من وەک باوک سەیری ئەم بێ تاوانانە دەکەم. ئەمەتان وەک راستییەک بۆ دەدرکێنم گەر باوک منداڵی خۆشی بکوژێ، بەبێ کینە دەیکوژێ، بە سۆزی باوکانەوە دەینێژێ. منیش ئەم ستەم لێکراوانەم لە دڵی خۆمدا نێژتووە. ئێستاش پرسیارێکتان ئاراستە دەکەم، ئێوە گۆڕستانێکتان دیوە شادومانبێت؟ وەک دەبینن تۆسقاڵێ خۆشیش لە دڵی من دا نییە، هەر بۆیەش بەرماڵەکانمان دەکەین بە سفرەی مەی و بادەی لەسەر دەنۆشین.

بەڵام ئەو تاوانبارانەی لە ناومان بردن؛ ئەوانە بە فیتی بێگانان ئاژاوەیان دەناوە و دەنێنەوە، دەیانەویست تەخت و تاراجی دێرینمان بهەژێنن. کە من و ملازم ئیحسان پرسیارمان لێ دەکردن کێ دەناسن کێ سەرپەرشتیتان دەکات پەردەی گوێمان بە کش و ماتی ئەم تاوانبارانە تەقی. ئەم کشوماتییە بوو، بوو بە هۆی ئەوەی کینە جێگای خۆشەویستی پڕکاتەوە. کوشتنی بێ تاوانەکانیش تاوانی ئەم تاوانبارانە بوو. بۆ ئەوەی ئیتر خەڵکی بێ تاوان نەکوژرێن من و هاوڕێکانم بڕیارمان دا ئەم سێ ژنە بەکاربێنین، بۆ شکانی ئەم ماتی و بێ دەنگییە بۆ رزگارکردنی هەزاران بێ تاوان، نەک بۆ زینا.

فاتێ بە ئاستەم سەری خۆی بەرزکردەوە و بە دیدارێکی پڕ لە پەژارەوە رووی لە هەڤال کرد و گوتی، هەڤال تکات لێ دەکەم وا بە نزمی

سەیرم مەکە وا تێدەگەیت من لێت دەترسم، بڕوابکە لێت ناترسم، سزای خۆشم خۆم دەیزانم خۆشم پێتان دەڵێم چیم لێ بکەن. چونکە ئیتر شەرمم بە خۆیە، وامدەزانی هەرگیز کەس ناتوانێ هەڵمخەڵەتێنێ. بڕوام بە خۆم وا بوو کە دەتوانم چیایەی پڕ بیر و باوەڕ لە رەگەوە هەڵتەکێنم. بەڵام بەم جوانییەی خۆم نەمتوانی دەبەنگێکی پیاو کوژ هەڵخەڵەتێنم. بۆیە ئیتر نابێت بژیم... ئیتر نامەوێت بژیم. زوو بمکوژن، ئەم ژیانەم بۆ چییە گەر نەتوانم سەر هەڵبڕم. ئەو پیاوەی خۆشم دەویست و بڕوام پێی دەکرد. بوو بە یەکەمین هەڵەی ئەم ژیانە کورتەم.

هەڤال تۆ دەتەوێت ببیت بە پاڵەوان و لە هەموو دیوەخانێکا باست بکەن، تا لە سەر شەقامەکانی کوردستان پەیکەرت بۆ بتاشرێت کتومت بە خۆت بچێت؟ بەڵام من وەک ژن دەمویست لە نێو رەحمی خۆمدا هەڵگری پەیکەری خۆشەویستەکەم بم، بە ئاواتەوەش بووم سەرومڕ بەو بچووبا و ناوی ئەویشی هەڵگرتبا. تیر لە کەوان دەرچوو ناگەڕێتەوە، بە ئاواتەوە بووم هەڵبژاردەی دڵم دەستکاری پەیکەری لەشم بکات و تەلاری ئاواتەکانی لە سەر لەشم دامەزرێنێ. چی بکەم دڵم ئەم راستییەی نەپیکا و ئاواتەکانم رمان و بەرەو نەمان رێگایان گرتە بەر. ئیتر هیچ بەربەستێک رێگایان لێناگرێ، ئەو بەردە زێڕینانەی لە ئەندێشەی کچێنێم دا لە سەر یەکم دادەنان بوون بە خشتی لە کا دروستکراو و کەوتنە بەر تەوژمی رەشەبا. جا ئەوەندەی هەم، بوونم هەیە، کە نەمام دەکەومەوە خانەی کە نەبووم. ئەوساکە کە نەبووم لە هیچ نەدەترسام کە دەگەڕێمەوە بۆ هەمان دۆخی جارانم لە چی بترسم؟ هەر بۆ راستیش پێتان دەڵێم خوشکم و دایکم بێ گوناهن من ئەوانم لەبەر خۆپەرستی خۆم توش کرد. ئەم دوو ژنەم راکێشا ناو ئەم کۆڕە پیسەوە، دایکم لەبەر حەیا چوون لەسەر ئەم کارە بەردەوام بوو. ئامینەش بە ناچاری لە بەر لەدەستدانی کچێنی لەگەڵیانا بەردەوام بوو.

- سەرم سوڕما، لێم پرسی دەتویست لە نێو ژانی خەڵکی تر دا ئاواتەکانت بژێن.

ـ دەزانم پێم دەڵێن، تۆ دەتویست لە سەر کەلاوەی پەژارەی خەڵکی تر تەلاری کامەرانی خۆت ئاوابکەی. بڕواتانبێت من نەمزانیوە کە کەسیان کوشتبێت. هەر وامدەزانی دەیانگرن و وەک ئێمە دەستەمۆیان دەکەن.
ـ باشە ئەوساکە ئەوەت نەدەزانی بەڵام ئێستە وا تێدەگەیت کە نەبوویت، خواستی ڕەها و ڕەوا نەی دەیزانی تۆ دەبیت و دێیتە ئەم جیهانەوە؟
ـ فاتێ هەردوو دەستی لە ژێر بەتانییەکە هێنا دەرەوە، لەش و لاری ناسک و پتەوی لە ژێر ئەتەگەکەی بەری بە دیار کەوت و ڕووی لە من کرد و گوتی :
ـ دەروێش من هەڵەییکم لەم ژیانە کورتەی خۆم دا کرد. ئیمشۆکە بە دڵێکی فراوانەوە سزاکەی قبوڵدەکەم بەڵام نامەوێ وا تێبگەیت کە ئەم سزایەم پێ ڕەوایە. دەروێش ڕۆژێک لە ڕۆژان پێشی بوونت پرسیارت کرد کوانێ ڕەوا ؟ ئەی لەم بوونە کورتەی خۆتدا دەتەوێ بەرەو ڕەوا بڕۆیت و ببیت بە پارچەیەک لە ڕەوا؟ سەیرم پێدێ بۆچ تێناگەن، کە ئێوە نەبوون واتا لە ئارادا نەبوون، ئێستاش لە ئارادان، بەیانی کە نامێنین دەبینەوە پارچەێک لەنەبوون. من وا بزانم ڕەوا هەر لە ئەندێشەی زیندو دا دەژیێ. بەیانی کە دێنە سەر تەرمەکانمان هەموو بە یەک دەنگ دەڵێن "انا لله و انا الیه راجعون"
بە پێکەنینێکی ساختەچییانە بە چاوێکی پڕ لە فرمێسک ڕووی تێکردم و گوتی : ـ وابزانم مامۆستا باشم تێگەیشت. مامۆستا بوونی ئێمە بەستراوەتەوە بە بوونی ئەندێشەیی خۆمانەوە، کە نەبووین ئەندێشەمان نەبوو کە نامێنین ئەندێشەمان نامێنێت. "انا للعدم و انا الیه راجعون" وا تا لە نەبوونەوە هاتین بۆ نەبوونیش دەگەڕێینەوە.
ـ تۆ دووریت لە ڕەوا و خواستی ڕەوا، چونکە گەیشتن بە ڕەوا، وت و وێژە ململانێ یە لە نێوانی خود و خۆتدا. مرۆڤ ئەوساکە دەگاتە پلەی پەیوەندی بە ڕەوا، کە تەرازووی نێوانی خود و خۆی بە پلەیەکیش لێک نەترازێن کە سنووری نێوان دەروون و سروشت دەسڕێتەوە، ئەوساکە دەتوانیت بڵێیت نزیک بوومەتەوە لە ڕەوا و بەرەو ڕەها دەڕۆم.
ـ نازانم تۆ باسی چ ڕەوایەک دەکەیت؟ لە نەبونم دا من لە ناو ئەندێشەی ڕەوا دا بووم. لە ژیان دا من لەبەر سایەی ئەندێشەی ڕەوا دا دەژیم. کە

نامێنم دەگەڕێمەوە ناو ئەندێشەی ڕەوا. ئەوەی تێبگەم گەر ڕاست بم مرۆڤ پێشی بوونی بێ ئەندێشە لە سروشتا تواوەتەوە کە دێتە ئاراوە بە ئەندێشەوە دەبێتە پارچەیەک لە سروشت کە نامێنێ دەگەڕێتەوە بۆ سروشت "انا لله و انا اليه راجعون". ئێمە پارچەیەکین لە سروشت و بۆ سروشتیش دەگەڕێینەوە. جا چ پێویست دەکات سنوری نێوانی سروشت و دەروونت بسڕینەوە؟ دەرونێکی بێ شۆڕش لە لەشێکی مردوو دا دەژێ، گەر دەرونی مردو ڕەوابێت ئەندێشە لەم ناوە دا بێ جێگایە و بێ بەهایە.
گوتم فاتێ سروشت دەستکردی ڕەوایە، چۆن دەستکرد دەبێت بە کردیگار.
هەڤاڵ و سامان چاویان لە یەک کرد و، کاک سامان گوتی :
- کچینە بڕیاری شۆڕشگێڕانەمان دا کە نەتانکوژین بە پەیمانێک ئەگەر یارمەتی پێشمەرگە بدەن لە پەیوەندیتان بەردەوام بن لە گەڵ دەسەڵاتی داگیرکەر. هەرسێک ڕەزامەندی خۆیان دەربڕی. منیش پیرۆزبایم لە پێشمەرگە و ژنەکان کرد و گوتم ئەی چی لەم سێ کوڕە دەکەن.
- ثائیر گوتی گەر لێمان ببورن شەرتبێ واز لە سەربازی و حیزبی بەعس بێنین، لە بەر خاتری پەیامی خۆشەویستی کە دەروێش هەڵگریەتی؛ مەمانکوژن. هەڤال ڕوی تێکردن و گوتی :
- لەو کاتەی ئێمە لەگەڵ پیری پیران خۆمان لە ئەلف و بێی خۆشەویستی ڕادەهێنا، ئێوە بە زۆرداری، وانەی ڕک و کینەتان پێ دەوتینەوە. کە وانەکانمان ئەزبەر کرد، بە زۆرداری دەتانویست خۆشەویستیمان پێ لەناو ببەن. فەرمایشتان بەسەر چاومان ئێمە سەربازین، خۆشویستترین کەس لای شاگرد مامۆستایەتی، لە سەر پەیرەوی ئێوە دەرۆین لێمان ببورن دەبێ بە ئێوە دەست پێ بکەین. خۆشەویستانمان بۆچ دەترسن بۆچ دەڵێن واز لە وانەکانتان بێنن بگەڕێنەوە سەر ئەلف و بێی جاری جارانتان کە پیری پیران فێری دەکردن، بەڵام مامۆستایان درەنگە پیری پیران لە سەفەرە، ئێستەش کاتی ئەوە هاتووە بتانکەین بە قوربانی وانە پیرۆزەکانتان، چونکە وانەی پیری پیران بوو بە داستان و تێپەڕی.

****

دەنگی زەنگی دەرگا چیرۆکی بە مامۆستا بڕی، ئازاد هەڵسا و دەرگای کردەوە. چێنەر و سەپان هاتنە ژورەوە. پاش سڵاو و تۆقە کردن، دانیشتن چێنەر گوتی داوای لێبوردن دەکەین وا دیارە دانیشتنەکەتانمان تێکدا. سەپان هەڵی داێ گوتی دەی دەی گەر مامۆستا لێرەبێت باس باسی دینە و گشتمان زەندیق و کافرین کوردستانیش بە خودانەناسان ناگاتە ئامانجی خۆی. ئینجا لە قاقای پێکەنینی دا و بە بەلوتبەرزییەوە ڕوویتێکردین و گوتی :

- توخوا ڕاست ناکەم؟

ئازاد گوتی :

- چاوەڕێی ئێوەمان دەکرد، بزانین چی نوێتان پێیە.

- کاک سالار گوتی :

- کاک سەپان دە ئەمجارەیان فت، نەتزانی باس باسی ژنان بوو.

- چێنەر بە شادییێکی منالآنەوە گوتی، سەیرە دەچین بۆ هەر شوێنێک بەسەر بابەتی خۆمان دادەکەوین. بە ڕاست من لەو تەوەرە بەولاوە سەرم لە هیچ بابەتێکی تر دەرناچێ بۆیە زۆر شادومانم کە بەسەر بابەتی خۆم دا دێم. من هەموو کاتێک دەڵێم؛ ژن ئافریدەیەکە هاتۆتە ئاراوە تا پیاو ئەندێشەی خۆی پێ ئاو بدات.

وا دیار بوو سەپان دەیویست دانیشتنەکە گەرم بکات بۆیە زوو بە زوو قسەکانی چێنەری قۆستەوە "ئەوەی بزانم بە دڵ دژی قسەکانی ئەو نەبوو" بە دەنگێکی نەرم گوتی :

- بە داخەوە کاک چێنەر، ژن ئەو ژنەیە کە لە خۆی بەولاوە هیچ کارێکی تری نەبێت. چونکە کاری لاوەکی لە مێیەتی ژنان کەم دەکاتەوە. ژنی دەستەمۆ پێی دەگوترێت ژن. گەر ژن کاربکات واتا بە کاری بازوو یارمەتی ئابوری ماڵەوەی دا ئیتر ملکەچ نابێت بۆ ژنایەتی خۆی. چونکە دەبێت بە هاوسەنگێک بەرانبەر بە پیاو بەم جۆرە لە یادی دەچێت کە ئەو ژنە دەبێت ملکەچ بێت بەرانبەر بە خواستی نێرینە. من وا ناڵێم بەڵکو سروشت دەڵێت نێر دەبێت زاڵ بێت بەسەر مێ دا. بۆ نموونە بە بیری پیاو ژن دەتوانێت بۆ ماوەیەکی کورت

ببێت بە مولکی پیاوێک. جاری جاران پیاوی بە هێزو و بە توانا نایابترین ژنیان هەڵدەبژارد، ئەوەی دەمانەوە بە بەر پیاوەکانی تر دەکەوتن.

وا دیار بوو چێنەر هەستی بەوە کرد کە ئەم تووێژە سەرنجی دانشتوان ڕاناکێشێ ئەگەر وابێت، هەر لە نێوانی هەردووکیانە دا دەمێنێتەوە و ئەوانی دیکە تێکەڵ بە گفت و گۆیان نابن، بۆیە هەوڵی ئەوەی دەدا رایانکێشێتە ناو باسەکەوە.

. براینە ئێمە گشتمان لە گەڵ ئەوەین کە ژن مولک بێت بەڵام مولکی پیاوێک بێت و بە مارەیی پێوەی ببەسترێتەوە. وا بزانم کەس دژی ئەوە نییە کە ژن لە پیاوی بە توانا و بەهرە دەگەڕێن، بەڵام ئەوە ئەمە ناگەیەنێ کە ژن هەر پیاوێکی بە بەهرەی دیت ئیتر بچێتە پاڵیەوە. تا مامۆستاش راکێشێتە ناو باسەکەوە گوتی، تێناگەم بۆ لە تەمەنی هەرزەکاری دا، ئەڤین هێند بەهێزە نە جیاوازی ئایینی نە کۆمەلایەتی دەتوانن لە رێگای دا ببن بە بەربەست لە هەمان کاتیش دا ئیمانی هەرزەکاران کزە. بەلام کە تەمەن گەورەدەبێ ئەوساکە ژن پیاوی بە توانا و بە بەهرە هەڵدەبژێرێت، لە هەمان کات دا خۆشەویستی لەلای کز دەبێت و ئیمانیان بە خوداش زیاد دەکات.

. سەپان گوتی، بە پێچەوانەی چێنەر، من لە دژی بە مولک بوونم.

چێنەر دەنگی بەرزکردەوە و گوتی :

. گەر ژن نەبێت بە مولک، ژن دەبێتە کۆتاڵ و بە بێ یاسا فرێ دەدرێت.

. راست دەکەیت لە لای ئێمەمانان بە مارەیی و تەڵاق دەبەسترێتەوە و لە لای شیعە ژنهێنانی چێژ وەرگرتنیان هەیە پێی دەڵێن(زواج المتعه) ئەم ژنهێنانەش ماوەکەی لە ژنهێنانەکەی تر کەمترە، لەم کردارەش ژن تۆزێک پارەی دەست دەکەوێ، ئەوەی دەمێنێتەوە ژنە سۆزانییەکانن کە ئەوانیش خۆیان دەفرۆشن بەڵام بۆ ماوەیەکی کورتتر. ئینجا گەر شتەکە خۆفرۆشتن بێت ماوەکەی گرنگ نییە گەر بۆ سەردەمێکی کورت یان دورخایەنبێت جیاوازی چییە؟ کات شتێکی پیرۆزنییە، لێرانە گرنگ ئەوەیە کە ئافرەت لە ژێر هەرپەردەێکابێت دەفرۆشرێت و گەر ژن بەم شێوە مارەییانەوە رازیبێت، دیارە خۆی خۆی دەفرۆشێت.

سەپان ئەم جارەیان بە دەنگێکی بەرزتر گوتی :
- کە خێزانێک بێ دڵداری بە مارەیی پێکەوە دەلکێنن بەم شێوەیە خۆشەویستی لەنێو بێشکەدا سەردەبڕن. گڤەی گەردەلولی هەناسەیەکی پیس جنجرۆک لە دەم و چاوێکی بێ گەرد دەگرێ. بە ژەهراوی ئاوێکی نەساز دامێنی کێژێک ئاو دەدەن. ئێمە گشتمان زادەی ئەم ژەهرەین، بۆیە لەم ژەهرە بەولاوە لە توانامان دا نییە شتێکی تر بە بوونەوەر ببەخشین. هەر بۆیەش گەر ببین بە پارچەیەک لە بونەوەر، بوونەوەریش ژەهراوی دەکەین. ئەویش هەزار نەفرەتمان بۆ دەنێرێ.
ئەم رستەیە بەرگوێی تەنیا کەوت و ئەم بیرەی زۆر بە دڵ بوو.
کاک سالار گوتی :
- هەرچەندە تۆ دەتەوێت درۆی دڵت بەم راستییە نەگۆڕە سواغ بدەیت : زەردەشت دەڵێ لەش تا ئەو کاتەی گیانی تیایە پیرۆزە کە گیان لێی دەرچوو، پیرۆزی خۆی لەدەست دەدات. هەر بۆیەش زەردەشتییەکان پاشی مردن لەشی مرۆڤیان نە بە خاک نە بە ئاو نە بەهەوا و نە بە ئاگریان دەسپارد، بەڵکو لە شوێنێکی بەرزیان دادەنا تا ئاژەڵ دەیخواردن. وەک لە فۆلکلۆری کوردی دا دەڵێ:

دەترسم بمرم بە چلەی زستانێ      قەل و داڵ بمخۆن یار پێنەزانێ.

لەم کاتەدا سەپان سەیری ئاشپەزخانەی کرد و تەنیای دیت. ئەم نیگا جوانە سەپانی لە ناخەوە هەژاند، هەرچەندە لە بیرە کۆمەڵایەتیەکەی خۆی دایبڕاند. بە هەرشێوەیەک بێت لە بیرۆکەی خۆی دوورکەوتەوە لە مێشکی خۆی دا لە بابەتەکەی خۆی دەگرا و دەیویست بەیادی دا بێتەوە کە باسی چی دەکرد؟ تۆزێک تفی قوت دا تا تۆزێک گەروی تەڕکاتەوە.
کاک ئازادگوتی :
- براینە بە مارەیی سەپێنراو ئەڤین لەناو دەبەن کە ئەڤینیش کوژرا ئەوساکە کۆمەڵگایەکی مردوی وەک کۆمەڵگای ئێمە لە دایک دەبێ و ئافریدەی وەک ئێمە دێنە ئاراوە. گەر دوژمنێک بیەوێت نەتەوەیەک لە ناو ببات ناتەباییان لە نێو دا بەرپا دەکات، خۆشەویستی لەناویان دا دەکوژێت. گەر توانی لەم

کارەیدا سەرکەوێت پێویستی بە تۆپ و فڕۆکە ناکات. ئێمە بەدەستی خۆمان خۆشەویستی دەکوژین، بە پیوانەی خۆمان ئەڤین لامان بێ ئابڕووییە. وەک گاڵتە کردنێک لە سەر بیرۆکەی خۆی بەردەوام بوو، ئێمەی بێ ئەڤین، با شکەست بین لەم ژیانە دا بەڵام بە سەربەرزی دەژین چونکە ئابڕوومان دەپارێزین. کوڕینە پێم ناڵێن کام ئابڕو دەپارێزن؟ پیاوم دەوێت لە کوردان بەرامبەر سەرکردەیەکی کورد پێ لەسەر پێ دانێ، بەڵام ژنێکی بێگانەی ڕۆژئاوایی کە لە تەمەنی دا بێدڵی خۆی نەکردووە ئەوەندەی پێی بکرێت پێ لە سەر پێ دادەنێ سەرکردەکانیشمان کڕنۆشیان بۆ دەبەن و داوای پشتگیرییان لێ دەکەن، جا چ بۆ کەسایەتی خۆیانبێت یان بۆ بە هێزکردنی تەختە رزیوەکانیان بێت. کوڕینە ئێمە پێش ئەوەی لە دایک ببین هەموومان کوژراوی دەستی نەریتمانین.

سەپان بە پێکەنینەوە گوتی :

- بەڵام سوپاس بۆ خوای گەورە دەرگای بەهەشتمان بۆ کراوەتەوە.

ئازاد گوێی نەدایە سەپان و لە سەر قسەی خۆی بەردەوام بوو :

گەر زەحمەت نەبێت سەیرێکی ئەوانە بکەن کە بە پیوانەی ئێمە بێ ئابڕوون، ئێمەی بە ئابڕوو خۆمان لە پاڵیان دەشارینەوە، چونکە دۆستە بە ئابڕووەکانمان کە لە هەمان ئایینی ئێمەن و بیر و باوەڕی کۆمەڵایەتییان لێمان نزیکە هەرجارەی هەنجەتێکمان پێ دەگرن تا پارچە پارچەمانکەن و نەمانهێڵن. ئێمەی هەڵگری بیر و باوەڕیان خۆمان نەمانی کۆمەڵگای خۆمان بە دەستی دۆستەکانمان مۆر کردووە، بەڵام ئەوە ئەمە ناگەێنێت کە ئێمە بەجارێک واز لە نەریت بێنین و کۆمەڵگایەکی بە دیدەی ئیمڕۆ بەڕەڵا دابمەزرێنین. ڕۆژئاوا بە نزیکەی ٦٠ ساڵ ئینجا گەیشتووەتە ئەم سەربەستییە دولبەرییەی کە دەیبینین. ئەوان تا ئیمڕۆش باجی ئەم سەربەستییە هەر دەدەن، تا ئێستاش ژن بە دەستی مێرد و دۆستەکانیان دەکوژرێن. ئێمەمانان بە بازێکی گەورە نە دەگەینە ڕۆژئاوا نە لێیان دەبەینەوە. هەرشتێک سنووری خۆی بەزاند و کەوتە خانەی بێ سنووری، نەمانی خۆی بەدەستی خۆی مۆر دەکات. بە شێوەیەکی کورت تر واتا هیچ شتێک نە بێ سنوور گەورە دەبێت

نە بێ سنوور گچکە دەبێتەوە گەر بکەوێتە هەر خانەیێک لەم خانانە واتا دەکەوێتە خانەی نەمانەوە. بەڵام بڕواتانبێت، گەر واز لە نەریت و ئابڕو بێنین، لە بەرەڵایی بەولاوە هیچی ترمان پێ نابڕێت. بۆیە مارەیی ئەڤین ناکوژێ، جەنابتان دەتانەوێت ئابروو بکوژن؟ ئەڤینی بێ ئابڕوو واتا ئەڤین لەپێناوی ناوجێیی دا، هێدی هێدی ئەڤینی راستی لە دڵی مرۆڤایەتیدا دەسڕێتەوە.

سالار وای دەزانی کەس گوێی لێی نییە و کەس ئاگای لەو نییە لە بەر خۆیەوە دەستی بە قسە کردن کرد و قسەی  بە ئازاد بڕی. جار و بار چاو لە ئاسمان دەکەم سوپاسی توانای دیتن دەکەم. بە دادانەوەی پێڵووم، چاوەکانم کڕنۆش دەبەن بۆ یارەکەم بۆ ئەو ژنەی هەموو کەلێنێکی ژیانمی پڕ کردۆتەوە، ئیتر لە هیچ کەلێنێکا دیمەنێکی لەو جوانتر بەدی ناکەم. دەشزانم ئیتر هەرگیزاو هەرگیز دەستم لێی گیرنابێتەوە. وەک پەرییەکانی سەر دیواری کڵێسەکان کە لە لای ئیمانداران هیچ شوێنێک لێیان بۆش نییە و کەسیش دەستی لێیان گیر نابێت. جیاوازی نێوانی من و ئەوان ئەوەیە من لە نێو دەستم بوو لەدەستم چوو، بەڵام ئیمانداران هەر ئاواتی دیتنیانن. من گەر بیناییشم لە دەست چێت، دوورمەبینە یارەکەم بە خەونێکی خۆش رووی لە دەروازەی چاوەکانم کاتەوە. بێتەوە لام و بە زەردە خەنەکەی خۆیی و بە دەنگە ژنانییەکەیەوە بڵێ باوکی شیرین ئاسودە بە من پەری ئیماندارەکان نیم، من ئەو پەرییەم تەنیا لە پێناوی تۆ هاتمە ئەو جیهانەی کە ئێستاکە تۆ تێیدایت، کە ئەم جیهانە بەجێ دێڵیت هەر وەک جاران باوەشم بۆت کراوەتەوە و پێتدەڵێم خۆشەویستیم بۆت دووپات دەکەمەوە. ئا ئەم خەونە دەتوانێت ژووانی نێوانی جوانی و دیدەم نوێکاتەوە. بە خەونێک چاوەکانم دەتوانن جارێکی تر روون ببنەوە. رۆژ لە ئاسمانی ژیانم زۆر لەمێژە ون بووە. دایکی شیرین جیهانی نە ناسراوی ئێستاکەت بوونەتە کۆسپێکی گەورە لە نێوانمان دا. وەرەوە باوەشم با رۆژ لە ئاسمانم هەڵێتەوە تا شەوەزەنگ وەک بەسەرهاتێک لە مێژووی ژیانمان رەشکەینەوە. هەر کە دەکەومە گومان لە بوونی یارەکەم، بە بەژن و باڵای خۆیەوە لە بەردەمما رادەوەستێ. دەڵێم بڕوا ناکەم دەشێت دێوانەبم گوێم لە دەنگی پەنهان و چاوەکانم دیمەنی

سەرووی سروشت ببینن؟ دەبێت گوێم نەزرینگێتەوە و چاوم رەشکەوپێشکە نەکات؟ دەنگێکی پڕ لە سۆز دێتە بەرگوێم دەڵێت ئەڤینی من بپارێزە ئەڤینی من راستییە و رەوایە و بروسکەیەکی نەبڕاوەیە. سوپاس بۆ تۆ ئەی ئەڤین کە توانیت لە سنوورێک دا بمبەستیتەوە تا لەگەڵ یارەکەم دا بژیم و لێی جیانەبمەوە. ئەم دەنگە رەنگدانەوەی ئەڤینێکە لە ناخمدا وەک کانیەک هەڵکولاوە، نە سەرچاوەی کانیەکەم لە دەست دایە و نە دەشزانم بۆ کوێ دەچێ.

هێزێکی تر لە دەروونمایە بێوچانە لە سڕینەوەی ئاسمانی رەشم، هەموو شتێک دەکات تا رۆژێکی تری لێ هەڵبێتەوە. هەموو کاتێک پێم دەڵێت ئەی داماو تۆ شایەستەی ئەم ئەوینەیت، بەڵام بڕواتبێت لەم ژینە دەرچیت هیچ باوەشێک چاوەڕێت ناکات. تا باوەشی ئەوینی راستقینەت لەدەست نەچێت باوەش لە باوەشێکی تر وەرینە.

مامۆستا قسەی بە سالار بڕی و گوتی :

- دەزانم باسی چی دەکەیت بەڵام نازانم باسی کێ دەکەیت، بە هەرجۆرێک بێت وابزانم درەنگە دەبێت بڕۆین ئەم ماڵە هەر ئاوەدانبێت. لەم کاتەدا سکاڵا بە تەنیای گوت تۆ مەیێ دەرەوە من دەچم چایان بۆ دەبەم. تەنیا خۆی پێنەگیرا و بەدوای سکاڵا کەوت، سەپان و چێنەر لەبەریان هەڵسان و تۆقەیان لەگەڵ کردن ئینجا دانیشتنەوە. سەپان سەیری ژێر پێی تەنیای دەکرد دوایی سەری هەڵدەبڕی و سەیری نێو چاوی دەکرد، ئینجا دیسان پێدادەهاتەوە. ئەم خوشکەتان پێ نەناساندم. دەنگێک وەک سوخڵەی پێبکرێت گوتی، ئەمە تەنیاخانە... ئەوەش کاک سەپانە. دەنگەکە لە شوێنی خۆی دامرکاوە.

چێنەر گوتی منیش ناوم چێنەرە، بە زەردەخەنەییکەوە درێژەی بە وت و وێژی خۆی دا، وا دیارە بە تەمانین ناوم بێنن. یەک لە بارەخۆم لە لای من گرنگ نییە هەست بە بوونم بکەن یان نەء، چونکە کە هەست بە بۆشایی دەکەم هەست دەکەم کە من هەم، هەر بونێک دەبێت شوێنێک لە بۆشایی پڕکاتەوە. کەوا بوو ئەوکاتەی، کە هەست بە بۆشایی دەکەم، هەست دەکەم

که شوێنێکم پڕکردۆتەوە، من تا ئەو کاتە هەم کە لەم جیهانە دا شوێنێک لە بۆشایی پڕ دەکەمەوە. توخوا سکاڵا خان حەقم نییە ئەم قسانە بکەم؟
- سکاڵاش گوتی داوای لێبووردن دەکەم نەتهێشت قسەکانم تەواو بکەم، بە گوێرەی قسەی خۆتبێ وا دیارە زۆر بۆشیت بۆیە هەست بە بۆشایی دەکەیت.
چێنەر پێکەنی و هەناسەیێکی تاڵی هێنا خۆی و گوتی :
- دیارە تۆش تێم نەگەیشتی من هەم بۆیە هەست بە بۆشایی دەکەم، با وابێت سکاڵا خان جوێنیشمان پێ بدەیت هەر خوشکی گەورەمانیت. پاش چا خواردنەوە، تەنیا چوو سینییەک کفتە و شۆربای هێنا، هەرکە چێنەر دیتی تەنیا سینی بەدەستەوەیە، یەکسەر رایکرد و سینییەکەی لە دەست وەرگرت و گوتی قەت خوو بە کارەوە نەگریت. تا پێت دەکرێت دەست لە هیچ مەدە گەر دەستت بۆ کار درێژ کرد فێری کاردەبیت ئەم دەست و پەنجانەت تێک دەچن.
- تەنیا پێکەنی هەنگاوێک گەراوە پشتەوە و گوتی :
- جا کێ دەڵێ من کارم نەکردووە بە خوو.
- لە وەڵام دا چێنەر گوتی بەڵام تکات لێدەکەم واز لەم خووە خراپە بێنە.
پیاوەکان سەیری یەکتریان کرد و بە بێ قسە دەستیان بۆ خواردنەکە راکێشا.
سالار زوو خوارنەکەی خۆی تەواو کرد و گوتی مامۆستا دەڵێی چی گەر خوداحافیزی بکەین؟ مامۆستا یەکسەر هەڵسا و،سەپان زوو زوو تەلیفۆنەکەی خۆی بە جوانی لەسەر پەڕێک نووسییەوە و لە دەستی تەنیای نا و گوتی :
- هەرکارێکت هەبوو سڵ مەکە زەنگێکم بۆ لێدە ئەوەی پێم بکرێت بۆتی دەکەم، هیوادارم هیچ کارێکیش لە وزەی من بەدەر نەبێت. ئینجا لای ئێوەمان خۆش دەبێ برۆین و بەیانی دەبێ زوو لە خەو هەڵسین و بچینە کار. هەمولایەک خوداحافیزییان کرد.

****

بۆ بەیانی سامان تەلیفۆنی کرد لانە نەیدەویست واز لە بووکە شووشەکەی خۆی بێنێ بۆیە هاواری کرد، دایە، دایە تەلیفۆنە...
دە کچم مەقیژێنە گویێم لێیە، دە تەلیفۆنەکە هەڵگرە بزانە کێیە؟
ـ ئەلوو،... من لانەم،... بابە لەماڵ نییە،... بەڵام دایە لێرەیە، ... دایە مامە سامانە.
ـ بەڵێ کاک سامان، زۆر سوپاست دەکەم زۆر باشین،... نا بەخوا نازانم کەی ئازاد دێتەوە، ... باشە پێی دەڵێم یەکسەر تەلیفۆنت بۆ بکات. دەفەرموون گەورەمانکەن، توخوا ئەگەر ئیمشەو نەیێت، بە خوا چاوەرێت دەکەین، بە خوا ئەگەر حەزت لە هەر خواردنێک بێت و پێم نەڵێیت ئۆباڵی خۆت بە ملی خۆت. دە باشە کە هاتەوە پێی دەڵێم تەلیفۆنت بۆ بکات، باشە... خواحافیز.
ـ سکاڵا سەیری تەنیای کرد و گوتی :
ـ ئەوە کاک سامان بوو، خەڵکی گوندی بالیسانە، زۆرم پێخۆشە بیناسیت پیاوێکی زیرەکە، یەک عەیبی هەیە حیزبایەتی لە کوردایەتی زیاتر دەکات. بەڵام بە گشتی پیاوێکی پاکە. وەک خۆی بۆی باس کردین.
گوتی من تا ئەو رۆژەی کە ئاسمان جارێ لێی نەشێوا بوو. تەم و مژی ژەهراوی بە خۆیەوە نەدیت بوو و ئەو تەم و مژەی بەسەر ئاوایی بالیسان دا تێپەڕی و موژدەی کۆتایی مێژووی نادیاری گوندی بالیسانی بۆ جیهانی ئیسلامی بێ ئاگا لە ئازارەکانی کورد برد. من هەر دەمزانی بە کوردی بدوێم و نەمدەزانی کوردایەتی چییە. ئاخ لەو رۆژە خەڵکی گوندەکەمان هەریەک لەلایەک ڕاکشابوو تا بە دیداری پەیامبەری ئیسلام شادببنەوە. ئا ئەو رۆژە سەرتاسەری بوونەوەر بوو بە گۆیەک لە ناوەندی گوندەکەمان راوەستا. لەنکاوێک وەک پڵینگی پێشی هێرش خۆی لێک کێشاوە و سەیری نێو چاومی کرد و خۆی وێک هێناوە و بە گڕم داهات. ئەو رۆژە ئاسمانی شین سپی هەڵگەڕا بوو. بە بەرد و ئاسن و ئاگر ئاوس بوو. ئەو رۆژە وامدەزانی رۆژی لە دایک بوونی بەردە، نا بەراستی ئەو رۆژە رۆژی لەدایکبوونی بەرد نەبوو، رۆژی لەدایک بوونی ئاگر بوو، رۆژی لە دایک بوونی مردن بوو. دەرگای مردن لە نێو گۆیە بچکۆلانەکەی زەمین دا

کرابووەوە. یان گۆیە بچکۆلانەکەی زەمین چووبووە ناو دەمی دەرگای نەمانەوە. ئا ئەو رۆژە لە خەوی منداڵیم بێدار بومەوە و گەورە بووم. دەستم پێ کرد پرسیار بکەم بۆچ دەمانکوژن؟ بۆچ بەرخەکانمان لار دەبنەوە؟ بۆچ گوندەکەمان وێران دەکەن؟ منی دیهاتی بیرم لە تۆڵەی باوک و برا و دایک و گوندەکەمان دەکردەوە، بەڵام نەمدەزانی تۆڵە لە کێ بکەمەوە. تا رۆژێک چەند پێشمەرگەیەکی (ی.ن.ک)نم دیت. ئەوان باسی کوردایەتیان بۆ کردم، منیش لەو ڕۆژەوە بووم بە پێشمەرگەی ی ن ک و دەستم بەکوردایەتی کرد.

ئەم کاک سامانە تەزرەی خوشکی بۆ چارەسەر هێناوە بۆ فەرەنسا، من ئەم کیژەم ئەوەندە خۆشدەوێت لەگەڵ منداڵەکانم جیاوازی ناکەم و قەت لە یادی ناکەم، هەردەم دەچم سەری لێدەدەم. چەند مانگێک پێش ئیستا تەزرەیان هێنا ئێرە. تەزرە بە مەزەندە کیژێکی تەمەن دوانزە ساڵانە. ئەم کچە ئەوەندە لاوازە، چاوە گەشەکانی هەردەم بە غەم و پڕ لە پەژارەن و هەردەم پڕ لە پرسیاری بێ وەڵامن.

ئەم کاک سامانە کۆنە پێشمەرگەیە دەڵێ پاش ئازادکرنی کوردستان، چوومە ماڵی مامم ئەوساکە تەزرە لە ماڵی ئەوان دەژیا و بەڕاستیش لەم مامەم بەولاوە کەسی ترمان نەماوە، ئەوانەی تر هەموویان بە کیمیاوی کوژران. بە قسەی خۆی دەڵێت رۆژێک تەزرەی خوشکم پێی گوتم کاکە سامان نەتگوت گوندەکەی خۆمانت پیشان دەدەم؟ نەتگوت منیش وەک پەروین و تاڤگە و منالانی گەڕەک دایک و باوکم هەبوو. من ئەوساکە تازە هاتبوومەوە ناو شار، جارێ تەمەنم هەر بیست و پێنج ساڵ دەبوو، خوێنم گەرم بوو، بۆیە زۆر دڵم بە تەزرە سووتا و بە چاوێکی پڕ لە ئەستەمەوە سەیری خوشکە بچکۆلانەکەی خۆمم کرد و گوتم :

- تەزرە، ئێمەش باوک و دایک و باپیرە و داپیرەمان هەبوو. کچێ لەمەش زیاتر مامە و مامۆژنی تریشمان هەبوون. ئەوەندە زۆربووین لام ئەستەمە هەندێکیان بەئاستەم دێنەوە یادم، بەڵام بەرخەکانی ئەو بەهارەم لە یاد ناچێتەوە. ئەو بەیانییە دایکم بابۆڵەیەکی دا دەستی جوامێری برام و گوتی، "رۆڵە جوامێر برۆ ئەو بەرخانە بلەوەڕێنە، بەڵام پێشی ئەوەی برۆی وەرە

ماچێکم دەیە" تەزرە گیان دایە سەیری منی دەکرد و جوامێری لە باوەش کرد و دەتگوت نەی دەویست بەری بدات، بەڵام دوایی، گوتی :

ـ کوڕم جوامێر بڕۆ بە خوام سپاردی، بەڵام ئاگات لە خۆتبێ بەردو و دار هەڵنەدەیتەوە نەوەکا دووپشکێ یان جانەوەرێکی لە ژێر بێ، کوڕم ئەگەر تەیارەی دوژمن هات لە شوێنی خۆت دانیشە هەتا تەیارەکە دەروات، رۆڵەگیان ئەوێ ئاوی لێیە بەڵام با ئەم مەتارەیەت لەلابێ نەی خۆیەوە کەتەیارە هات، دەستەسرەکەت تەرکە و ئەوەی ماوە بەسەری خۆتی داکە.

منیش چونکە لە جوامێر گەورەتر بووم مەڕەکانم پێش خۆم دا و بە گۆرانی خۆم گەیاندە سەر پەڕگی گوندەکەمان و ئاوا بووم، بەڵام جاروبار ئاوڕم دەداوە، دەمدیت دایە تۆی لەباوەشی خۆی کردبوو، واش دەهاتە بەر چاوم سەیری من و جوامێری دەکرد. جوامێریش هێدی هێدی دوور دەکەوتەوە. من تاوەکو ئێستەش کە سەیرت دەکەم هەمان باوەشی دایە دێتەوە یادم کە تۆی لە باوەش کردبوو. تاوەکو ئیمرۆش دوو چاوەکانی نیگابانمن وەک دوو باڵی فریشتە سەرتاپایان داپۆشیوم. تەزرە مادامەکینێ ئەوەندەت پێخۆشە بچینەوە گوندەکەی خۆمان، وەرە بە تەکسییەکەی مامم دەچین، بەڵام ئەوەی من بزانم گوندەکەمان جارێ ئاوەدان نەکراوەتەوە، بەڵام هەر دەتبەم.

خوشک و برا سواری ئۆتۆمۆبیلەکە بووین و بەرەو گوندەکەمان پێمان پێوەنا، دەمەو نیوەڕۆ بوو گەیشتینە شوێنێک ئیتر ڕێگای ئۆتۆمۆبیل نەما. ئۆتۆمۆبیلەکەم لە لا تەریکی ڕێگا ڕاگرت. تەزرە ئینجا دەبێ بە پێ بڕۆین.

تەزرە لە ئۆتۆمۆبیلەکە هاتە خوارەوە، بە شادییەکەوە گریان لە گەرووی دا قەتیس مابوو، گوتی.

ـ کاکە زۆر دوورە.

ـ نازانم، ئەوەی بێتەوە یادم دەبێ هەر نیو سەعاتێکمان مابێ. ئا لەو ناوە نازانم دوور یان نزیک، دار گێوژێکی لێیە.کە من و دایکم لە نێو ڕەزان دەهاتینەوە لەژێری دادەنیشتین، منیش سەرم بە کۆشی دەکرد. لە یادمە

جارێکیان دایە گوتی "کورم خەوت لێنەکەوێ دەنا دەبێ بە کۆڵ بتگەێنمەوە".
منیش خۆم خەواند. خەریکی گێڕانەوەی ئەم چیرۆکەبووم، زەینی بەر دەمی خۆم دا شاگەشکە بووم کە چاوم بە دار گێوژەکە کەوتەوە و گوتم کچێ تەزرە ئا ئەوە گێوژەکەیە. لە دوورەوە چاومان بە درەختێکی سەوز کەوت. منی گەشبین بە تەزرەم گوت. سەیری ژیان بکە چەند جوانە.

کە لێی نزیک بووینەوە، سەیریم کرد درەخت چ درەخت؛ چەکی کیمیاوی سیمای ژیانی پێوەنەهێشت بوو. بوو بوو بە دارێکی ووشکی مردوو. لاولاو هەموو لکوپۆپی بێ ژیانی ون کردبوو، هیچ شوێنێکی نەمابوو لاولاو خۆی لێنەدا و بە گوڵی سور و مۆر دای نەپۆشێ. ئەم دارە وشکە وا رازابووەوە دەتگوت بووکی رازاوەی بەهارە. وابزانم خۆی کردبوو بە بەیداغ، ژیانی لە باوەش کردبوو تا بە دوژمنانی ئەم خاکە بڵێ، ئەم خاکە لانکی ژیان بووە، بۆیە نابێت، ناشێت مەرگ باڵی بەسەردا بکێشێ.
گوتم، سەیرکە هەرجوانیەک ناشیرنیەک دەشارێتەوە. تەزرە پێکەنی و گوتی.
ـ سەیرکە وشکبوون یارمەتی ژیان دەدات جوان بێت، کاکە دەزانم زۆرم نەماوە منیش دەمرم، چونکە چیتر بەرگەی ئێش و ئازاری سینگم ناگرم. کاکە مردنی من وەک مردنی ئەم دارە وایە. ئەو بە چەکی کیمیاوی مردووە و هۆی مردنی منیش هەر ئەم چەکەیە. تکات لێ دەکەم کە مردم لە ژێری دا بمنێژە ئەوساکە هەردوکمان، من و ئەم دارە دەبین بە یەک، دەبین بە هێمای ژیان و کۆلەگەی هەڵگری جوانی.
لە دڵی خۆمدا گوتم هەردوکتان دەبێ ببن بە هۆی قەدەخەکردنی چەکی کیمیاوی.

لەنکاوێک چەرخی کاتژمێر پاشەوپاش بۆ چەند ساڵێک گەڕاوە دوواوە. بوومەوە منالێکی ٤ سالان لە چواردەوری دار گێوژەکە دەسووڕامەوە. وەک جاری جاران دیسان لیچکی کەوێی دایکم گرت و بە دەستی دایکم چێژێکی تری ئەم گێوژەم کردەوە و بۆنی کەوێی دایکم و دەستە زبرەکانی هێند ناسک بوون کە بە سەرمی دادەهێنا. ئەم مەستییەم چرکەیەک بوو بروسکەیەک بوو لە شوێنی خۆی دا کوژاوە، بۆیە دیسان

سەیرێکی دار گێوژەکەم کردەوە؛ بۆم روون بووەوە خەیاڵ نییە و راستییە وێزەی دوژمن ئەم دار گێوژەشی وشک کردووە. دوژمنانم لەم چێژەشیان کردم، لە جیاتی خشەی گەڵاکانی جاران کە شنەی با لێی دەدان هەمارەنگی جولانەوەی گەڵا و لکی ئەم دارە دەبوون بە ئاوازێک خۆیی و چوار دەوری خۆی بە سەما دەهێنا. هەر لە منداڵییەوە گوێم ئاشنای ئەم ئاوازە بوو کە لە لای من ئەم دەنگە؛ ئاوازی خۆشەویستی من و ئەم خاکە و دایکم بوو. ئێستەش ئەم دارە لە تاو ئێش و ئازاری بە جیڕە و زیڕە مۆسیقای کینەم بۆ لێدەدا داوای تۆڵەم لێ دەکاتەوە.

تەزرە دەستی گرتم گوتی، کاکە گوێت لێیە ئەم دارە چ دەنگێکی خۆشی هەیە. دەڵێی کەمانە، نا نا ئا لێرانە بە بلوێری شوان دەچێ کە بلوێر بۆ مەڕەکان دەژەنێ. وا بزانم دڵی تەزرەی بچکۆلانە و دڵی ئەم دارە شەهیدە هەمان ئاوازیان لێدەدا. لەنکاوێک دیسان بچووک بوومەوە و هاوارم کرد، دایە با تۆزێکی تریش لێرە دانشین بەیانی زوو تەپکەم لە ژێر ئەم تەڕاشە نابووەوە دەچم سەرێکی لێدەدەم. ئەسرین وەک گۆلێک لە چاوم دا پونگابووەوە بەڵام من وەک سوپا سالار سەیری ئاسۆی دوورم دەکرد، نەکا تەزرە هەست بە لاوازیم بکات، بەڵام لەشم لە گەڵ زیڕەی دارەکە زیرەی لێ هەڵدەستا. تەزرەش ڕاوەستانی نەبوو دەستی بە گەڵای لاولاوەکان دا دەهێنا و بە سیخە سیخی سینگە بریندارەکەیەوە لەگەڵ سیڕەی دارەکە سەمای دەکرد، لەژێری دا درێژ دەبوو و خۆی دەگەوزاند و هەڵدەستاوە و لەدەوری خۆی خولی دەخواردەوە. ئیتر نەوەکا ئاشکرابم خۆم پێ نەگیرێ و بگریم، گوتم. تەزرە با بڕۆین دەنا ناگەینێ. تەزرە لە پشتم دەڕۆیشت، بە دەنگە مناڵییەکەی خۆیەوە گوتی کاکە سامان باست بۆ نەکردم، کە خەوت لە خۆت خست، دایە لێت توڕە نەبوو؟

- ئاخ، چ شادییەکە کە تورەیی دایکم دێتەوە یادم. چارۆگەکەی کردەوە و بە ئەسپایی منی خستە ناو چارۆگەکە و لە کۆلی خۆی کردم. ناوە ناوەش دەیگوت "رۆلە دەوەرە خوارێ ئاخر دایە ماندووە، ئەی دایەت خۆشناوێ، ئەگەر بە قسەم نەکەی، بەیانی شلکێنەت بۆ ناکەم" منیش خۆم کڕ کردبوو

دەمزانی بەیانی ناسکەنانم هەر بۆ دەکات. تەزرە گوێی ڕاگرت بوو، وایدەزانی ئێستە دەگەینە ئاوایی و دایکم بەرەو پیلمانەوە دێ و تەزرەش یەکسەر دەڵێ دایە خۆ ئەوێ جارێ کاکە سامانم نەنووست بوو. وا بزانم ئەم بیرەی بۆ دەهات و بەم خەیاڵە هەنگاوی دەهاویشت و دەستی بەرز دەکردەوە بە بڕوای من خۆی دەخستە باوەشی دایکم و بۆنی دەکرد. وەک هەموو منالانی گەرەک دەیویست سکالا لە لای دایکی بکا، تا خۆی خۆشەویست بکات. بە سەرسوڕمانەوە سەیری ڕێگام دەکرد، وا دیار بوو زۆر لە مێژ بوو کەس هاتوچۆی پێدا نەکردبوو، چونکە بە ئاستەم شوێنەواری ڕێگایەکە دەبیندرا.

تەزرە گوتی :

ـ کاکە ڕێگامان لێ گووم نەبووە؟ ئەم هەموو دڕکە لە سەر ئەم ڕێگایە ڕوواوە. هەر چەند لە گوندەکەمان نزیک دەبوومەوە ئەو ڕۆژە ڕەشە وەک دێوەزمە خۆی بەسەرمدا شۆڕدەکردەوە. هەنگاوەکانی گران دەکردم، چونکە ئەو ڕۆژەی کە باسی دەکەم ڕۆژێکی ئاسایی نەبوو. وا دێتە بەر چاوم ئەو ساکە وەک ڕەوشێکی نا ئاسایی هەموو شتێک لە ناو ئاوایی دا غەمبار بوو. وەک ئاسایش غەمی بێ باک وەک پارچە ئاوازێک بە کەساسی لە سەر لێوی دایکم هەڵنشت بوو. کەس نەیدەدیت کەس نەیدەبیست، بەڵام لەنێو چاوی دایکم دا بەبێ تاوان خۆی مەکۆ دا بوو. ئاوڕێکم داوە تا بزانم تەزرە لە کوێیە؟ دیتم تەزرە لە سەر بەردێک دانیشتووە سەری ناوەتە کۆشی خۆی. گەڕامەوە کچێ تەزرە گیان بۆ ناڕۆیت؟ دیتم قسەی بۆ ناکرێت هەناسەی سوار بووە. منیش تەزرەم لە کۆڵی خۆم کرد و کەوتمەوە ڕێ، تەزرە چاکتر نەبووی، نا کاکە. تا تۆزێک دڵی دەمەوە، پێم گوت کچێ تەزرە تۆش وەک من نەکەی، خەو لە خۆت بخەیت ئێستە دەگەینە ئەو کانییەی ئەولا لەوێ دەست و چاوت بشۆ و پشویەکی بۆ دەدەین و ئینجا زۆرمان نامێنێ بگەینە مەبەستمان.

بایەک هات و هەموو شتێکی جولاندەوە. نا،،، نا،،، دار و بەرد لە ترسی ئەو بایە لە شوێنی خۆیان دەستیان بە لەرزین کرد. مێشکم تەزی، لەنێو مێشکی تەزیوم دا بیرەوەرییەکانم دەکوولان، قوڵپیان دەدا. وەک کانییەکەی بەردەمم

هێدی هێدی وەک جۆبار دەچوونە ژێر بەرد و پوش و گیای ئەم دەڤەرە. ئەوەش ئەو کانییە بوو کە جوامێر لەسەری کۆچی دوایی کردبوو. تەزرەم لە سەر هەمان تاتە بەرد درێژ کرد. لەسەر ئەم تاتە بەردە بوو ئاوم بە دەم و چاوی جوامێر دا دەکرد، وامدەزانی دەژییتەوە. بەڵام کە من گەیشتمێ، جوامێر زۆر لە مێژ بوو ئەم جیهانەی جێهێشت بوو. ئا ئەو ڕۆژە نازانم بۆ لەنکاوێک سەرتاسەری بوونەوەر بوو بە دڕندەیەک و بە گژ گووندەکەمان داهات. ئا ئەو رۆژە نەمان لەسەر خاکە بچکۆلانەکەی گوندەکەمان لە دایک بوو. وا دیارە دەرگای مردن هەموو کاتێک لە سەر پشتە، ئێمە وەک مێرولە لە ناویدا دەژین و کاردەکەین و جارێکی تر لە ناویدا دەتوێینەوە. چەندم پێخۆش بوو لە سەر هەمان تاتە بەرد دەرگای ئەزەلم بۆ بکرێتەوە. کە سەیری تەزرەم کرد گوتم من دەمەوێ بەرەو ئەزەل بچم ئەی گوناهی ئەم کچە چییە؟

نازانم چۆن ئەو دوو بەرخەی رۆژی کۆچی دوایی جوامێری برام کە لەلای لاشەکەی دەلەوەڕان و هیچیان لێنەهاتبوو، دیتم ئەوا لە هەمان شوێن دەلەوەڕێنەوە. دەرگای ئەزەل... دەرگای ئەزەل...، دەرگای ئەزەل نەکەیت خۆت داخەیت. تۆزێکی تریش بە والآیی بمێنەوە. تا جارێکی تریش چاوم بە جوامێر کەوێتەوە. دەنگێک گوتی گەر دەتەوێت جوامێر ببینیت وەرە ژوورەوە. بە تەما بووم بەرەو دەرگای ئەزەل هەنگاو بنێم؛ تەزرە گوتی کاکە قەت تۆم وا بە خەمگینی نەدیوە. هەرچەندە هەموو لەشم دێشێ بەڵام بۆنی ئەم تاتە بەردە زۆر خۆشە. لە دڵی خۆم دا گوتم راستدەکەیت. چۆن ئەو بەردەی کە جوامێری لەسەر درێژ کرابوو، دەبێت بۆنی خۆش نەبێت، بۆیە داهاتمەوە و تێر تێر تاتە بەردەکەم ماچ کرد. هاتەوە یادم دایکم جار و بار نوێژی لە سەر دەکرد شوێن پێی دایکم تێر تێر ماچ کرد. کە سەیری تەزرەم کرد و دیتم زۆر ماندووە، نێو چاوانی ئەویشم ماچ کرد. گوتم کچم ئیمڕۆکە ناچینە ناو ئاوایی دەگەڕێینەوە ناو شار بەڵکو بتگەێنمە دختۆر. تەزرەم لە سەر پشتم دانا و ئەم جارەیان بە دە دەقە گەیشتمەوە ئۆتۆمۆبیلەکە و زوو بەرەو شار لێمخوڕی و تەزرەم گەیاندە دختۆر.

ـ به ئاستەم گوێم لە دەنگی تەنیا بوو گوتی، ئەرێ، ئەی چۆن تەزرەی هێنا فەرەنسا؟ لەبەر خۆشیەوە گوتی وا دیارە لەم فەرەنسایەدا هەر من تەنیا نیم و خەمبارنیم.

ئازاد لە دەرگای دا تەنیا وەک سوسکە رایکرد و دەرگای لێکردەوە. کاک ئازاد یاخوا بەخێر بێیتەوە. کاک ئازاد، ئیمڕۆکە من دەچم منداڵەکان لە مەکتەب دەهێنمەوە.

ئازاد بە زەردەخەنەیەکەوە گوتی :

ـ بە خوا لە کۆڵ ئەرکێکی گەورەمان دەکەیتەوە، بەڵام پێویستە یەکەم جار لەگەڵ سکاڵا بچیت دەنا لە مەکتەب منالەکانت نادەنێ. خۆ ئێرە سلێمانی نییە هەموویان یەکتری بناسن. سکاڵا ئازادی گاز کرد، ئازادگیان زەنگێک بۆ کاک سامان لێدە، وا دیارە کارێکی پێت هەیە. خۆزیا پێت وتبا کە بەتەمام بچمە خەستەخانە بۆ لای تەزرە، بەڵام تازە درەنگە ئەوەی چوو چوو. ئیمڕۆکە دەبوایە بێت بۆ لامان، باشە ئێستە یەکسەر زەنگێکی بۆ لێدەدەم، بزانم چی دەوێ. بە راست ئەوە کەی بوو، چوونکە ئیمڕۆکە پێکەوە کۆبونەوەمان هەبوو دژی هێرشەکەی تورکیا بۆ سەر باشوری کوردستان.

****

بۆ ئێوارە کاک سامان هاتەماڵی کاک ئازاد و تۆزێک شیرینی لەگەڵ دەستی خۆی بۆ منالان هێنابوو. سکالا داوای لێبووردنی کرد کە ئیمڕۆکە پێی نەکراوە بچێت بۆ لای تەزرە بەقسەی خۆیبێت گوتی پەیمانبێت بەیانی زوو دەچم بۆلای. سامان هەر لەبەر خۆیەوە بێ ئەوەی سەری هەڵبڕێ بەم شێوەیە وەڵامی سکالای داوە.

ـ بەخوا خێرت دەگاتێ، چونکە ئەم بەستەزمانە فەرەنسیش نازانێ بۆیە زۆر دلی دەگوشرێ، جا ئەگەر هەرجارەی یەکێک بچێت بۆ لای تا لای چۆل نەبێت. سکالا چاوی پڕ لە ئاو بوو گوتی بە خوا قسوریمان هەیە بەلام، ئەم منداڵانە کاتێکی زۆرمان لێ دەکوژن بەیانی دەیانبەم بۆ مەکتەب سەعات یانزە و نیو دەبێ بچم بیانهێنمەوە و خواردنیان بدەمێ و بیانبەمەوە بۆ قوتابخانە، دوایی کاتژمێری چوار و نیو دیسان بچمەوە دوایان و بیانهێنمەوە دوایی بیانبەم بۆ باخچە تا تۆزێک یاری بکەن. ئینجا لە کۆتاییدا سەیر دەکەم هیچم نەکردووە و هەموو رۆژەکەشم لە دەست چووە و خۆ ئێوارانیش دەبێ خواردنیان بۆ ئامادە بکەم. تەنیا گوتی سکالا خان بۆ خۆت والێدەکەیت خۆ بێکەس نیت پەیمانبێت بەیانی من منالەکانت بۆ دابین بکەم. تۆش بڕۆ بۆ لای تەزرە و هیچ خەمت نەبێت. دوایی گەر هەر کەسێکتان پێی کرا بمبات بۆ لای تەزرە ئەوا منیش سەرێکی لێدەدەم. دەنا با بۆ رۆژێکی تر بمێنێت، دونیا هەر رۆژێک و دوو رۆژ نییە.

ئازاد رووی لە سامان کرد و گوتی :

ـ دەزانی تورکیا تا دێت هێرشەکەی بۆ سەر کوردستان بە هێزتر دەکات.

سکالا گوتی :

ـ چییە تورکیا هار بووە؟

کاک ئازاد گوتی :

ـ سکالاگیان ئیمڕۆکە تورکیا بە فێڵی ئەوەی کە گوایە PKK بنکەیان لە باشوری کوردستان داناوە، بڕیاری داوە هێرش بباتە سەر PKK. بەلام بەم فێلانە دەیانەوێت حکومەتە ساواکەمان لەناو ببەن. خۆشت باش دەزانیت تورکیا هەردەم لە هەل و مەرجێکی نوێ دەگەڕێت تا دەستی بخاتە نێو کار و

باری ناوخۆی کوردستانەوە. جا ئێمە لە دەرەوەی نیشتمان دەبێت هیمەتێک بکەین تا ڕێگا بەم دڕندانە نەدەین پێ بنێنە سەر خاکی پیرۆزی کوردستان.
سکالاّ گوتی :
ـ دەزانیت حوکمەتە ساواکەی کوردستان لە بەر وولاّتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا ناوێرێت زۆر لە دژی تورکیا ڕاوەستێ.
ـ سامان گوتی، بۆیە دەمویست لەگەڵ چەند کوردێکی بە شەرەف بدوێم تا کۆمەڵەیەکی پەنهان پێکبێنین. لە توانای دابێت لە دژی دەست تێوەردانی تورکیا ڕابوەستێت. ببوورن ئەوەندەی نەمابوو لە یادم بچێت شیرین خان پێی گوتم ئیمشەو دێت بۆ لاتان، دەیەوێت بەخێرهاتنی تەنیا خان بکات.
تەنیا بە شەرمەوە سەیری گشتیانی کرد و گوتی :
ـ ئینجا ئێوە لە دەرەوەی وولاّت چیتان پێدەکرێ؟
ـ سکالاّ دەستێکی بەسەری تەنیا داهێنا و گوتی، مەڵێ چیتان پێدەکرێت بڵێ جیمان پێدەکرێت؛ خۆ هەرنەبێت دەتوانین لە بەر دەرگای باڵوێزخانەی تورکیا خۆپیشاندانێک سازبدەین و نارەزایی خۆمان پیشان بدەین، دەتوانین واژۆ کۆکەینەوە لە دژی ئەم دەست تێوەردانە. هەرنەبێت بازرگانە کوردەکان هانبدەین لە جیاتی کۆتاڵی تورکی کەل و پەلی یۆنانی بکڕن.
سامان ڕوی لە سکالاّ کرد و گوتی :
ـ تا ئیستەش بڕوات بەم خەڕافیاتانە ماوە؟ کوا باوی ئەم شتانە ماوە. هەموکاتێک ئێمە دەچینە بەردەرگای خەڵکی هاوار دەکەین بروخێن کوردکوژەکان، بمرن کوردکوژەکان. ئیتر بەسە با ئێمە شتێک بکەین تا ئەوان بێنە بەردەرگای ئێمەو بڵێن بمرێ کورد.
ئازاد گوتی :
ـ زلهێزەکان کە سەیری هێزی رەش و رووتی کورد دەکەن. ئەوەندەی تر هاردەبن و زیاتر چەک دەدەن بە دوژمنانمان. بۆیە دەبێت ئاگامان لە خۆمان بێت و هێزی خۆمان پیشان نەدەین.
سامان گوتی :

ـ هەر هەمان یۆنانیی کە باسی دەکەیت ئاپۆیان تەسلیمی تورکیا نەکرد؟ دەبێت ئەوەش باش بزانن لە کورد بەولاوە کەس دۆستی کورد نییە.
ئازاد گوتی :
ـ براینە ئیمڕۆ رۆژی پیشاندانی هێز و توانا نییە. سەیرکەن ئاشی سیاسەتی ئینگلیز ئەوە هەشتا سالە لاشەی کورد دەهاڕێ. کە سیاسەت مەدارانیان گوێیان لە قرچە قرچی شکانی ئێسکی کورد دەبێ وا دەزانن مۆسیقایە، بۆیە قەت نابێت هێزی راسەقینەی خۆمان پیشانی کەس بدەین، چونکە چەند بزانن هێزت چەندە ئەوەندەش بە لاوازییەکانت ئاشنا دەبن. گەر بمانەوێت سەربکەوین دەبێت هێزی راستەقینەی خۆمان بشارینەوە، واز لە رامیاری ئاشکرا بێنین. دەبێت دوو دژایەتی کۆکەینەوە؛ وەک ژوژک لە ترسانا بچینەوە ناو خۆمان، لە کاتی پێویستیش وەک پڵینگ هێرش بەرین.
سامان گوتی :
ـ کاک ئازاد دەترسم پێش ئەوەی بچینەوە ناو خۆمان سەرمان بپەڕێنن.
ئازاد گوتی :
ـ لە سەرپەڕین مەترسە لەوەی بەسەرمان هاتووە خراپترمان بەسەر نایێت. مرۆڤی بێ چارە دەبێ وەک رێوی بێت چونکە ئازایەتی لایەنێکی شارراوەی بێ هێزییە. لە مێژ بوو دەبوایە ئازایەتییە کەونەکەی خۆمان بدەینە دەست مێژوو. ئیمڕۆکە باوی ئازایەتی جاری جاران نەماوە، کێ دەتوانێت بەرامبەر چەکی کیمیاوی و ناوکی بجەنگێ؟ تەنانەت زلهێزەکان کە خاوەنی ئەم چەکەن زراویان لێی دەچێت. نەتەوەی ژێردەست کە بێ هێز و بێ توانایە، هیچی نییە لە دەستی بدات، بۆیە جەنگاوەر و ئازایە. هەر بۆیەش بە ئازایەتی سەرناکەوین.
سامان گوتی :
ـ بە قسەی تۆ بێت پرۆلیتاریا هەرگیز دەسەڵاتی ناکەوێتە دەست. بە گوێرەی ئەم قسانە ئەو کوردانەی هاتنە ئەوروپا و بوون بە خاوەن بەرژەوەندی، ئەم بەرژەوەندییە ئازایەتی جارانیان لەناو دەبات. بۆیە کوردەکانی ئەوروپا

بوونەتە پەڕۆک، بەڵام چ پەڕۆکێک زلهێزەکان کوردستان نەبێت هیچ شوێنێکی تریان پێ پاک ناکەنەوە.
سکاڵا بەرامبەر بە پێشمەرگەیەکی ئازا و کەون پێی شەرم بوو باسی ئازایەتی بکات، بۆیە گوتی :
- کاک سامان تێنەگەیشتم ئایا لە ئەوروپا دەتوانین بەرەیێکی جەنگاوەر دژی تورکیا بکەینەوە؟ گریمان پێمانکرا بەرەیەکی وا بکەینەوە تا چەند دەتوانین خۆمان بە پەنهانی راگرین؟ وەک خۆت دەڵێیت دەوڵەتەکانی ئەوروپا دۆستی کورد نین. جا تۆ لەو بڕوایە دانیت کە بە دوو رۆژ تەفر و توناممان ناکەن؟ هەر تۆزێک بیر بکەینەوە هەموو کوردەکانی پاریس بە کوردەکانی باکورەوە چل ماڵ نابن، با خۆمان لە گێلی نەدەین فەڕەنسا ناتوانێت هەر ماڵەی سیخوڕێکی لە بەر دەگا دانێت. ئەی ناتوانێت گوێی لە تەلیفۆنەکانمان بێت؟ گەر پێت ناخۆش نەبێت شتێکت بۆ دەگێڕمەوە، "رۆژێک رێوی سەیری کرد شێر چۆن راو دەکات، مام رێوی هاتەوە لای دۆستکانی خۆی و گوتی من بووم بە شێر، وەرن سەیرم کەن چۆن راو دەکەم. دۆستەکانی بردە سەر رێگایەک، کاروانێک لەم کاتەدا بەرەو رێویەکان دەهات. مام رێوی بە دۆستەکانی گوت سەیر کەن مووەکانم گڤ بۆنەتەوە؟ گوتیان بەڵێ، گوتی، چاوم سووربووەتەوە؟ گوتیان بەڵێ، خۆی فڕێدا سەر پشتی کەرێک و ددانی لە چواڵی هەنار گیربوو... وای لێی گیر بوو هەرچەند خۆی هێنا و برد پێی نەکرا خۆی لە چواڵ رزگار بکات. تا کاروانچی هەستی پێکرد و بە دار کەوتە سەری تا گیانی لەدەست دا". جا تکاتان لێ دەکەم حکومەتە ساواکەمان بە دەردی مام رێوی مەبەن. براینە لە ئەوروپاش ئێمە توانای ئەم زلهێزانەمان نییە با رێوی بین با زیرەک بین، بەڵام بە دەردی رێوی بە شێرچوو نەچین.
کاک سامان بە سەر سوڕمانێکەوە گوتی :
- سکاڵا خان نابێت وا بەسادەیی لە شتەکان بگەین. بڕواتبێت گەر هێرش نەبەینە سەریان ئەوان فرسەت دەبێنن تا لەنکاوێک هێرشمان بێننە سەر.
ئازاد گوتی :

ـ نابێت چیتر سادە و ساکاربین. دەبێت چاوەڕێی هەل و مەرج کەین و بزانین چۆن بیانقۆزینەوە. پێویستە شتێکی گرنگ هەرگیز لەیاد نەکەین کە ئەویش هیچ هێزێک بێ لاوازی نابێت. ئێمە پێش هەموو شتێک دەبێت خۆمان رابێنین چۆن لاوازیی دوژمنانمان بدۆزینەوە. دەبێت هەموو کاتێک ئامادەبین، هێزی دوژمن بە هەند بزانین و وەک راوکەریش لە لاوازییەکانیان بگەڕێین. بەڵام لە کاتی خۆ ئامادەکردنا بە گوێرەی هەل و مەرج دەبێت نەقیزەیان لێدەین تا هێزی خۆیان پیشان بدەن. ئێمەش لەم کاتەدا لە لاوازییەکانیان بگەڕێین و بکۆڵینەوە، تا تێک و پێکیان دەشکێنین. هەموو کاتێک دوژمن شوێنە لاوازەکانی خۆی وەک شوێنی بەهێز نیشان دەدات، بۆ نموونە وەک پۆلیسی سەر شەقامەکان و فیتە فیتی دەنگی ئۆتۆمۆبیلی یاساوڵ.

تەنیا سەیرێکی ئازادی کرد و گوتی :

ـ دەتوانم قسەیەک بکەم. پاش ئەوەی هەموویان بێدەنگ بوون گوتی، کاک ئازاد کێ ناڵێ ئەو قەسپەی ئێمە دەیخۆین ناوکەکەی لە باخەڵی ئەوان دانییە؟ داوای لێبووردن دەکەم سیاسەت فلیمە کارتۆنیکانی مشک و پشیلە نییە. بە رواڵەت ئەوان هێرش دەکەن و دەست لە کار و باری ناو خۆی کوردستان وەردەدەن، دەبێ بۆ ئەوەیان نەبێت نەقیزەمان تێوەژێنن. تا بزانن لاوازیمان لە کوێیە؟ من لە گەڵ سکاڵا خانیش نیم پەیوەندی ئابووریمان لەگەڵیان ببڕین تا مل کەچیان کەین لە گەڵمان بێن، چونکە بۆی هەیە ئەم کردارە وەک زەنگەسورە هاریان بکات. بە پێچیوانەوە دەبێت گۆشتیان لە لایێک بۆ دانێین کە هیچ کارمان بەولا دا نەبێت تا هەموویان بەولادا بچن خۆشمان لە لایێکی تر کاری خۆمان بکەین.

ـ سکاڵا گوتی :

ـ من وەک ژنێک هەرگیز لە گەڵ ئەوە دا نیم کە ئێمە دەست بوەشێنین، دەستوەشاندن واتای سەرەتای جەنگە و دەسپێکی نەمانی وت و وێژە.

ـ سکاڵا خان ئەم خەون و خەیاڵە لە مێشکی خۆتا دەرکە دوژمن هەرگیز بە وت و وێژ کوردستانت ناداتە دەست و پێت ناڵێ تۆ کچی چاکیت فەرموو کوردستانی خۆت بەڕێوە ببە. بڕواتان بێت هیچ وت و وێژێک نامانگەیەنێتە

ئامانج، کورد گۆتەنی "مست لە درێشە دەگەڕێتەوە." گەر وەک ژوژک بین کە دەچینەوە ناو خۆمانیش هەموو لەشمان درێشە بێت کەس نەوێرێت دەستمان لێ بووەشێنێت ئەگەر بۆشمان رەخسا وەک پڵینگ پشتیان بشکێنین و لەناویان ببەین. بەم شێوەیە کوردستان نە ئازادەبێت نە پێشدەکەوێت، بەڵکو لە شوێنی خۆی هەڵدەپەڕێت.

- کاک سامان ئەگەر بە قسەی تۆبێت، جەنگ کۆتایی نایەت و مرۆڤایەتی بەرەو نەمان دەبات. بە پێچەوانەوە مرۆڤ دەبێت جەنگ لە بیرخۆی باتەوە، بیر و ئەندێشەیەکی بێ ئاژاوە بێنینە ئاراوە. بۆیە بە بڕوای من بیر و ئەندێشەی جیاواز لە ململانێەکی نەسرەو دان، گەر رێگایەک بدۆزینەوە ئەم بیر و باوەڕانە لێک نزیک کەینەوە، ئەوا پاڵێکی دورخایەن بە جەنگەوە دەنێین و دەتوانین بە ئاشتیانە پێکەوە بژین.
سامان گوتی :
- کچینە هەموو ئاژەڵەکان لە جەنگدان، هەر لە گۆشت خۆریانەوە تا گیا خۆریان. بڕوام پێ بکەن هەرگیز بڕوا بە نزیک بوونەوەی بیر و باوەڕ مەکەن. "چونکە نزیک ترین کەس دوورترین کەسە لێتان،" بۆ نمونە پارتییەک دەبێت بە دوو بەش و لێک جیا دەبنەوە، بە هەر دوو بەشی پارتییەکەوە دوژمنی سەرەکی خۆیان لە یاد دەکەن و یەک لە دژی یەک دەکەونە جەنگ، با زۆر دوور نەڕۆین پارتی و یەکێتی. بۆیە هەڵگری هەمان بیر و باوەڕیش ناتوانن پاڵێکی دوورخایەن بە جەنگەوە بنێن. لە کۆتایی دا ئێمەی کورد هێرشمان نەکردۆتە سەر کەس، بۆیە هەر چواردەورەمان هێرشمان دێننە سەر. بەداخەوەم کورد وەک ئاژەڵی گیا خۆری دارستانی بەسەرهاتووە، هەموو دڕندەکان هێرشی دێننە سەر و ئەویش هەردەم لە ڕابەرێک دەگەڕێت، ڕێگای هەڵاتنی پیشان بدات. بۆیە سەرۆکەکانمان هەردەم شەڕە قۆچیانە. ئەگەر قسەی من راستنەبووایە ئەم پەندەش نەدەووترا "سەری دوو بەران لە مەنجەڵێک دا ناکوڵێ"
سکاڵا قسەی بە سامان بڕی و گوت :

- جەنگی ئاژەڵ جەنگێکی کاتییە و هەموو کاتێک بە یەک شێوە دەست پێدەکا و بە هەمان شێوەش کۆتایی دێت، و لە پێناوی مان و نەمانە. ئەم جەنگە جەنگێکی بێ کینە و بێ چەکە، گەر مرۆڤیش چەکی پێنەبێت جەنگەکەی ئەوەندە وێرانکەر نابێت.
- بە بڕوای تۆ جەنگی مرۆڤ کینەی تێدایە؟ هەر بۆ زانیاری بە یادت دا دێنمەوە، دۆستی هەتا هەتا و دوژمنی هەتا هەتا لە رامیاری دا نییە. دۆستایەتی و کینە لە نێوانی ئەم دوو هەتا هەتایە دان، وەک رۆژ و شەو جێگا بە یەکتر لەق دەکەن.

لەم کاتەدا شیرین خان لە دەرگەی دا، هەموویان بێ دەنگ بوون. تەنیا کە لە گشتیان بچووکتر بوو، بە لەشێکی سووکی ئەوتۆ لەشوێنی خۆی هەڵسا کەس هەستی پێنەکرد، چۆن گەیشتە لای دەرگا و دەرگای کردەوە و دەستی شیرین خانی گرت و هێنایە ژوورەوە. شیرین چ شیرین ئەوەندە جوان و شیرین زمان بوو لەگەڵ ژەهری مارا دەخورا.
ئازاد گوتی :
- یاخوا بەخێر بێیت، تا دانیشتنەکە خۆش بکات وتی دەڵێن کە شێخ سمایل تۆی دیت زیکری بەتاڵ کرد و گوتی ئەم ئافەیە دەرکەن دەنا زیکرم پێ ناکرێ. شیرین گوتی دەک سەر و گێلاکی یا شێخ خواتەوە، هەر لە بەیانییەوە بە جوانی خودای هەڵدەدا، کە منی دیت جوانی خودای لە یاد کرد و فەرمووی ئەم سەرقۆتە لێرە دورکەنەوە.
سامان بەخێرهاتنی شیرینی کرد و گوتی تۆ زیکرت بە شێخ بەتاڵ کرد بەڵام سیاسەت بە ئێمە بەتاڵ ناکەیت.
شیرین پێکەنی :
- کاک سامان من هەر بە کوردایەتییەوە جوانم و کوردایەتیش سیاسەتە. وا دیارە کاک سامانیش جڵەوکێشی ئەم هاوکێشەیە چونکە بێ کوردایەتی هەڵناکات. وەک دەبینیت بێ من سیاسەتتان بەتاڵە.
سامان پێکەنی گوتی :

- بەخوا کەس لە زمانی ئێوە رزگاری نابێت. دەبا دەست بە سیاسەت کەین تا لەدەست جوانیت رزگارمان بێت، و هەست بە لاوازیمان نەکەیت.
ئازاد گوتی :
- کاک سامان دەمویست پشت بە تۆ ببەستم سەد خۆزیا بە شێخ سمایل هەرنەبێت ئەو دەستی لە خۆشترین شتی ژیانی خۆی بەردا و خۆی لە خۆی یاخی بوو، بەڵام تۆ خۆت بە سیاسەتەوە خەریک دەکەیت تا خۆت لە راستی بشاریتەوە.
سامان گوتی :
- من دەمویست لاوازی خۆم بەرامبەر جوانی شیرین خان بشارمەوە، بۆیە ویستم زوو بەرەو سیاسەت بتانبەمەوە.
تەنیا هەستی کرد لە هەموو لایەکەوە کاک سامانیان گەمارۆ داوە، بۆیە لە چارەسەرێک دەگەڕا تا سامان لەم داوە ئازاد بکات.
- کاک سامان تۆ دەڵێیت بێ جەنگ هیچمان بۆ ناکرێت، گەر بەهەڵەدا نەچم جەنگ پێویستی بە چەکە و چەک هەر لە لای دوژمنانمان وە دەست دەکەوێت. تۆ لەو بڕوایە دا نیت هەرگیز ئەوەندەمان چەک نابێت تا بەسەر چەکی ئەوان دا زاڵبین؟ گەر بەم شێوەیەبێت وەک گیسکەکەی هەیاسمان لێدێت نە لاواز و نە قەڵەو دەبین. لە رووالەت دا وەک خۆمان دەمێنینەوە، بەڵام وەرە سەیری دەروونی دایکێکی جگەرسوتاو بکە. دوور مەڕۆ، وەرە سەیری دەروونی من و دەروونی تەزرەی خوشکت بکە ئینجا وەرە باسی جەنگمان بۆ بکە. من تاوەکو ئێستاش وشەکانی دایکم "کچم بە ئیزنی خوا بەیانی یەکتر دەبینینەوە" لە گوێمدا دەزرینگێنەوە وا بزانم تا دوا هەناسەشم ئەوە جوانترین وشەی ژیانم دەبێت. لە لای من هەموو شاعیرانی دونیا کۆکەیتەوە ناتوانن رستەیەک لەم رستەیە جوانتر بهۆننەوە.
سامان بە چاوێکی پڕ لە ئەستەمەوە سەیری گشتیانی کرد و گوتی :
- ئاخ کچینە ئێوە لاتان وایە کە من ئاشتیم خۆشناوێت و عاشقی شەڕم؟ سوێندم بە دوا نیگای دایکم کە هەموو کاتێک وەک باڵی پەری بە سەرم دادێ و بە سۆزی دایکانەوە دەستی بەسەرم دادێنێ و هانم دەدات هەموو ژنێکم

خۆشبوێت و تەزرەش هەموو منالێکم لا خۆشەویست دەکات. بەڕاستیتان پێدەڵێم سەیری لەشم کەن بە دەیان گوللەی دوژمنی پێوەیە. لە تەمەنما نەترساوم بە گوللەیەک بگەڕێمەوە باوەشی دایکم، بەڵام هەموو کاتێک کە زامدار دەبووم و دەکەوتمە سەر مردن، تەزرە بە ئەسپێکی سپی دەهات و دەیگوت کاکە هەر تۆم هەیە بە تەنیا لەم ژیانە جێم مەهێلە. بۆیە هەموو کاتێک من بۆ کورد دەمردم و دەمرم بەڵام بۆ تەزرەی بچکۆلانە و بریندار دەژیم. من کە بووم بە پێشمەرگە کوردایەتی من لە سنووری گوندەکەی خۆم زیاتر تێپەڕی نە دەکرد. کوردایەتیم لە تۆڵەی دایکم و جوامێر و کەس و کارم زیاتر نە بوو. ئێستە دەریای خوێنی نێوان من و دوژمنانی کورد سنووری گوندەکەمانی بەزاند گەورە بوو تا لە ئاراراتەوە گەیشتە کەنداو، بەم شێوەیە ئەم ناوچەیە هەمووی بە گوندە بچووکەکەی خۆم دەزانم. من دایکی کەسیانم نەکوشتووە، وڵاتی کەسم داگیر نەکردووە، گوللەم بە هیچ کەسێکی بێتاوانەوە نەناوە، ئینجا بە چ مافێک پێمدەڵێن تۆ شەڕت دەوێ. من واز لە هەموو قسەکانی خۆم دێنم گەر مرۆڤایەتی واتە با بڵێین نەتەوە یەککگرتووەکان دان بە مافی ڕەوای کوردا بنێن.

شیرین گوتی :

ـ کوا نەتەوە یەککگرتووەکان نوێنەری مرۆڤایەتین، دەتانەوێت رێز لەم نوێنەرە پەڕپوتانەنێن. ئەوانە هەردەم خۆیان پیشان دەدەن کە بەدوای ڕەوا دا وێڵن و مافی نەتەوەکان دەچەسپێنن. لە راستی دا ئەم پەڕپوتانە لە دوای ڕێکایەک، ساختەیەک یان چارەسەرییەک دەگەڕێن بۆ پاککردنەوەی کارە ناپەسندەکانی ئیمپریالیزم. لە راستی دا ئەم داردەستانە گەورەترین دڕندەی سەر رووی زەمینن. هیچ دڕندەیەک ئەوەندەی ئیمپریالیزم زەمینی کاول نەکردووە. ئەوا وتەی پیرۆزی زەردەشت بۆی هەیە بێتە دی کە دەفەرمووێ دۆزەخ لە سەر ڕووی زەمین هەڵدەگیرسێ. ئەوا هێدی هێدی مرۆڤ سەر رووی زەمین گەرم دەکات. تا ڕۆژێک دێت مرۆڤایەتی لەسەر رووی زەمین بە دەستی خۆی، خۆی هەڵدەپروکێنێ. بە راستی ئەم پاکانەیەش باوی نەماوە، کە گوایە هەموو دەوڵەتە ئەوروپییەکان خراپ نین، ئەوە هەندێک دەوڵەت یان هەندێک

سیاسەتمەداری ئەورووپایین کە کرداری ناپەسند دەکەن. هەر وەک چۆن لە فلیمە کاوبۆییەکانی ئەمریکی، پاڵەوانی فلیمەکە موو زەردێکی چاو شینی باڵا بەرزە کە هیندییە سوورەکان دەپارێزێت. ئەم چاو شینە باڵا بەرزە پاکانە بۆ نەژادی سپی دەکات، کە گوایە نەژادی سپی بێبەرییە لە خوێنی هیندییە سوورەکان. بە هەمان شێوەش دەوڵەتە ئەورووپییەکان کوردستانیان بەسەر خۆیان دا بەش کرد و لکاندیان بەسەر عێراق و سوریا و تورکیا و ئێرانەوە، ئینجا بە دەستی ئەوانەش قڕمان دەکەن و وەک فلیمە ئەمریکییەکان چەند پیاوێکی خۆشیان هەڵدەبژێرن تا بەرگریمان لیَ بکەن. ئینجا خوا دەزانیَ کەی بەدەردی هیندییە سوورەکان دەچین. ئەوساکە ناوی کوردیش لە مێژوو دا دەبێت بە ڕووداوێک لە ڕووداوەکان. ئینجا بە تێگەیشتنی ئەو سەردەمەی کە باسی ئەو مێژووە دەکەن، ڕوودانی لەناوبردنی کورد شیدەکەنەوە.
سکاڵا گووتی :
- بێگومان مرۆڤ بە گشتی ڕووداو دەخاتە نێوان هۆش و ڕەوشتی ئەو سەردەمەی کە ڕووداوەکە تێیدا ڕوو دەدات. هەمان کردار لە سەردەمێکەوە بۆ سەردەمێکی تر هەمان ڕاڤەی نادەینیَ و بە هەمان شێوە دادگەیی ناکەین. بۆی هەیە ناوی ئەو کورد کوژە بکەوێتە تەک ئەم پیاو کوژانەی کە نەتەوەکانیان شانازییان پێوە دەکەن، بۆ نموونە بیسمارک، ناپلیۆن، سەلاحەددینی ئەیوبی، کوتوزۆڤ، ریشارد دڵ شێر، جەنگیزخان... هتد.
شیرین گوتی :
-من نامەوێت هیچ پیاوێک تاوان بار بکەم، بەڵام لایەنە کۆمڵایەتییەکەی مرۆڤایەتیش لە مێژووی ئەم کەڵە پیاوانە سپیتر نییە. کۆمەڵگای ئێمە کۆمەڵگایەکە، گەر ژنێک هەڵەیەک بکات هەرگیز لێی نابورێت، بەڵام ڕێگای لێبووردن بۆ پیاوان کراوەتەوە. هە پیاوێکیش بەرامبەر بە ژن (هیتلەر و تەیمورخان و سێزار)ێکە. جا نازانم تۆ باسی کام مرۆڤایەتیم بۆ دەکەیت؟ هاتەوە یادم تۆ باسی نەتەوە یەکگرتووەکانت دەکرد، با سەیرێکی ئەمەشیان بکەین تورکیا بزوتنەوەی کورد لە پێناوی ئازادیی کوردستان بە بزوتنەوەیەکی تیرۆریستی لە قەڵەم دەدات. ئینجا نەتەوە .یەکگرتووەکانیش

وەک قەلەرەش بنێشتی دوژمنانمان دەجوونەوە، وەک ئەوان دەقیرێنن. تۆش تاوەکو ئێستا بە قیرەی قەلەڕەشەکان هەڵدەپەڕیت، واتا ئیمان بە نەتەوە یەکگرتووەکان دێنی؟

ـ ئەی چی بکەین هەر ئەوەمان لەدەستە. "سامان گوتی"

شیرین گووتی :

ـ هەر کۆمەڵگایەک بیەوێت پێشکەوێت پێویستە گەشە بە بەڕێوەبردنی خۆی بدات، گەر مرۆڤایەتیش بیەوێت پێشکەوێت لە جیاتی نەتەوە کارتۆنییەکانی پێکەوە لکاو واتە نەتەوە یەکگرتووەکان دەبێت هەر نەتەوەیەک هەر میلەتەک نوێنەری خۆیان هەڵبژێرن و پەرلمانێکی جیهانی پێکبێنن، تا سەرپەرشتی گیر و گرفتەکانی مرۆڤایەتی بکەن.

زەنگی تەلیفۆن لێیدا گشت بێ دەنگ بوون. ئازاد تەلیفۆنەکەی هەڵگرت لە سەرەخۆ گوتی، oui je vous écoutes.

ـ رۆژ باش کاک ئازاد، من سەپانم، هیوادارم کە سەخڵەتم نەکردبن، بە یارمەتیت گەر تەنیا خان لە ماڵ بێت و ڕێگام بدەیت پێمخۆشە لەگەڵ تەنیا خانا بدوێم. تا بزانم چی کردووە، و بە تەمای چییە؟

ـ تەنیا خان ئەوە سەپانە، وا دیارە کارێکی پێت هەیە. تەنیا یەکسەر هەڵسا و چووە ئاشپەزخانەکە و تەلیفۆنەکەی هەڵگرت :

ـ بەڵێ کاک سەپان.

سەپان زمانی کراوە. تەنیا گوڵە جوانەکەی پاریس، زاری بەڵێت خۆشبێت تەنیا خان. تەنیا خان دوێنێکە درەنگ یەکترمان دیت، دەمویست پێتبڵێم چیت کردووە و چیت ئامادە کردووە بۆ ئەوەی لە فەرەنسا بمێنیتەوە. یان خوانەخواستە بە تەما نیت بچیت بۆ وڵاتێکی تر و بەجێمان بێلیت تەنیامان بکەیت.

تەنیا لە وەڵام دا گوتی :

ـ کاک سەپان من لە ژیانم دا هەر تەنها بوومە و لەم غەریبایەتییەش ئەوەندەی تر هەست بە تەنیایی دەکەم.

سەپان ئەم قسەیەی بە هەل زانی :

ـ تەنیا خان بەڕاستی لەم غەریبایەتییە هەست پێ دەکەم کە تۆ بێ هاوتایت و وەک ناوەکەشت تەنیایت، بەڵام تا من هەبم ناهێڵم تۆ تەنیا بیت. زۆرم پێ خۆشە تۆزێک پاریست پیشاندەم تا غەم و پەژارەی دڵت لە یاد کەیت.
تەنیا بە سەرسورمانێکەوە گوتی :
ـ من گەر بتوانم پەژارەی خۆم لە یادکەم، کە وابێت من هەر ناوم دەمێنێتەوە تەنیا، بەڵام من نە تاکم و نە تەنیام. وەک هەرکەسێکم لێدێت کە پەژارەی منی لە دڵدا نەبێت. کەسیش پەژارەی منی لە دڵدا نییە.
ـ تەنیا خان من دەمەوێ تۆ تاک بمێنیتەوە، بەڵام تەنیا نەبیت. خۆت لە نێو چوار دیوار دا بەند نەکەیت. تاوەکو بەند نەبیت، پێویستیت بە ویست هەیە، ویستیش بێ یەکەم هەنگاو هەر وەک ئاواتێک دەمێنێتەوە و بەس. هەردەمەوێت تۆزێک دونیات پیشاندەم. بەڕاستی تەنیا خان کە ئێمە گەشتینە فەرەنسا کەس نەبوو شوێنێکمان پیشاندات، هەمووی خۆمان بە کاوەخۆ شارەزایان دەبووین. هەرجارەی کە شوێنێکی نوێمان دەدۆزیەوە گەلێکمان غەم دەخوارد دەمانگوت چۆن تاوەکو ئێستە ئێرەمان پێنەزانیوە؟ هەر لەبەر ئەوەشە بە پەرۆشەوەم ئەم شوێنانەت پیشان بدەم. ئەگەر لە نێو چوار دیواردا دانیشیت جیاوازی ئێرە و ئەو لا چییە؟ من و چێنەر پێمان خۆش بوو کێسێکت بۆ ئامادە بکەین، تا مافی مانەوەت لەسەر خاکی فەرەنسا بدەنێ. نازانم هیچت ئامادە کردووە؟
ـ کاک سەپان زۆر سوپاست دەکەم چونکە پەیمانگای کورد لە پاریس(Instiut Kurde de Paris) گوتیان بۆ نووسینی کێسەکەم یارمەتیم دەدەن. خۆ ئەوانیش پسپۆڕی باشیان هەیە. ئەگەر بتوانیت لەگەڵم بێیت بۆ پەیمانگای کورد ئەوە کارێکی باشە و زۆر سوپاسیشت دەکەم.
سەپان هەستی بەوە دەکرد هێدی هێدی ئەوا دەستی لە نێچیرەکەی گیردەبێ، بۆیە ئیتر سەلیقەی قسەکردنی کراوە، لە خاڵە بێ هێزەکانی تەنیا دەگەڕا. بەسەر هەردوو چاو تەنیا خان، ئینجا گەر پێتخۆشبێت بەیانی پێشی نیوەڕۆ دەچینە ئەنیستیتوی کورد. باشتر وایە سەعات ١٠ وەرە خوارەوە لە بەر

دەرگای ماڵی کاک ئازاد چاوەڕێت دەکەم. تەنیا سوپاسی کرد و گوتی باشە تا بەیانی.

****

سەپان نەیدەویست تەلیفۆنەکەی داخات بەڵام ناچار بوو. هاواری کرد : کوڕە چێنەر وابزانم پێوە بوو. زۆر باشیش پێوەدەبێت ئەگەر بتوانین لە ماڵی ئەو ئازادە شۆرشگێڕە مارکیسییە پیسە دووری کەینەوە، بە کوێرایی چاوی ئازاد و پێشمەرگە بەزیوەکەی برادەری کە بە فیڵی خوشکە بچکۆلانەکەی مەیدانی خەباتی جێهێشتووە و لەسەر شەقامەکانی پاریس شان بادەدات و لاف بە ڕابردووە درۆکەی خۆیەوە لێدەدات. ئەی سکاڵا خان بووکە شووشەکەی ئازاد، ئەشەد ما بیلا جێگای جامخانەکانی هۆڵەندایە سەد یۆرۆی بخەیتە ناو دەمی و دەمی داخەی. کوڕە چێنەر بە خوا ئەگەر تەنیای لێ دوورنەکەینەوە ئەوا ئەم کەرویشکەشمان لێ دەبێتە دڕندە. کوڕە پێرانەگەین ئەم نێچیرەشمان لەدەست دەچێت. چێنەر ئەگەر وەک دامناوە بڕوات تەنیا خان بەشی من و تۆ و نیوەی پاریسیش دەکات. سەپان دێتە یادت بە منداڵی مامۆستا دەیگوت وێنەیێکم بۆ بکێشن ئێمەش یەکسەر دوو شاخمان دەکرد و رۆژێکمان لە ناوەندی شاخەکان دادەنا و چەمێکیشمان لە ناوەندی ڕەسم دەکرد.
سەپان قسەی پێبڕی :
- ئینجا ئەوەت بۆ بەیاد داهاتەوە چ پەیوەندیەکی بە باسەکەمانەوە هەیە؟
چێنەر پێکەنی :
- بێنە بەر چاوی خۆت گەر نوینە سپییەکانی خۆت بە پەڕێکی سپی دانێیت و تەنیای بە ڕووتی لەسەر درێژ کەیت جووتە مەمکەکانی دەبن بە دوو شاخەکە و دەموو چاوی وەک ڕۆژ لە نێوانیاندا هەڵدێ و تۆزێک شەمپانیاش بەسەر چیاکانی دا بیارێنیت ئەوا وێنەی چەمەکەی منداڵیشت دێتە وە دی.
سەپان بە سەر سوڕمانێکەوە سەری بادا و دەستی بەرز کردەوە و گوتی : - بەڕاستی تۆ وێنەکێش و شاعیریت، بەرامبەر بە بەهرەی تۆ زمانم لاڵ دەبێ.
ئینجا هەردووک لە قاقای پێکەنینیان دا.

****

جاریٚ تەنیا لە ئاشپەزخانەکە راوەستابوو کە سکالاٚ هاتە ژوورەوە و دەستی تەنیای گرت و گوتی :

ـ تەنیاگیان لەم هەرزەکارانە خۆت نزیک نەکەیتەوە، چونکە لای ئەوانە ژن هەر ژێرناوکە و لە ژێر ناوک بەولاوە هیچ بایەخێکی تری نییە. ئەوانە بێ ئامانج و تەنیا بۆ سەیر کردن و قسە کردن سەیری ژن ناکەن. ئەگەر سەیریان کردیت هەرگیز سەیری نێو چاویان مەکە. جاریٚ تۆ لە تەمەنێکی ناسک دایت دەترسم لە ئامانجیان نەگەیت و هەموو پیاوێکت لەبەر چاو بکەوێت و وا تێبگەیت هەموو پیاوان بەرامبەر بە ژن هەمان ئامانجیان هەیە.

بڕوا بکە گەر پێت بڵێم زۆرینەی پیاو گەر بۆیان بلوێت پێیان خۆشە ژێر کراسی ژنان ببینن. گەر هەڵێکیان دەستکەوێت دەستکاریشی دەکەن. پێم خۆشە بزانیت ئەم دیاردەیە هەموو پیاوێک دەگرێتەوە. جا کە پیاو سەیریان کردی خۆت گرانکە، ئەم خۆ گرانکردنە پێی دەڵێین شەرم سەنگێک دەدات بە مێینەیی ژنان . گەر ئەم شەرمە لەدەستدەین ئەستەمە بە ئاسانی لە مەرامیان بگەین. من دەڵێم گشتیان یەک خواستیان هەیە، ئەویش ببینن و ئەگەر ڕێککەوت بیگەنیٚ. لە سروشت دا ئەم ویستە لە دەروونی هەموو پیاوێک دا هەیە. بەڵام ڕێژەی بەر جەستە کردنی دەمێنێتەوە سەر کەسایەتی پیاوەکە. هەر پیاوێک تا پلەیەک لە توانای دایە سەرپەرشتی ئەم ویستە سروشتییە بکات و لە گەڵ چواردەوری خۆی بیگونجێنیٚ، ئەوەش لە زۆر لاوە پەیوەندارە بە مێینەیی ژنان و داب و نەریتەوە، پەیوەندییەکی گرنگیشی بە بار و دۆخی کۆمەڵایەتییەوە هەیە. بۆیە ئەم خواستە خواستێکی گڵاو نییە. هەر وەک خواستی ئێمە وایە کە دەمانەویٚ هەر پیاوێک چاوی پێمانبکەوێت، سەیرمان بکات و ئێمەی لا جوانبێت. ئەگەر هەر پیاوێک شتێکی لە ئێمە بە دڵ بوو ئێمەش دامانە دەستییەوە، ئەوا ئێمە و خواستەکەمان گڵاودەبین. ئەو پیاوانەش گڵاون کە لە ژێر ناوک بەولاوە هیچ بایەخێکی تر بە ژنان نادەن. ئەو ژنانەش بەدفەڕن کە دەیانەویٚ بە لەش و لاری خۆیان پیاو بەرەو خۆیان ڕاکێشن تا بەسەر توخمی خۆیان دا زاڵبن. ئەم زاڵبونەش ژەهرێکی

کوشندەیە، هەر ژنیشە لە ژەهری ژن تێدەگات. وەک پێم گوتیت گەر سروشتی پیاو بەسەر دانایی پیاو دا زاڵ بوو، ئەوا ژەهری ژن کاریتێدەکات.
لەم کاتەدا ئازاد هاتە ژوورەوە و پێکەنی و گوتی کچێ تەنیا گوێ لە سکاڵا رامەگرە ئەوە خۆی بە ناز و فیزی خۆی دڵی پیاوان رادەکێشێ. بەڵام لەمن بەولاوە کەسی تر نە پێی رازی بووە و نە پێی رازی دەبێت. سکاڵا قسەی پێبڕی، دەی دەی "هەتا ئەز هەبووم وەبانانەوە، بەرتیلیان دەدا و دەشپاڕانەوە". ئینجا تۆ توخوا بە راستی بڵێ بڕوات بە خۆت کرد کە من دڵم پێت سووتا و پێت رازی بووم. لە سەر شەقامەکانا خۆت دەهێنا و دەبرد کە پێت رازی بووم ئێستاش دەڵێیت ئەوە "ئەزم لە بانان دەبەزم ». ئینجا ئێستا منت پیر کرد و دەڵێیت کەس پێی رازی نییە.
سکاڵا گیان دونیا وایە بۆخۆت هەر دەهۆڵ لێدە نان ئەو نانە ئیمڕۆ لە خوانە. دەبا دڵت داکەوێت هەر تۆ لەسەر خوانی منیت و هەر تۆش دەخۆم کەسی ترم ناوێت ئینجا دڵەکەت داکەوت.
سکاڵا بە پێکەنینە جوانەکەی خۆیەوە سەیری ئازادی کرد و گوتی :
- دەی دەی نان ئەو نانە ئیمڕۆ لە خوانە گەر دوو رۆژ لە خوانەکە دەربچم و چاوم دیار نابێ بزانم گۆشتی قەلەڕەشیش ناخۆی.
- سکاڵا گیان لێم تورە بوویت. کچێ کە سەرهەڵدەبڕم و دەتبینم رۆژێک لە نێو دڵم هەڵدێت، من کە کڕنوشت بۆ دەبەم وێنەکەت لە نێو چاو و دڵما دەهێڵمەوە، تا خۆری رووت ئاوا نەبێت. ئێستەش پەیمانە چاوەکانم هەڵنەهێنم. ئەم جارەیان تا بەدەستی خۆت سەرم بەرز نەکەیتەوە و سەیری نێو چاوم نەکەیت و نەڵێیت پەیمانە لە خوانی تۆ هەرگیز دەرناچم ئەم جارەیان لە نێو چەقی رێگا کڕنۆشێکم بۆت بردووە بەڵێنبێت تا پرشنگت جیهانم رەوشەن نەکاتەوە سەر هەڵنەبڕم.
سکاڵا سەری ئازادی هەڵبڕی و گوتی :
- کوڕە ئازاد شەرم ناکەیت ئەوە تۆ پیر بوویت واز لەم کارە ناپەسندانەی خۆت ناهێنی، من دەزانم تۆ وەستای رەوانبێژیت. دەنا بە جوانی خۆت کەی دەتتوانی کچێکی شۆخ و شەنگی وەک من بەند بکەیت. هەر لەبەر قسە

خۆشەکانت گەر ماڵی دونیا و دەسەڵاتم دەنێ ناتگۆڕمەوە. گیانەکەم سێ دەسکەوت کەس نەگەیشتۆتە لوتکەیان: دەسەڵات و پارە و ئەڤین؛ پارە دەتوانێ دەسەڵات بکڕێ، دەسەڵات دەتوانێ پارە پەیداکات، بەڵام هەردووک پێکەوە ناتوانن ئەڤین ملکەچ بکەن، ئازاد گیان ئاسوودەبە من مل کەچی تۆم. چۆن من لە نێو ژیاندا دەژیم، تۆش لە نێو دڵی من دا دەژییت. ئازاد سەری هەڵبڕی و رووی لە سکاڵا کرد و گوتی:

رۆژی شادیم هاتەوە

روو بە رووی تۆ بوومەوە

وا دەزانیت شەرمنم

چاوەکانم داخستووە

دیدەیی ئاسایبت دیوە

ڕوبەڕوی رۆژ بێتەوە؟

****

هەر لەو کاتەی سکالاّ و تەنیا و ئازاد خەریکی وت و ویژی خۆیان بوون. سامان سەیری نێو چاوی شیرینی کرد، دڵی کەوتە خورپە. لە دڵی خۆی دا دەیگوت خوایە من قەت بەم شێوەیە ئەم کچەم نەدی بوو. ئەم کچەماڵی ئەوەیە باسی دونیای لەگەڵ بکەی نەک باسی سیاسەت. ئەی ئەگەر باسی سیاسەتی بۆ نەکەم باسی چی بۆ بکەم؟ دونیا بێ سیاسەت چییە؟ ئەی لە چییەوە دەست پێ بکەم؟ بەڕاستی ئەگەر ئێستە جلی پێشمەرگەی لە بەر بوایە و خەریتەی لە شان بووایە چەند جوان دەبوو؟ نا ... نابێ وای پێ بڵێم، پێی دەڵێم جلی کوردی چەند جوانە ئێستە کۆڵوانەیەکت لە شان بووایە و ملوانکەیەکت لە مل بوایە چەند جوان دەبوویت. سامان هەر خەریک بوو، لە رستەیەک دەگەڕا بە شیرینی بڵێ. دەیگوت، نا یەکسەر پێی دەڵێم شیرین خان بەڕاستی تۆ کچێکی جوانیت، وا بزانم کەوتمە داوی ئەڤینت. تو خوا ئەمەش قسەیە، وابزانم ئەڤین نابێت بە قسە دەست پێ بکات، باشتر وایە یەکسەر بکەومە سەر ئەژنۆ و پێی بڵێم شیرین گیان خۆشمدەوێیت. ئەڤین وەک جەنگ وایە دەبێت یەکێک دەست بە تەقە بکات.

شیرین سەیری سامانی کرد و گوتی :

ـ کاک سامان ببورە وابزانم قسەکانی کە ئاراستەم کردیت گەلێ رەق بوون تۆ شایەستەی ئەوە نیت. بۆیە داوای لێبوردنت لێ دەکەم.

ـ بەڵێ دەبێت یەکێک دەست بە تەقە بکات. بە هۆش خۆی هاتەوە و پێکەنی نا... نا شیرین خان ببورە من لە خەیاڵ و ئەندێشەی خۆم دا بووم. دەزانم ئێوە لەمن زیاترتان خوێندووە من لە پێشمەرگایەتی چوموتە مەکتەب و فێری خوێندن و نووسین بووم. لە خوا و یەکێتی بەزیاد بێ ئێستە دەتوانم نامە بنوسم، رۆژنامەکانیش بخوێنمەوە، ناڵی و مەولەوی و حەمەدۆکیشم خوێندۆتەوە، کتێبێکم خوێندۆتەوە باسی جەنگی پێشمەرگەکانی ئەمریکای لاتینی دەکرد نازانم کێ نووسیویەتی.

شیرین گوتی :

ـ کتێبەکەی بورهان قانع نەبێت؟

- ئا... ئا خۆیەتی باوکی شیعری جوانی نووسیوە، دەڵێن کوڕە شاعیر دەبن بە شاعیر، نازانم بۆ بۆخۆی شیعر نانووسێ؟
- شەرت نییە گرنگ ئەوەیە دەنووسێ.
- شیرین خان وابزانم لەگەڵ تۆ فێری ڕەوشەنیریەکی باش دەبم. تۆ مامۆستایەکی بێ هاوتایت. دەڵێی چی لە بەیانیەوە هەندێک دەرسی زمانی فەڕەنسیم پێ بڵێیت با بچین بۆ سینەما و لە سینەماوە دەست پێ بکەین. کاک سامان فێربوونی زمان لە سینەماوە دەست پێناکات، بەڵکو لە ئەلف و بێوە دەست پێ دەکات. بەیانی وەرە لام پێکەوە دەچینە لای تەزرە و لەوێوە دەچینەوە ماڵەوە لە بەشی ناوخۆی دانیشتگا دەرسی یەکەم دەخوێنین.
ئازاد قسەی خۆی تەواو کرد. هەرسێک لە قاقای پێکەنینیان دا و هاواریان کرد بژی ئەڤین. سکاڵا سینییەک پەرداخی هێنا و تەنیاش سولاحییەکی پڕ لە خۆشاوی بەدەستەوە بوو لەدوای سکاڵا لە مەتبەخەکە هاتنە دەرەوە.
ئازادیش هاتە دەرەوە و گوتی :
- با ئەم بەسەرهاتە خۆشە وەک گوڵێک ئاو بدەین تا هەردەم سوور و جوان بێت. سامان گوتی :
- جارێ بەس بڕیارمان داوە زمان بخوێنین خۆ هیچ بڕیارێکی ترمان نەداوە تائێوە بیکەن بە ئاهەنگ.
تەنیا گوتی :
- بەخوا نازانین ئێوە بڕیاری چیتان داوە بەڵام کاک ئازاد و سکاڵا خان پەیمانی خۆشەویستییان نوێ کردەوە. بۆیە دەمانەوێ ئەم ڕووداوە شیرینە بە شەربەت ئاوبدەین. سامان وەک بڵێی جامێک ئاوی ساردیان پێداکردبێ وای لێ هات. نەیدەزانی چۆن خۆی لەم گرفتە ڕزگار بکات.
سامان گوتی :
- دەنا ئێمە بەتەمابووین بیکەین بە شەو، لە فەرەنسا کەس نازانێ کەی شەو دەستپێدەکات و کەی بەیانی دادێ.
ئازاد پێکەنی :

- دەبا لە فەرەنسە کار بکەیت خوا خوات دەبێت زووتر شەودابێت، تا تۆزێک ڕاکشێیت، وەک دەبینیت شەوەکە بەدەست خۆتە، بەڵام بەیانییەکەی هەر ئەوەندەی لە خەو هەڵسای ئیتر خۆت بە خاوەنی خۆت نازانی، هەر کردارێک دەبێت بە کات بپێویت. چونکە لە کاتی دەستپێکردنی کار دەبێت لە شوێنی کار ئامادەبیت. کەی لە وڵاتی سەرمایەداری کارت کرد ئەوساکە لەم گرفتە تێدەگەیت. خوا رەحمی کردووە بەیانی کار ناکەم، بۆیە بیر لە بەیانی ناکەمەوە.
شیرین بە پێکەنینەوە گوتی :
- ئەگەر بە شێوەیەکی دانایانە بیر بکەینەوە، هیچ پەیوەندیەک بێ بەرژەوەندی ناتوانێت زۆر بخایێنێت، چونکە سەرمایە هیچ سودێک بە کات ناگەیێنیت، بۆیە رۆژێک لە رۆژان کات بەسەر سەرمایەدا زاڵ دەبێت.
- سکاڵا گوتی :
- ڕاستە گەر دوو شت لە پێناوی ئامانجێک لە راژەی یەکتر نەبن یەکێکیان ئەوی تریان وەلاوە دەنێ.
- تەنیا دەستی لەسەر لێوی دانا و گوتی :
- ئەیەڕۆ...! ئەی کات لە پێناوی چی دا لە ئارادایە؟
- ئازاد سەیری شیرینی کرد و گوتی :
- کات پیوانەیەکە مرۆڤ دایناوە و چەند پیوانەیەکیشی بۆ داناوە تا بیپێون، بەم شێوەیە کاتژمێر لە پێناوی کات دا هاتۆتە کایەوە.
تەنیا گوتی :
- ئەی کاتژمێر چییە؟
شیرین گوتی :
- تەمەن خۆی کاتژمێرە بە کاتیش دەیپێوین. بۆ نمونە لێتدەپرسن چەند ساڵە ئەم سەعاتەی دەستت کڕیوە؟ تەمەنی بە ساڵ و ڕۆژ و سەعاتیش دەپێورێتەوە. کە وا بێت کاتمان لە پێناوی تەمەن دا هێناوەتە ئاراوە واتای تەمەن بە گشتی تەمەنی بەردێک، ئاژەڵێک، دارێک یان تەمەنی مرۆڤێکە.
زەنگی تەلیفۆن لێی دا، ئازاد تەلیفۆنەکەی هەڵگرت بەڵێ گیانە.

سکالاّ گوتی :
ـ کوڕە ئەوە چییە بە کوردی قسە دەکەیت. ئازادیش پێکەنی گوتی کچێ بەم شەوە کەی فەرنسی تەلیفۆن بۆ یەکتری دەکەن سەدی سەد کوردە. شەو باش چۆنی ئەبونە، مامە قەشە پێکەنی و گوتی تەماشای کاک ئازاد هەر قەشە و مەلا لە وەختی نا وەختا تەلیفۆن دەکەن خۆ سەخڵەتم نەکردن بەم شەوە تەلیفۆنتان بۆ دەکەم؟ نا، نا ئەوە باسی بوون و نە بوونی کات دەکەین، بەم شێوەیە درەنگ و زووش دەکەوێتە ناو باسەکەمان و دەبێتە بەشێک لە باسەکەمان. باوە قەشە گوتی هەندێک کورد لە بەر دەرگای کەنیسەی نۆتەردام مانیان لە خواردن گرتووە. بە پێویستی دەزانم کە هەموو کوردەکان بچن و پشتگیریان لێ بکەن دەنا پۆلیس بەتەمانە هێرشیان بکەنە سەر و لەوێ دووریان کەنەوە مانەکەیان پێبشکێنن.
ـ ئاگامان لێیە. زۆر سوپاست دەکەین. هەرچەندە ئەم کارە کارێکی هەڕەمەکییە، چەند خوێنگەرمێکن بەم کارە هەڵساون، بەلاّم ئێمە هەر پشتگیرییان لێدەکەین. دە فەرموو وەرە لامان گەورەمانکە.
ـ ئا... پێم نەگوتن لە دژی هێرشەکانی تورکیایە بۆ سەر کوردستانی عێراق.
ـ دەزانم،،، دەزانم.
ـ لە وەلاّمی پرسیارەکەشت دەربارەی کات پێت دەڵێم لە ئینجیلی پیرۆز دا دەفەرمووێ، تیشک ببە تیشک بوو، زەمین ببە زەمین بوو...هتد بەم شێوەیە کات لە لای پەروەردیگار لە ئارادا نییە. ڕاستت فەرموو باوە مامۆستاش هەموو جارێک دەڵێ خودا دەفەرموێ ببە، دەبێ واتا (کن فیکن). باشە کاک ئازاد ئەگەر پێتانبکرێت تەلیفۆنی هەندێک برادەری تر بکەن، منیش داوای لێبوردن دەکەم چەند تەلیفۆنێکی ترم بەدەستەوەیە و تا زۆر درەنگ نەبووە تەلیفۆنیان بۆ دەکەم، شەوتان باش.
شیرین لە ناو دڵی خۆی زۆر لە سامان تورە ببوو، بەلاّم بەسەر خۆی نەهێنا، وەک بڵێی هیچ شتێک روینەداوە و دڵی لە کەسیش نەڕەنجاوە رەفتاری دەکرد. رووی لە سامان کرد بێ ئەوەی کەس هەست پێبکات کە پەللار لە سامان دەدات درێژەی بە قسەکانی خۆی دا. سکالاّ خان مرۆڤی

ناتێگەیشتوو کاتێک پێش کاتێک دەخات وەک بەردی دامە بەردێک پێش بەردێک دەخات و ئۆینەکە دەدۆڕێنێت.
ئازاد گوتی :
- ئەوە چییە کاک سامان بۆچ وا داماویت؟
سامان وەک بلّێی ئاوێکی ساردی پێدابکەن سڕ بووبوو. هیچ وەلاّمێکی نەداوە، بەلاّم لە دلّی خۆیدا دەیگوت لای وابێت پێمخۆشە وا دابمێنم. خۆ ناشبێت بلّێم ناتوانم سەرم هەلّبڕم، دەترسم لە پەژارەی دەروونم بگەن. کەتنێکم نەکردووە خۆشبێتەوە. کردیان بە شەو، سامان و شیرین خوداحافیزییان کرد و رۆیشتن.

****

سکاڵا گوتی ئەریٚ ئازاد گیان پیٚمناڵێیت ئەم شیرینە رەفتار شیرینە کێیە؟ بەڕاستی برایەکم لە فەرەنسا هەبوایە نەمدەهێشت ئەم شیرینە ناسکە بە فیڕۆ بچێت. بەڵام چی بکەم دەستی شکاوم ئێستە کاکم لە بەندیخانە دەبیٚ چی بکات. خوشکت کوێربێت دەبیٚ دڵی چ خوادنێکی بوێت. دەبیٚ ئێستا ئەشکەنجەی نەدەن... ئیتر سکاڵا دەستی کرد بە گریان و ئازاد سەری سکاڵای لەسەر سینگی خۆی دانا و بە ئەسپایی دەستی بەسەری دادەهێنا تا خەم و پەژارەی لە بیرباتەوە. ئازاد دەیویست بابەتەکە بگۆڕێت بۆیە شانی هەڵتەکاند وەک بڵێی دەیویست سکاڵا بیٚ دارکاتەوە.

تەنیا خان دەڵێی جلی دونیا بۆ باڵای ئەم شیرینە دوورواون هەرچی لەبەری دەکات لێی دێت، ئینجا پیاو لێی تێکدەچێت نازانێت نە جلەکان جوانن نە شیرین بیٚ هاوتایە. وابزانم شیرین خۆی جلەکان جوان دەکات.

ئەگەر ئازاد سەیری ژنێکی کردبا یان باسی جوانی ژنێکی تری کردبا ئەوا سکاڵا زۆر پێی سەخڵەت دەبوو. بۆیە ئازاد بەم شێوەیە باسی شیرینی دەکرد تا سەرنجی سکاڵا بۆ لایێکی تر رابکێشیٚ. ئەم جارەشیان وەک هەموو جارەکانی دیکە سکاڵا پێوە بوو. یەکسەر سکاڵا سەری لەسەر شانی ئازاد لادا و بە توڕەییێکەوە سەیری ئازادی کرد و گوتی :

ـ ئینجا هەر ئەوە مابوو لەبەر چاوی من بەسەر بەژن و باڵای ژناندا هەڵبڵێیت. من باسی هەر ژنێک بکەم تۆ بە هەلی دەزانیت کوڵ و کۆی دڵت هەڵدەڕێژی و باسی جوانی ژنانم بۆ دەکەیت. ئەیەڕۆ خۆ ناوێرم باسی هیچ لای ئەم کابرایە بکەم، پیاو ئافریدەیەکی سەیرە ئەوەندەی پیرتر دەبێت بە هەمان رێژەش هەرزەکاری لەناخی دا سەر هەڵدەداتەوە. ئەم جارەیان، ئازاد دەیویست بار و دۆخەکە هێور کاتەوە، بۆیە سەری سکاڵای گرتەوە باوەش و خستەوە سەر شانی خۆی و گوتی :

ـ سکاڵا گیان بە خوا تۆ وەک ئەو رۆژەیت لە ناخم دا دەژیت. سکاڵا چەند شەو تاریک بێت ئەوەندە ئەستێرەکانی ئاسمان جواندەبن. بەڵام رووخساری وەک رۆژت لە جوانی ئاسمانی کردووم. باش دەزانم پاش هەڵبژاردنی پرشنگت دەبێت ئەستێرەکانی ئاسمان وەلاوەنێم.

تەنیا بێ ویستی خۆی هەرکە گەنجێکی بدیبا چاوەکانی پڕ لە ئاو دەبوون چونکە لە مێشکی خۆیدا دەیگوت ئەگەر حەمە مابێت بۆی هەیە هەر وەک ئەم لاوە بێت. هەردەنگێکی گڕی نێرینەی گوێ لێبوایە ئەوا دەیگوت ئەم دەنگە بەدەنگی باوکم دەچێ. زۆریشی پێخۆش بوو گوێ لە پیاوی لە خۆی بە تەمەنتر راگرێ. وای دەزانی پیاوی بەتەمەن هەرگیز هەڵە ناکەن، چونکە لە هەر پیاوێکی بەتەمەن پارێزەرێک و باوکێکی دەدیت. دەیگوت گەر باوکی منیش نەبێت خۆ باوکی کچێکی ترە. خۆ ئەم ئازادەش باوکی دوو منداڵە و هەر لە تەمەنی باوکمی ئەوساکەیە، بۆیە ئارەزووی ئەوەی هەبوو خۆی پێوەی شۆڕبکاتەوە و تێر تێر ماچی بکات. لە ناخیدا ئەم ئارەزووەی خۆی پێشێل دەکرد لە ترسی ئەوەی نەوەکا سکاڵا خان تێی نەگات، بەڵام لەم بڕوایە دابوو کە ئازاد وەک باوکێک کوڵمەکانی ماچ دەکات، لەلایەک دڵی بە سکاڵا دەسووتا چونکە برایەکەی لە بەندیخانەیە بە پەرۆشەوە بوو بزانێ برایە گیراوەکەی هیچ دەربارەی برایەکەی نازانێ؟ دەیویست بپرسێ و بزانێ کەی زیندانی کراوە و دەبێ ناوی زیندانییەکان نەزانێ؟ و بۆی هەیە حەمەی برام لەگەڵ برای سکاڵا لە زینێکدابن. بۆیە بە دەمەقاڵێکەیان گەلێک سەخڵەت ببوو. دڵی بە هەردووکیان دە سووتا و وەک منداڵێک لای وابوو گەردایک و باوکییان بە شەڕ بێن ئیتر لێک جیادەبنەوە. بۆیە وەک منداڵێک پەشۆکا بوو و نەی دەزانی چی بکات. هێند بە ناسکی و منداڵانە شانەکانی بەرز کردەوە و وەک بڵێی دەیویست سەری لە نێو شانەکانی بشارێتەوە سەیری سکاڵای کرد و گوتی :

- تێناگەم ئێوە یەکترتان ئەوەندە خۆشدەوێت و هەردەم شەرتانە. دە بەسە مردم، کاکە ئازاد من پێش لەدایکبوونم کوژراوم، ئێوەش ئەوەندەی تر دەمکوژن.

سکاڵا بێدار بووەوە و گوتی :

- کچێ تەنیا گیان ئەوە کەی شەڕە ئەوە دووپاتکردنەوەی خۆشەویستییە، تا پیاوەکانمان بەڕەڵا نەکەین ئێمەی ژن هەردەم پێویستیمان بەوە هەیە رادەی خۆشەویستی مێردەکانمان بپێوین. نەکا لێیان بێ ئاگا بین. تا مەلە جوانەکەی

سەر دار تووەکەی ماڵمان لە سەر لیمۆکەی هاوسێکەمان نەنیشێتەوە. تەنیا گیان دونیا وایە بەیانی یەکێکت خۆشبوێت ئەوەندەی خۆتی لێ نزیک دەکەیتەوە و خۆتی لێ دەخشێنیت ئەوەندەش سەنگ دەدەیت بە خۆت تا هاوسەنگییەک پەیدا بکەیت لە نێوانی ئاوێتە بوونت لەنێو کەسایەتی یارەکەت و پاراستنی کەسایەتیت لەنێو خودی خۆتدا.

ئازاد زوو قسەی بە سکاڵا بڕی و گوتی :

- ئەم شیرینە ئامۆزای سەرکەوتە، ئەو سەرکەوتەی تۆ دڵت لێی شکا. دێتە یادت باسی ژیانی خۆی بۆ کردی. باسی ئەوەی بۆ دەکردی کە چۆن گرتویانە و چۆن ئەشکەنجەیان داوە.

سکاڵا گوتی :

- بەڵێ بەڵێ سەرکەوتە لاڵ، ئەی چۆن وشە بە وشە دێتە یادم، باسی پۆلیسە پیسەکەی بۆ دەکردم کە چۆن دەیویست بن زمانی دەربێنێت، وەک بۆی گێڕامەوە گوتی، پۆلیسە پیسەکە پێی گوتم.

- پێم خۆشە باسی شتێکم بۆ بکەی کە کاریگەری لەسەر ژیانت هەبووبێت، کاری تێکردبیت، لەلای من شەرتیش نییە ئەم شتە فەلسەفی بێت یان سیاسی بێت، با هەر پێکەنین بێت. پێمخۆش نییە وا بە مات و مەلولی دابنیشیت، هەرنەبێ! باسی برادەرێکی خۆتم بۆ بکە.

- بەراستی من بیرێکی "فەلفەسیم" نییە و ناشزانم "فەلفەسە" چییە و هەموو ژیانیشم خۆم لە سیاسەت دوورەپەرێز گرتووە. لە سیاسەت ئەوەندە دەزانم بچووک بووم هەلیکۆپتەرەکەی (عبدالسلام عارف) سووتا و کەوتە خوارەوە. محەمەدی رەحمەتی برام بۆمی گێڕاوە گوتی نازانم چۆن لە قوتابخانە بوو بە هەلا و بە عەرەبی هاواریان دەکرد "صعد لحم نزل فحم"، واتا " سەرکەوت گۆشت بوو، بە خەڵووزی هاتە خوارەوە" ئەگەر حەمەی رەحمەتی سیاسەتی کردبێ هەر ئەوەندەی سیاسەت کردبوو. باوکیشم لە سەردەمی (عبدالکریم قاسم) دا جارێک چووبوو بۆ خۆپیشاندان، لە خۆپیشاندانەکە کردبوویان بە هاوار هاوار "البعثيين ما يدرون جمال عند عشره قرون" باوکم لە یەکێک لە خۆپیشاندەرەکانی پرسی بوو، گوزارەی ئەم رستە عەرەبییە بە کوردی چییە؟

پێیان گوتبوو "بەعسی بێ ئاگان لەوەی، جەمال دە قۆچی هەیە" باوکم گوتبووی "پەکو لەم درۆیە مرۆڤ چۆن شاخی دەبێت"، وەڵا باوکم من گەرووی خۆم بەم درۆیە نادڕێنم. ئینجا لە خۆپیشاندانەکە هاتبوە دەرەوە. ئەوەی بیزانم باوکیشم هەر ئەوەندەی سیاسەت کردووە. دەربارەی فەلسەفە زۆری لێنازانم، ئەم وشەیەم زۆر بەر گوێ دەکەوێ دەشیانگوت هەر جاسماغا تێیدەگات. جاسماغا لە رەگەزی ئاغایەکان نە بوو، نازناوی ئاغایان بە دوا خست. رۆژێک جاسم دەچێتە نێوو شار و لە هاورێکانی دادەبڕێ، پۆلیس دەیگرن، و دەیانەوێت لێی بدەن، و دەڵێن ناوت چییە؟ ئەویش لە دەمی دەردەچێ و لە ترسی لێدان دەڵێ ناوم جاسماغایە. یەکسەر چا و ماستاوی بۆ دێنن و داوای لێبوردنی لێ دەکەن. خۆتان دەزانن جوتیار لە تەمەنیا هەر شەق و زیلەی خواردووە، ئینجا یەکێک بێت چا و ماستاوی بداتێ، بۆی دەبێتە خاک و خۆڵ. لەوێ داوایان لێ کرد دژی پێشمەرگە چەک لەگەڵ حکومەت هەڵبگرێ. ئەویش بێ یەک و دوو چەکی لێ وەرگرتن و بوو بە فورسان، "زابتەکە بە پێکەنینەوە گوتی بڵێ جاش" بەڵێ بوو بە جاش. دوو سێ رۆژی پێ نە چوو پێشمەرگە هاتنە ناو گوند و جاسماغا پێشوازی لێکردبوون و وەک جاری جاران پێشمەرگە بەسەر ماڵەکان دا بەش کران، سەرپەلەکە چووبووە ماڵی جاسماغا. بە خەتێکی گەورەی عەرەبی کوفی، لافیتەیەکی لە سەر دیواری دیوەخانەکەی هەڵواسی بوو، لێی نوسرا بوو، "امه عربیه واحده ذات رساله خالده" پێشمەرگەکەش پێی گوتبوو ئەرێ کاک جاسم شەرم ناکەی ئەم لافیتەیەت لێرە هەڵواسیوە؟ لەپێش هەموو شتێک: ئیتر نامەوێت پێم بڵێن کاک جاسم چونکە ئێستە من جاسماغام و پیاوی حوکومەتم. دووەم بۆ لەم لافیتەیە شەرم بکەم هیچ پەیوەندی بە منەوە هەیە؟ پێشمەرگەکەش بە سەرسوڕمانەوە پێی گوتوبوو راستەکەی هیچ پەیوەندی بە تۆوە نییە، ئەی بۆ هەڵتواسیوە؟ کاکی خۆم عەرەبەکان خۆیان لە گوزارەی ئەم رستەیە ناگەن. دەنا کەس هەیە رستەیەک هەڵواسێ جنێو بە دایکی خۆی بدات. سەیرکە وابزانم تۆ عەرەبی نازانیت بۆیە لە برا عەرەبەکانمان ناگەیت. ئەم رستەیە دەڵێ " دایکی عەرەب یەکە و خالید ناوێک نامەیکی بۆ ناردووە"

ئینجا بە تۆ چی خالید نامەی بۆ ناردووە یان نەء، خۆ دایکی تۆ نییە دایکی خۆیانە. ئینجا ئێوە جەنابی پێشمەرگە تفەنگتان لە شان کردووە، تا بە عەرەبەکان بڵێن ناوی دایکتان بە خراپە مەهێنن و بەدمەکەن.

ئینجا جەنابی زابت جاسماغا دەیگوت ئەم رستەیە فەلسەفەیە و کەس تێیناگات. گەر لێم بپرسیت، من تاوەکو ئیستاش هەر بەم شێوەیە لەم رستەیە دەگەم. ئەگینا بۆ کەس راڤەی ناکات؟ یان گەلێک ئاسانە و من تێیناگەم، و وابزانم ئەگەر تا ئەم تەمەنە تێینەگەیشتم، ئیتر تێی ناگەم و پێویستیش ناکات خۆم لە سیاسەت نزیککەمەوە.

زابتەکە گوتی :

ـ ئافەرین زۆر زیرەکانە خۆت لە سیاسەت نەجاتی دا، ئەم رستەیە واتای ئەوە دەدات کە نەتەوەی عەرەب یەکەو پەیامی پیرۆزیشی ئیسلامە.

ـ جەنابی زابت ئینجا نەتەوە هەیە دووبێت، دەبێت یەکبێت ئەوە ووتو وویژی لەسەر نییە، ئەگەر پەیامی پیرۆزی ئیسلام بووایە، ئەی بۆ مامۆستا هەژار دەڵێ عەفلەق و بەیتار فەلەنە و مامۆستای هەموو بەعسییەکانن، ئەی بۆخۆیان بۆ نەدەبوون بە ئیسلام، هەتا مردیشن هەر فەلە بوون. ئەی هەر ئەوان نەبوون ئەم رستەیان نووسی. ئافەرین کاکە ئێوەی کورد دەڵێن هێند زۆرزانە مەلا بەزێنە. تۆش لە مەلا بەزێن کەمتر نیت. بەخوا جەنابی زابت هەر هێندەی لێ دەزانم دەنا شتی تریشم بۆ باس دەکردی. با باسی شتێکی سەیرت بۆ بکەم تا تۆزێکیش پێبکەنیت. پیاوێکی هەژار لە گەرەکی ئێمە دا هەبوو هەزار رەحمەتی لێبێت پێیان دەگووت چل پەستەک. کورێکی هەبوو ئەویش شەهید بوو. رۆژێک لە رۆژان حکومەت ماڵەکانی دەپشکنی، عەسکەر و فرسان بە کۆڵانەکان دا بڵاوببونەوە و ماڵ بە ماڵ لە پێشمەرگە دەگەران. چل پەستەک زوو بە زوو جل و بەرگی کورەکەی خستبوە ناو ئاودەستی ماڵەوە. زابتەکە بەرەو ئاودەستەکە چو تا بیپشکنێ، پیرەمێرد لە زابتەکە چووە پێشەوە و دەستی گرت و لوتی خۆی گرتبوو پێی گووت مەچوە ئێرە "کخ... کخ... پیسە عەعە" بەم شێوەیە نەیهێشت زابتەکە بچێتە ئاودەستەکەوە.

- زابتەکە  ئانیشکی لە سەر مێزەکە دادا و سەری خستە سەر ناوپەلی دەستی و بە زەردەخەنەیەکی ژەهراوی و بە زۆرداریەکی ئاشکرا ددانە رەشهەڵگەراوەکانی پیشانی سەرکەوت دا و گوتی :
- دەی ئەوە چییە؟ مردوت مریّ، دەڵێی سوێندت خوادوە هەر باسی مردوانم بۆ بکەیت. بڵێ ئێستە کێ پێشمەرگەیە، بەڵکو منیش پێم خۆشبێت پەیوەندیان پێوە بکەم.
ئینجا سەرکەوت بە پێکەنینێکی منالأنەی بە درۆ هێنابووە خۆی و پێکەنیبوو، پێیگوتوبوو :
- لە بەیانییەوە خۆت دێنیت و خۆت دەبەیت تا پێمبڵێیت چۆن پەیوەندی بە پێشمەرگەوە بکەی. ئەی نازانیت من پیاوی جاسماغام. دەتەوێت خیانەت لە سەرۆک کۆمار بکەم دەک خودا بیپارێزێت. گەر ئیستا ئەم جلەت لەبەر نەبوایە و دەمانچەی سەرۆک کۆمارم لە بەر پشت بوایە وەک جەنابت لەبەر پشتتە، یەک گوللەم لێ دەدای و ئا لێرانە ساردم دەکردیتەوە.
زابتەکە بە خوێنێکی سارد لە سەر پەڕەکەی بەردەمی خۆی راپۆرتەکەی ئامادە دەکرد، پەڕەکانی ژێر دەستی بەو مەرامە دانابوو کە سەرکەوت بە ئاسانی  بتوانێ بیانخوێنێتەوە. بۆ سەرۆکایەتی بەڕێز گومان لێکراو پیاوێکە بە ناوی "سەرکەوت مامە مین" واپێدەچێت لە ناوچەی گەرمیان تاوانبارێکی گەورەبێت چونکە بە گوێرەی زانیاریەکانی موخابەڕاتمان لەم ناوچەیە هاندەری یاخی بوون و خراپەکارییە. ئینجا بە هەمان سارد و سرپەوە رووی لە سەرکەوت کرد و گوتی :
- خۆت دەزانیت لێرانە هەر قسەی من دەروات و کەس باوەر بە تۆ ناکات. ئینجا کەیفی خۆتە، ئا لێرانە سەرت لە قەبری باوکت دەنێم وا دەکەم تێرت لێدەن. فرتوفێڵ لەگەڵ من مەکە ئەگینا وا دەکەم ئیعدام بکرێیت. لەگەڵم راستبە، زۆرم لێت ناوێ ناوی یەک پێشمەرگەی ناوشارم پێ بدە. تا خۆم رزگار بکەم، چونکە ژیانم لە مەترسی دایە، بۆیە ئەم داوایەت لێ دەکەم. بۆی هەیە بڵێیت ئەوە عەرەبە چ کاری بە یەکێتی و پارتی و حسکەوە هەیە؟ من ناوی ماڵە شوعییەکم دەوێت و بەس، ئیستە وادەکەم ئازادت بکەن.

ـ ئینجا ئەم شوعییانە هەمویان عەرەبن کا خۆ کوردیان لەگەڵ نییە.
ـ چی تیا نییە، خۆت غەشیم مەکە من دەزانم کوردێکی زۆریان لەگەڵە گەر خۆشت نایانناسیت گرنگ نییە سەدی سەد دەزانم دەزانیت کێ دەیانناسێت. بەم شێوەیە ژیانی منیش لە مەترسی رزگاردەکەیت، ملی خۆشت لە پەتی سێدارە دەپارێزیت.
ـ جەنابی بەرێزت باسی پەیامی ئیسلامم بۆ دەکەیت و خۆت تاوانێکت کردووە بۆیە ژیانت لە مەترسیدایە، بەتەمایت بە کوشتنی من تاوانێکی تر بخەیتە سەر تاوانی خۆت، تا ژیانت لە مەترسی رزگار بکەیت؟
زەنگی تەلیفۆن لێیدا. پۆلیسەکە دەسکی تەلیفۆنەکەی هەڵگرت و بێ قسە گوێی راگرتبوو، ناوە ناوە دەیگوت بەڵێ سەروەرم. نا بەرمنەداوە. وەک بۆم بەدیار کەوتووە کابرایەکی ئەوەندەش ترسناک نییە و لە ئەفواج خەفیفەی جاسماغایە. من لەم بڕوایەدام کە پیاوێکی دڵپاکی سەرۆک بێت. نا...نا... من بڕوا ناکەم کە پێشمەرگەی ناوشاربێت. ئیعترافی لەسەر کراوە، بەڵێ ئەوە شتێکی ترە. بەراستیت پێ بڵێم هیچ شوێنێکی ساغی نەماوە ئەوەندەی لێدراوە. بەڵام تاوەکو ئێستاش هەر پشتگیری لە سەرۆک و حوکومەت دەکات. ئێستە لە ژێر ئەشکەنجەیە و هەموو نینۆکەکانیان دەرهێناوە و نازانم چەند پەراسووی شکاوە، دەڵێیت گوێی ببڕین، باشە ئێستە دوکتۆر دێنم تۆزێکی چارەسەر بکات ئەگینا ئەمرێت. لە دوکتۆر دەپرسم بزانم بەرگەی گوێ بڕین دەگرێت. بە بڕوای من دەتوانین دوایبخەین بۆ بەیانی، ئەگەر هەر قسەی نەکرد دووبەیانی زمانی دەبڕین. بەڵێ سەروەرم، لە پێناوی سەرۆک و نەتەوەی عەرەب ئامادەی هەموو شتێکم. خوات لەگەڵ، دڵ لە دڵ مەدە هەموو شتێک بە دڵی جەنابتان دەبێت. دەسکی تەلیفۆنەکەی دانا و سەیرێکی کردم و گوتی :
ـ من لە سەرەتاوە پێم گوتی لەگەڵم راستبە، چونکە من فەرمانبەدەست نیم، فەرمانبەرم. ئەوەی لەسەرمە ئەوەی گوێت لێبوو دەبێت جێ بە جێیان کەم. ئینجا ئەگەر زۆر دڵم پێت بسووتێت ئەوا لە ژێر پەنج نینۆکەکانت دەردەهێنم و ددانەکانت دەکێشم و چەند پەراسویەکت دەشکێنم. بەیانیش لە ژێر پەنج

گوێکانت دەبڕم و دووبەیانی زمانت دەبڕم. من لە شوێنی خۆم واقم وڕ مابوو. نەمدەزانی نە باوەربکەم نە بگرییێم نە ناوی هەندێک ماڵە شوعی دەمێ و لە کۆڵ خۆمی کەمەوە. لە بەرخۆمەوە گوتم ئەگەر لە ژێر پەنج بێت ئەوەندە نایەشێت با ئیمرۆکە دان بە خۆما بگرم و لە رووی ئەم جەلادە راوەستم.

گوتم :

- من شوعییەک دەناسم ناویت پێ دەدەم، بە مەرجێک یەکسەر رزگارم بکەیت.

- بە شەڕەفم یەکسەر دەتهێنمە دەرەوە.

- لە تۆ بەولاوە کەسی تر ناناسم شوعیبێت. ئینجا هەڵسا پێوە و تا توانای تیا بوو زیللەیێکی لێدام و لەسەر کورسییەکە کەوتمە خوارەوە، ئینجا بە شەق کەوتە سەرم و هاواری دەکرد، "ابن الكلب" "ابن الگحبه" واتا کوڕی سەگ. کوڕی قەحپە. من زۆر بەنەرمی لەگەڵت جوولامەوە دیارە تێناگەیت. ئاگام لێ بوو لەگەڵ هەر شەقەی کە دەمخوارد پەراسوێکم دەشکا، لە گەڵ هەر مستەی کە لەناو دەممی دەدا دوو تا سێ ددان دەکەوتنە ناو دەمەوە. بەڕاستی پاش دەمێک ئیتر هیچ هەستم بە ئازار نەدەکرد. ئەوەندەم زانی شەقێکی لە ژێر سینگم دا ئیتر هەناسەم نەهات و دونیا لە پێش چاوانم رەش بوو. وامزانی ئیتر ئەشکەنجە تەوا و ماڵ ئاوایی لە ژیان دەکەم. بە هۆش خۆم هاتمەوە، لەسەر کاشییەکی رووت درێژ کرابووم، سەیرم کرد دارەمەیت نییە، ئازارێکی زۆرم هەیە، بەڵام جارێ لە ژیان دا ماوم. بیرم لە دایکم و باوکم نەکردەوە چونکەهەردووکیان ساڵێک بوو ئەمری خوایان کرد بوو. بەڵام یەکسەر بیرم لە ناسکەی خۆشەویستم کردەوە و گوتم دەبێ ناسکە بزانێ ئێستە من گیراوم و بەم جۆرە لێمدراوە. دەبێ بەم شێوەیش ناسکە پیمرازی بێتەوە، بەڵام ئەوە گرنگ نییە هەرکەسەی بەشی خۆی بەردەکەوێت، ئەگەر ناسکە هی من بێت هەر بۆ من دەبێت. بەڵام ئێستە دەبێت جارێکی تریش بیبینمەوە و لە باوەشمی کەمەوە. خودایە بەبێ ددان چۆن قسەی لەگەڵ بکەم؟ بەبێ نینۆک جارێکی تر چۆن دوگمەکانی بترازێنم؟ نا کە لە بەندیخانە دێمە دەرەوە

یەکسەر خۆم دەکوژم. نا... نا... نامەوێت ناسکە بمبینێت و دڵی پێم بسووتێت. جیڕەی دەرگا هات و چەند پۆلیسێک وەک سەگ بە حوجرەکەوە وەربوون. ویستیان بە زۆرداری بە پاڵەسوان بمڕوێنن. هەڵیاندەگرتم لە بەر ئێشی پەراسوم توانای ڕۆیشتنم نەبوو. کورسییێکی بە ڕەوڕەوەیان بۆ هێنام هەمووی خوێن بوو، منیان فڕێدا سەری و بەرەو شوێنێکیان بردم. لەم داڵان بۆ ئەو داڵان، تا گەیشتمەوە بەر دەگای معاون اخطر (ەخزەر). پیرە پۆلیسی سەگانی هەر وەک دوێنێکە، جگەرەیەکی بە دەمەوە بوو. خۆی بە چەند کاغەزێکەوە خەریک کردبوو تا وا بکات کە گوایە نامبینێ و ئاگای لێم نییە. پۆلیسێکیان شەقەی لە پێی خۆیەوە هێنا و گوتی :
- سەروەرم تاوانبارمان بۆت هێنا.
سەری بەرز نەکردەوە گوتی :
- باشە بڕۆن.
- ئینجا سەری هەڵبڕی و پێکەنی. ئەوە هەمیسان تۆیان هێناوە بۆ لام، دەک خوا قەوەتیان نەدات. نانیان دا پێت،...
- نەخێر، زۆرم تینووە، ئەگەر تۆزێکم ئاو بدەیتێ، خێرت دەگا.
- هەڵسا و پەرداخێک ئاوی هێنا و گوتی :
- ئاشت بووینەوە؟
وەڵامم نەداوە ئاوەکەی هێدی هێدی بە سەرم داکرد، منیش بە زمانم ئەوەی پێمکرا بیلێسمەوە لەسەر لێوی خۆم بە بێ شەرم لێستمەوە، بەم جۆرە تۆزێک دەمم تەڕ کرد.
- ئێستا بابگەڕێینەوە سەر وت و وێژی دوێنێکەمان، هەر لەسەرەتاوە دەمەوێت پێت بلێم چۆنت دەوێت؛ بە برادەرانە لەگەڵ یەک بدوێین، یان بە شەق و شولاق؟ منیش لە سەرەتا دا وەڵامم نەداوە.
گوتی :
- ئەگەر هەر وەڵامم نەدەیتەوە زمانیشت دەبڕم، چونکە وا دیارە بە کەلکت نایەت. ئێستە بە زووترین کات پێمبڵێ کێ پێشمەرگەیە، یان نزیکترین بنکەی پێشمەرگەم بۆ دەست نیشانکە.

ـ منیش گوتم :
ـ کێ دەزانێ پێشمەرگە لەکوێن. هەر لەنکاوێک دەبینیت بەناو گووند وەردەبن، لێیان بپرسیت لە کوێوە دێن، دەڵێن لە سەرەوە بووین ئەی بۆ کوێ دەچن، دەچین بۆ ئەم خوارە.
معاون بە زەردەخەنەیەکەوە پرسی :
ـ ئا ئەم خوارە چ دووری دەدات بە شوێنێک، یان ئێوە چۆن تێی دەگەن؟
ـ جەنابی موعاون، تا بە باشی لەم خوارە بگەیت ئێستە بۆتی روونده‌کەمەوە. بۆیان گێڕامەوە کچێک لە رووسیا دەیخوێند، بە سەردان گەڕابووەوە، ژنێکی هاوسێیان چاوی پێدەکەوێت و دەستی لە ملی دەکات و دەلێ کچم ئەوە شووتکردووە دیارنیت؟ نا بەخوا پلە شووم نەکردووە، من لە رووسیا دەخوێنم. ئا...ئا... ئالەم خوارەی لە ئەمەریکای. نا پلە لە رووسیام لە ئەمریکانیم. ئەی رووسیا لەم خوارەنییە؟ با... با... لەم خوارەیە. ئێ کەوابێت ئەمریکایە، بەڵێ پلە ئەمریکایە. جەنابی معاون، هەر شوێنێک لە لای ئێمە نەبێت لە خوار ئێمەیە، کورد وا دەزانێ ئەو شوێنەی کە خۆی لێیەتی لە هەموو شوێنێک بەرزترە. بەم شێوەیە ئێمە لەم خوارە دەگەین. ئینجا تۆش چۆنی بە باش دەزانیت کەیفی خۆتە، چۆنی تیدەگەیت وای تێبگە.
ـ ئێستە ئەو شوێنەی کە تۆی لێ درێژ کراوە بەرزە، یان ئەم شوێنەی کە من لێی دانشتووم بەرزە؟
ـ جەنابی موعاون، کورد دەڵێ مەغدوربم، بەلام غەدار نەبم. بۆ نموونە حەزرەتی عیسایان بە غەدر لە خاچ دا، هیچی لە شوێن و پایەی کەمنەکردەوە. کوڕەکانی ئیمامی عەلییان بە غەدر کوشت. پایەو ناوبانگی بەرز کردنەوە. ئینجا تۆ گەر ئەم غەدرەت قبوڵبێت دەک ئەم شوێن و مەقامە هەر پیرۆزی تۆ بێت.
ـ هەی سەگ باب، ئەگەر دایکت شەریف بوایە کوڕی وەک تۆی ناکەس بەچەی چەپەڵی پیسی نەدەبوو. هەی پیسکەی خوێڕی سەیرێکی خۆتکە، بە چ یاسایەک خۆت دێنیتە رێزی حەزرەتی عیسا و کوڕەکانی ئیمامی عەلی. دوای ئەوە کێ دەڵێ کوڕەکانی ئیمامی عەلی بە غەدر کوژران. هاواری کرد وەرنە

ژورەوە. دیتم چوار پۆلیس هاتنە ژورەوە. هاواری کرد یەکسەر ددانەکانی بکێشن. یەکسەر ئاسنێکی دەم پانیان خستە ناو دەمم، ویستم دەمم نەکەمەوە، بە چەکوچێک لە پشتی ئاسنەکەیان دا و ئیتر بۆخۆی چووە ژورەوە و وەریانگێڕا ئیتر شەویلاکیان کردمەوە و گازیان لە ددانێکم گیر کرد، کە دوێنێکە نەشکا بوو و سەیری معاونیان کرد.

معاون گوتی :

- یا حوسەین ئێستە دەڵێیت چی؟

- بەخوا کەس ناناسم.

ئەوەندەم زانی ئەوا سەبر سەبرە بە ئاسنە پانەکە دیسان دەمیان کردمەوە و گازەکەیان لە ددانەکەم گیر کردەوە و دەستیان پێکرد بیلەقێنن. ئەوەندەم ئێش و ئازار هەبوو، نە بیرم لە کەس دەکردەوە نە ناوی کەس دەهاتە یادم.

- فەرمانی دا و گوتی :

- راوەستن، حەزرەتی عیسای دەجال ئێستە دەڵێیت چی؟ چونکە خوێن چوبۆوە ناو قورگم قسەم بۆ نەدەکرا بۆیە بە سەر وەڵامم داوە بە هێمای نازانم. ددانەکەی هێنادەرەوە و پیشانی موعاونی دا. بیخەنە ناو قورگی ئەم سەگبابە با قوتی دات لە ئیمرۆ بەولاوە هەر گۆشت و ئێسکی خۆی بدەنێ تا فێر بێت درۆ نەکات و قسەی راستی بدکێنێت. ددانەکەیان خستە ناو قورگم و تۆزێک ئاویان دا پێم تا ددانەکە بچێتە خووارەوە. دەمێکی پێ چوو چاوم کردەوە.

گوتی :

- دەڵێیت چی، وابزانم تێگەیشتیت لێرانە یاری ناکەین، یان قسەمان بۆ دەکەیت یان کە برسیت بوو بە پۆلیسەکان بڵێ تا تۆزێک گۆشتت لێکەنەوە و بتدەنێ بیخۆیت.

بێ ئەوەی بمەوێت موعاوین بشکێنمەوە گوتم :

- کورد دەڵێ گۆشتی رانی خۆت بخۆ و منەتی گۆشت فرۆش هەڵمەگرە.

پیسە پۆلیس لێم بوو بە ئاگر لەپاش مێزەکەی هاتە دەرەوە و پێلەقەیەکی لێ دام و لە هۆش خۆم چوم. ئیتر نەمزانی نە شەوە نە رۆژە.

ئەوەندەی بێتەوە یادم کە بێداربومەوە، لە سەر تەختێک درێژ کرابووم، دەرزییەکیان لە دەماری دەستم دابوو، ئەویش بە سۆندەیەکەوە بەسترابۆوە و تک تک دەرمانێکی سپیان لە لەشم دەکرد. هۆدەکە پەنجەرەی تێدانەبوو، بەڵام گلۆپێکی نیۆنیان بە بنمێچی هۆدەکەوە هەڵواسی بوو. گوێم لە تەقە تەقی پێیەکی ناسک بوو. هەستم پێکرد دەتگوت دەمووچاوم پەنماوە و لە دوورەوە هیچ نابینم، کە زەینم دایە دیتم کچێکە بە جلێکی سپییەوە لێم دێتە پێشەوە. هات لەسەر سەرم راوەستا. بە کوردی پێی گوتم :

ـ چۆنیت.

ـ باشم.

ـ ناوت سەرکەوتە.

ـ بەڵێ.

ـ سەرکەوت تۆ گەنجێکی جوانیت دونیات زۆر لە پێش ماوە، خۆت بە قوربانی شتی هیچ و پوچ مەکە. بڕواتبێت حکوومەت بە خۆڕایی ناتگرێت دیارە دەزانێت تۆ کێیت بۆیە تۆیان هێناوەتە ئێرانە، دەنا باش بزانە کەس بە خۆرایی ناگرن. دیارە تاوانەکانت دەزانن بۆیە تۆیان گرتووە. ئەی کوڕی قۆز، دڵت بە دەستگیرانەکەت بسووتێت هەر لە بەر خاتری ئەو کچە نازدارە جوامێرییەک لەگەڵ حووکمەت بکە و ئەوەی دەیزانیت بێ پێچ و پەنا بۆیان ئاشکراکە. ئێستە موعاون ئەخزەر دێت بۆ لات دڵی مەشکێنە و هەمووشتێکی بۆ باس بکە.

ـ جەنابت کوردیەکی باش دەزانیت، بۆیە پێتدەڵێم ئەگەر بۆ ئەوە دێتە لام تا لە دوژمنانی حکوومەت بکۆڵێتەوە، ئەوا خۆی گەورەترین دوژمنی حکوومەتە. جا چۆن تاوانەکانی منیان زانی با تاوانی ئەوانی تریش ئاشکراکەن. دەنا منێکی پیاوی جاسماغایان بۆ گرتووە؟ دەبێ گوناهم چی بێت؟

ـ گوناهت ئەخزەر دەیزانێ من نایزانم و کاری منیش نییە. ئەوەندەت پێدەڵێم ئاگات لە سەری خۆت بێت نەپەڕێت.

ـ دە خۆزیا زووتر دەیانپەڕاند، چونکە من کە لێرە چومە دەرەوە خۆم خۆم هەر دەکوژم، ئینجا ئەگەر ئەوان بمکوژن باشتریش خێریان دەگات. نامەوێت

دەستگیرانەکەم ددانەکانم بەم شێوەیە ببینێت. هەردەم دەیگوت سەرکەوت گیان نامەوێت جگەرە بکێشیت و ئەم ددانانەت رەش بکەیت. وەک خۆت دەبینیت ئەوەی لای یارەکەم جوان بوو گشتیان شکاند. چۆن بەم شێوەیە بچمەوە بەردەم یارەکەم.
- من بۆتۆمە پێراناگەیت خۆتبکوژیت، سەعاتێکی تر نابات ناسکە بە رووتی دەهێنن بۆ ئێرانە، ئینجا مەڵێ بەو کوردییە رەوانەی دەیزانیت بۆ پێتنەگوتم.
- تۆ لە کوێ ناسکە دەناسیت؟
- پێتدەڵێم خۆت گێل مەکە بە خۆڕایی تۆیان نەهێناوەتە ئێرە.
- ئەی ئەم دڕندانە موسولمان نین؟
- ئەی داماو لە کەس نە قەومێ وەک لە تۆ قەوماوە، کوا ئیسلام لای عەرەب باوی ماوە، ئیسلام هەر لای غەیرە عەرەب باوە. گەر کەعبە پارەی بۆ سعودییە نەهێنابایە لە مێژ بوو کەعبەیان تێکدا بوو. کاکی خۆم ئێستەش کاتی ئیسلامەتی نییە زوو ناسکە بپارێزە. ئابرووی خۆت و خێزانەکەت بپارێزە. ئێستە ناسکە دێننە لات، ئینجا جەنابی ناموشەڕەفت چی پێدەڵێیت؟ ئەم تەختە سپییەت دیوە بەرەو ئێرەی دەهێنن؟ ئا ئێستە لەبەر چاوی تۆ ناسکەی لەسەر دەکەن بە ژن. ئەگەر هەر لەسەر هەڵوێستی خۆشت سووربیت ئەوا ئیمڕۆکە زمانیشت دەبڕنەوە. ئینجا نازانم بە چ روویەک و بە چ زمانێک و بە چ ددانێک لەگەڵ ناسکەی خۆشەویستت دەدوێیت؟
- ئەوەندەی دەیزانم و بە یادی خۆمی دادێنمەوە هیچ نازانم، یەک شت دەزانم ماڵ نییە خزمێکی پێشمەرگە نەبێت، خۆ با دوور نەڕۆم ئێستە خۆت لە خۆت بپرسە و بە یادی خۆتی دابێنەوە دەبینیت خزمێکت پێشمەرگەیە. ئینجا تۆ دەتەوێت من ناوی کێ بدەم و ناوی کێ نەدەم؟

راستە بەڕوواڵەت چاونەترس بووم، بەڵام لە راستی دا دڵم لەگەڵ هەر جولەیەک خرپەی دەکرد. نەمدەویست بە هیچ شێوەیەک چاوم بتروکێنم. نەوەکا دیمەنێکم لە دەست بچێت. وامدەزانی بوونەوەر لە سەر دوو وشەی من راوەستاوە. دەمگوت کە ناسکە دەهێنن بۆ ئێرانە چۆن چاو و ڕووم دێت سەیری بکەم؟ دەبێت بە راستی بەزۆر خراپی بکەن؟ لەنکاوێک غڵبە غڵبێک

پەیا بوو دوختۆرەکەی من رۆیشت بێ ئەوەی خوداحافیزی بکات. ئەوەندەم زانی چەند کەسێکیان لە سەر عەرەبانە رادەکێشا و بەرەو شوێنێکیان دەبردن. وا دیار بوو هەموویان جلی پۆلیسیان لە بەر بوو. بۆیە زانیم شتێک رویداوە، بەڵام چی؟ وەڵامم نە بوو. ئەوەندەی بزانم راکشاوەکانی یەکەم دە عەرەبانەی کە تێپەڕ بوون، پێیان لە پێشەوە بوو، زانیم ئەوانە کوژراون. کوژراوەکانیان بەرەو شوێنێکی نا دیار دەبرد. هەر دوکتۆر و پەرستیار بە ناو دالانەکانی قشڵە دا بە پەشۆکاوی رایان دەکرد و بێ وت و وێژ دەچوون بۆ شوێنی نادیار و ون دەبوون و وەک مراوی ژێر ئاو بەدیاردەکەوتنەوە. لە خۆم دەپرسی خودای گەورە دەبێت چی رویدابێت. دوختۆر و پۆلیس و پەرستیار وەک هەنگ تێکدەئاڵان و لێک جیا دەبوونەوە. ویستم هەڵسمەوە تا بزانم چی رویداوە. دیتم سێ عەرەبانەیان بەرەو من هێنا، یەکسەر لە دەست و پێ کەوتم و لە شوێنی خۆم راکشامەوە و پەکم کەوت.

معاون ئەخزەر لەگەڵیان هاتە ژورەوە، و بە دەنگێکی بەرز هاواری کرد کوڕی سەگ ئیمرۆکە تۆڵەی هەموو شەهیدەکانت لێدەکەمەوە. گوتم ناسکەتان کوشت ئیتر چی دەکەن بیکەن. تۆ درندەیت و ئادەمیزاد نیت، تۆ مرۆڤ کوژیت، تروسکەی سۆز لە دەرونت بەدی ناکرێ. ئەخزەر زەردەخەنەیەکی لووت بەرزی هێنا خۆی و گوتی :

- گەر بۆ دوژمنانم وابم دیارە بۆ بیر و باوەڕی خۆم واتا بۆ نەتەوەکەم و بۆ خوداوەند دڵپاکم.

کە سەیری ناسکەم دەکرد راکشاوە، لەخۆم دەپرسی دەبێت مردن ئەوەبێت. لە دەمم دەرچوو بە دەنگێکی بەرز گوتم ناسکە، دەشێت مردن خەوی ئاسودەیی نەبێت؟

معاون سەیری کردم و گوتی :

- ئەی ترسنۆک ئەم تاوانبارانە دەناسیت؟

کە چاوم بە ناسکە کەوت وا بە بێ دەنگ راکشاوە، ئیتر ترسبێت لە لەشم دا نەما یەک ئاواتم هەبوو ئەیش بمکوژن و لە لای ناسکە درێژم بکەن.

- بەڵێ دەیانناسم، بۆیە پێتدەڵێم، لەم چووارەمان کەسمان تاوانبار نین، بەڵکو تۆ و خوداوەندە خوێنڕێژەکەت تاوانبارن.
- ئەی کوڕی سەگ تۆ لە خواش ناترسیت، ئەی پیسی چەپەڵ تۆ لەوانەیت کە دەیانەوێت باری گوناهیان ون بکەن و لە کونی دەرزیەک دا بیشارنەوە.
- راستەکەیت گوناهی من ئەوەندە بچوکە تەنانەت لە ناو کونی دەرزیش دەبێت بەدوایدا بگەڕێیت. وا دیارە گوناهی منتان لێ ون بووە بۆیە لە کونی دەرزیدا بەدوایدا دەگەڕێن. گوناە گوناهی ئەوانەیە کە لە خۆیانەوە گوناە بۆ بێ تاوانان هەڵدەبەستن. تاوەکو پایەیان بەرزبێتەوە ئامادەن مشکی بەستەزمان بکەن بە فیل.
- واتێدەگەیت بە فێڵ و درۆ گوناهت رەشدەکەیتەوە؟
- تۆ ئەگەر ئەوەندە زانا و دانایت، دە پێمنالێیت منی فێڵباز و تەڵەکە باز گوناهم چییە؟
- گووناهت ئەوەیە هیچ کوردێک نییە نەزانێت کێ پێشمەرگەیە. ئەو کەسەی کە دڵسۆزی دەسەڵاتە، هەرنەبێت ناوی ماڵە پێشمەرگەکان دەدات. ئەوانەی کە دڵسۆزیش نین هیچ زانیاریەک نادەن بە دەسەڵات. بەوە بۆمان بە دیار دەکەوێت کێ دڵسۆزی دەسەڵاتە و کێ دڵسۆزی نییە. جگە لە مەش ئەی ئامۆزایەکەت بۆ ئیعدام کرا؟ وا بزانم تێگەیشتیت بەڵام پاشی چی پاش ئەوەی ناسکەت بە قوربانی خۆت کرد. ئێستاش نەچووە بچێ، لەگەڵمانبە تەندوروستیت وەک جاران لێدەکەینەوە.
- تازە ناسکەت کوشت لەجیاتی ئەوەی دۆست بۆ دەسەڵات پەیاکەیت دوژمنت بۆ زیاد کرد.
- گوتی وادیارە وت و وێژ لە گەڵ تۆدا کۆتایی نایەت. ئەگەر نەمزانیبایە کەریت ئەوا بە شێوەیەکی تر هەڵس و کەوتم لەگەڵ دا دەکردیت. بەڵام من لە خودای خۆم پرسی چیت لێبکەم گوتی بیکە بە پەند تا کەس لە قسەم دەرنەچێت.
- گوتم با خودای تۆ بە هۆش خۆی بێتەوە و بزانێت خودایەکی بێ دادە. لێت دەپرسم چ خودایەک کچێکی بێ تاوانی وەک ناسکە دەکوژێ؟

ـ موعاون ئەخزەر شەقێکی لە چوارپایەکەی ناسکە دا و گوتی، ئەگەر ئەویش دڵسۆزبایە نەدەبوو بە یاری تۆ. ئێستە بەم زمانە پیسەی خۆت تێرت قسە کرد. ئەو شتەی من دەمویست لە تۆم نەبیست، بۆیە زمانت دەبرم. تائەو شتەی کە دیوتە نەیگێریتەوە. دەتکەم بە شێتەی لالە پەتە و منداڵت بەدوا دەخەم. کونە مشکت لێ دەکەم بە قەیسەری، یان واتلێدەکەم کڕنۆش بۆ عیگال ببەیت، یان لە ترسی عیگال وەک شەمشەمەکوێرەکان بە شاخ کەویت و شار و شارستانییەت لە مێشکە بۆگەنەکەت بسڕێتەوە. ئینجا هاواری کرد گوتی وەرنە ژوورەوە. سێ چوار کەس هاتنە ژوورەوە و دوویان دەستیان لە پشتەوە بەستمەوە و یەکێکیان بە ئاسنێکی دەم پان دەمی کردمەوە دەرزیەکی پەنجی لە زمانم دا و ئەوێ تریان بە ئاسانی گازێکی تیژی لە زمانم گیر کرد و قرتاندی ئیتر هۆشم لەخۆم نەما و بورامەوە. بە هۆش خۆم هاتمەوە. وەک دووایی زانیمەوە جلێکی جوانیان لەبەرکردبووم. هەستم کرد زمانم ئاوساوە و سەرم دێشێ. دوختۆرێک هات بۆ لام و گوتی دەرزیەکی مۆرفینی لێدەن. ئەوەندەی بزانم هەستم بە ئازار نەدەکرد. منیان برد بۆ حەوشی بەندیخانە و لەوێ عەرەبانەیەکی کەڕراکێشیان ڕاگرتبوو سێ جەنازەی لەسەر بوو، منیان سواری کەرەکە کرد و گوتیان بازۆ. ئەوەی بێتە یادم نەمدەتوانی سەر بۆ ئاسمان هەڵبڕم چونکە تیشکی ڕۆژەکە لە نێو چاومی دەدا. وەک زانیمەوە ئەو کاتە، ڕۆژ ئەوەندەی نەما بوو ئاوابێت. خەریک بوو بڵێم خەڵکینە بە هانام وەرن. سەیرکەن چیم بەسەر هاتووە. نە گریانم دەهات نە دەنگم دەهاتە دەرەوە، نە دەمتوانی کەرەکە بازۆم، ئیتر کەرەکە بە کەیفی خۆی دەرۆیشت. هەناسەم هەڵدەکێشا هەستم بە دوو ژیان و دوو ئازادی دەکرد: هەناسە هەڵکێشان ژیانێکە و مردنی بە سەربەرزیش ژیان و ئازادییەکی ترە. نە هیچم لە دەست دەهات، نەمدەتوانی هیچ بکەم، هەستم بە خۆ نە دەکرد. نە هەستم بە گەرما و سەرما، نە بە جوانی نە بە دزێوی دە کرد. نە دەمزانی، ئایا لە شوێنی خۆم خولدەدەمەوە، یان پاشە و پاش، یان ڕاستە و ڕاست مل لە شوێنێکی نادیار دەنێم. ئەوەندەم زانی چەند دەموچاوێک لێمهاتنە پێشەوە و پرسیان ئەوە چییە؟ دیتیان من هیچ وەڵام

نادەمەوە و هەموو دەم و ددانم شکاوە، زوو بە زوو سێ دارەمەیتیان هێنا و بە (لا الاه الا الله، محمد رسول الله)، (الله اکبر... الله اکبر) هەر سێ مەیتیان هەڵگرت و منیان لە شوێنی ناسکە درێژ کرد، گوتم شەرتبێ ناسکە گیان زۆرم پێ نا چێت لە دوات دێم لە وێ بەڵێنم دەیێ پێشوازیم لێبکەیتەوە. ئەوەی بزانم منیان بردبووەوە ماڵەوە، بۆ بەیانی مەیتەکانیان ناشتبوو. بەڵام من چەند رۆژێک ئاگام لە خۆم نەبوو. وەستاو دوختۆری مللیان هێنابووە سەرم و ئێسک و پروسکیان بۆ هەڵبەستبوومەوە. راستە نەمدەتوانی بجولێمەوە. بەڵام هێدی هێدی سەر و مێشکم گەڕابووەوە سەر دۆخی خۆی. پاش نزیکەی دوو هەفتە یان بیست رۆژ چووم بۆ سەر قەبران تا شوێنێک بۆ خۆم هەڵبژێرم، لە گڵکۆی ناسکە نزیک بێت. چاوم بە قەبری ناسکە کەوت تێر گریام. یەکێک لە سەر کێڵەکەی نووسی بوو ناسکە ئاسوودەبە تۆڵەت دەکەینەوە. یەکسەر تفم لە خۆم کرد، بە خۆم گوت هەی داوەشێیت، خەڵک تۆڵەی ناسکە بکەنەوە تۆش بێ تۆڵە وەرگرتنەوە خۆت لە ناو گڵ دەنێیت.

لە تەمەنما بیرم لە سیاسەت نەکردبووەوە، نەشم دەزانی چۆن بیر لە سیاسەت بکەمەوە. بەڵام تازە ناچار بووم بیر بکەمەوە. ئەو معاوینە پیسە سەگە، رقی دونیای لە شوعییەکان بوو. باشترین شت وایە لە گەڵ شوعییەکان بچم بۆ چیا. خۆم لە خۆم پرسی توخودا کەی بیستوتانە شوعی تۆڵەی یەکێک بکەنەوە. یەکسەر وازم لەم بیرۆکەیەی خۆم هێنا. یەکسەر بیرم بۆ یەکێتی نیشتمانی چوو، ئەوانیش دوو رۆژ لە چیان و سێیەی لە بەغدان. پارتی دیموکرات، تاوەکو ئیستا تەقەیان لە حکومەت نەکردووە. لەگەڵ ئەوانە تۆڵەی کێ دەکەیتەوە؟ ئەی پاسۆک پێشمەرگەیان هەیە و نە بەغدا دەکەن نە تووران. بۆیە بێ یەک و دوو پاش چەند رۆژێک رووم لە شاخ کرد. لە بنکەکانی پێشمەرگە زۆر بەگەرمی پێشوازیان لێ دەکردم. منیش لەوساکەوە خۆم راهێنا بە هێما نەدوێم بەڵکو بە نوسین بدوێم، بۆیە هەمووکاتێک دەفتەرێکم لە باخەڵە و ئەوەی دەمەوێت بیڵێم دەینوسم.

- راستە دەڵێن تۆ ئەو ئەخزەر ناوەت کوشت؟

ـ نەخێر کەمینێکم بۆ دانا و وەک سەگ پێوەبوو. منیش گرتم، هەرچەندە هاوڕێکانم لێم پاڕانەوە کە هیچی لێ نەکەم، وەک ئەسیرێک مامەڵەی لەگەڵ دا بکەم. بەڵام من خۆم پێ نەگیرا و زمانیم بڕی و گیانی چەپەڵی بەرەو دۆزەخ رۆیشت.

ـ دەڵێن قسەت لێ دەرهێنا بوو. کچێ هەر قسە، چی ما باسی نەکات. تا ناونیشانی ماڵی خۆشیانی دا پێم. بەڵام داخی گرانم منیان لە پاسۆک دەرکرد. لەسەر ئەوەی کە گوایە من نەهاتووم کوردستان ئازاد بکەم، هاتووم تۆڵەی خۆم بکەمەوە. بێ پشت و پەنا مامەوە، بۆیە بیرم کردەوە شوعییەکان دەبێت لە بەغدا بنکەی نهێنییان هەبێت، هەر لەبەر ئەوەش چووم بۆ لایان، کە گوایە دەمەوێت، کاریان لەگەڵ دا بکەم. ئەوانیش داوای لێبوردنیان لێ کردم. دەچووم بۆ هەر لایەک کەس قبوڵی نەدەکردم. لە هەندەران بەولاوە هیچی ترم بەدەستەوە نەما. دەڵێن لێرانە پاسەپۆرت دەدەن بە کوردەکان. لە بەینی خۆمان بێت، بۆیە هاتومەتە ئەوروپا تا پاسەپۆرتێکم دەستکەوێت و بچم بۆ بەغدا. تۆ بڵێیت پاسپۆرتێکم نەدەنێ؟ وا دیياربوو سەرکەوت رۆژ و شەوی نە بوو، هەر بیری لە تۆڵە دەکردەوە. کە پێمان دەگوت بیر لە کوردستان بکەوە، بیر بکەوە چۆن کوردستان ئازاد بکەین. دەیگوت دوژمنانمان بە کوشتن دەماتۆقێنن، ئێمەش ئەگەر بە تۆڵە نەیانترسێنینەوە، ناگەین بە هیچ.

منیش پێم گوت ئەم بیرەت وەک تنۆکێک ژەهر وایە، گەر تێکەڵی هەر ئاوێکی کەیت پیسی دەکات. بۆیە هیچ پارتییەک لە پارتییەکانی کوردستان تۆیان قبوڵ نەکردووە. بڕواتبێت ئەم ژەهرەش لە ناخی تۆدا نەزاوە. بە بڕوای من ئەم ژەهرە رەنگدانەوەی ژەهرە پیسەکەی موعاون ئەخزەرە کە ئاوێتەی دەروونت بووە. کاک سەرکەوت گەر پێتنەکرێت ئەم ژەهرە لەناخت دا لە ناو ببەیت، ئەوا موعاون ئەخزەر زیندووە و نەمردووە و لە ناختدا دەژێت. ئەوە تۆنیت ئەم قسانە دەکەیت، موعاون ئەخزەر بووەتە کرێگرتەی چوار دیوارەکەی دەروونت، زووکە دەریکە کرێچی بێگانەت بۆ چییە؟ ئەگەر هەر بە فیتی ئەو گۆرانی بڵێت، وابزانم وەک گومبەت و حەمامەکەی مەلای

مەشهورت لێ بەسەردێت. لە کۆتایدا هەر خۆت گوێگری گۆرانییەکانی خۆتدەبیت و کەست پێوە نامێنێ.

- بە قسەی تۆ بێت کەس بیرۆکەی منی بە دڵ نییە. ئەی بۆ گوێم لێ دەگرن؟ من باسی تۆڵەتان بۆ دەکەم. پێتان دەڵێم خوێن بە ئاو پاکمەکەنەوە. خوێن بە خوێن پاکدەکرێتەوە. سکاڵا خان گەر کورد راوێژکاری وەک تۆ و وەک شیرینی دۆتمامی هەبێت، هەر لە سەر جادەکانی پاریس دەبێت باڵمان فش کەینەوە و سینگمان دەرپەرێنین. ئێمەی پیاو چەند سینگمان دەرپەڕێنین لە سینگی ئێوە بەرزتر نابێتەوە. لەم وڵاتەش دەسەڵات بەدەست ئەو کەسەیە کە بزانێت چۆن سینگی دەرپەڕێنێت. ئێمەی پیاویش هەرگیز سینگمان لە سینگی ژنان بەرز تر نابێتەوە، جا بۆیە لەم پاریسە مشوری پیاوان کەوتووەتە دەستی ژنان.

یەکسەر بەدەست خوداحافیزی لێ کردم و رۆیشت، چەند جارێکی تریش دیومە، بەڵام وا رێکنەکەوتووە لەگەڵ یەک بدوێین. ئازاد گوتی کچینە بابیکەین بە شەو. راستە شەو درێژە بەڵام هەرچی بکەین و نەکەین بەیانی، چرکەیەکیش دوا ناکەوێت و هەر بەیانی دەبێتەوە.

لەم کاتەدا ئومێد گریا. سکاڵا بە خێرایی رایکردە لای و دەستی بەسەری داهێنا. ئومێد گیان گوڵەکەم بۆ دەگریت؟

- دایە گورگەکە لە دەرگای دا.

- کوڕم مەترسە دایە و بابە لێرەن گورگ ناوێرێ بێتە ئێرانە. کوڕم بخەوە ئەستێرەکانی ئاسمان هەورەکانیان کرد بە لێفە و بەخۆیان دادا و ئەوانیش خەویان لێکەوت تۆش بخەوە.

## دەرگای دووەم

## جریوەی ئەستێرەکان

کاتژمێری دەی بەیانی بوو، ڕۆژێکی خۆش بوو، باران نەبوو، ناوە ناوە ڕۆژ هەڵدەهات و ناوە ناوەش لە ژێر پارچە هەورە ڕەشەکان ون دەبوەوە. تەنیا بە سەرسوڕمانەوە سەیری ئەو خەڵکەی دەکرد، کە لەم بەر و ئەو بەری جادەکە مێرو ئاسا ڕێچکەیان بەستبوو، بەرەو شوێنی نادیار دەڕۆیشتن. لەبەر زۆری خەڵک، گەر دەرزیت فرێدابایە نەدەکەوتە سەر زەوی. تەنیا لەوبەری جادەکە چاوی بە کۆگای جل و بەرگی ژێرەوەی ژنان کەوت، بە هەر شێوەیەک بێت دەیویست بە زووترین کات خۆی بگەیێنێتە لای کۆگاکە تا لە پشتی جامخانەکەوە سەیرێکی کۆتالەکان بکات. هەر بۆیەش دەیویست هەلێک بدۆزێتەوە تا خۆی بگەیێنێتە ئەوبەری جادەکە. تەنیا لەبەر خۆیەوە دەیگوت خۆ سەر جادەکانیش گەر شوێنی پەڕینەوە نەبێت لەبەر هات و چۆی ئۆتۆمۆبیل ناتوانیت بچیتە لایەکەی تریەوە. تەنیا لە کاتژمێری نۆ و نیوی بەیانییەوە لە ماڵی کاک ئازاد هاتبووە دەرەوە و بە ئەسپایی بێ ئەوەی کەس هەستی پێ بکات لە بەر دەرگای ئەم کۆگایە دەچوو بەرەو دەرگای کۆگایەکی تر. سەیری شتەکانی دەکرد وابزانم بێ ئەوەی بیر لە کڕینیان بکاتەوە، چونکە خۆی باش دەیزانی بە پانزە فرەنگ ناتوانێت هیچ شتێک بکڕێت. خۆشی هەر ئەوەندەشی لە نێو جزدانەکەی خۆی شک دەبرد. بەڵام وەک غەریزەیەک بۆ ناسین و ئاشنا بوون سەیری هەموو شتێکی دەکرد.

وا دیار بوو چێنەر و سەپان لە پێش لە ئەوەی تەنیا لە ماڵەوە بێتە دەرەوە لە قاوەخانەکەی بەرامبەر ماڵی ئازاد دانیشتبوون. ئێشکیان لە دەرگای ماڵی ئازاد گرتبوو. هەر لەکاتی هاتنە دەرەوەی تەنیا تا ئەو کاتەی چێنەر چوو بۆ لای چاویان لەسەر تەنیا هەڵنەدەبڕی. سەرنجیان دەدایێ تا بزانن سەرنجی چی دەدات.

ـ چێنەر بە سەپانی گوت :
ـ سەپان گەر بتەوێت خاڵێ بێهێزی یەکێک بزانیت. لە ڕوانگەیەکەوە سەیری بکە بزانە سەرنج دەدات بە چی، یان چ شتێک سەرنجی رادەکێشێ. ئینجا دەتوانیت بە خاڵە بەهێز و لاوازەکانی ئاشنابیت. بەم شێوەیە دەتوانیت خاڵەکان هەڵسەنگێنیت و بیانپێویت و بە گوێرەی توانا و پێویست بۆ سودی خۆت بەکاریان بێنیت. سەیرکە سەیری پێڵاوی پیاوان دەکات. تەماشایکە ئەوە چوو بۆ لای ئەو سەعاتچییە، سەیری کاتژمێری پیاوان دەکات.
ـ سەپان گووتی:
چێنەر، ئەوە بوو بە سەعات دەی بەیانی، و ئەوە تەنیا پەڕییەوە ئەم بەرە بە زووترین کات بڕۆ بۆ لای منیش پارەی قاوەکان دەدەم و دێم بۆ لاتان. تا جارێ زووە و دەتوانین بیبەین و تۆزێک بیگەڕێنین، بەس بێت دوایی خۆمان دەتوانین نەخشەی ئیمڕۆکە دابنێین.
ـ چێنەر وەک دڕندە لە نێچیرەکەی خۆی دانووسابوو، لە نکاوێک وەک جنۆکە لە بەردەم تەنیا پەیا بوو. بەیانی باش تەنیا خان، بەڕاستی بەیانییەکی خۆشە و هیچ بە زستان ناچێت. تەنیا خان خۆ لەمێژنییە چاوەڕوانمان دەکەیت، داوای لێبووردن دەکەم، وا دیارە تۆزێک دواکەوتم بۆیە، لە شەقامەکە پەڕیتەوە؟ من وەک ئاسایی لە ژووان دواناکەوم، نازانم ئیمڕۆکە بۆچ دواکەوتم، بەڵام گرنگ نییە لەم پاریسە مرۆڤ دڵی ناگوشرێت، کەس بەکەس نییە، نە کەس دەتناسێت نە کەس دەناسیت، نە کەس دەڵێت ئەوە کوڕی فڵانە وا دەکات نە کەس دەڵێت ئەوە کچی فڵانە کەسە و وا دەکات. لێرانە هەرکەسەی بەکەیفی خۆی دەکات. هەندێک جار لەم پاریسە گەر لە کورد بەدووربیت لە خوا نزیکیت.
ـ جارێ بەیانی باش کاک چێنەر، زۆر دڵشادم بە دیتنت، وا دیارە کاک سەپانیش لەولا راوەستاوە چاوەڕوانمان دەکات. بابچین بەیانی باشی لێبکەین.
تەنیا تێگەیشت سەپان و چێنەر وەک دوو برا وان و هەرگیز لێک دانابڕێن. بۆیە بە هێمنی هەنگاوێکی بەرەو سەپان هاویشت و پێکەنی،

سەپانیش بە خێرایی خۆی گەیاندە لایان، بە زەردەخەنەوە دەستی تەنیای گرت و گوتی :
- بەیانی باش تەنیا خان بەراستی بەدیتنت شادم. زۆر شادومانم بە ناسینت و بە دیدارت.
چێنەر قسەی پێ بڕی و گوتی :
- بابچین بۆ چایخانەیەک بۆی هەیە تەنیا خان پێڕانەگەیشتبێت خورێنی خۆی بخوات. وا بزانم کاتژمێری دەی بەیانی بۆ تەنیا خان گەلێک زووبوو. دەمانتوانی ژووانەکەمان تۆزێک دوابخەین. بەڵام دەی ئەوەی چوو چوو، ئەوە با وانەیەک بێت بۆ جارەکانی داهاتوو. ئەوەی ئێستاکە گرنگە بزانین تەنیا خان تاشتی خواردووە بە ئا... یان... نەء؟
تەنیا لە تەمەنیا کەسی نەدی بوو ئەوەندە بۆی بە پەرۆش بێت. بۆیە ئەوەندە بە شەرمەوە سەیری هەردووکیانی کرد و گوتی :
- کوڕینە بەخوا تاشتیم خواردووە. ئیتر با بە زوترین کات بەرەو ئەنستیتوی کورد بەڕێکەوین. ئەرێ بە باوەڕی ئێوە بۆ کێسەکەم چ چیرۆکێک هەڵبەستم؟ تا مافی پەناهەندەییم بدەنێ.
- چێنەر گوتی :
- تەنیا خان گوێ بگرە، گەر بەڕاست بتەوێت لەم وڵاتە بمێنیتەوە، ئەوا باشترین شت ئەوەیە، خۆت بە ژنێکی چەوساوە پیشان بدەیت. بۆ نموونە بڵێ من حەزم لە کوڕێک ئەکرد باوکم نەیهێشت شووی پێ بکەم. سەرەرای هەڕەشەی باوکم من پەیوەندیم لەگەڵ کوڕەکەی برادەرم نەبڕی و هەر ئەمگوت شووی پێ ئەکەم. تا گەیشتە ئەو رادەیەی باوکم بەتەمابوو بمکوژێ. چوومەماڵی هاوسێکەمان خۆم شاردەوە، وامدەزانی، ئەمجارەشیان وەک جارەکانی پێشوو باوکم سارد ئەبێتەوە و وازم لێ ئەهێنێ. بەڵام وادیار بوو ئەمجارەیان باوکم لەسەر بڕیاری خۆی سوور بوو. بۆیە دایکم یارمەتی دام و گوتی کچم بۆخۆت بڕۆ شوو بەو کوڕە بکە و بڕۆن لە شارێکی تر بژین. منیش نامەیەکم بۆ کوڕکەی برادەرم نووسی تا پێکەوە ژیانێکی ئاسودە بەرینە سەر. بەداخەوەم چەند نامەم بۆ نووسی وڵامی نەدامەوە. منیش هیچ

ڕێگام لەبەردەما نەما. هانام هێنا بەر قاچاخچییێک ئەویش ئەم ڕێگایەی پیشان دام. من بیستومە وڵاتی ئێوە بە ڕۆژ خێوەتەو بە شەو ڕەشماڵێکی گەورەیە. کاتی سەرماش وەک کەپەنگی مامەی شوان پشتی بەستەڵەک دەشکێنێ و کەس تیایا سەرمای نابێت. من لە ڕەشماڵێک دەگەڕێم، جا خۆتان وەک وڵاتی پەناهەندە بڕیاری خۆتان بدەن.

بەدەم ئەم قسانەوە بوون گەیشتنە بەر دەرگای ئەنستیتوی کورد لە پاریس، هەرسێک وەک چۆن بچنە ماڵی خۆیان بەم شێوەیە چوونە ژورەوە و ڕۆژباشیان کرد و تۆقەیان لەگەڵ ئامادەبووان کرد. هەموولایەک وەک کوردەواری خۆمان بەخێرهاتنیان لێ کردن.

سەپان و چێنەر تەنیایان لە نێوانی خۆیان دانا وا دیاربوو هەر قسەیان بۆ دەکرد. ناوەناوەش بە زەردەخەنەیەکەوە سەیری دەور و پشتی خۆیان دەکرد، تا خەڵکەکە نەڵێن ئەوانە ئاگایان لە هیچ نییە. کوڕێک بە ناوی دڵشاد بەخێرهاتنی کردن و سێ چای لە بەردەمیان دانا و گوتی تەنیاخان بە کاک سەروەرم ڕاگەیاندووە کە جەنابتان لێرانەن. پێیراگەیاندم داوای لێبوردنتان لێبکەم و گوتی ئێستە دێمە خوارەوە. سەپان و چێنەر سەیری یەکتریان کرد و چێنەر گوتی :

ـ تەنیا خان ئەو کێسەی کە من و سەپان بۆمان ڕێکخستیت بڕواتبێت باشترین کێسە و هەرگیز ڕەتناکرێتەوە. ئیتر پێویست بە کەس ناکات.

وا دیار بوو تەنیا گەلێک دوو دڵ بوو لە قسەکانی سەپان و چێبەر، بۆیە بە پێکەنینێکی دڵنیاکەرانەوە گوتی :

ـ ئێنجا چیمان زەرەرە گەر گوێ لە کاک سەروەریش ڕاگرین بزانین ئەو چی پێیە؟ بۆی هەیە هەر هیچی پێنەبێت.

سەپان بە ناچاری گوتی.

ـ ڕاستە.

چێنەر نەقیزەیێکی لێدا و بە دزیەوە گوتی :

ـ کوڕە گەمژە پیاو هەیە بۆ ئەم نەرم و نیانە هیچی پێنەبێت؟

- تەنیا خان دەڵێی چی پێش ئەوەی کاک سەروەر بێتە خوارەوە، بابچین لە دەرەوە قاوەخانەیەکی خۆشی لێیە لەوێ قاوەیەک ئەخۆینەوە و دێینەوە ئێرە.
بەتەما بوون هەڵسن کاک سەروەر لە سەر پەیژەکان بە راکردن هاتە خوارەوە و بە هەنگاوی زل زل بەرەو هەرسێکیان هات و دەستی گوشین و داوای لێبوردنی کرد کە زۆر دواکەوت گوتی :
- وەرن با بچین لە دەرەوە قاوەیەک بخۆینەوە.
- تەنیا بە شەرمەوە سەری هەڵبڕی و بە دەنگێکی ناسک وەڵامی داوە پێویست ناکات من داوای لێبووردن دەکەم جەنابتانم سەغڵەت کرد. ئێستەش نامەوێت کاتێکی زۆرتان لێ بکوژم، هەر ویستم بتانبینم تا تۆزێک ئامۆژگاریم بکەن. من بەڕاستی شەرمەزاری ئێوەم و نازانم چۆن چاکەتان بدەمەوە. ئەم هەموو میهرەبانییەی کە لە ئێوەی بەرێز دا دەیانبینم لە کەسم نە دیوە و لە کەسیشم ڕەچاو نەدەکرد. ئەوەش نیشانەی گەورەیی و پایەبەرزیتانە.
کاک سەروەر بە زەردەخەنەیەکەوە رووی لە سەپان و چێنەر کرد، خۆ لاریتان لەسەر ئەوە نییە بچین قاوەیەک بخۆینەوە چونکە من لە شەشی بەیانییەوە بێدارم تا ئێستەش قاوەم نەخواردووەتەوە، ئینجا یاخوا بەخێربێن بە سایەی ئێوەوە بۆی هەیە پێمبکرێت قاوەکەم بخۆمەوە. هەردووک چاویان لە یەک کرد و شانیان هەڵتەکاند و دەستیان لە رانی خۆیان دا، وەک بڵێی ئیتر هیچیان بەدەستەوە نەماوەتەوە و رەزامەندی خۆیان بەم شێوەیە دەربڕی.
لەم کاتەدا دەرگای هۆڵی پێشوازی کەوتە سەر پشت و ئەلێکساندەر هاتە ژورەوە و یەکسەر بەرەو کاک سەروەر هات و کاک سەروەریش لەلای خۆیەوە چەند هەنگاوێک لە ئەلێکساندەر چووە پێشەوە و دەستی یەکتریان راگوشی، وا دیاربوو کە زۆر دڵشادبن بە دیتنی یەکتری. کاک سەروەر دەستی لەسەرشانی ئەلێکساندەر دانا و گوتی بەتەمابووین بڕۆین دە باشە با گشتمان پێکەوە بچینە قاوەخانە.
ئەلێکساندەر سلاوی لە تەنیا کرد نازانم بۆ بە فەرەنسی پێیگوت من زۆر دڵشادم بە دیتنتان.

تەنیاش زۆر بە شەرمەوە و چاوی لە زەمین بڕیبوو و سەیری کاک سەروەری کرد ئەویش زوو تێگەیشت کە تەنیا تێنەگەیشت بۆیە بۆیە بۆی کردە کوردی. تەنیا بە شەرمەوە وەڵامی داوە و گوتی منیش.
دەمێکی کورت لە قاوەخانە دانیشتن و کاک سەروەر گوتی :
- تەنیا خان ئیمڕۆکە یەکێکت لەگەڵدەنێرم بۆ دائیرەی پەناهەندەیی تا ئیزبارەکەتیان بدەینێ. لە هەمان کاتیش دا سوپاسی چێنەر و سەپانی کرد و بەڕێی کردن.
- سەپان رووی لە چێنەر کرد و گوتی کوڕە چێنەری نا پیاو وابزانم ئێمە هەر گەوادیەکەمان پێ بڕا.
- گوێ مەدەیێ سەپان گیان دێتە یادت لە کوردستان سەیری فڕۆکەیەکمان کرد زۆر بەرز ببووەوە پێمگوتی چەند بەرز بێت رۆژێک ێت هەر سواری ئەبم، ئیستەش تەنیاخان با لافی تەنیایی لێدات، ئەویش ڕۆژی خۆی دێت.
لە پاش وت و وێژێکی کەم لە نێوانی ئەلێکساندر و سەروەر کە پەیوەندی بە کار و باری خۆیانەوە هەبوو. هاتەوە یادیان کە تەنیا لە لایان دانیشتووە و هیچ لە قسەکانیان تێناگات. هەر بۆیەش کاک سەروەر بە ئینگلیزی بە تەنیای گوت : - دەتەوێت لە پەرتوکخانەی ئەنستیتوی کورد کاربکەی؟ ئەگەر پێتخۆشبێت هەر لە بەیانییەوە وەرە دەوام بکە من لەم بڕوایەدام کە ئەم کارەت بە دڵ دەبێت. ئێمەش پێویستیمان بە یەکێک هەیە لەوێ کاربکات.
وا دیاربوو ئەم بیرۆکەیە زۆر بە دڵی ئەلێکساندەر نەبوو. بۆیە گوتی :
- سەروەر دە تۆ واز لە پەرتوکخانەی خۆت بێنە، دەبا ئەم کچە بچێت زمانی فەرەنسی فێربێت. من دەتوانم ناوی لە فێرگەیەک بنووسم مانگانەش ٢٤٠٠ فرەنگیش وەربگرێ. کەی زمان فێر بوو وەک کچێکی رەوشەنبیر دەتوانێت لە پەرتوکخانەی ئەنستیتوت کاربکات. هەر خۆشیش نییە فەرەنسییەک دێت بۆ ئەنستیتوت کە شوێنێکی رەوشونبیرییە یەکێک پێشوازی لێ بکات کە زمانی وڵاتەکە نەزانێت.
ئا لێرانە سەروەر قسەی نەما و گوتی :

- ڕاستەکەیت.
بۆ ئێوارە تەنیا هاتەوە ماڵی کاک ئازاد، سکاڵا پێشوازیەکی گەرمی لێکرد و ئەولا و ئەولای ماچ کرد و بە ئومێد و لانەی گوت وەرن وەرن بابە تەنیا هاتەوە. یەکسەر سێ چوکلاتی مارسی خستە باخڵی تەنیا و گوتی بیاندەیە، بۆی هەیە برسیتبێت تا خواردن پێدەگات یەکێکیان بخۆ.
- سکاڵاخان دڵنیابە نانم خواردووە، ئەم لا و ئەو لای لانەی ماچ کرد و ئومێدی لە باوەشی خۆی کرد و لەگەڵ هەر گەزێکی لە چوکلاتەکەی دەدا سەیری ناو دەمی دەکرد. دوو ئەسرینی گەش ڕژانە سەر کوڵمەکانی تەنیا. تەنیاش بە پێکەنینێکی بێ دەنگ فرمێسکەکانی بە قۆڵی ئومێد سڕییەوە و مارسەکەی تریشی کرد بە نیوە و دای بە هەدووکیان. سکاڵا ئاگای لەم دیمەنە بوو دەیزانی دڵی تەنیا چی تیایە. بۆیە گوتی تەنیا نەتگوت ئیمڕۆ چیت کرد؟
- لە ئەنستیتوتی کورد منیان برد بۆ شوێنێک و چوار وێنەیان بۆ گرتم و پاسەپۆرتەکەیان لێسەندم و پەڕێکی سپان داوەپێم کە ماوەکەی ١٥ ڕۆژە دوای ئەوە تەواو دەبێت، وێنەیەکی منیشیان لێداوە. بەیانی دەچم بۆ ئەنستیتوتی کورد لە مەکتەبەکە کار دەکەم، تا لەم ڕۆژانە خوێندنی زمانم بۆ دەردەچێ.
- ئەی لە کوێ نانت خوارد؟
- لەگەڵ کاک سەروەر نانم خوارد. ئەی ئێوە ئیمڕۆ چیتان کرد؟ ئەی چاوم کوێربێ چون بۆ لای تەزرە؟
- بەڵێ چووین بۆ لای تەزرە، وا دیارە ئەم بەستەزمانە هەتا دێت خراپتر دەبێت و بەرەو چاکبوونەوە ناڕوات. بۆیە داوام لە دوختۆرەکەی کرد کە ڕێگامان بدات جار و بار لە خەستەخانە بیهێنینە دەرەوە تۆزێک بیگەڕێنین، تا لە نێو چوار دیوادا نەمێنێتەوە. چونکە گەلێک دڵی دەگوشرێت. دوختۆروکەی جارێ رازی نییە، پێیگوتم دەبێت بە باشی بیری لێبکەینەوە. گوتی، دەتوانن بیبەن بۆ باغچە گشتییەکان و نابێت زۆر یاری بکات واتا نابێت ماندوبێت. دەبێت لەگەڵ لیژنەی پزیشکان دابنیشم و ئەم پێشنیارەیان پێشکەش بکەم

بزانین ئەوان چی دەڵێن؟ ئەوەش ئەگەر هەفتەی بێتەوە وەڵاممان بدەنەوە زۆرباش دەبێت. دەوەرە قۆڵت لێ هەڵکە، چونکە ئیمشۆکە شیرین خان و مامۆستا و باوە قەشە و ئەنگێلا و کاک سامان و سەرکەوتە لال دێن بۆ لامان.

ـ ئەی بەتەمای چی بۆ ئەم حەشاماتە بکەی؟ ئەی ئەبونە کێیە، ئەو پیاوە نییە کە دوێنێ شەو تەلەفۆنی کرد؟ ئەی ئەنگێلا کێیە؟

هەر بەدەم قسەکردنەوە خواردنەکانیان ئامادە دەکرد.

سکالا گوتی :

ـ ئەبونە پیاوێکی زۆر گەورەیە. هەرچەندە راستەوخۆ ئەندامی هیچ پارتییەک نییە و نەبووە بەڵام ئەم پیاو چاکە، چاکەی بەسەر هەموویانەوە هەیە. قسەی لای هەموان دەروات. دەڵێن لایەکی کەنیسەی جیا کرد بووەوە بۆ هەندێک گەورە پیاوان کە لە دژی حوکمەت لێیان دەقەوما. جا چەند گەورە پیاو خۆیان لەلای ئەبونە شاردووەتەوە؟ ..... نازانم. دووای ئەوە کەنیسەکە کۆنە رۆنیۆیەکی هەبووە کە بۆ کار و باری کەنیسە بەکاریان هێناوە. ئەبونە ئەویشی خستبووە گەڕ بۆ کاری بەپەلەی بزوتنەوەی کورد؛ وەک بەیانێکی سیاسی، یان رووداوێکی سیاسی. ئەوەندەی شت لێ دەگێرنەوە خۆی لە خۆی دا دیاردەیەکی بێ هاوتای کۆڵنەدانە. بە هەڵکەوت ئاسایشی پێشمەرگە پێیان زانی کە دەسەڵاتی بەعس بەتەمایە ئەبونە بگرێ. یەکسەر مەفرەزەیەک بە دزیەوە دەچێتە ناوچەکە و بە ئەبونە رادەگەیەنن کە بە زوترین کات دەبێت خۆی بگەیەنێتە ناو هێزی پێشمەرگە، چونکە ژیانی لە مەترسی دایە. ئەویش یەکسەر لەگەڵ پێشمەرگەکان کەنیسە جێدەهێڵێت و خۆی دەگەیەنێتە سەرکردایەتی. ئەوانیش پێشنیاریان کرد کە بیکەن بە دەمڕاستی بزوتنەوەی کورد لە فەڕەنسا. ئەوەی بزانم قبوڵی نەکرد چونکە نایەوێت راستەوخۆ بکەوێتە ناو سیاسەتەوە، یان بە شێوەیەکی تر نایەوێت بکەوێتە ژێر رکێفی پارتییەکان. پیاوێکی بە تەمەن گەورە نییە، بەڵام زۆر پیاوێکی لەسەرخۆ و تێگەیشتو و دیندار و زانایە. لەگەڵ مامۆستا و ئازاد بەینیان زۆر خۆشە. ئەوەی سەیرە ئازاد نوێژ ناکات، بەڵام دیندارەکان خۆشیان دەوێ. ئەو رۆژە

ئازاد داڵغەی لێدابوو، نازانم بۆ چ لایەک فڕی بوو. مامۆستا و ئەبونەش قسەیان دەکرد و باسی نوێژیان دەکرد. ئەبونە ئاگادار بوو کە ئازاد فڕیوەتە لایەکی تر.

ئەبونە رووی لە مامۆستا کرد و گوتی :

ـ سەیرکە کاک ئازادیش بەم شێوەیە نوێژی خۆی دەکات.

ئازاد بێ ئەوەی تێبگات ئەبونە مەرامی چییە یەکسەر گوتی :

ـ بەڵێ قوربان راستەکەی.

مامۆستا پێکەنی و گوتی :

ـ دەست خۆش ئەبونە، سەیرکە ئەقڵی باتن درۆناکات.

ئازادیش بە پێکەنینەوە گوتی :

ـ نازانم چی ڕویداوە باسی ئەقڵی باتن دەکەن، دیسان راست ئەفەرمون ئەقلی بەتنی(بە عەرەبی بطن واتا سک) من دەڵێ سکالاگیان پێمانڕابگە برسیمانە.

ـ سکالاخان ئەی ئەنگێلا کێیە؟

دە تۆ باینجانەکان بقەڵشێنە، تەماتەکە وردکە، ئەم لاسکە کەرەوزانە بخەرە ناو ئاوێکی شلتێن. ئینجا ئەم ئەنگێلایە وەک ئیستاکەش دەیبینیت کچێکی زۆر جوان و ناسک و چاوکراوەیە. لەم رۆژانە ماجستێرەکەی تەواو دەکات. لە سیاسەت ئەگەر تووڕە نەبێت و دەماری نەگیرێت ئەوا گەلێک لە ئازاد نزیکە، بەڵام کە تووڕە دەبێت دۆ و دۆشاو تێکەڵداکات. هەر ئەوەندەم گوێ لە ئازاد دەبێت دەڵێت ئاخر هاوڕێ وانییە ... هاوڕێ دەڵێم وانییە. ئەو ڕۆژە ئەنگێلا پێی گوت ئەرێ: ئەگەر هاوڕێ وانەبێت ... و هاوڕێ وانەبێت ئەی هاوڕێ گیان چۆن دەبێت ئەوە یەکێتی سۆڤیەتیش ڕما.(قەڵای مەریوان پاڵم دا پێوە قەڵاکەم روخا پاڵدەمە کێوە؟) قەت گوێم لێ نەبووە ئەنگێلا گۆرانی بڵێ و ئازاد بدات لە قاقای پێکەنین. ئازاد وەک قوتابیەکی ژێر دەستەکانی تێکهەڵکێشا و لە سەر سینگی خۆی دانا، بێ ئەوەی چاوی بتروکێنێ چاوی لە چاوی ئەنگێلا بڕی. پاش دەمێکی تەواو سەری خۆی لەقاند و بە هێمنیی گوتی: هاوڕێ ئەنگێلا گوێ بگرە، خۆت دەزانیت کۆمونیزم بیرێکی فەلسەفییە. نە بەسەرکەوتنی پارتیەک بە هێز دەبێت نە بە رمانی ئەو پارتییەش لاواز

دەبێت. لە هیچ وولاتێک هیچ پارتییێک ناتوانێ هەتا هەتایە دەسەڵاتی لە دەستبێت. چونکە دەسەڵات بە بنکەی کۆمەڵایەتییەوە بەستراوەتەوە. بنکەی کۆمەڵایەتیش بنکەیەکی نەگۆڕ نییە، بەڵکو لە گۆڕانێکی بێکۆتایی دایە. کە وابێت بێ بنکەی کۆمەڵایەتی نە دەتوانیت بێیتە مەیدانی خەبات نە دەشتوانی دەسەڵات وەدەستبێنیت. ئەنگێلا بوونی سۆڤیەت دژ بە تێڕوانینی مارکس بوو، چونکە بە تێڕوانینی مارکس پرۆلیتاریا چینێکی چەوساوەیە، بەڵام سۆڤیەت دەیانگوت ئێمە دەوڵەتی پرۆلیتارياین. واتا پرۆلیتاریا دەسەڵاتی گرتۆتە دەست، ئەی چۆن، دەبێ خۆی خۆی بچەوسێنێتەوە؟ تا بە پرۆلیتاریایی خۆی بمێنێتەوە.

بۆ نموونە بۆ لە کوردستان پارتی کۆماری لە ئارادا نییە، بەڵام لە فەرەنسا پارتیەکی سەرەکی ئەم وڵاتەیە. هەر دوور نەڕۆین جارێ کوردستان نەبووە بە کۆمار چۆن دەبێت پارتییەکی کۆماری هەبێت؟ کە وابێت بوونی ئێمە کۆمونیست پەیوەندی نییە بە بوونی یان نەبوونی یەکەتی سۆڤیەتەوە. دوای ئەوە کێ دەڵێ پارتی کۆمونیست دۆڕاندی کێ ناڵێ شێوەی خەباتی خۆیان نەگۆڕیوە تا خۆیان ئامادە بکەن بۆ شۆڕشی جیهانی، واتا بیر و بۆچوونی ترۆتسکی. لە بەینی خۆمان بێت بیر و بۆچونی خرۆشۆڤ ئەوە بوو کە پارتە کۆمونیستەکان خۆیان لە نێو پارتە بۆرژواکانا بتوێننەوە. من نامەوێت زۆر بچمە نێو ئەم بابەتەوە، چونکە جارێ گەلێک زووە. بەڵام هەر وەک بۆچوونەکەی تۆ یەکەکتی سۆڤیەت بوو بوو بە قەڵغانی چەوساوەکان. هەموو زەبر و زەنگەکان بە بەر قەڵغانە کە دەکەوتن. سەرەرای ئەوەش هەموو چەوساوەکانیش نە کۆمونیست بوون و نەکۆمونیستن. هەرکە لە لێدانەکە رزگاریان دەبوو، یەکسەر دەبوون بە دڕندە دژی کرێکار و جووتیاری وڵاتەکەی خۆیان.

بە باوەڕی من گەر لێگەڕێین ئیمپریالیزم دژی نەتەوە بچووکان گورزی خۆی بووەشێنێت. ئیمپریالیزم هەرگیز لە نێوان خۆیاندا کۆک نابن لەسەر دابەشکردنی پارووی چەور. لە کۆتاییدا بەرجوازییەتی نەتەوە ژێردەستەکان دەکەونە گومان لە هەڵس و کەوتی ئیمپریالیستەکان. بەم

شێوەیە سەرمایەداری دەگاتە بەرزترین لوتکەی خۆی. پاش ئەم ئاڵۆزییە چاوەڕوان کراوە سەرمایەداری بە شێوەیەک لە شێوەکان نشێو دەبێتەوە، هەرشتێکیش سەربەرەو لێژ بووەوە سەرەنجامەکەی دیار نییە. یان بە شێوەیەکی رەگەزی دەگۆڕدرێت، یان شێوە گۆڕانێکی بەسەر دێت ئێمڕۆکە ناتوانین هێڵە گشتییەکانی دەستنیشان بکەین. بە بڕوای من بە شێوەیەکی گشتی لە نێوانی نەتەوە بچووکەکان و ئیمپریالیزم دا دۆڵێک دروست دەبێت، کە ئیتر هیچ پردێک ناتوانێت بیانگەێنێتەوە یەک. بەرجوازییای نەتەوە بچووکەکانیش باوەڕنامەی خۆیان لای نەتەوەکانی خۆیان لەدەست دەدەن. بۆ نموونە تا ئێستاش لە هەموو وڵاتانی جیهان کرێکار و جووتیاران دەنگ دەدەنە پارتییە بۆرژواکانی وڵاتەکەیان و بە فیت و داو و یارییەکانیان هەڵدەخەڵەتێن، بە سەرکەوتنیانیش هەڵدەپەڕن. هەر بۆیەش لە هیچ وڵاتێک پارتی کۆمونیست بە دەنگدان بەسەر نەکەوتوە. لەبەر ئەوە هەمووکاتێک کۆمونیستەکان باسی شۆڕش دەکەن و ئەم وشەیە لە وڵاتە پێشکەوتوەکان زۆرینەی زۆری خەڵکی دەرەوێنێتەوە. بەڵام ئەو کاتەی دەوڵەتە مەزنەکان وەک ئاغا بێ جووتیار مانەوە، ئەوساکە پرسیارێکی تر دێتە ئاراوە.

لە دەرگایان دا، سکاڵا گوتی توخوا تەنیا گیان بزانە کێیە؟ تەنیا بە پەلە خۆی گەیاندە دەرگا و کە دیتی کچێک لە بەر دەرگایە بە هێمنی دەرگەکەی خستە سەر پشت و گوتی فەرموو.

ئەنگێلا وەک منالێک پێکەنی و گوتی:

ـ مادام بە کوردی دەدوێیت دیارە بەهەڵەدا نەچووم و ئێرە ماڵی سکاڵاخانە.

ـ دە جارێ فەموو وەرە ژورەوە، دوایی من پێت ئەڵێم راستەکەیت؟ ئێرە ماڵی سکاڵا خانە، یان نەء.

سکاڵا لە چێشتخانە هاتە دەرەوە و دەستی لە ملی ئەنگێلا کرد و گوتی :

ـ وابزانم تۆ هەرگیز لە پێکەنینی خۆت ناکەویت. با بە تەنیاخانت بناسێنم، هەردووک دەستیان لە نێو دەستی یەک نا. سکاڵا دەستی ئەنگێلای گرت و گوتی ئەنگێلا گیان بە قوربان زۆر درەنگە وەرە تۆ خەریکی زەڵاتەکان بە.

تەنیا گوتی :

ـ ئەرێ ئەنگێلاخان بیستومە ئەگەر پارتی کۆمونیست بێتە سەر حوکم هەر جووتیارەی تراکتۆرێک و دەراسەیەکی تایبەتی خۆی دەبێت. ئەوە راستە؟
ئەنگێلا دای لە قاقای پێکەنین و گوتی :
ـ تەنیا گیان، ئەوە کێ وای پێگوتی، هەر بۆخۆت بیربکەوە ئەو زەوییەی بە دە رۆژ یان با بڵێین بە هەفتەیێک بە گا جووت بیکێڵن، بە دوو سێ سەعات بە تراکتۆر دەکێڵدرێت. کە وا بێ بە باوەڕی من هەرچەندە من جوتیارنیم تراکتۆرێک بۆ گوندێکی سیماڵی بەسە، گوندێکی سەد ماڵیش یەک دەڕاسەی بەسە. جگە لەمەش با دوور نە ڕۆین هەر کوردستانی خۆمان نزیکەی دوو ملیۆن جووتیاری تیایە، ئەگەر هەریەکەی تراکتۆرێکی بدەنێ دەبێتە دوو ملیۆن تراکتۆر، من لەم بروایەدام کە فەڕەنسا نزیکەی شێست ملیۆنە دوو ملیۆن تڕاکتۆری نەبێت. دوای ئەوە کێ دەڵێ یەکەم گرفتی ئێمە گرفتی تراکتۆرە؟راستە بۆی هەیە یەکەم گرفتی ئێمە ببێتە دروسکردنی تراکتۆر. نەک کڕینی تراکتۆر.
تەنیا بە سەرسوڕمانێکەوە چاوی لە هەردووکیان کرد و گوتی :
ـ بەڵێ،،،بەڵێ "دەستی هێناو برد وەک بڵێی باوەشینی پێبکات" ئەی بەساقەی دەمتبم تۆ قەت بیستوتە لە کوردستان تڕاکتۆر دروست بکرێت؟
سکاڵا پێکەنی گوتی :
ـ کچێ بڵێ دەرزی مەڵێ تراکتۆر، ئەی بەزیای خێرم نەکرد، شۆڕشێکی گەورە و گران کارگەیێکیان دانەنا بۆ چاککردنەوەی تفەنگە شکاوەکان. یان گولە و تەقەمەنی دروست بکەن. سەیری لوبنان کە بە قەدەر شارێکی کوردستان نابێت بارودیان لە شێوەی حەلوای لوبنانی دروست دەکرد، و بە دیاری دەیانارد بۆ دوژمنانیان. ئێمەش هەر دەست پاندەکەینەوە لەبەر ئێران و تورکیا. خۆ تورکیا ئەگەر شتێک خێری پێوەبێت هەرگیز نایدات بە کورد، ئێرانیش هەر وێوەتر. دەئینجا وەرە باوەڕت بەم سەرکردانە هەبێت.
ـ ئەنگێلا وتی زاری بەڵێت خۆشبێت. ئەنگێلا تا تەنیا بریندار نەکات چونکە نەی دەزانی بیر و باوەڕی تەنیا چییە، بە پێچ و پەنا بە شێوەیەکی نەرم بیری

خۆی دەربڕی: سکالآ دێتە یادت ماڵی شێخ قادر و عەولآغا "یادیان بە خێر" لێرانە بوون دووایی چوون بۆ کەنەدا.
سکالآ بەسەر وەڵامی داوە و پاش دەمێک گوتی :
- بەڵێ یادیان بە خێر چۆن لە یادیان ئەکەم!
- رۆژێک ستی خانی شێخ قادر من و قومری خانی عەولآغای بانگ کرد و چووینە ماڵیان، ستی خان خەریکی شیولێنان بوو، گوتی قومری خان سەیرکە چیمان بەسەر هات، لەم هەمووە خولآم و کارەکەرەی لەبەر دەرگامان بوون ئێستەش بۆخۆمان دەست لە نێو ئاوی سارد دەنێین و شیو لێدەنێین، دونیا دەوران دەورانە.
قومری خان بە ئەسپایی سەری هەڵبڕی و بە پێکەنینێکی دۆستانەوە گوتی، دەی دەی هەر حەمد و سەنای خوا بکە ئێوەی شێخ هەر بە سواڵ خواردنتان پەیا دەکرد ئەی بە ئێمەمانان دەڵێیت چی کە بە لوولەی توفەنگ نانمان دەهێنا سەر خوان، ئیستەش بوینەتە موچەخۆر و لەسەری مانگ تا کۆتایی مانگ پارەکەمان بەش ناکات.
- منیش گوتم ئەوەی تێبگەم هەر دوو لاتان مشەخۆر بوون.
- ستی خان گوتی قومری خان لەڕێی خودا، تۆ بۆ دەمی ئەم شوعیانەمان لێ دەکەیتەوە.
- ئینجا کچینە با بێینەوە سەر باسی خۆمان: ئەوەی فێری دەرۆزە بوو هەرگیز بیر لە بەرهەمهێنان ناکاتەوە و هەردەم دەست لەبەر ئەوانە پان دەکاتەوە کە تۆزێک زۆرتری پێ دەبەخشن، ئاغایەکانیش چۆن ئامادەن کە خولآمیان هەبێت بە هەمان شێوەش ئامادەن خولامەتی ئاغایەکی لە خۆیان گەورەتر بکەن. ئەگەر ئاغایەک پێی بکرێت بە ئاریکاری سەروەرەکەی و بە لوولەی تفەنگی خۆی دەست بەسەر زەوی و زاری هاوسێکەی دابگرێت، تا دڵی سەروەرەکەی نەشکێنێت هەرگیز بیر لەوە ناکاتەوە تفەنگ دروست بکات. چونکە تفەنگ دروست بکەیت پێویستیت بە سەروەرەکەت نامێنێت.
ئازاد دەرگای کردەوە و هەستی پێکرد میوانیان هەیە یەکسەر کۆکەیەکی هێنا خۆی و گوتی :

ـ سكالاَ واديارە میوانمان هەیە.
ـ هەمویان خۆیینە وەرە ژوورەوە. ئەرێ ئازاد لەگەڵ دەستی خۆت میوەت کڕیوە؟ ئازاد هاتە ئاشپەزخانە، پاشی سڵاو و چەند قسەیەکی نەستەق زەنگی تەلیفۆن لێی دا و ئازادیش بە پەلە میوەکانی دانا و بەرەو تەلەفۆنەکە چوو. بەڵێ کاک سالار، نا بەخوا دەبێ بێیت، ئاخر دانیشتنەکە بە بێی تۆ خۆش نابێت. وا دیار بوو سالار کاری ئێشکچی شەوانی دۆزیبووەوە، بۆیە، دەبوایە بچێت بۆ کار. ئازادیش پیرۆزبایی لێکرد و گوتی باشە با بۆ جارێکی تر بمێنێت. کاک سامان و ئەبونە و مامۆسا پێکەوە هاتن و هەمووولایەک زۆر بە گەرمی پێشوازییان لێکردن و دانیشتن. ئومێد و لانەش بەخێرهاتنی میوانەکانیان کرد و تۆزێک چوکلات و پسکیتیان بۆ هێنابوون لێیان وەرگرتن و زوو زوو دەیان خوارد وەک بڵێی گورگیان بە دوواوەیە. پەرداخێک شەربەت لەسەر مێزەکە بوو ئەویشیان خواردەوە.
سکالاَ لە مەتبەخەوە هاواری کرد منالَینە ئێوە دیاریتان وەرگرت گوتتان سوپاس؟ ئومێد گوتی :
ـ سوپاس. هاواری کرد دایە گوتم سوپاس.
بەڵام لانە بە مۆنی سەیری گشتیانی دەکرد و دەیویست شتێک بڵێ و نەی دەزانی چۆنی دەربڕێ.
مامۆستا گوتی :
ـ لانە بۆ وا بەعەبووسی سەیرمان دەکەی؟
ـ من پێتانم گوت سوپاس دیسانیش دەڵێمەوە سوپاس چونکە چوکلاتتان بۆمان هێناوە، بەڵام ئێوە لە شوێنی یاری من دانشتوون و پێمناڵێن سوپاس.
هەمویان دایان لە قاقای پێکەنین.
ئەبونە گوتی :
بە خوا راستەکەی دەبوایە لێتبپرسین، بەڵام با ئەوە بۆ جارێکی تربێت، باشە لانە گیان؟
سکالاَ بە دەنگێکی بەرز تا گشتیان گوێیان لێبێت گوتی :

- ئەی چاوت کوێربێت لانە، ئەیەڕۆ ئەوە بە مامۆستا و ئەبونە وادەڵێی؟ دەی هەڵسە دەستیان ماچکە.
- دایە من کچم، ژن دەستی پیاوان ماچ ناکەن بەڵکو پیاو دەستی ژنان ماچ دەکەن. ئەی کە لێتدەپرسم بۆ بابە دەستت ماچ دەکات دەڵێی چونکە من ژنم.
ئازاد سەری لێ شێوا بە هەر چۆنێک بێت دەیویست دەمی لانە داخات تا قسەی تری نەکردووە یەکسەر گوتی سەگە بڕۆ هۆدەی خۆت دەی. ئازاد لەبەر خۆیەوە بە پرتە پرت گوتی منداڵی ئەم زەمانە لە کوێ و منداڵیی ئێمەمانان لە کوێ، ئێمە تەنانەت نەمان ئەوێرا بەرامبەر باوکمان یاری بکەین، ئینجا باسی قسەکردن هەر مەکە. ئەوانەش لەم تەمەنەوە لەدەممان دەدەنەوە، ئینجا وەرە ئەم کەرە لەم قورە دەربێنە.
- ئەبونە بە ساردیەکی قەشانەوە گوتی کاک ئازاد ئێوە دەتانوێ دونیا بگۆرن ئەی چۆن ناتانەوێت مناڵەکانتان بگۆڕدرێن. گەر لە یادت بێ جاران کە مامە قەشە بە بازار دا تێ ئەپەڕی، ئەم بەر و ئەو بەری جادەکە کە هەر هەمویان موسولمان بوون دەستیان بۆی بە سینگیانەوە دەگرت. ئیمڕۆکە مەسیحییەکانیش پشتی تێ دەکەن نەوەکا ببینن و سڵاوی لێ بکەن. ئینجا هەر بەتەمای خودا ئەگەر ئەم خەڵکە ڕوو لە خوا نەکەنەوە، دەترسم زۆر خراپ تێکبچێت. ئەوەش ڕۆژەکەیە، ئەگەر لێبوردنی ئایینی نەگەڕێتەوە وەک جاری جاران بەم رەوشە زۆر گەشبین نیم. ئەگەر ئێمە لە پێناوی خۆشەویستی خودا پێماننەکرێت یەکترمان خۆشبوێت ئەوا هەردەبێت بەتەمای خۆشەویستی خودابین، لێمان ببورێت و بمانخاتەوە سەر ڕێگای ڕاست.
- ئەنگێلا گوتی ئەبونە ئێمە چاومان لە رەحمەتی خودایە شتێکمان بۆ بکات. ئەی خودا چاوەڕێی چی دەکات. دەیەوێت وەک یەسوعی مەسیح لە خاچمان بدەن؟ جوولەکە مەسیحیان لە خاچ دا ئینجا خودا بەنی ئیسرائیلی لە هەموو نەتەوەکانی تر خۆشتر دەوێت. ئینجا لێرە دەپرسم دەبێت خودا ڕاست بێت یان جوولەکە؟
مامۆستا بە دەنگێکی بەرز گوتی استغفرالله.
- سامان سەری خۆی خوراند و گوتی :

- مامۆستاینە داوای لێ بوردن دەکەم، کە پێشمەرگە بووم پەلەکەی ئێمە ئیسلام و فەلە و یەزیدی تیا بوو، باسی هەموو شتێکمان دەکرد باسی ئایینمان نەدەکرد. ئەگەر ئێمە ئایین بنە بڕبکەین و لەناو ببەین چ کارمان بە لێبووردنی ئایینی دەمێنێت؟ هەر گرفتێک دەبێت هۆییەکی هەبێت. بوونی دوژمنایەتی ئایینی لە بوونی ئایینەوە دێت. کەوابێت ئەگەر ئایین نەمێنێت گرفتەکە لەناو دەچێت. بەم شێوەیە کۆمەڵگایەکی بێ ئایین دوژمنایەتی ئاینی لەناو نابێت. لەم بیرەی خۆم گەر زۆر توندڕەو نەبم بۆی هەیە گورگ و مەڕیش پێکەوە ئاو بخۆنەوە.

- ئەبونە گوتی مامۆستا وادیارە ئیمڕۆکە ددانیان لێمان تیژکردووە. کاکی خۆم کاک سامان گەر دیمۆکراسییەت بە توندرەوی بسەپێنیت دەبێت بە دیکتاتۆری، کە وابوو کێشەکە لە ئاییندا نییە بەڵکو لە توندڕەوییە. تا بەباشی لە ئینجیل و قورئان بگەن. کە خودا دەفەرموێ من بەنی ئیسرائیلم لە نەتەوەکانی تر زیاتر خۆش ویست، یان لە نەتەوەکانی تر بەرزترم دانان ئەم ڕستەیە بە شێوەی ڕابوردوو هاتووە. نەک بە شێوەی بەردەوامی. ئەوەش کاتی خۆی خودا چەند پەیامبەرێکی لە بەنی ئیسرائیل هەڵبژارد و بۆی ناردن تا بێنە سەر ڕێگای ڕاست. بۆ نمونە بۆ نەتەوەی کورد یەک پەیامبەری نارد کە ئەویش زەردەشتە "خودا لێی رازی بێت" بۆ نەتەوەی عەرەب یەک پەیامبەری نارد، بۆ چەندین نەتەوەی تر هەر هیچی نەناردووە. جا لێرە پێمخۆشە بزانن خودا هەموو نەتەوەکانی جیهانی وەک یەک خۆش دەوێت. دەربارەی لە خاچ دانی سەروەرمان یەسوعی مەسیح پێمخۆشە بزانن خودا وای دانابوو کە لە خاچ بدرێت ئەوەش خواستێکی خودا بوو تا بە خوێنی مەسیح گوناهی تەڤایی مرۆڤایەتی پاک بکاتەوە. خودا ئەوەندە مرۆڤی خۆشدەوێت یەسوعی کرد بە قوربانی تا گوناهیان پاک کاتەوە.

مامۆستا گوتی :

- ئێوە بە عەقڵی خۆتان دەتانەوێت کرداری ئەم خودایە مەزنە بپێون. عەقلی مرۆڤ ئەوەندە بچوکە بەرامبەر بە کردای خودا، بۆ بەراوردی نەبێت بۆ نموونە پێتان دەڵێم، گەر چۆلەکەیەک لە هۆدەیەکی پڕ لە پەنجەرەی داخراو

بەند کەی، چۆلەکەکە هەر خۆی لە پەنجەرە داخراوەکان دەدات، تا شل و کوت ئەبێت، ئینجا پەنجەرەیەک لە پەنجەرەکان بکەوە، چۆلەکەکە بۆی دەردەچێ. بەڵام هەرگیز عەقڵی بەوەدا ناشکێ کە ئەوە جام بوو، ئەم جامە چۆن دروست کرا بوو، چۆن لەوێ دانرابوو، چۆن کرایەوە...هتد. بۆیە لە خوا بترسن، واز لەم قسانە بێنن.

لەم کاتە دا شیرین لە دەرگەی دا و هاتە ژورەوە، هەموویان بەجارێک لەبەری هەڵسان. بە قوربانتان بم توخوا دانشن شەرمەزارم.

ـ ئەبونەش گوتی :

ـ ئەوەی بزانم، دەڵێن کاتی خۆی ستالین دووایین کەس دەگەیشتە کۆبوونەوەکانی کە لە گەڵ سەرۆک کۆمارەکانی ئەکرد. بۆیە کە ئەگەیشتە جێ گشتیان لەبەری هەڵدەستانەوە. وادیارە شیرین خان تۆش باش مێژووی ژیانی ستالینت خوێندووەتەوە، زۆریش پێی سەرسامیت، بۆیە هەردەم دووایین کەس دەگەیتە شوێنی کۆبونەوەکان.

ئەنگێلاش گوتی :

ـ ئەبونە ئەوەی بزانم بۆ خۆپیشاندانەکان ئەوەندە زوو دەگاتە جێ و سەرپەرشتی ڕێپیوانەکە دەگرێتە دەستی خۆی. بەڵام ئەگەر کاری ماڵەوەی تیا بوو شیرین بۆ دەرمانیش بەدەست ناکەوێت.

ئازادیش گوتی :

ـ شیرین خان، هەموو پیاوەکان پێت سەرسامن، تۆش گوێ مەدە قسەی ژنان، من یەک لەبارەخۆم زۆر بە زیرەکیت سەرسامم.

ـ سکاڵا قسەی بە ئازاد بڕی، خۆ شیرین خوشکی خۆمە، هەر خوا ڕەحمی کرد من خۆم لێرە بووم، ئەگینا...

شیرین لێنەگەڕا سکاڵا قسەی خۆی تەواوکات :

ـ خودا لێتان ڕازی بێت کەس پێم ناڵێ دانیشە، دەڵێی لە دادگەم. وەک تاوان بار لەبەر دەمتانا وەستاوم ئەوە شارستانییەتی کوردە؟ ئینجا گشتیان پێکەنین و مامۆستا گوتی تۆ سزای دواکەوتنی خۆت وەرگرت ئینجا دانیشە.

ـ تەنیا گوتی :

- شارستانیەت چییە و چۆن دەپێوریت؟
ئازاد گوتی :
- شارستانییەت جموجۆل و هەڵسوکوتی کۆمەڵگایەکە، هەر بە دەستکەوت و بەرهەمەکانی دە پێوریێت.
- ئەی دانشتنی شیرین خان پەیوەندی چییە بە شارستانییەتەوە؟
- ئەوە قسەیە لە پێناوی قسە.
سامان هەڵیدایە و گوتی :
- ئێستا تێنەگەیشتین، شارستانییەت بەرهەمە یان دژ بە بەرهەمە.
ئازاد گوتی :
- نەخێر شارستانییەت نە ئەوە و نە ئەویانە، بەڵکو بەرهەم هێنان رووی, یان ناوەرۆکی شارستانییەتە, چوونکە هیچ شارستانییەتێک بێ بەرهەم هێنان ناتوانێت لە ئارا دابێت. بەرهەم سەرچاوەی ئابوری کۆمەڵگایە، کۆمەڵگاش بۆ رێکوپێک کردنی ئابوری پێویستی بە سیاسەتمەداران هەیە.
- ئەبونە گوتی لەوەش زیاتر شارستانییەت ئەخلاقە و ئایینە و هەڵسوکەوتە و شێوەی بەرێوەبردنی دەوڵەتە.
- من بیستومە، نا...نا دێتە یادم "سامان گووتی" کە کاک شاوەیس بەرپرسیاری سیاسی کۆمەڵە پێی راگەیاندین کە چەندین شارستانییەت هەبوون، پێش ئەوەی، ئابوری، سیاسەتمەدار و دەوڵەتیش هەبێت.
- شەرت بەرێوەبردنی کۆمەڵگایە،"مامۆستا پشتی ئەبونەی گرت" ئەندێشەی بەڕێوەبەرایتی لە چۆنیەتی هەڵس و کەوت و قووڵی بڕوای ئایینی ئەو کۆمەڵگایەوە هەڵدەکوڵێ، یەکدیگیری ئەم دوو هێزە، واتا هێزی بەڕێوەبراو و هێزی بەڕێوەبەر لایەنە قووڵەکەی شارستانییەت پیشاندەدەن.
- لایەنەکەی تریشی"شیرین روی لە ئازاد کرد" موجەرەدە، پێی دەوترێت بەرهەم و چەوسانەوە.
- ئازاد گوتی، نەخێر بەرهەمی رووت هیچ گوزارەیێک نابەخشێت چونکە دارێکی کیوی دەتوانێت بەرهەمی هەبێت. ئەو دارەی کە جوتیارێک دەیچێنێت و بەر دەگرێت، بەرەکەی بەرهەم هێنانە واتا بەرهەمی جوتیارەکەیە. بەڵام

ئەم بەرهەمەش جیاوازییێکی ئەوتۆی نابێت لەگەڵ درەختە کێوییەکە. ئەگەر نەکەوێتە نێو گرفتی دابەشکردنی ئاو زەوی و ئاڵو گۆڕی میوە بە کوتاڵی دیکە کە باخچەوانەکە ناتوانێت بە بەرهەمیان بێنێت. لەمەش زیاتر ئەم شتانە دەبن بە هۆی هاتنە ئارای ڕێبەرێک کە ئەویش دەبێتە سەرچاوەی یەکدیگیری بەرێوەبەران و بەڕێوەبراوان. هەر بۆیەش دەڵێم بەرهەم بەتەنیا لە توانای دایە شێوەی بیرکردنەوەی کۆمەڵگایەک بگۆڕێ. ئەم گۆڕانەش دەبێت بە هۆی گۆڕانی بەڕێوەبەرانی ئەم کۆمەڵگایە. بۆ زانینتان ئێمە کۆمەڵگایەکی بێ بەرهەمین بۆیە سەرکردەکانمان نەگۆڕن و ناگۆردرێن.

- سامان سەری بادا و گوتی :

- ئەوە بۆیە سەرکردەکانمان نایانەوێت گەلی کوردستان نەتەوەیەکی بەبەرهەم بێت. تا نەتەوەکەمان هەر وەک جاری جاران بمێنێتەوە.

- ئەبونە گوتی :

- ئەگەر قووڵی ئیمانی نەتەوە بە خودا، لە هەمان پلەی قووڵی ئیمانی سەرکردەکان بێت. ئەوا هیچ گیروگرفتێک لە نێوانی بەڕێوەبراو و بەڕێوەبەر نامێنێت. ئەم شارستانییەتە دەگەشێتەوە. بەڵام لە هەمان کات دا بە هەمان ڕێژەی قووڵی ئیمانی ئەم دوو دەستەیە "بەڕێوەبراو و بەڕێوەبەر" بە ئایینەکەیان، پایە بەرزی شارستانیەتێک سەربەرەو لێژی دەبات.

وا دیار بوو شیرین ئەم وتووێژەی زۆر بە دڵ نەبوو، چونکە شیرین وایدەزانی سەرچاوەی هەر پێشکەوتنێک دەبێت: کار و کردەوە و دەربڕینی بیر و بڕوابێت. ئەم سێ کوچکەیەش بە بڕوای ئەو، بێ ئازادی : نابووت و سست و لاوز دەبن.

- بێ ئازادیی ژنان هیچ شارستانییەتێک ناتوانێ زۆر بخایێنێ.

- شیرین خان "ئازاد گوتی" ئەوا هەر لە سەرەتاوە تا ئێستا شارستانیەتی ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا لەسەر چەوسانەوەی ژنان دامەزراوە و شارستانیەتیش هەر بەردەوامە.

ـ پیاو ناتوانن ئازاد بن گەر ژنەکانیان ئازاد نەبن. چونکە بە گوێرەی کۆت و زینجیری دەست و پێی ژنەکانیان دەبێت هەنگاو بنێن، ئەگینا ژنە کۆتکراوەکانیان جێ ئەهێلن.
ئازاد گوتی :
ـ شیرین خان ئازادی شتێکە و شارستانییەت شتێکی ترە، ئازادی ئەتوانێت ببێت بە خاڵێک لە خاڵە پێکهێنەرەکانی شارستانییەت.
سامان گوتی :
ـ کێ ناڵێ هەر وایە، هیچ شارستانییەتێک ناتوانێ بێ ئازادی دورخایەن بێت. ئەی ئەوە نابینن ئێمە یان لە شوێنی خۆمان تەپە تەپ ئەکەین، یانیش وەک میزی وشتر بۆ پاشەوە ئەگەڕێینەوە. سەیرکەن ئەو رۆژە کاک ناکام دەیگوت یەک لە هێلە گرنگەکانی شارستانییەت نووسینە، هیچ نەتەوەییێک لەو نەتەوانەی کە پیتی عەرەبیان خواستۆتەوە بۆ نووسینی زمانەکەیان نەیانتوانیوە ئەم پیتانە وەک کورد لەگەڵ زمانەکەی خۆیانا بگونجێنن. من لەم بڕوایەم گەر عەرەب خۆیان بێنە سەر شێوە نووسینی کوردی و واز لە فەتحە و زەمە و کەسرە بهێنن ئەوا زمانەکەیان ئەژێیتەوە. تەماشاکەن سەرەرای ئەوەش کەس باسی شارستانییەتی کورد ناکات. شیرین خان راست دەکات چونکە نەخۆمان و نە ژنەکانمان ئازادین.
ـ ئینجا هەر ئەوە مان کەم بوو "مامۆستا نە بە ئاشکرا و نە بەدزی لە گەڵ ئازادیی ژنان نە بوو" بڵێن شارستانییەت بە ئازادیی ژنانەوە بەستراوە. ئێوە باسی ئازادیی ژنان دەکەن بێ ئەوەی بزانن ئەم ئازادییە بەرەو کوێمان دەبات. باش بزانە ئازادی ژنان بەرەو بەرەلایی کۆمەڵگامان ئەبات. ئازادی گوزارەی ئەوەیە کە دەست درێژی نەکەیتە سەر ئازادی کەسێکی تر. سنووری ئازادی نێر و مێ خودا دایناوە و مرۆڤ ناتوانێت دەستکاری بکات. ئەگەر ئێوە بتانەوێت کەس دەستدرێژی نەکاتە سەر ئازادیی ئێوە، ئەی ئێوە بە چ مافێک دەستکاری سنووری خودا دەکەن؟ سەیری ئافرەتە بە ناو ئازادەکان بکەن. بە ناوی ئازادییەوە هەموو لەشیان بەدیار ئەخەن. گوایە جوانە، یان دەڵێن هەرکەسەی ئازادە لە رەفتار کردن بە لەشی خۆی. بەم

شێوەیە هەموو سنوورەکانی قەدەغە بە ناوی ئازادییەوە ئەبەزێنن. لای هەموو کەسێک سەیر ئەبێت ئەگەر پیاوێک لە ڕێگا بڕوات و دەرپێیەکەی چوبێتەوە ناو پاشەڵی و نیوەی پشتیشی روتبێت هەر خەڵکی ئێرە داهێنەرانی ئەم ئازادییە چی پێ ئەڵێن؟ بڕواتان بێ دەڵێن سنووری ئازادیی رەتاندووە. ئەی بۆ هەمان شتیش بە ژنەکە ناڵێن؟ چونکە داهێنەرانی ئەم بە ناو ئازادییە پیاون و نرخی ژن لایان لە چێژ وەرگرتن لە دیتنی لەش و لاری ئافرەت بەولاوە هیچی تر نییە. بەم شێوەیە نرخی ژن لە پلەی چێژ وەرگرتنی پیاو لە لەش و لاری ئافرەت تێپەڕ ناکات. هەروەها ئەو ئازادییەی کە باس دەکرێت، بە کاری دەهێنن بۆ پارە پەیا کردن و فرۆشتنی کەل و پەلەکانیان. بازرگانی ئەم ئازادییەی کە ئێوە باسی دەکەن خستووەتە چواچیوەی بێنە و بەرەی سودی ئابووری. وەک دەزانن ژنی دووگیان سودێکی ئابوری نییە. بۆیە ژنی سکپڕ گوایە مافی خۆی وەرگرتووە، کە ئەویش; مافی لەبەرچوواندنی منداڵە. ئێوە سەیرکەن مافی پێکەوە ژیانی نێر و مێ بێ مارەیی، وایکردووە ژن ئەو مافەی هەبێت کە منداڵی نا شەرعی هەبێت، یان منداڵ لەبەرخۆی ببات. لە هەژدە ساڵییەوە منداڵ مافی ئەوەی هەیە کە لە گەڵ دایک و باوکی خۆی نەژییێت. سەیرکەن چۆن لە ئازادیی خێزان دەدەن تا ئابووری دەوڵەت بپارێزن: منداڵ تا بیست و پێنج ساڵی دەتوانێت لە ماڵی باوکی خۆی بێت و حووکمەت موچەیەکی بچوکی بۆ خێزان بە گوێرەی منداڵەکانی کە لە ژێر یەک بنمێچ دا لە ماڵەوە دەژین تەرخان کردووە. بەڵام کە منداڵ لە ماڵ هاتە دەرەوە ئیتر خێزان ئەم مافەی دەسووتێت. جگە لەمەش بۆ نموونە ئەگەر چویتە دارستانێکەوە دەکەویتە ژێر رکێفی یاسای دارستانەوە گەر نەخۆی دەتخۆن. ئا لێرانەش هەر ئەوەندەی منداڵ لە ماڵەوە دابڕا ئیتر دەبێت خۆی خۆی بژیێنێت. نەک هەر ئەوەش ئەو باجەی کە لەسەر زگورتی هەیە لەسەر خێزان نییە، دوای ئەمەش ئەو خێزانەی کە منالەکەی ماڵی جێ هێشتووە دەبێت باج زیاتر بدات. چونکە منالی لەسەر نییە بەخێوی کات، هەر ماڵێکیش پێویستی بە کڕینی کەلوپەلی ناوماڵ هەیە وەک تەلەڤیزیۆن یەخچاڵ و هتد. وەک دەبینن رەوشی ئازادی بە شێوەیەک دەسووڕێتەوە وەک ئەو بایەی کە

کەشتی حەزی لێناکات. خێزانیش وەک کەشتیەکی بچوک وایە هەموو بایەک بۆ پێشەوەی نابات، هەتا دێت خێزانی ئەوروپی ناونیشانی خێزان لە دەست دەدات. ئەگەر لێم بپرسیت بۆ دەڵێم لەبەر باجی رەشەبای ئازادیی خێزانی ئەوروپی تا دێت باجی سەر شانی زیاد دەکات و دەبێت پارە زیاتر بدات بە حووکمەت و بەناوی ئازادییەوە زیاتر سەرف کات و گیرفانی بەتاڵکات. گەر کاک ئازاد بێتەوە یادی جۆرج مارشێ سەرۆکی پارتی کۆمونیست بە حکومەتی فەرەنسای گووت "ئێوە بە دەستێک دەدەن بە میلەت بە دوو دەست لێیان دەسەننەوە" بەم شێوەیە دەبینین کە هێدی هێدی کۆمەڵگا بەرپرسیاریەتی خۆی لە دەست ئەدات بەرامبەر بە ئازادیی لەشی تاکە کەس بەتایبەتی ژن و نێرەمێینەکان.

- تەنیا سەری لێ شێوا و رووی لە ئازاد کرد کاک ئازاد تێناگەم بە کورتی ئازادی چییە؟

- مامۆستا باسی ئازادیی کرد، منیش دەتوانم پێتبڵێم; گوزارەی ئازادی ئەوەیە کە تۆ بە ئازادی هەڵسوکەوتی خۆت بکەیت بەڵام بە پەیمانێک ئازادی تۆ نابێ رێگا لە ئازادی کەس بگرێ.

- ئەی شیرین خان دەڵێت: تا پیاو ئازاد بن دەبێ ژن ئازادبن، گەر پیاو و ژن ئازادنەبن ئەی کێ ئازادە؟

- قسەکەی شیرین خان راستە، بە گوێرەی رێ گرتن لە ئازادیی کەسانی تر، بە هەمان رێژەش رێگر دەبەسترێتەوە بە دابین کردنی ئەو رێگرتنە. ئەوەش چواچیوەیەک دروست ئەکات کە رێگر و رێلێگیراو خۆیان بە ئازادیی لەناو ئەم چوارچیوەیەدا ئەجولێنەوە، هەر دەرچوونێک لە چوارچیوەی دارێژراو بە دەرچون لە یاسا دائەنرێت. ئازادیی بە رێژەی دەستدرێژی کردنە سەر ئازادی کومەڵایەتی و تاکە کەس دەپێورێ. پێوانەکەشی پێی دەوترێت یاسا.

- شیرین هەڵی دایە وەک بڵێیت ئێستاکە شتێکی لە دەست دەچێت و گوتی :

- تـەنیا گیان نە مزگەوت و نە کەنیسە و نە کنیسێت لە گەڵ ئازادی ئافرەتانن. هەر بۆ نموونە لە کاتی بابلییەکان پیاوێک ژنێکی دەهێنا لە گەڵی دەخەوت ئەگەر منداڵی لێ بووبا ئەوساکە دەیهێنا واتە مارەی دەکرد. ئەگەر منداڵی نە

بوایە ئەوا دەیانناردەوەماڵی باوکی، دیانەتی مەسیحی تەڵاقی قەدەخە کرد. لە ئاینی ئیسلامیش، دەتوانێ ژنێکی تر بێنێ بەسەر ژنەکەی کە منداڵی نابێت. لە ئایینی نوێی ئەوروپایی کچ و کور پێکەوە دەخەون کەی بە دڵیان بوو یەکتر مارە دەکەن یان بێ مارەیی پێکەوە دەمێننەوە و منداڵیشیان دەبێت. وەک ئەبینیت کە پیاوی ئایینی باسی ئازادی ئەکەن باسی ئازادی پیاوان ئەکەن، نەک ئازادیی ژن و پیاو. کە ئێمە باسی ئازادیی ژنان ئەکەین، باسی یەکسانی هەڵسەنگاندنی کاری ژن و پیاو ئەکەین، باسی مافی دایکایەتی ئەکەین، ئەویش کە ژن سێ ساڵ پاش منداڵ بووون کارنەکات، ژن مافی هەبێت ببێت بە مەلا و بە قەشە و سەرۆک کۆمار، ژن هاوسەری خۆی بە ئازادی خۆی هەڵبژێرێت، ژن هەر زگێک نەبێت بۆ زاوزێ، ژن لە بەڕێوە بردنی کۆمەڵگا هاوسەنگی پیاو بێت. ئەی ئەم شتانە کە لەلای ئێمە پێیان دەڵێین ئازادیی ژنان روخساری شارستانییەت نەبن، ئەی شارستانییەت بە چی دورخایەن دەبێت؟ دیندارەکان لایان وایە ژن هەر لە ناوک بۆ خوارەوەیە.

ئەبونە گوتی :

- کچم شیرین ئێمە گشتمان لە خودا پەرستی دا یەکین، هەرکەسەش بەشێوەی خۆی خودا ئەپەرستێ. بە شێوەیەکی تر یاسا یەکە و دژ بە یەکە واتای یاسا ئەوەیە کە سنوور یان چوارچیوەیەک بۆ هەڵس و کەوتی کۆمەڵایەتی و تاکەکەسی دابنێ، ئینجا مرۆڤ لە نێو ئەم چوارچیوەیە دا ئازادە. بۆ نموونە خودا مارەیی داناوە. ژن و مێردێکی مارەکراو ئازادن لە چوارچیوەی مارەیی دا چی بکەن بیکەن، بەڵام لەدەرەوەی مارەیی ئازادنین یەک شتیش لەم شتانە بکەن. بە داخەوە خراپ لە بیر و باوەڕی کەنیسە گەیشتوویت. ئاڵای ئێمە ئەو ئازادییە بێ دینییەی ئەوروپا نییە، کە تۆ ناوی لێدەنێیت ئایینی نوێی ئەوروپایی. ئەم کۆمەڵگایە خۆی لە ئاینی مەسیحایی دوورکەوتۆتەوە و کۆمەڵگایەکی بێ دین و فاسقە. راستە هەندێک لە دیندارە نەزانەکانی خۆمان کردەوەی ئەوانیان دەخستە ئەستۆی چەپەکانەوە، بەڵام ئەمە، ئەوە ناگەیەنێت کە پیاوانی ئایینی گشتمان هەمان بڕوامان هەبووبێت. من یەک لەبارەخۆم پێمخۆشە ژن ببێت بە سەرەک کۆمار، پێمخۆشە کاری

ژنان وەک کار هەڵسەنگێنن نەک وەک کاری ژنان. من لەگەڵ منداڵ لەبەر خۆ بردن نیم، چونکە ئەوە رۆحێکە خودا دەیبەخشێ بە ئادەمیزادێک، کە خودا شتێکی بەخشی تۆ بە چ مافێک لێی ئەسێنیتەوە. گەر هەر رێگایەک بگریتە بەر و نەتهێنێتەوە سەر رێگای خوداناسین بزانە کە رێگایەکەت هەڵەیە و گومڕایت.

ـ ئەنگێلا گوتی :

ـ گریمان من لەگەڵ لەبەر چوواندنی منداڵ نیم با بڵێین لەبەر رۆحەکەی بێت بەڵام بۆچ مزگەوت و کەنیسە و کنیسێت بە شێوەیەکی گشتی جەنگیان قەدەخە نەدەکرد؟ جەنگ واتای وایە تۆ رۆح لە یەکێک دەسەنیت کە خودا ئەم رۆحەی پێ بەخشیوە. ئەمە لە لایەک لە لایەکی ترەوە دەمەوێت پێتان بڵێم کە ئەگەر دڵشادی دەمێکی کورت زۆری خایاند دەبێت بە غەمێکی گەورە. هەموو کەسێک بەوە شادە کە کچە بچکۆلانەکەی وەک پەپوولە لە ماڵەوە یاری بکات. بەڵام کەس بەوە شاد نابێت کە کچەکەی گەورەنەبێت و مێرد نەکات و هەر وەک پەپولەیەکی بێ تاوان لە ماڵەوە بمێنێتەوە. وەک خۆت ئەو رۆژە فەرمووت خوورەوشتی کوردەواری بە هەزاران ساڵە نەگۆڕاوە، من ناڵێم ئەوە هەر قسەی تۆیە ئەوە قسەی زۆرینەی ریش سپیەکانمانە. زۆر جار کاک ئازادیش وا دەڵێ، ئەی ئەوە خەمێکی گەورە نییە، نەتەوەیەک بە هەزاران ساڵ نە گۆردرێت؟ باوە دیواری کلێسەکان وەک دیواری مزگەوتەکانی کوردستان بە سەدان ساڵە نەگۆڕاون جا هەر ئێوەشن یاسا دەچنن، نەتەوەکەشمان قوربانیی یاسا کەونەکانی ئێوەیە.

ئازاد گوتی:

ـ شیرین خان یاسا وەک خواردن وایە گەر کەون بوو دەترشێت و بۆگەن دەبێت لەجیاتی ئەوەی سوود بەخشبێت هەڵدەگەڕێتەوە و دەبێت بە ژەهرێکی کوشندە. لە هەمان کاتیش دا هەزاران جۆری خواردن هەیە کە نەمان دیوە و نەمان بیستووە نە حەزمان دەچێتێ، نە ناویان دەزانین . گەر گرفتێک لە شوێنێک هەبێت، و لە لای ئێمە نەبێت پێویست ناکات یاسای بۆ دارێژین. یان لە ترسی داهاتوو خۆمان بە تانۆکی توترک گەمارۆدەین.

سکالا گووتی:
ـ کۆمەڵگای دوواکەوتوو بەناوی فەلسەفەی خۆشەویستییەوە سنوور و چوارچێوە بۆ هەموو هەلس و کەوتێکی نێوان دوو هاوسەر دادەنێ. سنووری کۆملگا دەگاتە رادەیەک دێتە نێو نوێنی شەوی دوو هاوسەر. لە کۆملگای کۆنەپەرستی هەموو شتێک چووارچیوەی بۆ دادەندرێ، ئەم چوارچیوەیەش بە هیچ شێوەیەک نابێ لێک بترازێ، نە نوێ دەکرێتەوە نە کەونیش دەبێ. جا ئەم فەیلەسوفانە لە باسی دیموکراسییەت ناوەستن، ئەم مێشک پڕ چوارچێوانە، لە جیاتی چوارچیوەیەک بشکێنن و لەناوی ببەن. خۆیان بە چوارچیوەی دیموکراسی هەڵدەکێشن و دەیهێننە ناو کۆملگاوە. ئەم دیموکراسییەتەش هیچی لە دیکتاتۆریەتەکەی جاران کەمتر نابێت و نییە. گەر سەیری خۆشەویستی نێو ئەم کۆمەڵگایەش بکەین ئەویش هیچی لە دیکتاتۆریەت کەمتر نییە. هەر لادانێک لە چوارچێوەی داندراو بۆ ئەڤین لەم کۆمەڵگایە دا ڕوو بدات کینە شوێنی ئەڤین دەگرێتەوە.
مامۆستا گوتی:
ـ قوربانیی خۆی خۆی هەڵدەبژێرێت ببێت بە قوربانی. ئەی سەرکەوتوو قوربانیی سەرکەوتنەکەی خۆی نییە؟ گەر تۆ ئێمەی پیاو بە سەرکەوتوو بزانیت ئێمە قوربانیی سەرکەوتنەکانی خۆمانین، چونکە ئێمەی پیاویش لەم یاسایانەی کە ئێوە پێی ئەڵێن یاسای پیاوان ئازادنین. بڕواتبێت ئێوە لەوە دەگەڕێن غەریزەکانتان بەسەر یاسایەکانی خودا دا زاڵ بکەن. ئا ئەوساکە مرۆڤ خۆی دەبێتە قوربانی غەریزەکانی خۆی. سەیکە لە ساڵی ١٩٦٨ فەڕنسییەکان شۆڕشێکیان هەڵگیرساند، گوایە لەدژی ئەوەی کە سەدان ساڵە کۆمەڵگای فەرەنسی نەگۆڕاوە و پێویستی بە گۆڕان هەیە. داوای ژنان ئەوە بوو کە یەکسان بن لەگەڵ پیاوەکانیان و جیاوازی نێر و مێ نەمێنێت، و هەرکەسەی خاوەنی لەشی خۆیەتی چی بیەوێت لەگەڵی بیکات. بێ چاودێری ئایین و یاسا و نەریت، کەس بێ دڵی خۆی نەکات. واتا ئەگەر ژنێک منداڵی لە پیاوێک ویست، لەسەر خواستی خۆی دەمێنێتەوە و حکوومەت دەبێت بێ جیاوازی یارمەتی هەر ژنێکی بێ پیاو بدات. واتا مافی ژنێک کە منداڵی

ناشەرعی هەبێت وەک مافی ژنێکی تەڵاق دراو و بێوەژنێک وا بێت ... هتد بڕواتان بێت ئەو ژنانەی کە بەم دۆڵ و زورنایە هەڵپەڕین گشتیان زەرەریان کرد. بەشی زۆری ئەم ژنانە یان مێردیان نەکرد یان تەڵاق دران. ئێستاکەش لە هەر چوار مارەیی، سێ مارەیی لێک جیا دەبنەوە. دەبێت هەر سوپاسی خودا بکەن کە کۆمەڵگای ئێمە ئافرەتی لەم ئافەتە بێ ئامانە پاراستووە. دەبێت پارچەیەک گۆشت بخۆن و بەرخێک بکەن بە قوربانی.

- تەنیا سەری لە بن گوێی شیرین نا و گوتی، ڕاستەکەی مامۆستا خۆی ددانی پێدا نا ئەگەر ژن ئازاد نەبێت پیاویش ناتوانێت ئازادبێت.

- شیرین گوتی :

- مامۆستا پێویست ناکات، لە گەڵ ئێوە لە هیچ بکۆڵینەوە، ئەوە بوو بە ١٤٠٠ ساڵ وتووێژی ئێوە نەپێش کەوتوە و نە گۆڕاوە،نە پێشیش دەکەوێت. یەکەم باس باسی ژنە کە بە چ شێوەیەک جل و بەرگیان بپۆشن تادڵی پیاوان بەلای خۆیان دا ڕانەکێشن. گەر گوێ ڕاگری وا تێدەگەی گیر و گرفتی نەتەوەکەمان هەمووی لە سەر هەلسوکەوتی ئێمەی ژن ڕاوەستاوە.

- دەک خودا نەتگرێ ئەی کاتی ڕەمەزان باسی ڕەمەزان دەکەین، باسی سەرفترە و زەکات دەکەین. کاتی جەنگ باسی نیشتیمان دەکەین، کە شتێکی خراپیشمان لە ژنان یان پیاوان دیت ئەوە باسیان دەکەین. ئەی لەمە زێتر چیت دەوێ؟

- ئەگەر وتووێژی ئاینی پاش ١٤٠٠ ساڵ لە سەرفترەو زەکات و ڕەمەزان و جل و بەرگی ژنان تێپەر نەکات. ئیتر خۆتان بڕیار بدەن، خوا دەزانێ جیمان بەسەر دێ.

- ئازاد وەک بڵێی منگە منگێکی لێوە هات و گوتی :

- داخی گرانم هەر زانا ئاینییەکانمان دژی طاعونی چەپ بە هەنجەتی بێ ئیمانن پشتی ڕۆژئاوایان گرت و یارمەتیان دان و پێکەوە پشتی چەپەکانیان چەماندەوە.

- ئەنگێلا سەیرێکی ئازادی کرد و گوتی :

- پیاوانی ئاینیمان وەک بازرگانەکان بە دووای دۆلاردا وێڵن.

ـ هەرکەسێک بە دووای دونیا کەوت ئاخیرەتی لەدەست دەدات.
سامان گوتی :
ـ لەم زەمانە، وابزانم دونیا بەسەر قیامەت کەوتووە.
ـ بۆ خۆتان لە گێلی دەدەن، ئیمامی عەلی فەرمویەتی خۆزیا ملم بە قەدەر ملی وشترێک درێژ دەبوو تا وشەیەک لە دەمم دەهاتە دەرەوە حەوت جار بمتوانیبوایە کاوێژی کەمەوە، ئینجا بمدرکاندبا. ئێوە کردەوەی هەندێک کۆلکە مەلا مەخەنە پاڵ زانایانی ئیسلامەوە.
ئەنگێلا گوتی:
ـ کاک ئازاد کە کۆمەڵگای کورد دێتە یادم هەموو لەشم پڕ لە کینە دەبێت بە شێوەیەک خۆمم پێ ناگیرێت و لە هەژمەتا دەلەرزم. کۆمەڵگایەک تا ئیستەش هەر تەماشای پاکیزەیی کچان دەکات دەبێت چەند دڵمان بەم کۆمەڵگایە خۆشبێت؟
شیرین قسەی بە ئەنگێلا بڕی و سەری خۆی لەقاند :
ـ راستەکەیت ئیمڕۆکە ئافرەت وەک کرێکارێک ئەچەوسێننەوە و سەرەرای ئەوەش وەک ئافرەتێکیش ئەیچەوسێننەوە. بۆیە هەردەم دەڵێم دەبێت شارستانییەت بە ئازادیی ژنان دەستپێبکات و بپێورێت، چونکە بێ ئازادیی ئێمە ئێوەی پیاویش ئازاد نابن. من دەمەوێت بە کاک ئازاد بڵێم چونکە هەڵگری بەیداخی چەوساوەکانە. بۆیە بێ ئازادیی تەوای ئافرەتان چەوسانەوەش وەک چەوسانەوە بنە بڕ نابێت. باڵەخانە گەر بناغەکەی چەوت بێت زوو یان درەنگ هەر ئەڕمێت. ئینجا باشتر وایە کۆمەڵگای خۆمان لە بناغەوە بگۆڕین، نەک بۆیاغێکی جوانی کەین و وازی لێ بێنین.
ـ شیرین خان، "ئازاد گوتی" ئازادیی شتێکە و شارستانییەت شتێکی ترە. ئازادی و دیکتاتۆری دەتوانن روویەکبن یان پێکهێنەرێک بن لە پێکهێنەرەکانی شارستانیەت، بەڵام ناتوانن ببنە پێوەری شارستانییەت. چونکە پێوەر دەبێ لە دەرەوەی پێوراو بێت. پلەی لەنگی نێوان پێکهاتەکانی کۆمەڵگا دەتوانێ ببێت بە پێوەرێک بۆ پێوانی بەرزی و نزمی پلەی شارستانییەت. گەر بتەوێت پیری و لاوێتی شارستانیەتێک بپێویت چۆنیەتی ژیانی ئەم کۆمەلگایە لە چۆنیەتی

بەڕێوەبردنی ئەم کۆمەڵگایە ڕەنگ دەداتەوە، بۆیە دەبێ سەیری بەڕێوەبەران و بەڕێوەبردنی ئەو کۆمەڵگایە بکەین. بۆ نموونە گەر سەیری شارستانییەتێکی چالاک و گەشەدار بکەین دەبینین، کە هەر بەڕێوەبەرێکی هەڵبژاردراو بۆ بەڕێوە بردنی هەر کارێکبێت. ئەم بەڕێوەبەرە یەکسەر دەور و پشتی خۆی بە چەندین جێگر و ڕەخنەگر و ڕاوێژکاری بەتوانا دەچنێ کە لێیان فێردەبێ و فێریان دەکا تا ڕۆژێک لە ڕۆژان بتوانن شوێنی بگرنەوە.
ئازاد پاش دەمێک ڕامان ڕووی لە ئەنگێلا کرد و درێژەی دایێ، گەر ئێمە شۆڕشگێڕ بین نابێت کینەمان لە دڵ دا بێت. کینە ئامانجی سەرەکیمان لە ناو دەبات، چونکە کینە بە شتی لاوەکییەوە خەریکمان دەکات، بۆیە ئەنگێلا ئەوەی کینە بێت لە دڵی بێ گەردی تۆ دا نییە. تۆ وەک هەر گەنجێک دەتەوێت کۆمەڵگای کوردەواری بە گوێرەی دڵی تۆ بگۆردرێت، ئەوەش مافێکی خۆتە. من ناڵێم تۆ، بەڵکو بەشی زۆری ئەوانەی وا بیردەکەنەوە کە کۆمەڵگا بە دڵی ئەوان ناگۆردرێت دەیانەوێ بە شەو و ڕۆژێک ناسنامەی خۆیان لە ئاوی سێن "سێن ئەو ڕووبارەیە کە بەناو پاریس دا تێدەپەڕێت" دا بشۆنەوە. سەیر ئەوەیە دەتانەوێت بتوێنەوە و لە هەمان کاتیش دا وەک خۆشتان بمێننەوە. وەک گلۆتێک شەکر لە نێو ئاوێکی کوڵاو دا دەتانەوێت بە گلۆتی بمێننەوە. ئەوەش خەونی منالانەی ئەم جۆرە بیرکردنەوەیە. بەڕاستی هەر گەنجێک بۆ گەیشتن بە ئامانجاکانی دیکتاتۆرێکە. هەر دیکتاتۆرێکیش وادەزانێ دەتوانێ بە یاسا کۆمەڵگا بگۆڕێت. ئەنگێلا خۆت باش دەزانیت یاسا ناتوانێت کۆمەڵگا بگۆڕێت. بەڵام کۆمەڵگا دەتوانێت یاسا بگۆێت. یاسا وەک تانۆکێکە دەورەی باغێکی گەورەی پێ دەپارێزن. تاکە کەسێک یا دیکتاتۆریش بێت دەتوانێ هەر کونێک لەم تانۆکە بکاتەوە و لێی بێتە دەرەوە. بەڵام ناتوانێت هەموو تانۆکەکە هەڵوەشێنێتەوە. گەر زۆرینەی خەڵک ویستیان ئەم تانۆکە هەڵوەشێنن ئەوا دەبێت هێدی هێدی هەڵیوەشێنن، بێ ئەوەی ئازاری ئەوانە بدەن کەدەیانەوێت لە نێو تانۆکەکە دا بمێننەوە. چونکە ئەوانەی کە دەیانەوێت بمێننەوە نزیک ترین کەسی ئەوانەن کە دەیانەوێت پەرژینەکە هەڵوەشێنن.
سامان هەڵیدایە و گوتی :

ـ ئەی ئەگەر بەرێوەبەرێک لە نەژادێک بێت خەڵکەکە لە نەژادێکی تربن. بەڕێوەبەر وەک گورگی نێو پێستەی مەر لە خەڵکەکە دانوسابێت.
ئازاد گوتی :
ـ کاک سامان گورگ ناتوانێ زۆر لە پێستەی مەڕ دا بمێنێتەوە، ئەگەر وابێت ئەم کۆمەڵگایە کۆمەڵگایێکی ناکۆکە و تەمەنی درێژ نابێت، پێویستە گورگ و مەڕ لێک جیا بکرێنەوە.
سامان گوتی :
ـ بە قسەی کچەکانمان ئەگەر شەڕ نەمێنێت ئیتر گورگ و مەڕ پێکەوە ئاو دەخۆنەوە؟ من دەڵێم کوردستانیش وەک هەرێمێک وڵاتێکی ئازادنییە، راستە هەر لایەی سەرۆکێکی خۆی هەیە. خۆ ئەگەر زلهێزەکان بیانەوێ، سەرۆکی بزوتنەوەی کوردستان دەکەن بە سەرۆکی ووڵاتێکی سەربەخۆ. دەنا رۆژێک دێت گورگ لە پێستی مەڕ دێتە دەرەوە.
ئازاد گوتی :
ـ کۆمەڵگایەکی بە زۆر پێکەوە لکێنراوە ناتوانێت دوور خایەنبێت. لە کۆتایی دا کورد سەربەخۆیی خۆی هەر دەوێت، چونکە عەرەب ئەگەر بە زۆری زۆرداری نەبێت نایانەوێت دەسەڵات لەگەڵ کورد دا بەشکەن. جگە لەمەش نایانەوێت هیچ لە دەستکەوتەکانیان واتا گوایە لە سەروەرییان لە دەست بدەن.
تەنیا گوتی :
ـ تێناگەم بۆ سەروەری نەتەوەیەک دەبێت ببەسترێتەوە بە دەست بەسەر داگرتن بە سەر نەتەوەیەکی تر دا؟ یان سەروەری هەر بۆ داگیرکەرە؟
ئازاد بە هێمنی و غەمێکی قووڵەوە گوتی :
ـ بەڵێ هەر چەرخەی نەتەوەیەک دەستدرێژییەکانی خۆی بە دەستکەوت و بە سەروەری نەتەوەکەی خۆیەوە دەبەستێتەوە، بەڵام دونیا دەوران دەورانە، داگیرکەر هێدی هێدی دەسەڵاتی جارانی لەدەست دەدات. وابزانم دەسەڵاتی عەرەب بەسەر کورددا قەت کاریگەر نەبووە، هەر بۆیەش عەرەب نەک هەر دەسەڵاتی لە ناو وڵاتەکەی لەدەست چوو، بەڵکو سەروەری خۆشی لەدەست

دا. سەیرێکی ئەو دەوڵەتە عوسمانییە مەزنە بکە کە لەگەڵ کورددا کەوتە ململانێ، ئەویش نەک هەر دەسەڵاتی خۆی لەدەست دا بەڵکو سەروەری خۆشی لەدەست دا. بڕواتانبێت ئێرانیش حاڵی لە حاڵی ئەم دوو نەتەوەیە باشتر نابێت.
تەنیا گوتی :
ـ ئەی ئەمریکا دیکتاتۆرە؟
ـ نەخێر، ئەمریکا لە ناو خۆی دا دیکتاتۆر نییە. بەڵام بۆ دەرەوەی خۆی شتێکی ترە، هەر دەسەڵاتێک کە نەیتوانی بە هێمنی دەسەڵاتی خۆی پەخشکات، ئەوا بە زۆرداری دەیچەسپێنێ. هەر دەسەڵاتێکیش بە زۆرداری چەسپێندرا ئەوا ئەو دەسەڵاتە دەسەڵاتێکی دیکتاتۆرییە. وەک دەبینیت ئەمریکا دەسەڵاتێکی دیکتاتۆرە. هیچ دیکتاتۆریەتێک بێ دیکتاتۆر نابێت. ئەم دیکتاتۆرییەتە گەر دیکتاتۆری کەسێک بێت یان دەسەڵاتێک بێت جیاوازی نییە. شاکاری هەر دیکتاتۆرێکیش، دەمکوت کردن و خوێنڕێژییە، تەمەنیشی درێژ نییە. بە شێوەیەکی تر کە دیکتاتۆر ویستەکانی بۆ جێ بە جێ ناکرێت ئیتر هار دەبێت و تەمەنی هاریش هەر چل ڕۆژە.

دیکتاتۆر هەموو ئابووری وڵات دەخاتە ژێر چاودێری و ژێر دەستی خۆی. ئینجا تا میللەتەکە دەمکوت کات مافەکانی میللەت "موچە زیاد کردن یان پارچەیەک زەوی میری کە لە بنەڕەت دا هی دکتاتۆر نەبووە" دەبەخشێتەوە بە میللەت. ئەو کەسانەی کە  بە توانا و لێهاتوویی خۆیان دەبێت دابمەزرێن دایاننامەزرێنن ئەگەر ستایشی فەرمانڕەوا نەکەن. ئینجا ئەگەر داشیانمەزراند، ئەم دامەزراندنە وا دەسووڕێننەوە کە چاکە و خێری فەرمانڕەوایە بە دامەزراوی بەخشیوە. بەم شێوەیە خۆی دەکات بە باوکی میلەت. بۆیە دیکتاتۆر قەت بە خۆشی تەختەکەی جێ ناهێڵێ، چونکە دەسەڵاتی سەپێنراو لای دیکتاتۆر شیرین دەبێ. شاکاریی داپڵۆسانیش دەبێتە پیشەیەک تێکەڵی خوێنی دیکتاتۆر دەبێت. دیکتاتۆریش هەموو هێز و توانای خۆی بەکار دێنێت بۆ ئەوەی دام و دەزگاکەی بە ئاسن و پۆڵا دابڕێژێ. بە مەرجێک تا لە توانای دابێ ناهێڵێ هیچ پێچ و پەنایەک لە ژێر چاودێری ئەو

دەربچێ. لە دەنگ و باسەکان دا یەکەم وێنە وێنەی دیکتاتۆرە. وا خۆی پیشان دەدات کە گوایە خەمخواری نەتەوەیە و نەتەوە بێی دیکتاتۆر و خێزانەکەی بەڕێوە ناچێ، بۆیە دیکتاتۆر لە جێی مرۆڤی لێهاتوو تا بۆی بلوێت دەورەی خۆی بە خێزانی خۆی دەچنێت. خێزانەکەی یان خزمەکانی دیکتاتۆر بە خەونیش پلە و پایەی وایان نەدەدیت، بۆیە هەموو شتێک بۆ سەرۆک واژۆ دەکەن. وەک دەبینن گشت دیکتاتۆرەکانی جیهان گەر دەم و چاویان پێکنەچێت، ئەندێشەیان یەکە و یەک داهێنان و یەک شاکاریان هەیە، ئەویش چۆنیەتی گرتنی دەسەڵاتە.

ئەبونە گوتی:

ـمن لەم بڕوایەدام کە هەردیکتاتۆرێک بە شاکارێکەوە دەسەڵاتی وەدەست هێناوە، هەندێک کار لە دەرفەتێک دا دەبن بە شاکار، بەڵام دیکتاتۆرەکان ئەم شاکارە وا لێدەکەن کە فڕی بەسەر خودی خۆیەوە نەمێنێ و ئیتر نەفرەتیشی لێبکرێ. بۆ نموونە دیموکراسی شاکارێکە، بەڵام چونکە ئەمریکا دەیەوێت بەزۆر بیسەپێنێت، ئەم شاکارە دەبێت بە مێردەزمەیەک تا هەڵگری بیر و باوەرەکەش نەفرەتی لێدەکات.

بە شێوەیەکی گشتی وزە و توانای داهێنان لە تەنی هەر مرۆڤێک رادەیەکیان هەیە. دەتوانم بڵێم بەشی زۆری مرۆڤایەتی لەبەشی زۆری بەهرەکان لێک نزیکن. هەرچەندە هەندێک بەهرە لە هەندێک کەس دا بە شێوەیەکی جیاواز سەرهەڵدەدەن کە لە دەورو بەریان یان لە تەڤایی مرۆڤایەتی جیایان دەکەنەوە. لە دوای بەدیارکەوتنی ئەم بەهرەیە دەتوانین چۆنیەتی ئەم توانایە دەسنیشان بکەین. ئەم بەهرەیە دەتوانێ لە بواری مۆسیقا، نیگارکێشان، هەڵبەست، یان سیاسەتمەدارییێت، ئینجا هەرچییێت، ئەم بەهرەیە لەم بوارەدا ناتوانێت بێ مەودابێت. مرۆڤێکی لێهاتو بە گوێرەی توانای خۆی شاکارێک پێشکەشی کۆمەڵگایەکەی خۆی دەکات، یان پێشکەشی مرۆڤایەتی دەکات، ئینجا ئەم شاکارە هەرچی بێت ناتوانێ هەموو کەلێنەکانی بابەتەکەی خۆی پڕکاتەوە. کەوا بوو مرۆڤی بە توانا تاکە پاڵێک یان چەند پاڵێک لە ماوەیەکی دیاریکراوی کورت دا بە شاکارێکەوە دەنێن. ئینجا ئەم

شاکارە رەوتی خۆی وەردەگرێ و وەک گۆیەک سەربەرەو لێژی دەروا. ئیتر تا دێت بەتەوژمتر دەبێت. گەر شاکاربێت بەرەو ئاسمان لێژدەبێتەوە و دەبێت بە ئەستێرەیەکی پرشنگدار. گەر ئەم مرۆڤە شاکارەکەی خۆی گرت تا لەدەستی دەرنەچێت، خۆی دەبێتە بەربەست و تەگەرە لە بەر ڕێگای شاکارەکەی خۆی. شاکاری ڕێ لێگیراو لە لایەن خودی خاوەنەکەیەوە ناکرێت ئاراستەی لووتکە بکرێت، زۆرجار لە سیاسەت دا کە وای لێدێت سەری خاوەنەکەی دەخوات.

ـ سکاڵا لە بەر خۆیەوە بێ ئەوەی سەیری کەس بکات، دەستی لە بەرۆکی خۆی گیر کرد، دەک خودا لە دەمت بنۆڕێت، دەک سەریان خوات، بەڵام کوا سەریان دەخوات، تا سەری دیکتاتۆرێک دەخورێت ملی هەزار بێ تاوان بە سێدارەوە دەکرێت. دەک بە قوربانی ئەوانەی ئێستا لە زیندانەکانی ئەم کافرە بێ ئامانەدان بم. ئەبونە تا پارانەوەی تۆ لە لای خودا قبووڵ نەبێت هەرگیز سەرم بە ئاسوودەیی بە سەرینی خۆم ناکەم. دەک بە دوعای پیاو چاکان بێت، دەک بە توکی دایکە جگەر سوتاوەکان بێت، دەک سەدام تەخت و بەختت وەرگەڕێت، لانە لەولا هاواری کرد ئامین دایە گیان ئامین. دەک خودایە بە ئامینی ئەم بێ تاوانە بکەی.

## دەرگای سێیەم

## دیوانەکانی پاریس

ئاخوو بە چ شاخێکەوە گیرساوە دڵی من؟

لە پاریس لای "ناوەندی رەوشەنبیری جۆرج پۆمپیدۆ" قاوەخانەیەکی لێیە عێراقییەکان پێی دەڵێن قاوەخانەی بەلچیکی. ئەم قاوەخانەیە لە کاتژمێری ١٨ بەولاوە ئیتر دەبێت بە قاوەخانەی عێراقییەکان. گەر بتەوێت دەنگ و باسی راست و درۆی عێراق بزانیت دەتوانیت بە ئاسانی قاوەیەک یان بیرەیێک لە بەردەمی خۆت دانێیت و گوێت لە وتووێژی دانیشتوانی قاوەخانەکە راگریت. ئیتر بێگومان دورنابیت لە چین و توێژ و پارتییەکانی گۆرەپانی رامیاری عێراق. هەر وەک حەمامی ژنان دەنگ و باسی تەڕ و بڕی عێراق هەمووی لەوێ باس دەکرێت، بۆیە کاک ئازاد کە توێنووی دەنگ و باس دە بوو یەکسەر رووی دەکردە قاوەخانەی بەلچیکی. گشتیان دەیانناسی کە کابرایەکی کەم دووە، بۆیە کەس لەلای دانەدەنیشت. خۆی وەک دادوەری میانرەو پەنایەکی دەگرت و گوێی لێدەگرتن. زۆر جار نەدەهاتە یادی کێ ئەم قسەیەی کردووە بەڵام بێگومان بوو لەوەی کە لە قاوەخانەی بەلچیکی باسکراوە. نەک هەر کاک ئازاد بەڵکو زۆربەی زۆری عێراقییەکان کە باسی شتێکیان بکردایە ئەوا دەیانگوت لە قاوەخانەی بەلچیکی گوێمان لێ بووە. ئەوەی بیزانم کەس دۆستی عەلی ئەلجەعفەری (علی الجعفری) نەبوو. هەندێک جار لەگەڵ خالید ئەلعومەری (خالد العمری*+ دەهات و هەندێک جاریش، ئەم دوو دۆستە عەرەبە پێکەوە لە قاوەخانەکە دەردەچوون. لە یادمە زستانی ساڵی ١٩٨٩ بوو، علی بە دەنگێکی بەرز لە گەڵ عومەری دۆستی قسەی دەکرد.

عومەر گوتی:

ـ خالید لەو رۆژانە دائیرەی پەناهەندەیی داوای هۆیەکانی هاتنت بۆ فەرەنسا لێدەکەن. خۆت مەشێوێنە وەک من دڵی خۆتیان بۆ بکەوە و هەرچی لە دڵتە پێیان بڵێ. من راست و رەوان پێمگوتن: سەروەری من.
خالید گوتی:
ـ ئەرێ ئەوە چییە هەر باسی سەروەری خۆت دەکەیت، کێ سەروەرتە؟
ـ کورە تا کەی تێمناگەیت من سەروەر بە واتای رۆح بەکاردێنم. ئینجا با پێتبڵێم سەروەری من موشەخۆرێکی بێ هاوتایە، لە خۆ بایی و تەمبەڵ و نەوسنە. سەروەرێکە کەس نایبینێ، هیچ سەروەرێکی تریشی خۆشناوێت. هەندێک لە سەروەرەکانی دیکە پێشێل دەکات. کاتێ کرداری پێشێلکردن دەکات، من یان هەموو لەشم دەلەرزێت و دەهەژێمەوە. یان بێ ئەوەی کینەم پێوە دیاربێت، یان بشێوێم بەدەستی خۆم ماڵی نەیارەکەی پارچە پارچە دەکەم.
ـ نەیارەکەت کێیە؟ و ماڵی لە کوێیە؟
ـ ماڵی نەیارەکەم ئەو لەشەیە کە رۆحی نەیاری سەروەرەکەمی تیایە. ئینجا کە دەکەوێتە ژێر پێم هەست دەکەم نەیاری سەروەرەکەم کڕنوش بۆ سەروەرەکەم دەبات. هەندێک جاریش وا روودەدات، خانوەکە بێ سەروەر جێ دەمێنێت و کەس کڕنوش بۆ سەروەرەکەم نابات. گەر لە من بپرسیت دەڵێم کرێگرتەکە خانووەکە جێ دەهێڵێ، ئەگەر بە قسەی ئێوەبێت دوژمنەکەم کوشت واتا گیانی لە لەشی جیابووەوە.
نازانم بۆ لەوکاتەی کە علی بەدەنگی بەرز قسەی بکردایە قسەکانی بە کۆ دەکرد نەک بە تاک
ـ راستیتان پێبڵێم هیچ لە سەروەری خۆم ناگەم. بە هیچ و خۆڕایی بۆ هەندێک سەروەر کرنوش دەبات. ئەم ئافریدەیە تەخت و تاراجی لە شوێنێکی دەروونم داناوە. لەکوێیە کەس نازانێ. هەزاران ساڵە بێ ئەوەی مرۆڤایەتی بگات بە ئامانجێک بە دوای سەروەر و شوێنەکەی وێڵ و سەرگەردانە.. لێم مەپرسن ناوی چییە؟ لێم مەپرسن رەنگی چۆنە؟ نازانم لەگەڵما لەدایک دەبێت و لەگەڵما دەمرێت؟ یان پاش مردنم خانویەکی تر بەکرێ دەگرێت؟ دەشێت

ئەم سەروەرانە ئێمە ئاسا بۆ ئامانجێکی لە ئێمە شارراوە وەک ئاژەڵی دەستەمۆ بەخێومان نەکەن؟ دورمەبینە وابێت، چونکە هەست دەکەم لەوکاتەی دەخۆم لەگەڵم دەخوات دەنا ئامادەیە لەشم بخوات، دەخوێنمەوە تێمڕادەمینێ، یان لەگەڵما دەخوێنێتەوە و لێم فێردەبێت، یان لە ئەندێشە و بیرم دەدزێت و دەیبەخشێت بە هاوتایەکی خۆی، ئەویش یان خانووەکەی خۆی پێ جواندەکات، یانیش لەسەر ڕێگایەکی گشتی پێشێلی دەکات.
عەلی درێژەی بە قسەکانی دا و گوتی:
- پێمگوتن، ئەی دەروونناسان و کاربەدەستان ئەوەندەی ئێوە پرسیارتان لەسەر ئەم ئافریدەیە هەیە، من ئەوەندە و زیاتریشم هەیە. نە من نە ئێوە نەکەسیش پێشی ئێمە گەیشووەتتە وەڵامی ئەم پرسیارانە. پاش ئەم چەند گوفتوگۆیە ئەو دەستەیەی کە بەرامبەرم دانیشتبوون سەیری یەکتریان دەکرد و سەریان بادەدا. پێیانم گوت،لە خۆبایی مەبن، وا سەیرم مەکەن وەک پزیشکی دەروونی پەناهەندەکان وا مەزانن کلیلی هەموو پرسیارەکانتان لایە. وادەزانن سەروەری ئێوە لە سەروەرەکەی من لێهاتوترە؟ چونکە ئێمڕۆکە کاربەدەستن کلیلی پەناهەندەییتان پێیە؟ بە پێچەوانەوە هەست بە سەروەرەکانی خۆتان ناکەن، چۆن کڕنۆش بۆ سەروەرەکەی من دەبەن. ئێوە لەشی منتان لە ژێردەستە وامەزانن بەسەر سەروەرەکەم دا زاڵبوون. بڕۆنە هۆڵی کۆبونەوە و ئێوە و پزیشکەکان کۆببنەوە، دەگەن بە ئەنجامێک خۆتان سەرتان سوڕدەمێنێ. هەر ئەوەندە دەزانن کە باسی فراوانی و سەرکەلی دەروون بکەن، لە ئەنجامدا دەگەن بە سەرکەلی دەروونی من. ئینجا گشتان دێن و کڕنۆشم بۆ دەبەن. من نە پیاو کوژم و نە جەلاد بووم، من ئازادکەری ڕۆحی ئەو داماوانە بووم کە لە نێو بەندیخانەی تەنی تاریکدا بەندبوون. من ئامرازێکی ملکەچی سەروەرێکی زۆر گەورەم. سەروەرەکەم پێمدەڵێت من بە فەرمانی فەرماندەی خوداوەند هەڵسوکەوت دەکەم. خوداوەندی گەورە لە ڕۆحی خۆی فوی کردە ناو لەشی باوە ئادەم و دایە حەوا؛ ئەم گیانە هاوتای گیانی زیندووی هەموو ئادەمیزادە زیندووەکانی سەر ڕووی ئەم زەمینە بوو. ئینجا ئەم ڕۆحە چەند ڕۆحی تری لێبێتەوە ئەوەندە بێهێز و لاوازتر دەبێت.

چۆن پارچەیەک فسفۆری پرشینگدار بکەیت بە دوو ، بە چوار یان بە شانزە بەش..... هەتا دووایی، لە کۆتاییدا دەبێت بە تەپ و تۆزێکی زۆر و بێ کەلک، چەند یەک بگرنەوە و کەم ببنەوە ئەوەندە پرشینگی ئەم رۆحە زیاد دەکاتەوە. ئێوە سەیرتان پێ دێت، بەڵام کە لە شوێنێک جورج زۆردەبن کلکی یەک دەگرن، و خۆیان بە ئاودادەدەن، بۆیە خوداوەندی گەورە لە تەورات و ئینجیل و قورئانی پیرۆز دا باسی جەنگی پیرۆز دەکات، تا کەممانکاتەوە. جاران خودا تاعونێکی بۆ دەناردن بە هەزاران پێی دەمردن، ئیمرۆکە مرۆڤ دەرمانی بۆ دۆزیوەتەوە و کەس پێی نامرێت. ئێوە بەناوی ئازادی لەش پەیوەندی نێر و مێتان ئازاد کرد، خودا ئایدزی بۆ ناردن تا کەم ببنەوە. گەر خودا بیەوێت جەنگ نەمێنێت بە چاو نوقانێک جەنگ ناهێڵێت. بۆ نموونە ئێوە باسی دڵڕەقی جەلادێکی فەرمانپێدراو دەکەن، گەر لەدەستانبێت خۆتان دەکەن بە جەلادی جەلادەکە. ئەی راڤەتان بۆ ئەم دیاردەیە چییە، کە لە هەندێک وڵات بە شەڕ و شۆر بە ساڵێک نۆ هەزار کەس ناکوژرێن، لە هەندێک وڵاتی ئاسودەش بە بەسەرهاتی ئۆتۆمۆبیل نۆ هەزاریان لێ دەکوژرێت. ئەی ئەوە، ئەوە ناگەێنێت کە لە هەر لایەکی ئەم دوو شوێنە جیاوازە نۆ هەزار کەس زیادە بوون. ئەی ئەگەر راڤەی زیادەبوونی توخمی ئینسان نەبێت ئێوە راڤەی چی بۆ ئەم دیاردەیە دەکەن؟ راستی لە نێوانی برادەران زۆر خۆشە، بۆیە راست و رەوان پێتان دەڵێم من دڵنیام لەوەی کە مردن لە ئارادا نییە، بۆ نموونە کە خانوویەک کەون بوو دەیرووخێنن و لە شوێنی خانوویەکی تر بەرپا دەکەن.

سالار گەلێک رقی لە عەلی ئەلجەعفەری دەبووەوە، رووی تێکرد و گوتی:

- تۆی پیاو کوژ پاکانە بۆ کردەوە دزێوەکانت دەکەیت. خۆت وا پیشاندەدەیت کە گوایە پیاوێکی چاونەترسیت و لە ژیان بێزاریت و لە دوای ژیانێکی تر دا وێڵ و سەرگەردانیت. گەر تۆ لە ژیانی خۆت بێزاریت، ژیانی خۆت ببڕێنەوە و ئاسوودەمانکە پەیوەندیت چییە بە ژیانی خەڵکی ترەروە. بڕواتبێت من دەمناردیت بۆ ژیانێکی تر، بەڵام من لە یەک شت دەترسم ؛ بە کوشتنت تاوانەکانت رەشببنەوە، دەنا ئێستا گیانم لە بەرت دەبڕی. بە دەردی خۆت

دەڵێیت راستی لە نێوانی برادەران خۆشە. من دەڵێم خۆشە راستی بە دوژمنیشت رابگەێنیت، بۆیە پێت دەڵێم لەم ژینە دا هەر تکێتێکی یەک سەرمان پێیە کەس تکێتی هاتنەوەی پێنەبووە کەسیش پێی نابێت، بۆیە کەسمان تکێتی هاتنەوەمان پێ نییە. بۆ زانینی تۆ و گوێڕایەڵەکانت پێتان دەڵێم ژیانێکی تر لە ئارادا نییە. گەر تکێتی هاتنەوەت پێبایە بە مرڤایەتیت رادەگەیاند چ تاوانێکت کردووە. جا گەر بتەوێ ئەم ژیانە جێبێلیت ئەوا ژیان پەکی بە تۆ نەکەوتووە، بەڵام داخی گرانم بۆ ئەو کەسانەی بەدەستی چەپەڵی تۆ بە هەناسەی ساردەوە ئەم ژیانەیان جێهێشت، جەنابیشت سەیرم دەکەی لە دڵی خۆتا دەڵێیت گەر بکەویتە ژێردەستم دەزانم چی لێ دەکەم. ئێستە تۆ لە فەرەنسا پەنابەریت و فەرەنسا دەتپارێزێت. دەنا کەسانی وەک تۆ پیاوی ئەوەنین بێن لە تەک ئێمە مانان دانیشن. سەیرێکی خۆت کە دانیشتنەکەشت ناشیرین کردووە.

عەلی گەنجێکی ناشیرین نەبوو، بەڵام لە سیمای دا ماندوبوونێکی زۆر دەبینرا. تەمەنی ئەم گەنجە نزیکەی بیست و پێنج تا بیست و هەشت ساڵ دەبوو، بەڵام کە بیرەکەی هەڵدەگرت دیاربوو دەستی دەلەرزی و پێڵووەکانیشی ناوە ناوە سەمایان دەکرد. ئەوەی سەیر بوو ئەم کابرایە نەدەشێوا، وەڵامەکانی هێمن و لەسەرخۆ بوون. پەرداخە بیرەکەی دەستی دانا و هەڵسا سەر پێ بە دەنگێکی بەرز تا کشیان گوێیان لێبێت گوتی:

- من و جوانی رەها لە دووڕیانی هەربووندا "لە ئەزەلدا مان و نەمان هەیە مان بەسەر نەماندا دەکەوێت بۆیە دەبن بە یەک" بووین بە یەک. جیاوازی لە نێوانی جوانی رەها و من دا نەما. چونکە هەردووکمان سنورمان بەزاند و ئاوێتەی یەکتری بووین، هەر بۆیەش دانیشتن بە منەوە جوانە. چونکە هیچ کردەوەیەکم بێ فەرمانی رەوا نەکردووە. گەر کردەوەکانی منتان لا دزێو بێت ئەوا کردەوەی خواتان لا دزێوە. لە خۆتان بپرسن، چۆن بە بێ رەوا دەچنە رەوا؟ گەر مردن رەوابێت چۆن یەکێکی نارەوا دەتوانێت بتاننێرێت بەرەو رەوا؟ کەس دەتوانێت مرۆڤێک بکوژێت؟ ئەگەر پێش لەدایک بوونی کوژرا و

بکوژ خوا وای دانەنابێت. ئەی نازانن مرۆڤ پێش ئەوەی بمرێت ناوی لە سەر گەڵای ژیان ڕەشدەبێتەوە و ئیتر رزقی لە سەر ئەم زەمینە نامێنێت.
- خۆت بە زیرەک دەزانیت، گەر من پیاوێکی ئایینی بام بەم شێوەیە وەڵامم دەدایتەوە:
- جوانی رەها وەک جوانی دەبێت لە نێو رەها دا بەند بێت و نەیێتە دەرەوە. چونکە ئەگەر ئەم جوانییە بێتە دەرەوە و بەدیار دەکەوێت؛ کە بەبەر چاوی مرۆ کەوێت مرۆڤ هەڵیدەسەنگێنێت. هەر شتێک کە دیترا بە دەروون دا تێدەپەڕێت ئینجا دەروونی مرۆڤ دەبێت بە پێوەرێک بۆ ئەم جوانییە. ئەگەر هەرشتێک پێورا رەهانییە. وەک دەزانیت شوێنی دادوەر لە شوێنی دادپرسراو بەرزترە. ئینجا باش بزانە تۆ شێتیت و جوانی رەها لێت بێبەرییە و هیچ فەرمانێکی بە تۆ نەداوە.
یەکێک لە دانیشتوانی قاوەخانەکە بە دەنگێکی هێمنانە گوتی.
ئەو رەوایەی باسی دەکەیت هەر لە مێشکی تۆ دا هەیە. باش بزانە هەرگیز خودا ناڵێت دەست لە کار و باری من وەردە، "کل نفس ذائقه الموت" "هەر گیان لەبەرێک مردن دەچێژێت" جا خودای گەورە پێویستی بە یارمەتی کەس نییە. ئەوە ئەهرەمەنەکەی دەروونتە فەرمانی ناڕەوای وات پێدەدات. پاش ئەوەش کە باسی جوانی خۆت دەکەیت دەڵێم، راستە،...رۆژێک لە رۆژان تاڵیی بە شیرینی گوت:- کێ دەتناسێ گەر چێژی تفت و تاڵی من نەبێت؟ تۆش وەک تاڵی دەتەوێت خۆت بە کردەوە دزێوەکانت هەڵکێشیت. یان دەتەوێت لە ژێی هەستی مرۆڤ بدەیت، چونکە مرۆ یەکەم شت هەست بە ناخۆشی دەکات ئینجا بە خۆشی، تۆش خۆت فش دەکەیتەوە تا نرخت زیادبکەیت. ئادەمیزاد بە کردەوەی جوان جواندەبێت، نەک بە پیاوکوژی.
عەلی وەڵامی کابرای داوە.
- خۆتت لێمان کردووە بە مەلا، ئەهرەمەنیش بێ فەرمانی خودا هیچی پێناکرێت. سنووری چێژ لە دەمی مرۆڤ تێپەر ناکات، بۆیە ئەم بیرەنابوتەی جەنابت لەم قاوەخانەیە تێپەرناکات. من بە کردەوە لە راژەی خودای گەورەدام. بە جوانی خوداوەندی خۆم دەوڵەمەندم، مەجبوری گەواهی تۆ نیم.

سالار وتی.
- مرۆڤ هەر شتێک بە پێوەرێک دەپێوێت دەوڵەمەندی بە پارە وەک پێوەرێک دەپێوێت، جوانیش گەر پیوەرێکی هەبوایە تۆ دەبویت بە هەژارەکە.
- تۆ نازانیت تیشک پێوەری جوانییە؟ گەر نەزانیت پیوەری جوانی چییە؟ چۆن هەر لە خۆتەوە من هەڵدەسەنگێنیت.
سالار گوتی.
- هیچ شتێکَ بێ تەرازو ناتوانین هەڵسەنگێنین، هەر شتێکیش کەوتە ناو تەرازو رەها نییە. گەر جوانی تۆ رەهابێت چۆن دەکەویتە ناو تەرازوی ئێمەمانان؟
- کاکە سالار بۆ تێناگەیت. من لەو رۆژەوە کە تیشکم دیوە لەناوی دا تواومەتەوە.
- لەماڵەوە چرا پێناکەیت؟ کا بەساقە ئەم چرایانە بکوژێننەوە، با تۆزێک چاومان بە نووری ئەم زاتە رووناکبێتەوە.
- دەبێ تێبگەیت تیشک لە دەروونم دا تواوەتەوە، لەشیش پەردەی داپۆشەری ئەم تیشکەیە، بیریش لە دەروونم دا رەنگدانەوەی پلەی توانەوەی ئەو تیشکەیە. زیرەکی مرۆ لەوەدایە کە فێربێت چۆن ئەم تیشکە بەکاربێنێ. چونکە ئەم تیشکە ئامرازێکی ناسینی رەوایە واتا ئامرازی خود ناسینە. چۆن تۆ چرایەک بەدەستەوە دەگریت و لە دوای شتێک دەگەرێیت منیش لەو رۆژەوە تیشکی دەروونم بەدەستەوە گرتووە و بەرز دەبمەوە و کەوتوومەتە ناو سنووری جوانی. رەوا وەک شنەی با وەکو تیشکێک بەبەردەما تێدەپەڕێ و ون دەبێ، لەو کاتەی کە لێم ئاوادەبێ منی دێوانە بە دوای رەوادا وێڵ دەبمەوە.
- بۆچ ناچیت دەروونناسێک ببینیت تا چارەسەرێکت بۆ بدۆزێتەوە؟ گەر بەم شێوەیە برۆیت دەبیت بە پەروانە و رۆژێک دێت لە ناو ئاگری دۆزەخدا هەڵدەپروکێیت، چونکە گەر ئاگر ببینیت وادەزانیت تیشکت دیوە.
لەو کاتەدا عەلی بە زەردەخەنەیەکەوە سەیری ئازادی کرد و پەنجەی ئاماژەی لە ئاسمان کرد و گوتی هەر تۆ تێمدەگەیت.

وەک بڵێی سالار لە خەو هەڵسابێ، ئەویش رووی لە ئازاد کرد و گوتی:
ـ نا کاک ئازاد وا تێنەگەیت من دەمەوێت یارمەتی بدەم، بەڵکو بە پێچەوانەوە نامەوێت وا بە ئاسانی و بێ هیچ سزایێک ئەم ژیانە جێبهێڵێت، دەمەوێت بدرێتە دادگا.
ـ کاک سالار بە یارمەتیت، ئێوە لە ترسی رەخنەی ئێمە دوژمنی خۆتان لە یاد دەکەن و بە گژمان دا دێن، ئەوەی بێ ئاگابێت وادەزانێ شەڕەکە لەگەڵ ئێمە بووە. لە تەماشاکردنی من مەترسە من دۆستتم، لە دوژمنەکەت فێربە، بێ ئەوەی زمانی ئێمە بزانێت سەرنجی تۆی بەرەو من راکێشا.
ـ دەمنێرێتە لای دەروونناس، بەڵام بڕواتبێت لەم رۆژانە سەیری ئەو وەردەی لایماڵی خۆمانم دەکرد. لەنکاوێک ئەوەندەم زانی وەک گەردەلوول تیشکێک لەم وەردە هاتە دەرەوە، بەڵام چۆن تیشکێک بوو هەرچی رەنگێ خودا دایناوە تێدا دەبریسکانەوە. سەرم سورما، واقم وڕما، هەر سەیری ئەم خاکە بۆرەم دەکرد. دەتگوت خەرمانی زێڕ و ئەڵماسە جریوەی لێ هەڵدەستێ. لە شوێنی خۆم حەپەسابووم. تاکە موویەکیش لە لەشم نە دەجوولاوە. گەر خەنجەرت لێدابام خوێن لەبرینم نەدەهات. ئەوەندەم زانی زەوی بە زمان هات و گوتی: ئەی بەندەی خودا چیتە دەترسیت؟ بۆچ وا پەشۆکاویت؟ لە شوێنی خۆتا رواویت؟ من بەناوی ئەم تیشکە پێتدەڵێم مەترسە. گوتم ئەی نابینیت گەردەلولی تیشک لە دەروونتا هەڵدەکوڵێ؟ ورەم نەماوە دەڵێم نەکا ئەم ئاگرە بمسوتێنێ. ئەی بەندە ئەم تیشکە زۆر فێنکە دەرونی تۆی پێ ئاودراوە چۆن لێی دەترسیت؟ گەر دەرونت پڕ لەم تیشکە نەبوایە نەتدەتوانی ئەم تیشکە ببینیت. هەزاران دڵڕەش دەبن بە خاڵێکی رەش لە ناخم وەک دڕکێک دەڕوێن. یەکێکی وەک تۆش دەبێتە خاڵێکی گەش و دەروونم ئاودەدات. گەر دەروونی من دوا کونجی ئادەمیزادی وەک تۆ نەبایە، خودا زۆر لە مێژ بوو منی کرد بوو بە ریزە (تۆز) بە ئاسمانەوە. ئا ئەم تیشکەش تیشکی دەرونی بەندەیی وەک تۆن لێم هەڵدەستن.
وا دیار بوو سالار بە تەمای وەڵام بوو، بەڵام خالید پێش سالاری گرتەوە و گوتی.

- گەر شاهی خاوەن شکۆی دەڤەرێک کۆچی دوایی کرد و بە دەهۆڵ و زورنا و تەنتەنە و سەنتەنە بینێژن، بە ئاسوودەیی تەخت و بەختی بۆ نەوەی خۆی جێبهێڵێ. گەر رۆژێک بە دۆنای دۆن رێگای کەوتەوە شارەکەی خۆی، کێ ناڵێ، لە بەر دەروازەی شاهانەکەی خۆی نەوەی نەوەی خۆی بەجل و بەرگی گەدایی نادۆزێتەوە. کێ ناڵێ خۆی لەبەر دەگای خۆی دا گەدا نابێ. کێ ناڵێ ئەم "سەدام"ە کە ئیمرۆکە لافی هێزو و توانا لێدەدات، دەیەوێت هەموو عێراق بکات بە عەرەب، کێ ناڵێ بە دۆنای دۆن نایەتەوە بۆ ئەم عێراقە و تاکە کەسێک نادۆزێتەوە بە زمانی عەرەبی قسەی لەگەڵ بکات. ئا ئەوساکە سەرۆکی نەتەوەی عەرەب دەبێت هەڵس و کەوتی لەگەڵ خەڵکەکە چۆن بێت؟ لە لایەک ئەوەندەم پێ خۆشە دۆنای دۆن هەبێت، لە لایەکی تر ئەوەندە لێی دەترسم دەڵێم گەر نەبێت زۆر باشترە. سەدام دەیەوێت کورد لە عێراق نەهێڵێت بەڵام کورد بە دۆنای دۆن هەموو عێراق داگیر دەکەن. چونکە دیمەنی کوشتنی کوردەکان لەبەر چاوم هەرگیز ون نابێت.
بە گشتی ئازاد حەزی لە دەمەتەقێ نەدەکرد، زیتر تێنوی دەنگ و باس بوو، بۆیە یەکسەر بە قسەهات.
- کوشتنی چی؟
خالید سەری خۆی خستە نێو دەستەکانییەوە و ئاخێکی هەڵکێشا:
- من تا ئەورۆژەش مریشکێکم سەرنەبڕی بوو، کە گۆشتم دەخوارد بە هەموو شێوەیەک نەمدەویست بیر لە وە بکەمەوە کە ئەم گۆشتە پێشی چەند سەعاتێک گیانی لەبەر بووە. وەک من لەم ژیانە هەناسەی هەڵکێشاوە. نامەوێ چیتر سەرتان بە دەنگ و باسی خۆم بێشێنم.
ئەو رۆژە زستانێکی گەلێک توش بوو. بە ناوی "سەربازە بەلیمەتەکان" ناوی چەند سەربازێکیان خوێندەوە یەک لەوانە ناوی من بوو. سواری زیلێکی سەربازییان کردین، زۆر نەڕۆیشتین دایانبەزاندین. بێ ئەوەی هیچمان پێ بڵێن لە بەردەم چاڵێکی لاکێشە رایانگرتین. دیتم چەند زیلێکی عەسکەری تریش لە لایەکەی ئەولا وەستاون. گوتم وەک ئاسایی دیسان مەشقی سەربازییە. ئەوەندەم زانی چەند لاوێکییان بە بەرگی کوردی و بە چاو

بەستراوەیی لە زیلەکان هێنا خوارەوە. هەموویان یەک یەک لە نێو چاڵەکە ریز کردن. زابتەکە بە ئێمەی گوت ئامادەبن، ئێمەش بێ یەک و دوو تفەنگە سوارکراوەکانمان ئاراستەی سنگیان کرد. یەکێکیان دەمامکەکەی لە سەر دەم و چاوی کراوە و چاوی لە نێو چاوم بڕی. هەسم پێ کرد ئەوا هەزارساڵە دەیناسم. پێشی هەزار ساڵ ئا ئەم کوڕە برای من بوو. من دەیناسم چۆن بچم باوەشی تێوەریێنم و لە باوەشمی کەم هاتەوە یادم پێش هەزار ساڵیش ئەو بە دوو ساڵ لەمن گەورەتر بوو. لە باوەشی دەکردم هەندێک جاریش لەسەر چیلکەیەک بە شەر دەهاتین پۆڕ (پرچ)ی یەکتریمان رادەکێشا و یەکتریمان دەگەزت. زابتەکە گوتی شەهادەبێنن، هەر وەک دەنگی ئەسحابەکانی پێش ١٤٠٠ ساڵ دەنگی "اشهد ان لا اله الا الله، محمد رسول الله" لەم بیابانە کاکی بەکاکییە بەرز بووەوە. هەستم پێ کرد و بە چاوی خۆم دیتم مەلائیکەکان لە ئاسمانی حەوتەمەوە هاتنە خوارەوە، هەموویان کڕنوشیان بۆ خودای گەورە دەبرد. برایەکەم بە زمانی عەرەبی هاواری کرد، گوتی جەنابی زابت من و برایەکەم و ئامۆزایەکەم دیانین دەستمان بکەوە تا خاچی خۆمان بکەین. زابتەکە گوتی دەستیان بکەنەوە. دەستی هەرسێکیان کردنەوە. زابتەکە گوتی شەهادەبێنن بەرەڵاتان دەکەم. ئەی ئەوانە هەموویان شەهادەیان نەهێنا ئەی بۆچ بەرەڵایان ناکەی؟ دەستی لەبەر حەزرەتی عیسا بەرز کردەوە و گوتی:

خاوەنی تاکە ژینێکم ئەویشم پێشکەش کرد بە تۆ
گەر ژینێکم پێ ببەخشن بە پەیمانێ نەیدەم بە تۆ
ئەم لەشەم بۆ چییە ناوگڵم لا خۆشترە بێ تۆ
دیاری ژەهراویم بۆچییە گەر رۆحم دوربێت لە تۆ

هەرسێک سەیری یەکتریان کرد و پێکەنین. ماڵ ئاوایی و گەردەن ئازادییان لە یەکتری کرد و پێکەوە سەیری ئاسمان و بیابانی بێ سنوری بەردەمی خۆیان دەکرد. وابزانم برایەکەم منی هاتەوە یاد و بە زەردەخەنەیەکەوە سەیری کردم تفەنگەکەم ئاراستەی سنگی ئەو کرا بوو, بەرزم کردەوە ئاگام لێ بوو مەلائیکەتێک دەستی بەسەری دا دادەهێنا و بە بێ کینە چاوی لە نێو

چاوم بڕیبوو. ئەوەندە نەمابوو تفەنگەکەم لەدەست بەربێتەوە وا بزانم خەو بەسەرم دا زاڵ بوو، بۆیە زابتەکە هات و شانەکانی ڕاتەکاندم و گوتی ئەی سەرباز کاتی خەو نییە. لەنکاوێک گوێکانم تەپ بوون بە دەنگی دەفی سۆفییە کوردەکان لە لایەک شێخ عەبدولقادری گەیلانی، لە لایەکی تریش مەولانا خالیدی نەقشبەندی ، مەولانای بەلخی ناسراو بە مەولانای ڕۆمی ڕاوەستا بوو. هەرسێک پێکەوە دەفیان لێدەدا. نازانم چۆن گەنجە ڕیزکراوەکان هەموویان پێکەوە بەدەنگێکی نزم و کاریگەر دەیانگووت "حی الله حی الله، لا اله الا الله،،، حی الله حی الله، لا اله الا الله. دەنگی دەفی ئەم سێ شێخە کوردە و (حی الله حی الله، لا اله الا الله) ی ئەم گەنجانە بایەکی هەڵکرد گەردەلوولێکی سپی گەورە وەک کراسی سپی سۆفییەکانی مەولانای بەلخی لە چوواردەورەی ئەو گەنجانە دەسوڕاوە دەتگوت گیانی سۆفییەکانی ئەم سێ شێخەن هاتوون گیانی ئەم گەنجانە لەباوەشکەن تا بەرەو ئاسمانی بەرین بیانبەن. دەنگی گوللە دەنگی دەفی ڕاگرت، گەردەلوولە سپیەکە بە چاونوقانێک لەم ناوە نەما. سەیری تفەنگەکەی خۆم کرد، فیشەگی تێدا نەمابوو. لەرزێک بەلەشم داهات:

- گووتم من... منی فەرمانپێدراو کێم کوشت؟

- سەلاحەددینی ئەیوبی بە سواری ئەسپەکەیەوە هاتە بەردەمم و ئەسپەکەی حیلاندی و سەلاح الدین یەخەی گرتم و گوتی:- دەپرسیت کێت کوشت؟ تۆ کەست نەکوشت، تۆ ئیسلامت وەک ئایینێک لەناو برد.

ئەوەندەی بزانم لە سەربازگە لە سەر تەختێک درێژکرابووم، گوێم لێ بوو یەکێک دەیگوت، جارێ منداڵە و یەکەم جاریەتی خوێن ببینێ بۆیە بەرگەی بۆنی خوێنی نەگرتووە. چاوم کردەوە زابتەکە لێمهاتە پێشەوە و گوتی، ئەی ترسنۆک لە ڕژانی خوێنی دوژمنەکانت دەترسیت؟ گەر نەمزانیوایە تۆ لە پشت و ڕەگەزی نەتەوەی منیت لە گەڵ ئەم پیسە بۆگەنانە لە هەمان چاڵدا دەمناشتیت. زابتەکە سەیرێکی منی کرد و درێژەی دایێ؛ ئەم چەپەڵانە چ بەختێکیان هەیە لە خاکی پیرۆزی ئێمەدا ناژران.

گوتم:

- راست دەفەرمویت سەروەرم بەڵام من دوێنێکە خراپ نوستم بۆیە خەوم لێ کەوت. بەڵام بەڕاستی بوورابوومەوە، ئەویش باش دەیزانی، بەڵام چاوپۆشی لێکرد.
پێکەنی گوتی:
- دەبڕۆ ژێر چادرەکەی خۆت بخەوە.
– یەکێک لە نێو قاوەخانەکە دا هاواری کرد شێتە چی ترت پێ نییە بیڵێیت؟ بە درۆ و دەلەسەی شێتی بەتەمایت ئابڕومان ببەیت؟
– گەر شێتبم یان شێتنەبم شتێکی تریشم بۆ مێژوو پێیە بۆتانی دەگێڕمەوە.
– جا ئەگەر ئێمە شێتنەبین چۆن گوێ لە شێتێکی وەک تۆ رادەگرین.
ئازاد گوتی:
- ئەوەی پێی خۆشە با گوێ راگرێ ئەوەی پێشی خۆش نییە با خەریکی کاری خۆی بێت، ئێرە شوێنێکی گشتییە.
غڵبە غڵب کەتە ناو قاوەخانەی بەلچیکی و یەکێک لە دانیشتوانەکە هەڵسا و گوتی گەر نەچیتە دەرەوە من بە شەق دەتبەمە دەرەوە. عەلی چەقۆیێکی درێژی لە باخەڵی دەرهێنا و گوتی، سەروەرەکەم پێمدەڵێت ئەوەی بەلات داهات پارچە پارچەی کە. ئینجا گشتیان لە شوێنی خۆیان دانیشتنەوە. وا دیاربوو خاوەنی قاوەخانەکە دەیویست تەلەفۆنی پۆلیس بکات، ئەویش دەسکی تەلیفۆنەکەی داناوە سەر تەلیفۆنەکە. گشت بێدەنگ بوون. خالید سەیرێکی عەلی کرد و گوتی عەلی گیان دەریابە شێلو مەبە ئەوەی من و تۆ هەستی پێ دەکەین ئەوانە بە مێشک بیری لێ دەکەنەوە. ئەوەیە جیاوازی نێوان بیر و هەست، بۆیە لەلای ئەم زیرەکانە من و تۆی هەست ئەشکەنجە دراو بێ سەر و بەر و شێت وێتین. جا ئەم جارەشیان دووپاتی دەکەمەوە بۆ ئەوەم نییە کەس تورەبێت، نامەوێت دڵی کەستان بشکێنم، بۆ ئەوەشم نییە کەستان دڵی پێم بسوتێت. دیسان دووپاتی دەکەمەوە دەڵێم من بۆ مێژوو ئەم راستییە دەدرکێنم. لە تەمەنما نەمبیست بوو زەردەشت کێیە، نە ناوی ئەهورەمۆزدام بیست بوو، نە دەمزانی پەڕاوێک هەیە بەناوی ئاڤێستا. زۆرکەستان ئەم ناوانەتان لا نامۆیە، هەر چۆن ئەوساکە لای منیش نامۆ و

نەناسراو بوون. چەند مانگێک بەسەر ئەو بەسەرهاتە دڵتەزێنەی کە بۆم باس کردن تێپەڕی. سەیرێکی ئازادی کرد و گوتی نا کاکە ئازاد واتێنەگەیت بەسەر چوو، واتا سڕاوە و لە ئارادا نەما. نەخێر کە وادەڵێم من باسی میلی کاتژمێر دەکەم کە بێ خواستی ئێمە دەسوڕێتەوە. بەڵام دەنگی دەفی ئەم سێ شێخە بونەتە مۆسیقای ژیانم.

ئێوارە بوو تازە گەیشتبومەوە سەربازگەکەی خۆم، پشتێندەکەم شلکردەوە ویستم تۆزێک لێی راکشێم، تا تۆزێک چێژی خۆشەویستی کەس و کارم وەک فلیمێکی بەسەر چوو بێنمەوە بەر چاوی خۆم. دەنگی فەرماندەی ئێشکچی هات "کۆبنەوە" هەر سەرباز بوو بە راکردن جل و بەرگی خۆی لە بەر دەکرد. منیش بە هەمان شێوە پشتێندەکەی خۆم بەستەوە و پۆستاڵەکانم لە پێ کرد و بەرەو گۆڕە پانی کۆبونەوە رام کرد. گشتمان بە رێز راوەستاین. چەند ناوێکیان خوێندەوە و هەرکەسێک ناوی دەخوێندراوە هەنگاوێک لە ریز دەهاتە دەرەوە. ئەوەی ناوی نەخوێندراوە پێیانگووتن بڵاوەی لێ بکەن، ئێمەشیان سواری چەند ئۆتۆمۆبیلێکی جێب کرد و بەرەو هەمان شوێن ئێمەیان بردەوە. من سامێک لە دڵم نیشت وەک بڵێی بەرەو مردن بمبەن وا بوو. زراوم لە دەست و شمشێری سەلاحەددین چوو بوو، بەڵام چارەم نە بوو. لە دڵی خۆشم دەمگوت; خۆ ئەم رێگایە رێگای مردن نییە، خۆ شەرت نییە خەڵکمان پێ بکوژن، کێ ناڵێ بۆ مەشق نامانبەن. من لەم قسانە دا بووم جێبەکانمان راوەستان. هەموومان بە گورجی هاتینەخوارەوە. .سەیرم کرد چاڵێکی تریان لێداوە، هەر ئەوەندەی چاڵەکەی پێشو دەبوو، هەستم کرد دیسان خەو دەمباتەوە. بەڵام دانم بە خۆما نا و گوتم من هیچم بەدەست نییە من سەربازم.

عەلی لە شوێنی خۆیەوە منگەمنگێکی لێوەهات:

- ئەوە کاری کوێڵە نییە ئەوە خواستی خودایە، نە بە تۆ نە بەمن راناگیرێت.

خالید گوتی:

- عەلی راستەکەیت. بەڵام ئەوەی من دیتم خودا بەزەیی بە تۆ دا هاتووەتەوە بۆیە پیشانی تۆی نەداوە.

ئەوەندەی زانیم ؛ دەرگای پشتەوەی زیلەکان کرانەوە، دوو زیل بوون هەردووک پڕ بوون لە ژن و منداڵ. بە کراسی کەسک و سور و زەرد، ئەو ناوچەیان کرد بە باخێکی رازاوە. وامدەزانی ئەم کیژۆلانە بەرەو شایی دەچن، ئێستە دەستی یەک دەگرن و دۆڵ و زورنا دەستپێدەکات. شایی چی بە بڕوای من ڕۆژی حەشریش بەم شێوەیە نابێت. نازانم چۆن دەنگی گریانی منداڵی مەلۆتکە و نوزەنوزی منداڵی بچوک، عەرشی پەروەردیگاریان دەهەژاند بەلام نەیان دەتوانی تۆسقاڵێک بەزەیی بخەنە دڵی زابتەکەمان. کیژۆڵەکان بە چاوە گەشەکانیانەوە، چاویان لە سۆزی یەزدانی بوو. بە هەمان شێوەش سەیری پەنجەی سەربازەکانیان دەکرد کە لەسەر پەلاپیتکەی تفەنگەکانیان گیر بووبوون. گشتیان لە ناو چاڵەکە راگرتن. کچێکی بچکۆلانەی چاوگەش سەیری مەتارەکەی قەدمی کرد و پەنجەی ئاماژەی بۆ ڕاکێشا و گوتی بابە ئاو. ویستم مەتارەکەی بدەمێ ئاو بخواتەوە. زابتەکەمان زوو پێڕاگەیشت، هات و مەتارەکەی لێ وەرگرتم و رژاندیە ژێر پێم. گوتی نابێت دڵت بەم ئاژەلانە بسوتێت ئەوانە دوژمنی نەتەوەکەمانن. لەو کاتەی کە زابتە دڵڕەقەکە ئاوەکەی دەرژاند، پارچە هەورێکی سپی ئاسمانی شینی داپۆشت دەستی کرد بە گریان؛ بارانێکی لێ هاتە خوارەوە ئەو ناوچەیە لە تەمەنیا بارانی وای نەدی بوو. بە بەزەیی ئەم خودایە مەزنە ئەم خاکە دەستی کرد بە پێکەنین تا تێر ئاو بوو. کیژۆلەکە دەمی دەکردەوە و زمانی لە لێوە بچکۆلانەکانی خۆی دەدا کە تێر ئاو بوو سەیری کردم. تێیگەیشتم پێمدەڵێت سوپاس. ئاخ...، ئاخ...، عەلی پێش هەزار ساڵ ئەم کیژۆڵەیە کچی من بوو. لە باوەشی خۆم رامدەکوشی و ماچم دەکرد یاریمان پێکەوە دەکرد، تا ئەو کاتەی لە هەمێزما خەو بەسەری دا زاڵ دەبوو خەو چاوەکانی دەبردەوە. ئینجا لە سەر جاجمێک درێژم دەکرد و بە ئەسپایی نێو چاوانمیشیم ماچ دەکرد. سەیریم کرد لەبەردەمما وەستاوە دیسان چاوەکانی خەو دەیانباتەوە. ویستم لولەی تفەنگەکەم ئاراستەی ئەفسەرەکەکەم، بەلام ڕێژنەی گوللە لە هەموو لایەک بەسەر ئەم مناڵ و ژنانەدا باری. بارانەکە وەستا. کۆڵکەزێرینەیێک بە هەموو ڕەنگەکانییەوە لە نێو ڕۆژەوە هەلات و سەرێکی

گەیشتە نێو چاڵەکە. پیاوێکی ڕیشدار بە کۆڵکەزێڕینەکەدا هاتە خوارەوە و گوتی من زەردەشتم، پەڕاوەکەی بەرز کردەوە لێی نووسرابوو ئاڤێستا، من پەیامبەری ئاهورەمەزدام، بۆچ پەراوی پیرۆزی منتان ون کرد. دەستی بۆ ئاسمان بەرز کردەوە و فەرمووی ئاهورەمەزدا خودای تیشک و خودای پاکی، ئەم جارەشیان لە نەتەوەی من ببورە. ئەوەندەم زانی کچەکەم ئاڤێستایەکەی وەرگرت و ماچی کرد. سەرنجم دا بەرگی ئەم پەڕاوە دیتم جێ ماچی لێوی کچەکەم بوو بە خۆرێک لە ناوەندی بەرگەکە، ڕەنگەکانی کۆڵکەزێڕینەش لە سەر بەرگەکەی نیشتەجێ بوون. نازانم ئەوە خەون بوو کەوتە نێو باوەشی خەیاڵمەوە. هەرچۆنێک بێت؛ ڕاستی بێت یان خەیاڵ بێت، ئێستاکە چۆن دەتانبینم ئەوساکەش بە هەمان شێوە دیتم دەرگایەک لە ئاسۆ کرایەوە، ئەودیوی دەرگاکە ئاسمانێکی تر بوو جۆرەهای ئەستێرە و ڕۆژ دەستیان لە ملی یەک کردبوو. هەر ئەستێرەیەی ڕەنگێکی هەبوو، ڕەنگی وای تیابوو لە جیهانی ئێمەدا نەبوو. لە پشت دەرگاکەوە گەردلوولی تیشک هەڵسا و هەموو تیشکەکان بوون بە تیشکێکی بێ هاوتا وەک کۆڵکەزێڕینە بەرەو چاڵەکەی بەردەمی من هاتن, کچەکەم ئەوەی تفەنگەکەم ئاراستەی سنگی کردبوو, پەیامی ئاڤێستای هەڵگرت و کۆڵکەزێرینەکە بوو بە پەیژەیەکی بێ کۆتایی و کچەکەم بەسەریدا بەسەرکەوت. منداڵ و کچ و ژنەکان بەدوای کەوتن. ئاسمان ڕەنگی گۆڕا، بوو بە مافورێکی ڕەنگاو ڕەنگ، ڕەنگەکانی ئەم مافورە دەتگوت ئەستێرەنە و دەبریسکێنەوە. کچە نەشمیلانەکەم ئاوڕێکی لێدامەوە و گوتی باوکە من وام نەدەناسیت، ئەوە گوللەی تۆ بوو بە سنگی من کەوت. ئینجا پەڕاوەکەی بەرز کردەوە و گوتی ئاهورەمەزدا لەبەر خاتری ئەم پەڕاوە پیرۆزەت کە لە دەستم دایە لەم باوکە داماوە بێ چارەیەم ببورە. بە هۆش خۆم هاتمەوە دیتم ئاسمان هیچ نەگۆڕا بوو، دەتگوت بارانیش نە باریوە، بەڵام سەربازەکان لە نێو خۆدانی (ئارەقەی) ڕەش و شین دا وەردرابوون. نەمدەوێرا سەیری چاڵەکە کەم، بۆیە سەیری سەربازەکانم دەکرد.

بەڕاستی لەم کاتەدا بیرم لە تۆڵە دەکردەوە، بۆیە دەستم لە پەلاپیلکەی تفەنفەکەم دا ویستم ئاراستەی سنگی ئەفسەرەکەمانی کەم وا دیاربوو گوللەیەکی لەناو مابووەوە ئەویش لە دەستم دەرچوو و تەقی. ئیتر ئاوڕم لە چاڵەکە نەداوە و سواری ئۆتۆیۆبیلەکان بویونەوە و بەرەو سەربازگە بەڕێ کەوتینەوە. کە دابەزین زابتەکە گوتی ئەی پیاوینە، ئیمرۆکە ئێوە کارێکی مەزنتان کرد. ئەم کارە مەزنە لە مێژووی نەتەوەکەمان بە ئاوی زێڕ و بە ناوی ئێوە دەنووسرێ. ئینجا دای لە قاقای پێکەنین و گوتی ئیمڕۆکە خواردنێکی خۆشتان دەدەینێ. ئێستە بڕۆن پشوێک بدەن. بۆ ئێوارە لە ریز وەستاینەوە، ناوی منیان خوێندەوە ئەوەندەی نەمابوو لە ترسانا لە هۆش خۆم بچم. بەڵام بە هەرجۆرێک بێت دانم بەخۆمدا گرت. هەنگاوێک هاتمە دەرەوە. سوپاهسالارەکەمان نیشانەی ئازایەتی لە سینگم دا و گوتی دەمەوێت گشتان وەک ئەلعومەری مێرخاسبن. یەکەم گولله و دواین گوله ئەم پالەوانە تەقاندی. پاشدان لە سەربازەکانم پرسییەوە بۆ ئەم نیشانەیان دا بە من. گوتیان چونکە تۆ وەک هەمومان راوەستای و واقت وورما کە دیتت، دایکی کچە بچکۆلانەکە لە نێو خوێنی خۆی هەڵساوە و کچەکەی لە باوەشی خۆی کرد. کچەکە ئەوەندە چاوی لە دونیا بوو چاوی دانەخرا بوو دایکی بە دەستە خوێناوییەکەی خۆی چاوەکانی داخست و چاوی لە چاوی تۆ بڕی تۆش گوللەیەکت لە نێو چاوانی دا، و رووت وەرگێڕا و پشتت تێکرد و بەرەو جێبەکان بەڕێ کەوتی. ئەم خوێن ساردییەت وای کرد نیشانەی مێرخاسی وەرگریت.

تا ئێستاش هاڕە هاڕ و هاژە هاژی قەڵبەزی رۆحی کوژراوەکان وەک تیشکی بروسکەیەک تیشک ئاسا لە بەر چاوما دەرژێنە نێو ئەستێرەکانی ئاسمان.

دەنگی یەکێک هات کە لە شوێنێکی قاوەخانەکە دا دانیشت بوو گوتی:

- ئەی کوڕی سەگ تۆ دوژمنی سەدامیت خۆ دوژمنی نەتەوەی عەرەب نیت. بۆ باسی ئەم شتانە دەکەیت؟ بەم شێوەیە تۆ عەرەب ریسوا دەکەیت نەک سەدام. عەلی هاواری کرد، عەرەب بەم کارانە ریسوانابن، چونکە هیچ کارێک بێ فەرمانی خودا ناتوانێت رووبدات. ئەوا خالید بۆ خۆی بە چاوی خۆی

دیویەتی زەردەشت هاتووەتە خوارەوە و پێی گوتوون، ئێوە دینی منتان جێ هێشت، بۆیە واتان بەسەر دێت. وەک دەبینیت ئەوان ئایینی خۆیان جێهێشتووە، بۆیە خودا وایان لێدەکات و ئەم کارەساتانەیان بەسەر دێت. من پیاوێکی چاونەترسم، بە بێ پەروا دەڵێم نە سەدام و نە نەتەوەی عەرەب لە قڕانی کوردان تاوانبارن. لە گەڵ هەموو ڕێزێکم بۆ نەتەوەی کورد. هەر نەتەوەیەک پەیامبەری خودا کە لە لایەن کردگارەوە بۆی ناردراوە ڕەتکاتەوە، لای خودا ئەو نەتەوەیە مافی ژیانی نییە. دەبێت ئەوەش باش بزانن مردن شتێکی ئاساییە چونکە کەس لە دەسکی دەرگای ژیان گیر نابێ ئینجا ئەگەر کوردبێت یان عەرەب. هەر ئەوەندەی دەرگای ژیان کەوتە سەر پشت، یەکسەر خۆت لەسەر لێژاییەک دەدۆزیتەوە، ئەم ڕێگایە وەک هەسان وایە هیچی لێ نییە خۆتی لێ گیر کەیت، ئەوەندەی دەزانیت خۆت لە ژێر خشخشۆکەکە دەدۆزیتەوە. پێ هەڵگەڕانەوەش قەدەغەیە، گەر قەدەغەش نەبێت کە دەکەویتە ژێرەوە هەر توانای ئەوەت دەمێنێتەوە ئاوڕێک لە خشخشۆکەکە بدەیتەوە. ئینجا پێویست ناکات کەس بەتاوان بار دابنێن. ئەوەی نووسرابێت هەر ئەو ڕوودەدات، لە توانای کەسیش دانییە ڕێچکەی بگۆڕێت. ڕێگام بدەن شتێکتان بۆ دەگێڕمەوە:

. ڕۆژێک گەر بێتەوە یادم تازە سەرەتای بەهار بوو. دەزانم سەرەتای بەهار بوو، چونکە تازە چەند کوردێکی تاوانباریان هێنابوو بۆ ئەو بەندیخانەیەی کە من لەوێ کاربەدەستێکی بچووک بووم. گوتیان ئەم چەند تاوانبارە سەرپێچییان لە حووکمەت کردووە و بێ فەرمانی حووکمەت چوونەتە شاخ و ئاگری نەورۆزیان کردووەتەوە و لە گۆرانییەک لە گۆرانییەکانیان گوتوویانە بە کوێرایی چاوی دوژمن جەژنی نەورۆزی خۆمان دەکەین. سەربازەکان ئەوەندەیان لە گۆرانی بێژەکە دابوو، هەر بە ئاستەم گیانی لەبەر مابوو. پاش چەند ڕۆژێک سەرەرای ئەوەش کە بەو لێدانە هەر دەمرد، دادگەی شۆڕش بڕیاری لە سێدارەدانی دەرهێنا. ئەوەی بزانم خۆشی ڕیخەڵۆکە کوێرەی ئاوسا بوو. بەم شێوەیە لە سێ لاوە مردن رووی تێ کردبوو. بەندەکان بە توندی لەدەرگایان دەدا، چووم تا بزانم بۆ لەدەرگا دەدەن. دیتم گۆرانی

بێژەکە راکشاوە. ئەوانی تریش لە چواردەوری دانیشتوون. گوتیان نەخۆشە پزیشکی بۆ بانگکە، خودا خێرت دەنووسێ. منیش داوام لە سەروەرەکەم کرد چی بکەم؟ سەروەرەکەم گوتی، تەمەن بەدەستی خودایە، دەست لە کاری خودا مەدە. منیش چوومەوە لایان و پێمگوتن کە تەلەفۆنم کردوە و ئێمشۆکە پزیشک دێت بۆ لای. بەڕاستی دەسکی تەلەفۆنەکەم هەڵگرت و لەگەڵ پزیشکێک لە پزیشکەکانی سەر بە بەندیخانە دووام و پێیم راگەیاند کە شتێکی وا هەیە، گەر کاتی هەبێت بێ و سەرێک لە بەندیخانە بدات. لەم کاتەدا پیرە دەلاڵ (فریشتەی گیان کێشان) هات و لەبەرامبەرم دانیشت. سەروەرەکەم هەر وەک مەیمون لەسەر مێزەکەی بەردەمم، بەرانبەر بە پیرە دەلاڵ هەڵتروکا و کڕنۆش لەسەر کڕنۆشی بۆ دەبرد و داوای لێبوردنی لێدەکرد.

ـ یەکێک لە قاوەخانەکە هاواری کرد ئەرێ ئەم دەلاڵە کێیە؟

ـ ئایی کوێرینە تاکەی بۆتان بژیم و فێرتان بکەم، ئەو دەلاڵە فریشتەی گیان کێشانە ... گیان کێشان. بیرەکەی بەردەمی هەڵگرت و قومێکی لێ دا و بە سەربەرزییەکەوە سەیرێکی تری خەڵکەکەی کرد کە لە چایخانەکە دانیشتبوون و جگەرەیێکی دەرهێنا و قومێکی زۆر قوڵی لێ دا و دوکەڵەکەی بەبا دا. ئەوەندە پرسیاری هیچ و پوچ مەکەن کەی چیرۆکەکەم تەواو کرد ئەوساکە دەتوانن پرسیارەکانتان بکەن. ئینجا با بێینەوە سەر باسەکەی خۆمان.

لەم کاتەدا فریاد هاتە ژورەوە، ئەم فریادە پێڵووەکانی بە ئاستەم دەتروکاند و چاوەکانی نەدەجوولانەوە. دەتگوت چاوەکانی کەلا شووشەن. گەر بیوستایە سەیری یەکێک بکات ئەوا سەری دەسوڕاندەوە تا چاوی دەبڕییە ناو چاوی کەسەکەی دەیویست لە گەڵی بدوێت. ئینجا سەری تۆزێک بۆ پێشەوە دەهەژاند، برۆکانی بەرز دەکردەوە. ئەو کوڕە هەردەم بە دەنگێکی نزم دەدوا. ئەگەر یاساوڵێک یان سەربازێک لەم ناوەبوایە ئەوا ورتەبێت لە دەمی فریاد نەدەهاتە دەرەوە. خۆ ئەگەر باسی حووکمەت بکرایە ئەوا یەکسەر رایدەکرد و بە دەنگێکی نزم دەیگوت من هیچم نەبیست، هیچم گوێ لێنەبوو. خۆ ئەگەر بە دەنگێکی بەرز گوێی لە وشەی (ادخل) بە عەرەبی واتا

"وەرەژوورەوە" بووایە ئەم کوڕە بە جارێک تێکدەچوو. فریاد کە هاتە ژوورەوە یەکە یەکە سەیری گشتیانی کرد و بە ئەسپایی بێ ئەوەی خۆی لە یەکێک بدات یان وشەیەک لە گەڵ یەکێک بگۆڕێتەوە ئەوا چوو و لە لای کاک ئازاد دانیشت. ئازاد بەخێرهاتنی کرد بەڵام ئەو بەگرنگی نەزانی وەڵامی بداتەوە، بۆیە سەیری نێو چاوی ئازادی کرد و بێدەنگ بوو.

پاش ئەوەی پیرە دەلال لێبوردنی سەرووەرەکەمی قبوڵ کرد، پێی گوت: کرێچێیەکەی ئەم ماڵە دەبێت دەرچێت. ئەم خانووە بچوکە بۆ ئەو دەست نادات، بە فەرمانی خودای گەورە، هەرکە ناوی خودای گەورە هات سەرووەرەکەم و دەلالەکە کڕنۆشیان برد. بەڵام من نەمدەتوانی نە کڕنۆش بەرم نە لەشوێنی خۆم بجولێمەوە. بە قسەی ئێوەبێت من مردبووم چونکە سەرووەرەکەم منی جێهێشت بوو. ئەوە گرینگ نییە. سەرووەرەکەم پرسی ئەی خانووێکت بۆ ئەم بەختیارە دۆزیوەتەوە؟ گوتی بەڵێ هەر ئێمڕۆکە دەچێتە ناو سکی ئافرەتێکی ئەمریکی، پاش نۆ مانگی تر ئەم ژنە کوڕێکی دەبێت و دەبێت بە گەورەترین گۆرانی بێژی جیهان. سەرووەرەکەم هاتەوە ناو من. رامکردە لای بەندەکان. گۆرانیبێژەکەیان لەسەر جەمەدانییەک درێژ کردبوو واتا لەسەر تەختی مردن. گۆرانی بێژ چاوی کردەوە دیتی خەلک لێی کۆبوونەوە، وتی خەڵکینە با گۆرانییەکتان بۆ بڵێم. گشت بێدەنگ بوون. ئەویش گۆرانییێکی بێ دەنگی بۆ گوتن. چاوی لێکنا دەنگی مۆسیقای گریان بەرزبووەوە، پێڵوەکانی هەڵێناوە، دەنگی پێکەنین و گریان تێکەڵ بوون، پێکەنین و زەردەخەنە، لەژێر ئەم بنمیچەدا راوەستان. ئینجا بۆ یەکجاری چاوی لێکنا. زەردەخەنە و گریان و پێکەنین لەسەر لێو و چاوی بەندییەکان هەڵتروکان و بوون بە ئاوازی ژیان. زانیم ئەم سەرووەرە شوێنێکی باشتری دەست کەوت. پزیشکی فەرمی گەیشت، کابرایەکی بێ مێشک و لە خۆ بایی بوو گوتی:

- نەخۆشەکەم بۆ بێنە ئێرانە

گوتم:

- نەخۆش تۆ خۆش. دەرگام بۆ کردەوە و گوتم:

ـ ادخل.

فریاد کە گوێی لە وشەی ادخل بوو لە ترسانا قاوەکەی بەردەمی خۆی رژاند و هەڵاتە دەرەوە.

عەلی ئاگای لەم رووداوە نەبوو، بۆیە بێ ئەوەی بشێوێت لەسەر چیرۆکی خۆی بەردەوام بوو. دوکتۆر چووە ژورەوە بێ ئەوەی سەیری بەندەکان بکات گوێگرەکەی لەسەر دڵی گۆرانی بێژ دانا و سەری بادا. و سەیرێکی بەندەکانی کرد و گوتی ئێوە خۆش. دیسان گوێگرەکەی لەسەر سینگی داناوە و گوتی، مۆسیقا لیمەدەن با گوێم لێبێت، بەندەکان سەیری یەکتریان کرد. من لەسەرووەری خۆمم پرسی گوتم چییە؟ گوتی ماڵی باردەکات نۆتەکانی دەگوازێتەوە بۆ ماڵە نوێکەی. هەر ئەوەندەم زانی دوکتۆر لەبەر خۆیەوە سروودی ئەی رەقیب دەڵێت. ئیتر لەو کاتەوە تێگەیشتم بە جەنگ و بەندیخانە و کوشتن بەسەر ئەم کوردانە ناکەوین. ئەوەش رۆژەکەیە منیش بۆ مێژوو پێتان دەڵێم، رۆژێک دێت ئەم کوردانە بە دۆنای دۆن ئەم دونیایە داگیر دەکەن، چونکە هەرچی بێتە ناویان دەبێت بە کورد ئەوەی لە ناویشیان بڕوات هەر بە کوردی دەمێنێتەوە.

خاوەن قاوەخانەکە بە سەرسوڕمانەوە سەیری کاک ئازادی کرد. چونکە نەیزانی چی روویدا، هەر ئەوەندەی زانی یەکێک پارەی نەدا و هەڵات. کاک ئازاد خاوەن قاوەخانەکەی بانگ کرد وابزانم ناوی پییێر میشێلێت بوو. ئەویش هات و مێزەکەی سڕیەوە. کاک ئازاد پارەی قاوکەی لە جیاتی فریاد دا. پییێر میشێلێت بە ئازادی گوت گەر پێمنەڵێیت ئەم کوڕە بۆ وای کرد پارەکەت لێوەرناگرم. کاک ئازاد سەری بادا و سەیرێکی کابرای کرد و گوتی باشە؛ بەڵام هەڵاتنی ئەم کوڕە پەیوەندی بە قاوەخانەکەی تۆوە نییە. ئەم کوڕە بە منداڵی کە تەمەنی نزیکەی پێنج ساڵان بووە لەگەڵ دایکی و باوکی لە بەندیخانە گیرابوون. کە دەیانبردن بۆ لێکۆڵینەوە، جەلادەکان لە ژورەوە چاوەڕوانیان دەکرد. کە پۆلیسەکە دەیبردن بۆ هۆدەکە لەدەرگای دەدا، ئەوانەی ژورەوە بە زمانی عەرەبی دەیانگوت (ادخل) واتا وەرە ژوورەوە. ئینجا ئەم منداڵە کە گوێی لەم وشەیە دەبێت عەقڵی تێکدەچێت و وادەزانێ بۆ

لێدان دەیبەن. چونکە پاش چەند رۆژێک لەبەر چاوی ئەو باوکیان بە لێدان کوشت. دوای چەند ڕۆژێکی تریش لەبەر چاوی ئەو دایکیان بەلێدان کوشت. ئینجا کە خۆی بە تەنیا ماوە، نازانم چۆن بەریان دا و رادەستی مامیان کرد، یان هەر دەرگایان بۆ کردەوە لێیگەڕان خۆی بچێتەوە ماڵەوە. بە قسەی مامی پاش ئەوەی لە بەندیخانە بەربوو تا تەمەنی گەیشتە دە ساڵانیش قسەی نەدەکرد. بەڵام کە گوێی لە وشەی "ادخل" دەبوو هاواری دەکرد بابە... دایە... ئیتر دەچووە پەنایەک و لە شوێنی خۆی دەلەرزی و دەگریا و دەیگوت بابە گیان دێشیێ؟ بابە ئەوە بۆ وادەکەن؟ دایە ئەوە بۆ ئەم یاساولانە بە زۆرداری روتت دەکەنەوە، دایە ئەوە چی دەکەن؟ دایە گیان مەچریکێنە، دایە...، دایە...، ئەوە بۆ بێدەنگ بوویت؟ ئیتر ناتێشێت؟ دایە خەوت لێکەوت؟ دایە هەڵسە بابچینەوە ماڵەوە، بۆ هەڵناستیت، بۆ ناچینەوە ماڵەوە؟ بۆ ئەم پیاوانە ئیتر چیتر لێتنادەن؟ چییان لە ئێمە دەوێت؟ دایە گیان لە خەو هەڵسە برسیمە. دایە گیان ئیتر قەت لە دەرەوە یاری ناکەم؟ دایە تەماشای ئیتر کەس لێتنادات دە زوو هەڵسە با بڕۆین، بە خوا کەس سەیرمان ناکات، ئەگەر دەڵێیت من بە راکردنێک دەچم بە مامم دەڵێم بێت.

ئیتر نازانم باسی زۆر شت دەکەن ناتوانم گشتیت بۆ بگێرمەوە. لێرەش کە ئەم کوڕە هەڵات گوێی لە وشەی ادخل بوو. جا هەر بۆ پێکەنین پێت دەڵێم ئەم کوڕە لە زمانی عەرەبی لە ووشەی ادخل بەولاوە هیچی تر نازانێ، بڕواش ناکەم بزانانێت ادخل واتای چییە، وابزانم لای ئەو هەر گوزارەی لێدان و کوشتن دەگەێنێت. ئەوەی سەیرە لە تەمەنیا یەک جار وشەی ادخلی درکاندووە، ئەویش دەڵێن مامی خۆی و خێزانەکەی لە دەست حوکمەت هەڵاتبوون، ئامۆزاییێکی لە برسا مرد. کە ناشتیان لە مامی پرسی بوو مامە نەوزاد (ئودخولی) کرد؟ مامیشی پێگوت بوو، بەڵێ ئودخولی کرد.
- ئەی ئێستە دەچێتە باوەشی دایە و بابە.؟ بەڵێ دەچێت.
پییێر میشێلێت لە ئازادی پرسی ئەی ئەم شێتە چۆن گەیشە ئێرە؟

ئازاد سەری بادا و گوتی زۆر بە ئاسانی کەس نازانێ چۆن ئەو کوڕە لە ماڵی مامی دابڕا و لەگەڵ کێ لەسنووری دا و گەیشتنە کوردستانی

داگیرکراو لە لایەن تورکیاوە. لەوێ نازانم کێ چ ناسیارێک بردبووی بۆ un لەگەڵ چەند خێزانێکی کورد هێنایانن بۆ فەڕەسا ئەم کوڕەش، وابزانم هەندێک ناسیاری خێزانەکەی خۆی بەگەڵ خێزانەکەی خۆیان دا بوو. دەڵێن ئێستەش دەچێت بۆ لای دوکتۆری دەروونی. هەرنەبێت ئێستا ترسی شکاوە و بە تەنیا دەتوانێ بێتە دەرەوە، و بچێت بۆ بازاڕ و وەک دەبینیت ئەوە یەکەم جاریەتی دێت بۆ چایخانە و لە نێو خەڵکی غەریب دادەنیشێت. لە یادم چوو پێت بڵێم کە ئامۆزایەکەی لە برسا مرد و ناشتیان. وابزانم کە لەدەست بەعس هەڵاتبوون چەند خێزانێکی تریشیان لە گەڵ بووە، مناڵەکانی هاواریان دەکرد بابە برسیمانە، پیاوەکەش هەڵسا سەر پێ و دەمانچەکەی دەرهێنا و گوللەیێکی لەکەللەی سەری خۆی دا تا نەبینێت چۆن منالەکانی لە برسا دەمرن. ئینجا فریاد کە چاوی بەم دیمەنە کەوت لە ترسانا هەڵات و ماڵی مامی نەدۆزییەوە. دەڵێن مامی لە خەفەتی مردنی کوڕەکەی و ون بوونی برازاکەی پاش چەند مانگێک وەزگی دا و مرد. ئێستەش ئەم کوڕە لەم دونیایە دا بەس یەک مامۆژنی ماوەتەوە. بۆیە مەدام میتیڕان باشترین پزشکی دەرونی لەسەر حیسابی خۆی بۆ گرتووە تا چاکبێتەوە و بچێت یارمەتیەکی مامۆژنە پەککەوتووەکەی بدات.

****

ئەوەی بزانم خالید و عەلی زۆر دۆست بوون بە تەنیا نەدەهاتنە قاوەخانەی بەلچیکی، هەر دەمیش لە گۆشەی پشتی پشتەوە دادەنیشتن. لەم دواییەدا ئەم دوو دۆستە زۆر کەم سەریان بەم قاوەخانەیە دادەگرت. پاشی شەڕی کەنداو جیهان شلّەژابوو. ئەوانیش لە دەنگ و باسی عێراق دەگەڕان بۆیە پێیان خۆش بوو بچنە شوێنێک چاویان بە عێراقییەکان بکەوێت.
خالید و عەلی لە شوێنە کلاسیکییەکەی خۆیان دانیشتنەوە.
خالید گووتی:
ـ عەلی ئەهلی حەق دەڵێن خودا حەفتا ساڵ چاو لە ستەم دەپۆشێت. هەرچەند دەزانم دۆنای دۆن هەیە، پێشم خۆش نییە هەبێت، چونکە ئەم ڕۆحە ستەم لێکراوانە، بە دۆنای دۆن چوار دەوری ئەم ستەمکارانە دەگرن. ئینجا پاش حەفتا ساڵ تەفروتونایان دەکەن. سەیرکەن کورد تۆڵەی خۆی بە دەستی خۆی ناکاتەوە، چونکە ئەگەر تۆڵەی خۆیان بە دەستی خۆیان بکەنەوە ئەوا دەبن بە گەورەترین خوێنڕێژ. تەماشاکەن جارێ حەفتاساڵیش تێنەپەڕیوە، با زۆر دوور نەڕۆین پەیمانی جەزائیر کە لە دژی کورد مۆرکرا، بوو بە هۆی کوشتنی زیاتر لە ملیۆنێک کورد، بۆ نموونە سەیرکە جەزائیر چی بەسەر هات ئەوا ئیسلامیەکان و حووکمەت خەریکن یەکتر تەواو دەکەن. شای گۆڕبەگۆڕ چی بەسەر هات. جارێ کەس نازانێت چەند ئێرانی و چەند عێراقی لە جەنگ دا کوژراون. جارێ لە عێراق کەس نازانێت چی بەسەر نەتەوەی عەرەب دێت. براینە تۆڵەی خودای کورد بە سەبرە ئەما بە زەبرە. ئەوەش ڕۆژەکەیە پاش چەند ساڵێکی تر ئێران چی بەسەر دێت. تەماشای ئەمە نمونەیەک بوو گەر خودا پەڕاوێکی تری بۆ مرۆڤایەتی بنێرێت ئەوا بە ڕاست و ڕەوانی بە نەتەوەکانی تری جهان ڕادەگەێنێت و دەفەرموێت سەیرکەن چیم بەسەر ئەو نەتەوانە هێنا کە لە فەرمانی من دەرچوون و ستەمیان لە نەتەوەی کورد کرد. ئینجا خاکمان بە سەر نازانم خودا چ دیاریەکی تری بۆمان ئامادەکردووە و لە داهاتودا چیمان بەسەر دێت؟ ئاگرێکی بۆ کردوینەتەوە دوایی فەرمانمان پێ دەدات و دەفەرموێت وەرنەناویەوە.

****

فریاد هاتە قاوەخانەکە لە لای دەرگا راوەستا و سەیری گشتیانی کرد. دڵنیابوو لەوەی کە پۆلیسی لێنییە ئینجا هاتە ژورەوە. پیێر میشیلێت هاتە لای ئازاد و گوتی:

ـ دێتە یادت گوتت مامۆژنی ئەم گەنجە پەککەوتەیە؟

ـ ئازاد سەری بادا و گوتی بەڵێ:

ـ دەڵێن مامی ئەم کوڕە بە شەو مردبوو. مامۆژنی لە لای لاشەی مێردەکەی دانیشت بوو، تا بەیانی بە کەسی نەگوت بوو کە مێردەکەی مردووە، تا بەیانیش باوەشێنی کرد بوو و لەبەر خۆیەوەش سەردولکەی بۆ گوت بوو. کە خەڵکی گوێیان لە سەردولکە دەبێت دەچن ئینجا دەزانن مێردەکەی مردووە. بەڵام ئەو ژنە هەر ئەو دانیشتنە بوو ئیتر لە شوێنی خۆی هەڵنەستاوەتەوە و ئێستەش پەککەوتەیە.

ـ ئەی بەڕێوەبەرایەتی کورد یارمەتی دەدەن؟

ـ نەخێر، ئینجا کوا بەڕێوەبەرایەتی کورد. بەشێکی بچووکی کوردستان لە ژێر دەستی کوردە ئەویش هەر پارتییەی شارێک و ناوچەیەکی بۆ خۆی داگیر کردووە، بەشە زۆرەکەشی لە ژێر دەستی سەدام ماوەتەوە.

ـ ئەی ئەو کوڕە کێیە؟ کە جار بە جار دێت و لەنکاوێک دەنگی بەرز دەکاتەوە و بە هەرچی زمانێکی کە دەیزانێت جنێو دەدات.

ـ ئەو کوڕە ئەندازیارە، کە کۆلێژی ئەندازیاری بەغدای تەواو کرد لە دانیشتگا کچێکی خۆشدەویست و کچەکەش عەشقی ئەم کوڕە بوو. لە ڕۆژی مارەیی و پاش ئاهەنگ گێڕان ژنەکەی بە کراسی سپی بوکێنییەوە دەبات بۆ حەبانییە. لەوێ عودەی کوڕی سەدام چاوی بەم کچە دەکەوێت. فەرمان دەدات کە یەکەم شەوی بووکێنی لەگەڵ زاوا دا نەکات. بەڵکو یەکەم شەوی بۆ عودەی بێت. ئینجا ئەوشەوە عودەی بە زۆرداری لەگەڵ ئەم بووکە رایبواردوە. وەک دەبینیت ئەو کچە ژنی ئەو کوڕەیە کە ئیستاکە بە هەموو زمانێک جنێو دەدات. ئەی گەر تۆ لەجیاتی ئەو بایت چیت دەکرد؟

ـ نازانم. من لەم بڕوایە دام کە ئێوە پێشی لەدایک ببن شێتن; دەنا چۆن شێتێک دەبێت بە سەرۆکتان؟ من یەک لەبارەخۆم بەتەمام چایخانەکەم

بفرۆشم; چونکە وادەزانم کە تۆ شێتنیت. من لە ناخمدا لەم بڕوایەدام کە ئێوە گشتتان شێتن. هەر بیر لە شتێک بکەوە گەر تۆش دەروونت دروست بوایە بۆ پارەی شێتێکی هەڵاتووی قاوە لێڕژاوت دەدا؟ ئەگەر من نەبینم کە تۆش شێتیت دیارە شێتی من لە ئاستی شێتی تۆ دایە. ئەگەر هەست بەوە نەکەم منیش وەک ئێوە شێت دەبم. کاکی خۆم وڵاتی ئێمەش بێبەش نییە لە نەخۆشی دەروونی. بەڵام خەڵکەکە زوو پێڕادەگەن و نەخۆشەکە دەبەن بۆ لای پزیشک تا خۆی چارەسەر بکات. بەڵام ئێوە چونکە گشتتان نەخۆشن کەس هەست بەوی تر ناکات کە نەخۆشە. جگە لەمەش ئێمە کە گرفتێکی دەروونیمان دەبێت بە سەربەرزییەوە دەچین بۆ لای پزیشک. ئێوە ئەگەر بە شێت شێتەکەتان بڵێم بڕۆ لای دەروون ناسێک ئەوا یان جارێکی تر سڵاوت لێ ناکات یان چەقۆیەکت لێدەدات. من لە یەک شت سەرم سوڕماوە نازانم ئێوە چۆن پێکەوە دەدوێن؟ چۆن پێکەوە دادەنیشن؟ چۆن باسی سیاسەت دەکەن؟ چۆن خۆشەویستی دەکەن؟ لە کاتی خۆشەویستی دا باسی چی دەکەن؟ هەر ئەم پرسیارانەن وام لێدەکەن لێتان نزیک ببمەوە تا تێتانبگەم. دەنا نەمدەهێشت قاوەخانەکەم ببێت بە شێتخانە.

- من ناتوانم وەڵامی ئەم پرسیارانەت بدەمەوە. بەڵام پێتدەڵێم کە بەشی زۆری لێکدانەوەکانت ڕاستن. ئێمە لە نێو ئاگر و ئاسن و ترس و لەرزدا گەورە بووین. بڕواتبێت کە مناڵ بووم ئەگەر بە شەو تەقە نەبووایە خەوم لێنەدەکەوت. سەیرکە مناڵێک کە چاوی بە سەربازێک بکەوێت و بە دڵ بیەوێت گوللەیەکی لێ بدات و بیکوژێت دەتەوێت ئەم مناڵە بە چ شێوەیەک گەورەبێت؟ تەماشاکە لە لای ئێمە خوێندکار هەر لە پۆلی یەکەوە تا دانیشتگا تەواو دەکات، کە مامۆستا هاتە ژوورەوە ئیتر ئەم خوێندکارە هیچ کەسایەتیەکی نامێنێت. تاکە کەس لە پۆلدا مامۆستایە. لەماڵەوە تاکە کەس باوکە، ئەگەر برای گەورەی هەبێت پاشی باوکی برای گەورەیەتی. مرۆڤێک تا بیست و پێنج ساڵی کەسایەتی خۆی نەبێت، چۆن گەورە دەبێت؟ نموونەیەکی ترت بۆ دەهێنمەوە کچ و کوڕێکی هاوسێ کە دایک و باوکیان هەموو ڕۆژێک لە ماڵی یەکترین، و ئەم دوو مناڵەش هەر لە مناڵییەوە یارییان پێکەوە

کردووه و لەگەڵ یەک مەزن بوون، هەر ئەوەندەی کچە دەبێتە سێزە ساڵ و کوڕە دەبێت بە چواردە ساڵ ئیتر ناتوانن لە کۆڵانی خۆشیان پێکەوە بدوێن. دیارە مرۆڤ هەر عەشقی جوانی نابێت، بەلکو دەکەوێتە داوی خۆشەویستی هەڵس و کەوت و بیر و باوەڕ و تێڕوانین. ئەوانەش وەک خۆت دەزانیت بێ تێکەڵی و ئاشنایی ئاشکرا نابن. جا خۆت بڕیار بدە ئەگەر ژن و مێردێکی نوێ بە ئاستەم بیر و باوەڕی یەکتری بزانن دەبێت ئەڤینی ئەم جووتە هاوسەرە چۆن بێت؟

. با بڵێین ئەوانە هەمووی تێگەیشتم. بەڵام ئەو ڕۆژەی کە کوڕێک هات و واتۆی کەبابخانەی بڵاو دەکردەوە و دای بە یەکێک لە کوردەکان ئەویش یەکسەر دەستی کرد بە گریان. ئێوە گشتتان ژێرتان کردەوە و وەک بڵێی هیچ ڕوینەداوە لەگەڵی دانیشتنەوە و لە قاوە خواردنەوەی خۆتانیش نەکەوتن. ئەو کوڕە لە لای ئێمە گەر شێتیش نەبێت، بەڵام گرفتێکی دەروونی هەیە. لە جیاتی ئەوەی قاوەی لەگەڵ بخۆنەوە بیبەن بۆ لای پزیشکی دەروونی تا چارەسەرێکی بۆ بدۆزێتەوە.

. لە لای ئێمە کەس نایەوێت لە بەرامبەرەکەی خۆی تێبگات. چونکە گەر لەو گەیشت لە خۆی دەگات. بۆیە گەر لە دۆستەکەی خۆی گەیشت خۆی لێ گێل دەکات. بڕواتبێت لە وڵاتی ئێمە هەرکەسەی بەوە کامەرانە کە خۆی ناناسێت. ئینجا با بێمە سەر باسی ئەم کوڕە. ئەو کوڕە باوکی مامۆستا بوو، زانکۆی تەواو کرد بوو. پاش ئەوەی ڕێژیم پێیزانی کوردایەتی دەکات. هەڵات و بوو بە پێشمەرگە. پاش ئەوەی هەولێر کەوتە ژێر ڕکێفی خۆمان گەڕاوە بۆ سەر کاری مامۆستایەتی خۆی. لە بەر بێ سەروبەری و نەزانی و چاوچنۆکی بەڕێوەبەرایەتی کورد، گرانیەکی ئەوتۆ کەوتە کوردستانەوە زۆر کەس دەرگا و پەنجەرەی خۆیان فرۆشت. بە چەند مانگ پارەی مامۆستایانیان نەدەدا. بەشی زۆری مامۆستایان خورێنییان لەیاد کرد بوو. ئیتر لە یادیان نەما بوو چای چ چێژێکی هەیە، جگە لەمەش موچەی مامۆستایەک کیلۆیەک برنج و کیلۆیەک شەکری پێدەهات. وەک خۆت دەزانیت لە لای ئێمە هەرماڵەی چوار یان پێنج منداڵیان هەیە. کیلۆیەک برنج بەشی چی دەکات؟ ئینجا باوکی ئەم

کوڕە پەنجەرە و دەرگای ماڵەوەی فرۆشت بوو. لە ماڵەوە هەر دوو بەتانییان مابوو، رایبێخن و بەخۆیانی دابدەن. باوکیان ئیتر هیچی تری بەدی نەدەکرد کە بیفرۆشێت، مناڵەکانیشی برسی بوون. ئەو کابرایە لە تەمەنیا قەردی نەکرد بوو. ئەم جارەیان چوو بوو بۆ کەباب خانەیەک بێ ئەوەی دەم لە کەبابێک بدات، بە قەرد سینیەک کەبابی کڕی بوو و هێنابویەوە بۆ ماڵەوە. لەبەردەمی مناڵەکانی خۆی دانا بوو. پێیانی گوتبوو تێر بخۆن. سەیری کرد بوو وا مناڵەکانی تێر بوون. چوو بوو بۆ هۆدەکەی خۆی و دوو وایەری کەهرەبای لە دەستی خۆی لوول دا بوو و کارەبایەکەی پێکرد بوو و بەم شێوەیە خۆی کوشت بوو. باوکێک ئەوەندە مناڵی خۆی خۆشبوێت نابێت مناڵەکانی دوو فرمێسکی بۆ بڕێژن؟

- دەڵێم دەبێت ئەم قاوەخانەیە بفرۆشم ئەگینا وەک ئێوە شێت دەبم، چونکە هێدی هێدی کردارەکانتان لای منیش ئاسایی دەبێت.

هەر لەوکاتەی کە کاک ئازاد و خاوەن قاوەخانەکە پێکەوە خەریکی قسەکردنبوون، عەلی بە دەنگێکی بەرز لەگەڵ خالیدی دۆست و هاوڕێزی خۆی دەدوا، هەموو چایخانەکەش گوێیان لێ راگرتبوو. راستە پێش ئەوەی هەڵێم و بێمە فەرەنسا من بەڕێوەبەری بەندیخانەیەکی بچووک بووم لە دەڤەری بادینان لە شارۆچکەی بامەڕنی. رۆژێک بەیانی زووەکەی فڕۆکەکانی خۆمان هاتن دەڵێم خۆمان، چونکە ئێرانی نەبوون. بە بۆمبای کیمیاوی لە هەندێک گوندی چواردەوری ئێمەیان دا، چونکە هەموو ڕۆژێک چەکدارەکان لەو گوندانەوە دەهاتن و هێرشیان دەکردە سەر بنکەکانی ئێمە و میللەتەکەشیان دەترساند لە پشتگیری کردنی نەتەوەکەمان لە جەنگە پیرۆزەکەی دژی فارسی مەجوسی ئاگرپەرست.

خالید هەڵی دایە و گوتی :

- عەلی برای خۆم ئەی ئەوان ئیسلام و شیعە نین، بۆ دەڵێی مەجوس؟ دووای ئەوەش ئەی لە قورانی پیرۆزدا ناڵێت مەجوس ئەهلی کیتابن. ئەی زەردەشت پەیامبەری خودا نەبوو؟ ئەی من ئەو رۆژە نەمگێڕاوە بە چاوی خۆم زەردەشت و ئاڤێستام دیت؟

- خالید من باسی ئێستە ناکەم، من باسی ئەوساکە دەکەم، ئەوساکە وایان پێدەگوتین، بۆیە ئێمەش وامان دەکرد. لێمگەڕێ ڕێچکەی بیرم مەپچڕێنە. فەرمانی میریمان بۆ هات. پاش لێدانەکە بچین بۆ ناوچەکە و سەیری سەرەنجامی چەکە بەکارهاتووەکان بکەین و پلەی توانای چەکەکان بپێوین. من خەریکی پێوانی پلەی گەرمی ناوچەکەبووم و ئامرازێکی بچووکم پێ بوو تا تیژی بای پێ بپێوم و بزانم با بۆ چ ئاستێک ڕۆیشتووە. لە یادم چوو پێت بڵێم بلدۆزەر و ئامرازی ترمان هێنا بوو، تاوەکو خانووەکانیان تێکبدەین و کانیی گوندەکەش بە چەمەنتۆ بگرین. منیش بەرەو ڕێچکەی ئاوەکە چووم تا بزانم کانییەکە لە کوێیە. ئاژەڵی کێوی و دەستەمۆ و ماڵی لە هەموو لایێک کەوت بوون. من هەرچیم دەدیت دەمنووسی. لەنکاوێک چاوم بە تارمایەک کەوت بە مرۆڤ دەچوو، بۆیە بە زوترین کات خۆم گەیاندە تارماییەکە. کە بە جوانی سەیرم کرد دیتم ژنێکە کەوتبووە ناو جۆگە ئاوەکە ئیتر نەیتوانیبوو پتر هەنگاوبنێ و لە شوێنی خۆی کەوتبوو، منیش بە پێ ژنەکەم خستە سەر پشت، لە شوێنی خۆم ڕاچڵەکیم کە دیتم مناڵێکی لەسەر سینگە و مناڵەکە مەمکی دەمژێ . دیتم سەروەرەکەی لە تەکیا هەڵتروکاوە و سەیری ماڵەکەی خۆی و مناڵەکەی دەکات. سەروەرەکەم لێی پرسی، چییە خانوت دەستناکەوێ لێرە هەڵتروکاویت؟ گوتی نا، ناتوانم پاپای ڤاتیکان جێ بێڵم، سەروەرەکەم یەکسەر لە تەنی من هاتە دەرەوە و کڕنۆشی بۆ مناڵەکە برد. منیش بە بێ سەروەر لە شوێنی خۆم چەقیم. لەم کاتەدا من و ئەو ژنە کەوتینە گفتوگۆ. گوتم :

- ئەوە چۆن بە مردوەتی شیرت وشک نەبووە؟

- ئێمە پێش ئەوەی دڵمان لێبدات دەژین و پاش وەستانی دڵیشمان هەر دەژین، بەڵام ئێوە کە دڵتان لە لێدان وەستا ئیتر دەمرن.

- ئەی کەی ئێوەی کورد دەمرن؟

- ئێمە ئەوساکە دەمرین کەی پاشماوەی بێگانانمان خوارد، کەی بە زمانێکی بێگانە بیرمان کردەوە، کەی لاسایی بێگانانمان کردەوە، کەی ماندوو بووین لە چاوەڕێ کردنی خدری زیندە کە دێتە سەر ئەم زەمینە و گورگ و مەڕ

پێکەوە ئاو دەخۆنەوە. تا بزانیت پێتدەڵێم ئەو کوردە دەمرێت کە کوردێک دەکوژێت، ئەو کەسەی کوردیش نییە گەر کوردێک بکوژێت دەمرێت.
. سەروەرەکەم ئاگای لێم بوو کە لەشە تەزیوەکەم دەستی کرد بە لەرزین، ئەوەندەم نەما بوو بەسەر لاشەی ئەم ژنەدا بکەوم. سەروەرەکەم تا پێمڕابگات داوای لێبوردنی لە سەروەرەکەی تر کرد، گەڕاوە ناو تەنی من و هێز و توانام هاتەوە بەر. ئینجا لای لاشەکە دانیشتم. ئەم جارەیان بە هێمنی سەیری دەم و چاوی ئەم ژنەم دەکرد. گەر ژیانی لەبەر بووایە شێتی دەبووم بۆیە بە کامیرەکەم وێنەیەکیم گرت، (بۆ ئاگاداریت کە سەروەرەکەم هاتەوە لام پەیوەندی من و ئەم ژنە بڕا). ئاگام لێ بوو سەروەرەکەم دەیویست پەیوەندی بە دەلالەکەوە بکات. ئەوەندەم زانی دەلالەکە ئامادە بوو هەر سێ سەروەر لەبەر دەمیا کڕنوشیان برد. دەلال لە سەروەری ژنەکەی پرسی بۆ لێرانە هەلتروکاویت و فەرمانی خودا ناهێنیتە دی؟ بۆ ناچیت ماڵەکەی بۆت تەرخان کراوە بیڕازێنیتەوە؟ ئەی پێمنەگوتیت؟ دەبیت بە گەورەترین شاژنی سەر روی ئەم زەمینە. گوتی سەروەرم بەلام کۆرپەکەم بەبێ شیر دەمێنێتەوە. دەلال گوتی گەر شیرت نەدابایە ئێستاکە کۆرپەکەت لە ماڵە نوێکەی خۆی دەبوو. دایکیشی ئەوە چەند سەعاتە ئازاری ژان و بەرە ژانی لێیە، "چاکەی سەربەخۆ سەری خاوەنەکەی دەخوات". بۆیە سەیری سەروەرەکەی منی کرد و گوتی فەرمانی خودا بەجێ بێنە. ئەو سەروەرە لەم بەندیخانەیە ئازاد بکە. من هەموو لەشم لەرزی و کەوتمە سەر ئەژنۆ و چاوم لە چاوی ئەو ئافرەتە بڕی و ئەویش بە زەردەخەنەیەکی جوان، پێیگوتم ئاگات لە خۆت بێت تۆ قوربانیی گێلی خۆتی. دەلال ڕۆیشت، سەروەرەکەم هاتەوە لام و گوتی تفەنگەکەت سوارکە و گوللەیەکی لێدە. منیش بە قسەی ئەوم کرد، هەر دوو سەروەر بەرەو ڕۆژئاوا فڕین. هەتا توانیم و چاو بڕی کرد سەیرم کردن, ئینجا ئاوڕێکم لە لاشەکان داوە، زەردەخەنەی سەر لێوی ئەم ئافرەتە تۆزێک زیادی کردبوو، مەمکە سپیەکەی کە پڕ لە شیری خۆشەویستی دایک بوو، بە خوێنی سووری کوڕەکەی سوورهەڵگەڕا. چەند هەوڵم دا پەیوەندی بەم ژنە بکەمەوە بەلام پەیوەندیمان پچڕا.

- یەکێک هاواری کرد ئەی... ئەی سەگی سەگ باب ئابڕوی نەتەوەکەمان بۆ دەبەیت؟ ئەگەر ئێمەش شێت نەبین قەت گوێ لە شێتێکی وەک تۆ رادەگرین.
- سالار هاواری کرد ئەگەر رۆحت نەکێشم پیاو نەبم.
عەلی بە لەخۆ بایی بوونێکی ساکارەوە، بێ ئەوەی بشێوێت گوتی :
- یەکەم شت من سەگ نیم و کەسیش لێرانە بە سەگ نابینم. دووەم کاک سالار تۆ پیاو نیت و ناشتوانیت ببیت بە پیاو، چونکە تا ئێستاش حەزرەتی ئیزرائیل فەرمانی خانو بەتاڵکردنی بە سەروەرەکەم نەداوە. تۆ هەرگیز ناتوانیت ئەم سەروەرە یان ئەم کرێچییە لەم خانووە وەدەرنێیت.
- رۆژی خۆی دێت ئەورۆژەی کە حەزرەتی ئیزرائیل بڕیاری نەمانت دەدات و شومشێرەیش بە من دەسپێرێت. خۆتبگرە ئەو رۆژە زۆری نەماوە بێت.
- چۆن من لە ژیاندام ژیانیش لە نێو تەنی من دا دەژێ کەی جێیهێشتم بە ناچاری لە نێوی دێمە دەرەوە. جیاوازی نێوانی من و تۆ وەک جیاوازی نێوانی کوێر و چاو ساغێک وایە، ئەوەی من دەیزانم و دەیبینم بتزانیایە و بتدیبایە هەرگیز ئەم قسانەت نەدەکرد.

پیێر میشیلێت، لە ئازادی پرسی ئەرێ ئەو مشت و مڕەی ئەولا لەسەر چییە؟ ئازادیش بە کورتی هەموو شتەکانی بۆ گێڕاوە. کابرا بە هەر دوو دەست لە سەری خۆی دەدا و دەیگوت کاکە ئەوە شێت نییە، ئەوە تاوان بار و پیاو کوژە. ئەگەر بە راستی ئەم شتانەی کردبێت ئەوا دەبێت هەموو ژیانی لە بەندخانە بباتە سەر ئەگەر بەڕاستی شێتیش بێت ئەوا پێویستە هەموو ژیانی لە شێتخانە بباتە سەر و چیتر مافی ئەوەی نەمێنێت وەک پاڵەوانێکی شێت بە ئازادی لای لێقەوماوەکان باسی ئازایەتی خۆی بکات. ئێستاکە من دەری دەکەمە دەرەوە "پەنجەی ئاماژەی بۆ دەرگا راکێشا" بە ئازادی گوت، پێی دەڵێم جارێکی تر بەم ناوەدا نەیێت دەنا پۆلیست بۆ بانگ دەکەم. ئازاد دەستی کابرای گرت و گوتی شتی وانەکەیت لێیگەڕێ با باسی تاوانەکانی رژێمی بەعسمان بۆ بکات. چونکە ئێمە خۆمان زۆر شت هەیە نایزانین، یان لە زمانی خەڵکی ترەوە دەیانبیستین. ئەم عەلی و خالیدە شتی وا سامناک دەگێڕنەوە، بە ملیۆنیش ئەم زانیاریانەمان دەست ناکەوێت. ئالێرانە بە هیچ و

خۆڕایی بۆمانی هەڵدەڕێژن. ئینجا داوای لێبوردنت لێدەکەم نەکەی ئەم دوو کوڕە لێرانە دەرکەیت. ئەگەر پارەشیان پێ نەبوو من پارەکەیان دەدەم. خاوەنی قاوەخانەکە بە ترسێکەوە گوتی ئەی ئەگەر یەکێک ویستی بیانکوژێت؟

ـ ئازاد بە هێمنی پێی گوت تۆ بیر لەوە مەکەوە. کەس نایانکوژێت چونکە کورد تێنوی دەنگوباسە نەک خوێن

## دەرگای چوارەم
## ئەستێرە وێڵەکان
## تۆ بڵێیت ئەستێرە وێڵبن؟

ئەلێکساندەر کارگەیێکی دورمانی هەبوو کە سوخمە و دەرپێ و جۆرەها شتی تری ئەدوری. وەک هەر خەیاتێک پێویستی بە چەند ئافرەتێک هەبوو کە داهێنانەکانی خۆی لەبەریان تاقیکاتەوە. ئەم کارەش نە پێویستی بە زمانە و نەپێویستی بە رەوشەنبیری هەیە، بەڵکو پێویستی بە لەش و لارێکی گونجاو بۆ ئەم کارە هەیە. وەک هەموو خاوەن کارێک ئەویش لە دەستی کرێکاری هەرزان دەگەڕا. ئەلێکساندەر بۆ کاری خۆی ناچار بوو کچە نمایشکەرەکانی جل و بەرگ (عاریضات الازیاء) بە کرێ بگرێت بۆ پیشاندانی پرۆژەکانی.

ئەلێکساندەر لە یەکەمین چاوپێکەوتنی دا لەگەڵ تەنیا، بیری بۆ ئەوە چوو کە لەلای خۆی کاری پێبکات، بەڵام نەیدەزانی رازی دەبێت یان نەء. بە هەر جۆرێکبێت کە زانی تەنیا لە پەرتوکخانەی ئەنستیتوی کورد کار دەکات. هەر ناوە ناوە دەچوو و قاوەیەکی لەگەڵ دەخواردەوە، تا وای لێهات بانگی دەکرد بۆ نان خواردن. ئەلێکساندەر پیاوێکی نەرم و لەسەر خۆ بوو و زۆر رێزی لە ژنان دەنا و دەیزانی چۆن لەگەڵ کچی تازە پێگەیشتو هەڵس و کەوت بکات. بە شێوەیەکی گشتی زۆر بەئاسانی توانی دڵی تەنیا بۆ لای خۆی ڕاکێشێ. لەوکاتەی کە تەنیا ئەلێکساندەری ناسی ئەلێکساندەر لە گەڵ سەندرینی برادەری دەژیا، بەڵام ئەوەی بزانم ئەوساکە بەینیان زۆر خۆش نەبوو، چونکە سەندرین تەمەنی لە سی ساڵ لای دا بوو هەر بۆیە داوای منداڵی لە ئەلێکساندەر دەکرد. ئەلێکساندەریش سەرقاڵی کاری خۆی بوو. لە هەموو لایەک دەرپێ و سوخمەی جوانی کارگەکانی تر بازاڕی ئەلێکساندەریان لەق کردبوو. هەر بۆیەش ئەم کابرایە کاتی ئەوەی نەبوو بیر لە سەندرین و منداڵ بکاتەوە. ئەوەش بوو بوو بە هۆی ناکۆکی و دەمەقاڵی رۆژانەیان. تا ئەهات پەیوەندییان تێک دەچوو، ئەو رەوشە ئاڵۆزە

ئەلێکساندەری زیاتر لە تەنیا نزیک دەکردەوە. سەندرین و ئەلێکساندەر لێک جیابونەوە. ئەلێکساندەر هەوڵی دەدا کە تەنیا لەگەڵی بژیێت. تا وای لێ هات دڵی تەنیا نەرم بوو بڕیاری دا کە لە گەڵ ئەلێکساندەر بژیێت و بە هەر شێوەیەکبێت شوێنی ساندرینی گرتەوە و نەیهێشت ماوەیەکی درێژ شوێنەکەی چۆل بێت.

بە شێوەیەکی گشتی ژنی ڕۆژهەڵاتی فێرن، یان هەروا پەروەردە کراون کە پیاو دەبێت پارە لە ژنەکەی خۆی سەرف بکات. پێویستی سەر شانی ژن نییە کە پارە پەیدا بکات، ژن ئەو ژنەیە بتوانێ کار و باری ناو ماڵ ڕاپەڕێنێ. لەم سەردەمەدا زۆر ژن هەن کاردەکەن بەڵام ئەوە هیچی لە هاوسەنگییەکە ناگۆڕیوە، ژن کار و باری ماڵەوەی هەر لەسەرە، دەبێت بیانکات ئەگینا نە خۆی خۆی بە ئافرەت دانانێت نە کەسیش بە ئافرەتی دانانێت.

یەکەم ڕۆژ کە تەنیا لە ماڵی ئەلێکساندەر خەوت، بەیانیەکەی ئەلێکساندەر چوو بۆ سەر کاری خۆی، و تەنیای بەتەنیا لە ماڵەوە جێهێشت، پاش چێشتە خەوێک، تەنیا هەڵسا و ویستی خواردنێک بۆ نیوەڕۆ ئامادە بکات. هەرچەندی دۆلاب هەبوو کردییەوە هیچی وای لێ دەستنەکەوت کە خواردنێک بۆ پیاوەکە ئامادەبکات. هەندێک ماکەرۆنی دۆزیەوە، تەنیاش نەی دەزانی چۆن ماکەرۆنی لێدەنێن، بۆیە ماکەرۆنییەکەی خستە ناو ئاوی سارد و خستیە سەر ئاگر، ئەوەندەی پێ نەچوو ئاوەکە کوڵا و ماکەڕۆنییەکە بوو بە پارچەیێک هەویر و لێک جیا نەدەبوونەوە. بۆیە لەتاوانا دەستی بەگریان کرد، هیچ پارەشی پێ نەبوو تا بچێت شتێک بکڕێت. لە خەیاڵی خۆی دەیگوت ئێستا ئەم پیاوە لە کار دێتەوە دەبێت زۆری برسیبێت و وەک هەر پیاوێک چاوەڕێی خواردنێکی گەرم دەکات. هەر لە خەیاڵی خۆشیا دەیگوت ئەی نەدەبوایە تۆزێک پارەم بۆ بەجێبێلێت؟ کەوەنتەرەکانی دەکردەوە و دایدەخستنەوە، هیچ شتێکی ئەوتۆی تیانەبوو کە لێبندرێت. چەند قتوێکی خواردنی ئامادەکراوی دۆزییەوە بەڵام کلیلی قتوکردنەوەی نەدەدۆزییەوە. بۆیە فرمێسک لە چاویا ڕانەدەوەستا و ئەویش بە هەنگاوی سەیر سەیر

ماڵەکەی دەپێوا. دەرگای ماڵەوە کراوە و ئەلێکساندەر بە چەند کیسەیەکەوە هاتە ژورەوە و لە لای دەرگا دوو پیزای دانا بوو ئەوانیشی هەڵگرت و بە پێیەک پاڵێکی بە دەرگاوە نا و دایخستەوە. دیتی تەنیا دەگری زوو چوو دەستی لە ملی کرد و گوتی بۆ دەگریت خۆ کەس دڵی نەشکاندووی. گوتی نا من ئەگریم، چونکە نەمزانی چیت بۆ ئامادەبکەم. ئەلێکساندەر دای لە قاقای پێکەنین و گوتی ئێمە هەر لە جەژنا خواردن ئامادە دەکەین. چونکە ئێمە کاتی شیولێنانمان نییە. ئێستەش لەبەر خاتری تۆ هاتمەوە ماڵەوە ئەگینا لەدەرەوە نانم دەخوارد. تەنیا گیان گەر بتەوێت ببیت بە فەرەنسی دەبێت هێدی هێدی خۆت لە ژیانی فەرەنسا ڕابێنیت. گەر بتەوێت خۆش بژیت دەبێت پارە پەیدا بکەیت، لەو کاتەی کە پارە پەیدا دەکەیت دەبێت بزانیت کات پارەیە. سەیری ئەم هاوسەنگییە بکە، خواردن ئامادەکردن دوو تا سێ کاتژمێری دەوێت، تۆ گەر کاربکەیت یەک کاتژمێرت هەیە بۆ نان خواردن، من بە ٤٥ خولەک ئەگەمە شوێنی کار هەر بە هەمان کاتیش دەگەمەوە ماڵەوە واتا هەر بۆ ڕێگا پێویستیم بە کاتژمێر و نیوێک هەیە، بە قسەی تۆبێت من دەبێت سێ سەعات دابنێم بۆ نان خواردن. بەڵام من بە ٤٨ فرەنگ باشترین خواردن دەخۆم ئەزیەتی سەعات و نیوێک ترومبێل لێخورینیشم نابێت. جگە لەمانەش پێمگوتیت کات پارەیە من کە دوو کاتژمێرم لە دەست دەچێت واتا دوو هەزار فرەنگم لە دەست دەچێت، وەک پێمگوتیت نانەکەم ٤٨ فرەنگی تێدەچێت. تەنیا گیان ئێستەش خواردنم هێناوەتە ماڵەوە پێویست ناکات بگریت، و پێکەوە دەیخۆین. هەر ئەلێکساندەر خۆی کیسەکانی دڕاند و خواردنەکانی لەسەر مێز دانا و گوتی گیانەکەم وەرە بخۆ ژیانی ئێمەی فەڕنسی وایە دەبێت لەئێستاوە لەگەڵیا ڕابێیت. ئیمڕۆ ناوتم لە فێرگەیێک نوسیوە تا زمانی فەڕەنسی بخوێنیت، لەگەڵ ئەمەش مانگی ٤٠٠٠ فرنگت پێ دەدەن. ئەم پارەیەش بەشت دەکات لەدەرەوە نان بخۆیت و لە قاوەخانەکانا قاوەش بخۆیتەوە. ئیمڕۆکە پێکەوە دەچین کارتێکی مانگانەی میترۆت بۆ دەکرم و شوێنی خوێندنەکەت نیشان دەدەم، هەر لەلای ماڵی خۆمانەوە سواری(RER) ی B دەبیت و دەچیتە وێستگەی cité université و دێیتە خوارەوە. ئیمڕۆکە پاش

نانخواردن من خۆم دەتبەم بۆ ئەوێ و شوێنەکەت نیشان دەدەم. ئێوارەش پێویست ناکات خواردن ئامادەبکەیت، دەچین بۆ چێشتخانەیەکی چینی لەوێ نان دەخۆین چونکە چینیەکان خواردنیان گەلێک سووکە و مرۆڤ پێی قەڵەو نابێت. لەم ڕۆژانە دەچین و ناوت لە وەرزش دەنووسم تا چەند کیلۆیێک بێیتە خوارەوە. من خۆشم هەموو شەمەیەک لەوێ وەرزش دەکەم. ئا، بۆ ئاگاداریت سبەینێ کاتژمێری نۆی بەیانی دەوامت دەست پێ دەکات، لە کاتژمێری هەشتی بەیانییەوە ژنێک دێت بۆ ئێرە وماڵەکە پاک دەکاتەوە و جل و بەرگەکان دەخاتە ناو جلشۆرک و لە ئوتیان دەدات. تۆ هیچ یارمەتی مەدە، چونکە زۆری پێناخۆش دەبێت، گەر دەست لە کار و باری ئەو وەردەیت. تۆ قاوەی بۆ مەکە ئەو خۆی دەزانێ قاوە لەکوێیە و کەی ویستی ئەوساکە خۆی قاوەیەک بۆخۆی دەکات و خۆی کاری خۆی باش دەزانێت. ئا، بەیانی ئەم ژنە کە ناوی مەدام لەبۆردە Labord خواردنی بەیانیانمان بۆ دەکرێ و ئەیهێنێتەوە بۆ ماڵەوە، خۆی دەزانێ شتەکان لە کوێ دادەنێ و فاکتوری پارەکانیش دەخاتە نێو ئەم دۆلابە، تۆ دەست لە هیچ مەدە، ئەو خۆی شوێنی هەموو شتەکان پێ دەزانێ. ئەوەی پێتبکرێ تۆ خەریکی کار و باری خۆتبە و پەیوەندیت بەم ژنەوە نەبێت. کە بەرەو روت هات زەردەخەنەیەک بێنە خۆت. واتا کە زۆر دڵشادیت بە دیتنی.

پاش نان خواردن تەنیا بەتەما بوو میکیاج بکات. ئەلێکساندەر دەستی لە ملی کرد و ڕایگوشی و ماچی کرد و گوتی تەنیا گیان لە فەرەنسا ژن کە لە چل ساڵی لائەدات ئینجا دەست بە میکیاج دەکات. بە تایبەتی ئەم شێوە میکیاژانە بۆ پێستەی ناسک وەک ژەهر وان. تۆ لەم تەمەنە ناسکەی خۆتا خۆت دەڵێی گوڵیت بۆ خۆت توشی میکیاج دەکەیت؟ لە مەش زیاتر ئەم ژەهرانە ئەچنە ناو خوێنی ئافرەتانەوە و زۆریان مناڵی پەک کەوتەیان دەبێت. ئینجا گەر گوێ لە من بگریت زەرەر ناکەیت. لەم رۆژانە ئەتبەم بۆ Institut de beauté واتا ئاراشگای جوانکاری لەوێ ئەوان ئەو دەرمانانەی کە دەم و چاوت پێویستیان پێ هەیە بۆتی دەنووسن و پێشت دەڵێن چۆنیان بەکار بێنی. هەفتەی دوو جار پاشی وەرزش دەچیت، پشتت ئەشێلن جۆرەها

دەرمان و شیری لێ ئەدەن وا ناسک ئەبیت ئیتر هەرگیز پێویستیت بەم میکیاجە پیسانە نابێت کە دەم و چاوی ژنان دەسووتێنن. ئێستەش گەر بە قسەی من بکەی دەم و چاوت بشۆ با زوو بەڕێ کەوین، دەنا منیش لە کاری خۆم دوادەکەوم.

ئەلێکساندەر وەک هەر پاریسیەک لە پاریس شێتانە ترومبێلی لێدەخوڕی، سەرەڕای ئەوەش هەر ئاگای لە خۆی بوو و هەڵەی زل زلی نەدەکرد. ئەلێکساندەر ئۆتۆمۆبیلەکەی راگرت و گوتی تەنیا گیان ئەوە دەرگای میترۆیەکەیە کە لێی دێیتە دەرەوە، ئینجا بردی بۆ لای دەرگای بالاخانەیەکی کەون گوتی ئەمەش دەرگای فێرگەکەیە. ئیستەش من دەبێت بە زوترین کات بگەمەوە سەر شوێنی کاری خۆم، دەمی تەنیای ماچ کرد هەستی پێ کرد کە تەنیا شەرم دەکات لە جادە لەناو ترومبێل ماچی بکەن، بۆیە گوتی تەنیا ئێرە فەرەنسایە کوردستان نییە کەس پەیوەندی بەسەر تۆوە نییە، ئەوەی دڵت بیبات دەیکەیت. باشە تەنیا گیان ئیمرۆکە سەرم ئێشاندی ئەوەندەم ئامۆژگاری کردی. دەترسم بڵێیت ئەم هەموو شتەم پێ ناکرێت.

ـ تەنیا دەستی ئەلێکساندەری گرت کە لەسەر سوکانی ترومبێلەکە بوو خۆی بە ئەلێکساندەر دادا و دەستی لەسەر دەستی دانا و خۆی لێ نزیک کردەوە و ماچی کرد و گوتی تۆ چی بڵێیت من وادەکەم. ئێستە دەچم بۆ institut kurde de Paris و پێیان دەڵێم کە بەیانی ناتوانم بێم بۆ دەوام.

تەنیا گەیشتە ئەنستیتوتی کورد و وەک ئاسایی چووە پەرتووکخانەکە و بە سەرسوڕمانەوە دیتی کە پەرتووکخانەکە کراوەتەوە و یەکێک لەوێ کار دەکات. کورەکە بە تەنیا پێکەنی و گوتی:

ـ جەنابتان تەنیا خانن.

ـ بەڵێ.

ـ کاک سەروەر چاوەرێت دەکات، گوتی ئەگەر تەنیا خان هات پێ بڵێ بێ بمبینێت.

ـ بەسەر چاو.

تەنیا لە دەرگای کاک سەروەری دا و گوێی لە وشەی فەرموو بوو، دەرگای کردەوە و کاک سەروەر لە سەر کورسییەکەی خۆی هەڵسا و بەرەو پیلی تەنیا هات و تۆقەی لەگەڵ کرد و داینیشاند و یەکسەر تەلیفۆنەکەی هەڵگرت و لە خوارەوە داوای دوو چای کرد. زۆر ئەحواڵی تەنیای پرسی و گوتی:
- هیوادارم کە فەرەنسات بە دڵ بێت. چونکە وڵاتێکی زۆر خۆشە.
- کاک سەروەر بەیانی ناتوانم بێم بۆ دەوام چونکە کاک ئەلێکساندەر گوتی خوێندنم بۆ دەرچووە و لە بەیانییەوە دەبێ دەوام بکەم.
- کچی باش ئەوە حەفتەییەکە ناوت دەرچووە و من چاوەڕێم دەکرد کەی بێیت و پێم بڵێیت دووشەمەی داهاتو نایێم بۆ دەوام.
- بەسەری تۆ کاک سەروەر ئیمڕۆکە کاک ئەلێکساندەر پێی گوتم کە ناوم دەرچووە، بۆیە داوای لێبوردن دەکەم.
- راستە هەفتەیێکە ناوت دەرچووە بەڵام بڕیاری کۆتاییمان بەدەستەوە نەبوو، بۆیە کاک ئەلێکساندەر ئەم موژدەیەی بە نهێنی هێشتووەتەوە و پێی نە وتویت.
- ئەی بۆ جەنابتان بە منتان نەگوت ئەگەر دەتانزانی؟
- چونکە کاک ئەلێکساندەر بەم کارە هەڵسابوو، هەرکەسەش بەرپرسیاری کاری خۆیەتی.
- تەنیا داوای لێبوردنی کرد و رووخسەتی لە کاک سەروەر وەرگرت. چووە ماڵی کاک ئازاد و لەدەرگای دا و کەس لەماڵەوە نەبوو بە کلیلەکەی خۆی دەرگای کردەوە و چووە ژورەوە. یەکسەر چاوێکی بە ماڵەکە دا خشاند و بەراوردی کرد بە ماڵی ئەلێکساندەر کە ئێستاکە ئەو بە ماڵی خۆی دادەنا. وەک بڵێیت ناچار بوو ئەم ماڵە بچکۆلانە و نارێکە جێبهێڵێت. کە سەیری هۆدەی لانە و ئومێدی کرد دەستی کرد بە گریان. لە بەرخۆیەوە گوتی خۆ دنیا ئاخر زەمان نییە، جار و بار دەتوانم بێم و سەریان لێ بدەم. سەیری سەر مێزەکەی کاک ئازادی کرد، لەسەر پەڕێکی سپی بە خەتێکی گەورە نووسرا بوو; "کچم تەنیا گیان دوێنێ زۆر دڵمان پێتەوە بوو نازانین بۆ نەهاتیتەوە ماڵەوە. هەرچۆنێک بێت بەخێر بێیتەوە ئەوە برنج و فاسۆلیام

لێناوە چاوەڕێمان مەکە تۆ نانی خۆت بخۆ، چونکە من دەچم بۆ لای تەزرە و بۆی هەیە زۆرم پێبچێ؛ چونکە تەزرە لە بیمارگە زۆر پێویستی بە یەکێک هەیە دڵی بداتەوە، ئەم بەستەزمانە زۆر بێکەسە. تا پێکگەیشتن بە خودات دەسپێرم. یایت سکالا".

تەنیاش لە پشتی هەمان پەڕ وەڵامی پسولکەکەی داوە. "یایە سکالا من خانویەکم دۆزیوەتەوە بەیانیش دەست بە دەوام دەکەم، ئینجا نازانم کەی دەتوانم بێم و چاوم پێتان بکەوێتەوە. چونکە دەوامم رۆژی هەشت سەعاتە، هەر لە بەیانییەوە لەوێ دەبم تا ئێوارە و لە پاش خوێندنیش پێویستە وانەکانی بەیانی ئامادە بکەم، جا بەڕاستی بەرنامەی خۆم بەباشی نازانم، بۆیە ناتوانم هیچ گفتێکتان پێ بدەم. تا پێکگەیشتن بە خوداتان دەسپێرم. چاوی منالەکان ماچ ئەکەم، ئەم ماڵە هەر ئاوەدان بێت و هەزار ماڵی لێکەوێتەوە. خوشکی بچووکت تەنیا."

تەنیا جانتاکەی هەڵگرت و کلیلەکەی لەسەر مێزەکە دانا و دەرگای کردەوە و ئاوڕێکی لە ماڵەکە داوە و هەناسەیەکی ساردی هەڵکێشا و دەرگاکەی لە دوای خۆی راکێشا و دایخست. لە ماڵەوە چووە دەرەوە وەک بڵێی شتێکی ون کردبێت وابوو نەی دەزانی چی بکات. تەنیا دەمێک وەستا،،، و بێ ئەوەی بیەوێت سەیری لێشاوی ئەم خەڵکە بێ سروەیەی ناو شەقامەکە کرد کە خۆی لە سەری وەستا بوو. هەریەکەی بەلایەکدا ڕای دەکرد، دەرگای میترۆ ناوەناوە دەرشاوە و کۆمەڵێک خەڵکی فڕێ دەدا دەرەوە و هەریەکەی بە پەلە لە نێو لێشاوی خەڵکەکە شوێنێکیان بۆ خۆیان دەکردەوە و ڕوباری لێشاوەکە بەرەو شوێنێکی نادیار دەیبردن. تەنیا لەبەر خۆیەوە دەیگوت ئەم فەرەنسیانە بێ دینن خودا هەمووشتێکی داوە پێیان. ئێمەش هەموو کاتمان بە نوێژ کردن دەبەینە سەر و ئینجا خودا هیچمان ناداتێ. بە قسەی هەندێک کات نییە و بەقسەی هەندێکی تر کات هەیە و بەقسەی ئەلێکساندەر کات پارەیە. بەڕاستی قسەی ئەلێکساندەر لە گشتیان راست ترە. چونکە کات پارەیە و نوێژیش پارەناهێنێ، ئەگەر پارەی بهێنایە ئەوا ئێمە لە هەموو نەتەوەکانی جیهان دەوڵەمەنتر دەبووین. تەنیا بە خەیاڵ و

ئەندێشەکەی خۆیەوە، لەگەڵ ڕێچکەی خەڵکەکە بوو بە یەک و بوو بە یەکێک لەوان و خۆی بەدەرگای میترۆ کەدا کرد. ئیتر ئەو شوێنەی کە تەنیا لێی وەستا بوو دەتگوت هەرگیز کەسی لێ نەوەستاوە. لە ژێرزەمینەکانی نێو میترۆ واتا لەنێو گەروی ئەژدیهایەکەی پاریس کە بێ ژمارە خەڵکی هەڵلوشی بوو. کەس بە کەس نەبوو، کچ و کور دەمیان لەنێو دەمی یەک دەنا و یەکتریان ماچ دەکرد. نە کەس سەیری دەکردن نە کەس پێی دەگوتن ئەی بێ ئابڕوینە شەرمکەن.تەنیا لەبەر خۆیەوە دەیگوت دەبێ خودا ئەم هەمووە زینایە ببینێ؟ ئینجا خێر و بەرەکەتیشیان بەسەر دا بباریێنێ؟ هەر خۆی وەڵامی خۆی دەداوە و دەیگوت، نەخێر بڕوا ناکەم. من لەم بڕوایە دام تا من لە پاریسبم خودا ئاگای لە منیش نابێت. ئەوەندەی زانی گەیشتەوە بەر دەرگای ماڵی خۆیان. سەیرێکی دەرگاکەی کرد، نەوەکا دەرگاکەی لێ تێک چوبێت. ئینجا لە دڵی خۆیدا هاواری کرد، ئای پاریسی بێ خودا چەندە جوانیت و چەندە خۆشیت. لە وڵاتەکەی من هەرکەسەی خۆی خودایەکە و لە جیاتی خودا سزات دەدات. خودا بووەتە فەرمان بەرێک لەلای ئیمان دارەکانی سێ ئایینە ئاسمانییەکان، هەر بە قسەی ئەوان خودا دەبێت ڕۆح بکێشێ. وابزانم گەر پێیان بکرێت ئەویش سزا دەدەن چونکە سێ پەیامی جیاوازی ناردووەتە سەر زەوی.

تەنیا کە دەرگای ماڵەوەی کردەوە یەکسەر سەیرێکی هۆدەی خەوی خۆیانی کرد. ئێستە پلکم چیم پێ دەڵێ؟ مێردی پلکم چیم پێ دەڵێ؟ خەڵکی گەڕەک چیم پێ دەڵێن گەر بزانن ئیمشۆکە ئا لێرانە من چیم کردووە؟ کەمێک داما و لە بەر خۆیەوە گوتی، زۆر زۆر پێم دەڵێن قەحپەیە. ڕاستییەک هەیە کەس نایەوێت بیدکێنێ ئەویش؛ ئەوەی مرۆڤ خۆشی بوێت بێزی لێدەکاتەوە و بە کەمی دەزانێت. ئەوەش واتای ئەوە ناگەێنێت کە پیاو خۆی، خۆی لە شتی بێ نرخ دووردەکاتەوە. بە پێچەوانەوە، لە هەمان کاتی کە پیاو جنێوێک دەدات خۆشی بە پاڵەوانی جنێوەکە دادەنێ. بە خەیاڵ و کردەوەش بە دوای سامان و دەسەڵات دا وێڵە تا بگاتە پلە و پایەی هێنانە دی جنێوەکانی. واشدەزانێ ژن هەر شایەستەی کردەوەی جنێوەکانی ئەون، بەڵام بە

ئاشکراش ئەو ناوجێیی بە گەورەترین تاوان و جنێو دادەنێ. پیاوی ڕۆژهەڵات لە هاوسەنگییەکی سەیر دا دەژییێت. جوێنەکانیان تێرکردنی هەستەکانیانە لەو شتانەی کە دەستیان لێی گیرنابێت و خەونی پێوەدەبینن.

****

تەنیا دەیویست بزانێ بۆچ ئەم کارەی کرد! تا بگات بە سەرەنجامێک و هێوربێتەوە. بەڵام نەیدەتوانی لەگەڵ کەسیش باسی ئەم کردارە بکات. یان بەڕاستی جارێ دۆستێکی ئەوتۆشی نەبوو دڵی لای بکاتەوە. تەنیا وەک هەر کچێکی رۆژهەڵاتی لەم باوەڕە دابوو کە ناوجێیی پێشی مارەیی کارێکی خراپە. خۆشی نەیدەزانی بە چ شێوەیەک کارەکەی خۆی پەسند بکات. بۆیە خۆی دەخستە شوێنی مامۆستا و وەڵامی خۆشی بەم شێوەیە دەداوە:

- بە قسەی تۆبێت گشتمان نەوەی کرداری جنێوین. بەڵام باش بزانە بە هەڵە دا چوویت، چونکە جنێو بەو کردارە دەدرێت کە سنوری خودای بەزاندووە. دەنا کەست دیوە بە ژنی خۆی بڵێ ئەوها و ئەهات لێدەکەم؟ چونکە ئەوەی کە دەیکات سنوری خودای نەبەزاندووە.

- ئەگەر گرفت لەسەر سنوری خودا بێت بۆچ خۆتان وەک پیاوێک دەکەن بە پاڵەونی کردارە دزێوەکەی ئەو دیو سنوور؟ ئەو کردارە لای ئێوە بەزاندنی سنووری خودایە، بە تاکە ژنێک نابەزێندرێت دەبێت پیاوێک ئەو ژنە بپەڕێنێتەوە.

- ئێستا گەر مامۆستا لێرە بوایە دەیگوت، الزانی لا ینکح الا زانیة بۆیە هەردووکیانْ بەجووتە دەکەونە ئەودیوی سنوورەکەوە.

ئەو رۆژە کاک ئازاد و مامۆستا مشت و مڕیان بوو، کاک ئازاد دەیگوت:

- لە راستی دا جنێو ویستێکی دەروونی یان مادی مرۆڤە. بە تایبەتی ئەو وێستەی کە مرۆڤ پێویستی پێ هەیە و هەست بە نەبوونی دەکات. لە هەمان کاتیش دا لەبەر هۆی تایبەتی و سنووری سروشتی و سنوری دەستکرد ناتوانێت یان ناکرێت یانیش ئەو مرۆڤە لە توانای دا نییە بیانگاتێ، بۆیە مرۆڤ بە هەر شێوەیەک بێت هەوڵی بەزاندنی سنوورەکان دەدات. جنێودەر جنێو وەک منشارێک بەکاردێنێت تا سنووری قدەغەی پێ ببەزێنێت. بۆ نموونە ئەوەندەی لە شوێنێک قەدەغە زۆربێت جنێو زۆردەبێت بە رێژەی رێگادانی جنێوەکان، لە سەنگی قەدەغە کەم دەکاتەوە. بۆ نموونە لە ئەوروپا کەس بە کەس ناڵێت خوشکت وا،،، و،،، وا لێ بکەم. چونکە لە بارەی ناوجێییەوە تۆ

هیچ پەیوەندیت بە خوشکتەوە نییە و خوشکت هیچ پەیوەندی بە تۆوە نییە. بەڵام لە لای ئێمە تۆ خوشکتیت خوشکیشت تۆیت.

تەرازووی ویستی دەروونی بەستراوەتەوە بە: گۆشەی قەدەغە و چاودێری و داپلۆسین. لەسەرەتا دا گۆشەی قەدەغەکراو زۆر گەورەیە، گۆشەی چاودێری واتا "کۆمەڵگا" قەدەغەکراو دەکات بە نەریتێکی خۆڕسک و کەرەستەکانی بۆ دابین دەکات، لە کۆتایی دا سێگۆشەکە تەواو دەبێت بە گۆشەی داپڵۆسین، واتا ئەگەر سنوری قەدەغە ببەزێنیت ئەوا یاسا یان نەریت هەیە، بە شێوەیەک لە شێوەکان وات لێ دەکات کە سنوری قەدەغە نەبەزێنیت.

تەنیا فێرنە بوو بوو بە تەنیا دانشێ و هەر چواردەوری کش و مات بێت، بۆیە پەردە ئەستوورەکانی ماڵەوەی لا دا ویستی سەیری دەرەوە بکات. لە پاش پەردە تووڵەکەی پێش پەردە ئەستوورەکە سەیری دەرەوەی کرد لە چەند پەنجەرەیەکی پەردە داخراو بەولاوە هیچی تری لێ دیار نەبوو. بۆیە زوو زوو رای کردە لای پەنجەرەکەی ئەولا. ئەم جارەیان خۆی خستە ژێر پەردەکان، چونکە وای دەزانی ئێستە لە تەنیاییا وەک ماسی بێ ئاو دەخنکێت. یەکسەر لە پشت پەردەکان هاتە دەرەوە و رایکردە لای تەلیفۆنەکە و تەلیفۆنی ئەنگێلای کرد. ئەنگێلا ئەگەر کاتت هەبێت پێمخۆشە بتبینم، من لە نزیکی پۆرت-روایالم (Port-royal) باشە نیو سەعاتی تر من لەسەر لێوی میترۆی کە بەرەو سانت میشێل دەچێت چاوەڕێت دەکەم. ئەنگێلاش گوتی نا هەر لە لای دەرگای CRUS (دەزگای راپەراندنی کار و باری قوتابیانە) بووەستە من خۆم دێم بۆ ئەوێ و چونکە تۆزێک کاریشم هەیە دەبێت جێبەجێیان کەم. پاش دەمێک هەر دوو دەستە خوشک لەبەر دەرگای کروس یەکتریان دی و پێکەوە چون بۆ جێبەجێکردنی کارەکانی ئەنگێلا و پاشی تەوا بوونی کارەکان کە زۆریان پێنەچوو، چەند پرسیارێک بوون و وەڵامەکەی وەرگرت، ئیتر چونە قاوەخانەی کروس و لەوێ دوو قاوەیان داواکرد. تەنیا هەندێک دەردی دەرونی خۆی بۆ ئەنگێلا هەڵڕێشت بێ ئەوەی باسی راستی دوێنێ شەوی بۆ بکات. بە هەر شێوەیەک بێت هەر باسی چەوسانەوەی

ژنانی بۆ ئەنگێلا دەکرد تا پێکەوە چارەسەرێک بدۆزنەوە بۆ رزگارکردنی ژنان.

ئەنگێلا بە تەنیای دەگوت تەنیا گەر ژن، ئێمە خۆمان ئامادەبین ئازاد بین، هەر ئازاد دەبین. بەڵام بەداخەوە ژنی لای خۆمان شانازی بە زنجیر و کۆتی دەستی خۆیانەوە دەکەن. کەی ژن ئامادە بوو کۆتی دەستی خۆی بشکێنێت ئەوساکە پیاو هیچی پێ ناکرێت و ناشتوانێت هیچ بکات. خوشکم پیاو هەر بە رووالەت بە هێزە بەڵام لە ناوەرۆکا ئێمەی ژن زۆر لەوان بە توواناترین. پیاو لە بێهێزی خۆی ئەوەی دڵی دەیەوێت بە خەڵکی تر دەڵێ مەیکەن، ئینجا خۆی بە دزییەوە دەیکات.

- ئەی چۆن راڤەی کرداری برایەک دەکەیت کە خوشکی خۆی دەکوژێ، لە سەر شتێک کە خۆی ئامادەیە جزدانی خۆی بکاتەوە و جووتە رانێک بخاتە ژێر خۆی، هەر بۆ ئەوەی ئارەزووی خۆی دامرکێنێ.

- خۆزیا هەموو جارێک ئەم پارەیان بە ژنێک ببەخشی بایە، لە گەڵ ژنێک ئەو کردارەیان بکردایە، چونکە لە سروشت دا ئەم کارە کاری ژنە. ئەم جۆرە پیاوانە دەچن سواری کورێک دەبن نەگەیشتووەتە تەمەنی خۆ ناسین. خۆی لە خۆی دا سواری منداڵ تاوانە دەبێت سزا بدرێن، بۆیە دەبوایە وەک ئەوروپا ئەوکەسانەی کە سواری منداڵ دەبن بخرێنە زیندانەوە.

- ئەو کەسانەی کە خوشکی خۆیان دەکوژن بە یاسا لە سێدارە بدرێن. لە دڵی خۆیدا دەیگوت، دەک زمانم لاڵ بێت، خۆزیا حەمە رەشم جارێکی تریش دەدیتەوە و نوقلەکانم دەخستەوە ناو دەستی، ئینجا با بیکوشتبام. ئاخ حەمە گیان چەندم خۆشدەوێی. چاوە گەش و بە بریسکەکانی تەنیا پڕ لە گریان بوون، بە دەنگێکی بەرز گوتی دەک خوشکت مرێ حەمە.

- لەوڵاتی ئێمە دا موویەکی باریک کینە و ئەڤین لێک جیا دەکاتەوە و ئەم مووە نابێ بترازێ ،چونکە لای ئێمە جارێ ئەڤین و کینە هەردووک هەست و نەستن و سەرچاوەیان یەکە بۆیە وا بە ئاسانی لە دۆخێکەوە دەگۆردرێن بۆ دۆخێکی تر. بۆ نموونە "ئاشتی پاش دەعوایە شیرنترە لە حەلوایە"چۆن خۆشەویستی لە جەرگی کینەدا دەزێ، کینەش لە جەرگی خۆشەویستی دا

لەدایک دەبێت. ئێمە بە پێچەوانەی ئەورۆپییەکانەوە دەڵێین گەر تەماشای خۆشەویستیتان کرد و لێبوردنتان لە ناو دیت، لەم خۆشەویستییەدا ئەڤین بێت لە ئارادا نییە. ئەورۆپییەکانیش دەڵێن گەر ئەڤینیش لێبوردنی تێدا نەبێت، بڕواتبێت پڕ لە کینەو زۆردارییە.
. من لە نێوانی ئەم دوو ڕوانگەیە دا سەرگەردانم یان دەبێ ئەڤین لە کایەدا نەبێت یان دەبێ ئەڤین و کینە جومکەبن.
. لە مێژوو دا ئەگەر شاهێک بیوستایە شاهێکی تر لە خۆی نزیک کاتەوە و جەنگ و ئاشوبێک بەلاوە نێ ئەوا کچێکی خۆی ئەدا بە شاهەکەی تر. لە کوردەواری خۆشمان کە پیاو لە یەکتری دەکوژن، ژنێک لە جیاتی ئەدەن بە برایەکی کابرای کوژراو، ئیتر چاک ئەبنەوە.
. سەیرکە ئێمەی ژن چەندە گرنگین نرخی ناوجێیمان دەگاتە نرخی پیاوێکی کوژراو.
. تەنیا گیان بەڕاستی ئەوە نرخی ئێمە نییە، نرخی ئێمە زۆر لەمە بەرز ترە. من یەک لە بارەخۆم وادەزانم ئەڤین بە بێ نرخ و بێ پەروازەیە. کێ پێویستی بەو خۆشەویستییە هەیە کە بە سەرمان دا ئەی سەپێنن؟ ئێمە کەسانێکین هیچ شتێکمان بێ خۆشەویستی ناوێت، باوەڕیشمان وایە خۆشەویستی شادییەکە بێ پێکگەیشتن نایێتە ئاراوە. ئەڤینێکی بێ پێکگەیشتن، خواستێکی بێ ئامانجە، درۆیەکی ڕووتە و وشەیەکی بێ واتایە. مانگی تابان جوان نییە گەر نەیبینیت. ئەختەری وا هەیە چوار مانگی هەیە، بەلام من نەمدیوە و نەمبیستووە هەستیارێک بەسەر جوانی ئەو چوارمانگەدا هەڵبڵێ. جوانی لە ڕەنگدانەوەیەکی دەروونی بەولاوە هیچی تر ناگەێنێ. هیچ شتێک لە شتێکی تر جوانتر نییە، هەر شتەی لە شوێنی خۆی دا جوانە. هەر شتێکی نەیناسین و نەیبستین بەراوردی دەکەین بەو شتانەی کە دەیانبینین و دەیانناسین. بەم شێوەیە وێنەیەکی لێلی ئەو شتە لە مێشکی خۆمانا دروست دەکەین. ئەم وێنەیەش لە یەکێکمان بۆ یەکێکی ترمان جیاوازی هەیە، لەبەر هۆیەکی ساکار، چونکە گشتمان بە هەمان شێوە و قووڵی لە جیهانی چواردەورمان ناگەین. هەرشتێک کە لە توانا بەدەربێت، یان هێزێکی تر نەهێلێت بکرێت. یان

ئێمە نەمانەوێت بکرێت، بۆ من ئەوە ئەو شتەیە کە ناکرێت. هەرگیزیش داخ بۆ شتێک هەڵناکێشم کە لە تووانای من بەدەربێت و رووبدات. گەر ئەم رووداوە دژی خواستی منیش بێت بەڵام سورِ بزانم رۆژێک لە رۆژان ئەم شتە هەر دەبوایە رووبدات. دیارە ئەم شتە لە دەرەوەی توانای منە، کەوابێت دەبێت سەری بۆ دانەوێنم.

- ئەبونە ئەورۆژە گوتی لە ئینجیلی پیرۆز دا هاتووە دەڵێ هەموو حوکمێک لە خواوەیە. دوای ئەوەش هەموو ئایینەکان دەڵێن بێ رەزامەندی خودا لەسەر ئەم زەمینە هیچ شتێک روونادات. هەر شتێک وانەیەکە بۆ تێگەیشتنی ئەم جیهانە. منیش لە هەر شتەی وانەیەکم وەرگرتووە. وا ئەم وانەیەی تۆش لە داهاتو دا دەکەم بە گەورەترین وانە و لەسەری دەڕۆم.

- بەڵام ئاگات لەخۆت بێت، سادە و ساکار مەبە. لە جیاتی وانە لەقسەکەی من وەرگریت خۆت نەکەیتە وانەیەکی دزێو بۆ خەڵکانی تر. چەند بنگەیەکی سەرەتایی هەیە کە پێم خۆشە بیانزانیت; مارکس دەڵێ هەموو پەیوەندیەکی کۆمەڵایەتی لەسەر بنکەی بەرژەوەندی هاتوونەتە ئاراوە. من دەڵێم هەموو پەیوەندییە کۆمەڵایەتیەکان لەسەر بنکەی درۆ دامەزراون و بە راستیت پێ بڵێم پەیوەندی خۆی درۆیە و هەڵخەڵەتاندنە و خۆهەڵخەڵەتاندنە. نزیکترین کەس مەزن ترین شتی دڵی لێت دەشارێتەوە. تۆش بە هەمان شێوە لە نزیک ترین کەستی دەشاریتەوە. کەس راستی بەکەس ناڵێت. لە کۆمەڵگای ئێمە دا ئەوەی راستی بدرکێنێ دەبەنگە.

- ئەی ئێوەی شوعی دەڵێن ئێمە ڕاسگۆترین حیزبین لە کوردستان دا.

- خوشکۆلە راستەکەی چونکە ئێمە هیچمان نییە لەدەستی بدەین. بەڵام درۆی ئێمە لە درۆی گشتیان گەورەترە. ئەوان درۆ دەکەن تابگەنە دەسەڵات, ئێمە درۆدەکەین نامانەوێت بگەینە حووکم و خەڵک لەدەورەمان کۆدەبنەوە، ئێمەش وەک کای سەر جۆخین بە بایان دەدەین، ئێمە هەر چاوەڕێی رەشەباین تا لە کۆل ئەم کایەمان کاتەوە، واتا ئەم خەڵکەمان لە کۆڵکاتەوە. تەنیا ئێمە درۆدەکەین، چونکە ئەوەی دەمانەوێت ئیمڕۆکە ناکرێت، و لە تواناش دانییە بکرێت، جا ئەگەر دەسەڵات بگرینە دەست هەر رسوادەبین.

- ئینجا بۆ وازناهێنن؟
- ئەی ئەگەر وازبهێنین کێ راستی بدرکێنێ و درۆی پارتییەکانی تر سپی کاتەوە، هەرنەبێت ئێمە خۆمان دەکەینە قەڵغانی بەر قامچی، بۆ پاراستنی پشتی هەژاران و تۆزێک لە ئازاریان کەم دەکەینەوە. لە لایەکی ترەوە ڕێگایەک و چارەسەرێک بۆ بەرجوازیەت دەدۆزینەوە کە بە شێوەیەکی مرۆڤانەتر هەڵس و کەوت لەگەڵ کرێکارانا بکات. و تۆزێک بارگرانی سەر پشتی کرێکاران کەم کەینەوە.
- ئەنگێلا قسە لەگەڵ تۆ تەواو نابێت، و قسەت ئەوەندە خۆشە نازانم چۆن خوداحافیزیت لێ بکەم. دەبێت بچمەوە ماڵێ ئێستە سکالا خان دڵی پێمەوەیە. دوێنێکە گوتی دەچمە لای تەزرە، دەمەوێت بزانم تەزرە چۆنە؟ باشتر نە بووە.
- خۆ دونیا شەو و رۆژێک نییە، دوایی تەلەفۆن بۆ یەکتری دەکەین. بەڵام ئاگات لەخۆت بێت قەت راستی نەدرکێنیت. لە فەرەنسییەکان فێربە، بە زەردەخەنەوە بەرە و رووت دێن. پاشەملە هەر بە زەردەخەنەیێکەوە تۆیان بەیاد دا دێتەوە. ئێمەش کە پێمان پێدەکەنن دڵی خۆمانیان بۆ ئەکەینەوە، ئەوانیش هەر بە زەردەخەنەو و بەڵێ راستدەکەی گوێمان لێ دەگرن. هەرچەندە گەورەترین وانەمان لێ فێر دەبن، کە چاومان ون بوو دەڵێن چەند سادە و ساکارە. کە شتێکیش بۆ کوردەکەی خۆمان دەگێڕیتەوە یەکسەر دەڵێ بۆ وات کرد دەک ملت شکێ، ئەی کوێر بووی ئەوەت نەدیت. ئینجا لە پاش ئەم قسانە تۆش زەوقت نامێنێ باسی نهێنی دەرونت بۆ کەس بکەی. ئێستەش بەلای درۆیەکانی خۆت دا برۆ ئاگات لە خۆت بێت، بە خودام سوپاردیت.
- ئەیەڕۆ ئەنگێلا ئەوە بۆ پێمدەڵێیت درۆ دەکەیت.
- چونکە دوێنێ سکالا خان تەلەفۆنی بۆ کردم و دڵی پێتەوە بوو. منیش چوم بۆ لایان و تا درەنگ چاوەڕێمان کردی. و ئێمرۆکەش پێکەوە چوینە لای تەزرە، گەر لە تەندوروستی بپرسیت باشە، و بە قسەی من بێت بەرەو باشی

دەڕوات. بەڵام دکتۆرەکان زۆر گەش بین نین. و دەڵێن سییەکانی شوێنی ساغیان تیا نەماوە. بە بڕوای من چونکە منالە، بۆی هەیە چاکبێتەوە.

ـ ئەنگێلا من خانوویەکم دۆزیوەتەوە، ئێستە هیچی تیانییە بۆیە بانگت ناکەم بەڵام هەر بەتەواوی موچەی خۆم وەربگرم تۆزێک کەل و پەل دەکرم ئینجا بانگتان دەکەم. ئێستە خوا حافیز.

تەنیا لە دڵی خۆی دا دەیگوت ئینجا چی بکەم، ئێستا هەموو کوردەکان دەزانن کە من بێ مارەیی لە گەڵ یەکێکا دەژیم. دەزانم ئەم خەبەرە دەگاتەوە لای پلکم و مێردی پلکم. من باوک و دایکم نە بوو ئەوان باوک و دایکم بوون ئێستە ئەوانیشم لە دەست دەچێت. با بچمەوە ماڵەوە با ئەلێکساندەریشم لە دەست نەچێت.

****

تەنیا دەرگای کردەوە و بە ئەسپایی چووە ژورەوە، سەیری هۆدەی خەوی خۆیانی کرد، پەردەکان دادرابونەوە، وا دیارە یارەکەم هاتووەتەوە. سەیری چێشتخانەکەی کرد کەسی لێ نە بوو چاوێکی بە هۆڵەکە دا خشاندەوە هۆلەکەش کەسی لێ نە بوو. وا دیارە چۆتەوە دەرەوە. تەلیفیزیۆنەکەی پێکرد و بەرامبەر بە تەلیفیزیۆنەکە دانیشت. بە بیری هاتەوە کە ئیمرۆکە چای نەخواردووەتەوە یەکسەر چوو چایەکەی لەسەر ئاگر دانا و هات دانیشتەوە. ئەم جارەیان گوتی خۆ لە بەیانییەوە جلی خۆمم نە گۆڕیوە، بۆیە زوو چوو کراسێکی تەنکی ماڵەوەی هەبوو کە تا ئێستە لە ماڵی کاک ئازاد نەیدەتوانی لە بەری بکات لەبەری کرد و بەرامبەر بە ئاوێنە گەورەکەی ناو دالانەکە راوەستا هەر سەیری خۆی دەکرد. لەبەر خۆیەوە دەیگوت توخوا حەیف نییە  ئەم لەش و لارە تا ئێستا بێ باخچەوان بوو. لە ژێر کراسە تەنکەکەی هەر دوو جووتە رانە پتەوەکانی خۆی دەگووشی و دەستی بە سنگ و بەرۆکی خۆی دادەهێنا. لەو کاتەوە کە خۆم ناسیوە سەیرتان دەکەم، چاو دەگێڕم کێ بکەم بە خاوەنتان ئەوە ئەلێکسانەرم بۆ هەڵبژاردن تا ببێت بە خاوەنتان. ئەوەندەی زانی دەنگی تەلیفیزیۆنەکە کز بوو. بە خێرایی سەیرێکی هۆڵەکەی کردەوە، دیتی ئەلێکساندەر لەوێ راوەستاوە، شەرم دایگرت یەکسەر دەستی بەخۆیەوە گرت و پێکەنی و گوتی:

- ئەوە تۆ لێرەی؟ لام وا بوو چوویتەوە دەرەوە.

ئەویش بەرەو پیلی هات و ماچی کرد.

- من لەمێژە هاتوومەتەوە ماڵەوە. چاوڕێم دەکردیت تا بچینە دەرەوە.

- تەنیا دەمی تێک ئالا و نەیدەزانی چۆن بۆی باس بکات کە ئیمرۆکە چی کردووە و لە گەڵ کێ قاوەی خواردۆتەوە.

- تەنیا گیان ئەگەر بێین بۆ یەکتری باس بکەین چیمان کردووە هەموو رۆژەکە دەکوژین بە گێڕانەوەی چیرۆکەکانمان. ئەوەی پەیوەندی بە منەوە نییە بۆمی مەگێڕەوە. منیش هەرگیز سەرت بە چیرۆکی کە پەیوەندیان بە تۆوە نییە نایەشێنم. ئیتر دەتوانیت باسی ئەوەم بۆ بکەیت کە چیت بە دڵ بووە و چیت بە دڵ نەبووە.

- تەنیا یەکسەر وت و وێژی بەرەو لایەکی تر برد. بەس دەمەوێت بزانم تۆ لە چ کونێک خۆت شاردبووەوە؟
- ئەلێکساندەر پێکەنی، دەستی تەنیای گرت و گوتی:
- راست دەکەیت، منماڵەکەم پیشان نەداویت. سەیری ئەم دەرگایە بکە دەرگاکە وەک دەرگای دۆلابێک وا بوو، دەرگاکەی کردەوە و چوونە ناو داڵانێکی بچکۆلانەی رووناک کە دوو دەرگای لەسەر بوو. ئەوە یەکێکیان دەستگای منە و ئەوی تریشیان دەتوانیت بیکەیت بە نووسینگەی خۆت.

تەنیا بە سەر سوڕمانەوە سەیری دەزگاکەی ئەلێکساندەری دەکرد. سەیری ئەم هەمووە بووکەشوشە نمایشکەرانەی دەکرد، هەر یەکەیان بە شێوەیەک جلی لەبەر کرا بوو. کاغەز و جۆرەهای قەلەم و دەزگای وێنە کردن و چەند جۆرە مەکینەیەکی دورمان و شانۆیەکی بچکۆڵانەی بازنەییشی لێ بوو. تەنیا لەنێو بازنەکە وەستا و سەیری چواردەوری خۆی دەکرد، هەر ئەوەندەی زانی شانۆکە دەستی بە سوڕانەوە کرد و ئەویش لە ترسانا زوو لە نێو بازنەکە هاتە دەرەوە.
- بۆ هاتیتە دەرەوە، ترسای، ئەوە بۆ ئەوەیە کە شتێک ئامادە دەکەم، ئا لێرانە لەبەر کچێکی نمایشکەری دەکەم ئینجا شانۆکە دەسوڕێنمەوە تا بە شێوەیەکی زیندوو یان راستەوخۆ سەیری داهێنانەکەی خۆم بکەم.
- ئینجا خۆ بەتەمانیت کچێک بێنیتە ئێرانە و رووتی کەیتەوە، گووایە دەتەوێت سەیری داهێنانەکانی خۆت بکەیت.
- جا چی تیایە، ئەوە کارە.
- نا وەڵا ئەوە کار نییە، من خۆم لەبەریان دەکەم تۆ سەیرمکە.

ئەلێکساندەر لە دڵی خۆی دا بەم پێشنیارە خەنی بوو، ئەوەی دەیویست هەر لە خۆیەوە هات بێ ئەوەی خۆی ماندوکات. بەڵام نەیویست یەکسەریش رازی بێت، چونکە تازە مەلەکە بە تەڵەوە بووە، کەی بیەوێت ئەوساکە لێی دەکاتەوە.
- تەنیا گیان ئەوە کارێکی ئەوەندە سانا نییە. پاش ئەوەی کە تۆزێک زمان فێر بوویت و ناوتم لە وەرزش نووسی و چەند کیلۆیێک هاتیتە خوارەوە، ئەوساکە

دەتنێرم بۆ وەگرتنی وانەی پێشانگایی کچان. ئێستە ئەوەی گرنگە برۆ زمانەکە فێربە خۆت لاوازکە و هەرگیزیش دڵت پیس مەکە. چونکە دڵپیسی کاری ئێمە دەکوژێت. ئێمە بەرگ بۆ هەموو ئافرەتان دەدروین، هەر ئافرەتێکی متمانەمان پێ بکات و بیەوێت جلمان لا بدروێت ئەوا ئێمە، باڵای ئەو ژنە دەپێوین هەر لەسەرەوە تا خوارەوەی، هیچ شوێنێک نامێنێت نەی پێوین تا رانەکانیشی دەپێوین. تەنیا گیان خۆ ناتوانین لەگەڵ ئەم هەمووە ژنانە کاری ناوجێیی بکەین. کە کچێکیش دەهێنین بۆ هەمان کار، بە هەمان شێوە سەیری دەکەین. واتا وەک ژنێک سەیری دەکەین کە بیەوێت بەرگمان لە لا بدروێت. ئیتر تەواو، ئەم شتەش باش بزانە کە پەیوەندی کار پەیوەندی کارە و هیچ پەیوەندی بە ناوجێییەوە نییە. وابزانم چات خستبووە سەر ئاگر با بچین چایەک بخۆینەوە و زوو زوو برۆین بۆ چێشتخانەی چینی. ئەگەر بە دڵیشت نەبێت دەچین بۆ چێشتخانەیەکی لوبنانی، خواردنەکانیان هەموو وەک خواردنی کوردی وایە.

ـ ئەی سەیری هۆدەکەی من نەکەین؟

ـ بۆ نەء.

پاش تەماشا کردنی هۆدەکە هاتنەوە ناو سالۆنەکە و دانیشتن تەنیا خێرا خێرا چوو دوو چای تێکرد و سینییەکەی لە سەر مێزەکە دانا. ئەلێکساندەر لە ناو دۆلابەکەی لای دەرگا کراسێکی درێژی هێنا و دایە دەستی تەنیا و گوتی:

ـ هیوادارم بە دڵت بێت.

تەنیا ئەوەندەی نەمابوو لە خۆشیا بفڕێت. خۆی بە ئەلێکساندەر دادا و ماچی کرد و گوتی:

ـ ئەوە لە تەمەنما یەک کراسی وا جوانم هەبێت. ئەلێکساندەر وەستایانە کراسەکەی لە بەر کرد و سوخمە و دەرپێی گونجاوی بۆ هەڵبژارد. باشە با ئەم جارەیان بچین بۆ ئەو چێشتخانە لوبنانییەی کە تازە کراوەتەوە، دەڵێن خواردنیان زۆر خۆشە.

- تەنیا کراسەکەی گەلێک پێ جوان بوو، بەلام چونکە لە کراسی وا رانەهات بوو، بۆیە وای هەست دەکرد کە رووتە. پشتی لە ئەلێکساندەر کرد و پێی گوت:
- چۆن وا دەبێت گشت پشتم رووتە ئەی نابێت شتێک لە سەر ئەم کراسە لەبەر کەم. ئەی هەرنەبێت ئەتەگێک لە ژێرەوە لەبەرکەم. ئێستا پیاوی دونیا سەیرم دەکەن گەر بەم شێوەیە بمبینن چیم پێدەڵێن؟ هەر لەبەر ئاوێنەکەش دەسوڕاوە و سەیری خۆی دەکرد. وەک بڵێی باوەڕی بە خۆی نەدەکرد کراسێکی وای هەبێت، کە لە کراسی ئەکتەران بکات.
- تەنیا گیان، تۆ لە فەرنسایت کەس هیچت پێناڵێت. ئەم کراسەش هیچی لەسەر لەبەر ناکرێت و هیچیشی لە ژێر لەبەر ناکرێت. چونکە مۆدەکەی وایە و دەبێت پشتت دیار بێت. جوانی ئەوساکە جوانە کە دیار بێت و نە شاردرێتەوە. ئینجا واز لە ئەندێشەی کەون بێنە، خۆ لە چەرخەکانی ناوەندی ناژین تا بە ئەندێشەی ئەوان بجولێینەوە. لە یادت نەچێت ئیمڕۆکە گوتت تۆ چی بڵێیت من وا دەکەم. کورد یەک قسەیەیان هەیە و نایکەن بە دوو و گفتی خۆشیان دێننە دی. تەنیا گیان وا بزانم بە هەڵەدا نەچووم.
- ئینجا گەر تۆ ڕازی بیت لەشم دیاربێت و پیاوی تر سەیرم بکەن ئەوا من هیچم لەدەست نایەت و بە قسەت دەکەم، چونکە تۆ مێردی منیت.
- هەر وایە، با زوو سواربین و بڕۆین، ئەگینا درەنگ دادێ.

****

ئەلێکساندەر لە شوێنێک دەگەڕا کە ئۆتۆمبێلەکەی لێ ڕابگرێت، بەڵێ هیچ شوێنی دەست نە دەکەوت، بۆیە ئۆتۆمبێلەکەی هێنا بەردەگای چێشتخانەکە و بە تەنیای گووت تۆ دابەزە و بڕۆ تا من دێم مێزێکی دوو نەفەری بگرە. لە شەقامێکی نزیک ئۆپێڕا ئۆتۆمۆبیلەکەی بە هەزار حاڵ ڕاگرت و بە پێ چوو بۆ لای چێشتخانەکە. کە چووە لای تەنیا هەستی کرد کە تەنیا زۆر شاد نییە و دانیشتنەکەی زۆر سەیرە. لە نێو ئەم کراسە جوانەدا تەنیا بووبوو بە تۆپێکی بچکۆلانە. ئەلێکساندەر دەستی بە سەری تەنیا دا هێنا و گوتی:

- ئەگەر ئێرەت پێخۆشنەبێت دەچین بۆ چێشتخانەیەکی تر.

هەر لەو قسانە دا بوو سەیری کرد سەپان بە خۆیو دەفتەرچەی خواردنەکانەوە هاتە لایان و بەخێر هاتنی کردن و دەفتەرچەکەی لە بەردەمیان دانا و چوو بۆ لای مێزێکی تر.

- بۆ وا پەشۆکاویت چی بووە؟

- ئەی نابینیت سەپان لێرە کاردەکات، ئەی ئیستاکە چیم پێ دەڵێن؟

- چیت پێ دەڵێن ئەوەی دەیڵێن با بیڵێن تۆ ناڵێیت تۆ ژنی منیت؟ ئەگەر تۆ ژنی من بیت دەبێت لەگەڵ من بیت، نەک لەگەڵ پیاویکی تر. تۆ ئەم شتانە لە مێشکی خۆت بسڕەوە; ئەوە شەرمە، ئەمە دەکرێ ئەوە ناکرێ، فڵان چی گوت، فڵان چی کرد، فڵان لە گەڵ کێ دەروات، فڵان بۆ کوێ دەچێ، ئەی بۆ وا دەکات، ئەی بۆ جلی وا لەبەر دەکات. واز لەم شتانە بێنە تۆ لە فەڕەسا دەژیت. تۆ وەک هەر ژنێکی فەرەنسی سەربەستیت. تەنیا گیان باش بزانە ڕۆژهەڵات سێ بەشی کاتی خۆیان بەم پرسیارانەوە دەکوژن. نیوەی بەشەکەی کەماوەتەوەش بۆ نە هێشتنی ڕوودانی ئەم شتانە تەرخان دەکەن. لە بیست و چوار سەعاتا نزیکەی چوار سەعات و نیو کاردەکەن، ئەویش بەس پیاوەکان کار دەکەن، واتا نیوەی کۆمەڵگای کوردستان کار ناکات. ئەی کە قسەش دێتە قسە دەڵێن بۆ ئەوروپا دەوڵەمەندە و ئێمە هەژارین. ئێوە هەژارن، چونکە کار ناکەن. چونکە کاتی خۆتان بە شتی هیچ و پوچ دەکوژن. دەمی هەر ڕۆژهەڵاتییەک دەکەیتەوە، دەڵێ ئێوەی ئەوڕوپایی بێ ڕەوشتن،

مێژووی ڕۆژهەلات مێژوێکی پڕشینگدارە. با بێینە سەر خوورەوشت.;
رەوشتی بەرزی پیاوی ڕۆژهەلاتی ئێشکچی دەرپێی ژنانن، کە لەمالەوە
دەچنە دەرەوە مێشکیان پشوو نادات لە بەر پرسیاری دەبێت خوشکم ئێستا
سەرە تاتکانێ نەکات؟ دەبێت کەس تەماشای ژنەکەم نەکات؟...هتد خۆشی
چاوی بەرامبەر هیچ ژنێک داناگرێت. گرفتی پیاوانی ئێوە لەوەدایە ئەوەی کە
بۆ خۆیان بە حەلالی دەبینن بۆ ژنەکانیان حەڕامە. هەر بۆ نموونە بە قسەی
تۆ کوڕە کوردەکان پێیان ناخۆشدەبێت گەر تۆ لەگەڵ من بیت، بەلام باش
بزانە هیچیان نییە یەک یان دوو کچی فرەنسییان نەبێت. دە با کچێکی
کوردیش کوڕێکی فەرەنسی هەبێت. دوای ئەوە کە باسی مێژوو دەکەن وای
باس دەکەن کە گوایە ئیمڕۆکەیە. من پێت دەڵێم وەک یەکێکی فەرەنسی تا
بەیانی بە بەژن و بالای ناپلیۆنا هەلبلێم چیم بۆ دەکات؟ نانم پێ نابەخشێ.
من لەم باس و خواسە دا هەر کاتم لەدەست دەچێت. وەک هەردەم دەڵێم کات
کارە، کار پارەیە، کات پێوەری ژیانە، بێ کار و بێ پارەیی، کەی ژیانە؟
ـ ئەلێکساندەر قسەکانت زێڕن، بەلام وا ئاسانیش نییە. تۆ لە منداڵییەوە بەم
جۆرە گەورەبویت من بە شێوەیێکی تر گەورەکراوم. بۆیە لە توانام دا نییە
و لە فەرهەنگی من دا نییە هەموو شتێک وەک تۆ بکەم. ڕاست و رەوان
پێتدەڵێم من نازانم وەک تۆ بکەم. وا تێنەگەیت من نامەوێت وەک تۆ بکەم و
لێشت ببەمەوە.
ـ تۆ جارێ لێمفێربە و وەک من بکە، جارێ کاتی ئەوەت نەهاتووە بیر لە
بردنەوە بکەیتەوە.
ـ تەماشا تۆش لە داهاتوویەکی نادیار دەترسیت. دەڵێیت نەکا بەیانی بە
نەوەی نوێ ڕانەگەم. بڕواتبێت کەس بە نەوەی نوێ ڕاناگات. لەم ژیانەدا
ئەوەی زوو پیر بێت هەرگیز کامەران نابێت. کە پیر دەبین بە نەوەی نوێ
ڕاناگەین. کە پێشیان ڕاناگەین دان بە شەکەستی خۆمان دانانێین. بۆیە لەم
ژیانەدا کەس تا کۆتایی کامەران نابێت. بەڕاستی ئێمە نازانین هەنگاوەکانمان
بەرەو کوێ دەمانبەن. منیش لەگەڵ تۆ ئەم هەنگاوەم ناوە و نازانم بەرەو
کوێ دەمبات. تۆش دەتەوێت نەترسم و وەک کچێکی تازە پێگەیشتووی

تەمەنی خۆم کە لەم کۆمەڵگا مەزنە پەروەردە نەکراوم. من پەروەردەی کۆمەڵگایەکی ترم. سەرەڕای ئەوەش داوام لێدەکەیت کە لەو هەنگاوەی خۆم بگەم؟ سەیرکە من هەنگاوی خۆم هاویشت و لە تۆش ئازاترم.
چێنەر لە چێشتخانەکە هاتە دەرەوە و چوو بەخێرهاتنی هەردوو میوانی کرد و هیوای ئەوەی خواست کە خواردنەکانیان بە دڵ بوو بێت.
ئەلێکساندەر گوتی:
ـ سەیرە ئەی خاوەنی چێشتخانەکە لە کوێیە؟
ـ من و سەپان خاوەنی ئەم چێشتخانەین، ئەوە دەمێکە لە لوبنانییەکمان کڕیوەتەوە و خواردنەکان بەشی زۆریان خواردنی کوردینە، هەر (حمص بطحین) و (تەبولە) هی ئەوانە. کفتە و شفتە و کەباب و ساوار هەر خواردنی کورد بووە، بۆیە بە بێ ترس کڕیمانەوە و ئێستەش وەک دەبینن کارمان باشە.
ئەلێکساندەر گوتی:
ـ کاک چێنەر بەیارمەتیت پارەکەمان چەند دەکات؟
ـ کاک ئەلێکساندەر ئیمشۆکە یەکەم جارتانە میوانی ئێمەن بە دەستوری کوردەواری دەبێت هەموو شتێک لەسەر حیسابی ئێمە بێت.
ـ کاک چێنەر، خۆت لە سستەمی فەرەنسی باش ئاگاداری. من ئەم فاکتورە دەدەم بە دائیرەی باج بە ناوی ئەوەی کە گوایە ئەم نان خواردنەمان کۆبونەوەیەک بووە بۆ پێشەوە چونی کارو باری کارگەکەمان. ئینجا لە کۆتایی دا دائیرەی باج ئەم پارەیە لە باجەکەی کە دەبێت بیدەم بە دەوڵەت کەم دەکاتەوە. گەر وا بێت لەم ناوە بۆ تۆ زەرەر بکەیت. من زۆر سوپاسی ئەم هەستە جوانەت دەکەم. لەمەو دواش گەر خواردنی بەکۆمەڵمان بوو لە پێناوی پەرەسەندنی کار، دەیان هێنم بۆ ئێرانە، ئیتر زۆر سوپاس.
ئەلێکساندەر گوتی تەنیا من دەچم ترومبێلەکە دەهێنمە بەر دەرگا ئینجا تۆ وەرە دەرێ، نزیکەی پێنج دەقەم پێ دەچێت، باشە گیانە؟ تەنیاش سەری خۆی لەقاند. پاش ئەوەی سوار بوون و بەڕێ کەوتن.
تەنیا رووی لە ئەلێکساندەر کرد و گوتی:

- ئەرێ ئەلێکساندەر دەتوانم بەکوردی ناوت بەرم.
- ئەگەر بە کوردی ناوم بەریت پێم دەڵێیت چی؟
- پێتدەڵێم ئەسکەندەر.
- ئینجا بۆ بە ڕوسی ناڵێیت ساشە. پەیوەندیم لەگەڵ شەریکەیەکی رووسی هەیە، ئەوەندە بونەتە برادەرم بە رووسی بانگم دەکەن ساشە، هەر لەوەشەوە لە شوێنی کار، برادەرە نزیکەکانم بانگم دەکەن ساشە، ئینجا هەر چاوەڕێی ئەوەم دەکرد تۆش وا ناوم بەریت.
- ئەرێ ئەم باڵەخانە جوانە چییە؟
- ئەوە ئۆپێرای بەناوبانگی پاریسە. با زمانەکەت تۆزێک بە هێز تر بێت، ئینجا ناوە ناوە دێین بۆ ئێرانە، ئێستەش بەرەو لوڤەر دەرۆین و دوایی دەچینەوە ماڵە خنجیلانەکەی خۆمان. هومێدەوارم کە ئەم دەرچوونەت بە دڵ بووبێت. دەزانم ئەوەت پێ ناخۆش بوو ئێستە کوردەکان دەزانن تۆ یاری منیت.
- دۆزەخی دەروونم لە بەهەشتی کوردەواری خۆشترە. ئەو زینایەی لەگەڵ تۆ دەیکەم لام لە بەهەشتی خوا خۆشترە. ئیتر ئاسوودەبە ناسنامەکەم لە رووباری سێن (سێن ئەو رووبارەیە کە بە ناو پاریسدا تێدەپەڕیت) دا دەشۆمەوە.
- تەنیا گیان من پێم خۆشنییە ناسنامەکەت لە روباری سێن دا بشۆیتەوە. پارە بە هەر دوو دیویەوە پارەیە، ئەگینا دەبێت بە پارچەیەک مەعدەنی بێ نرخ. گەر ناسنامەکەت هەڵنەگریت تۆش بۆ من دەبیت بە ژنێک لەم ژنانەی ناو جادە، من تۆم بە ناسنامەکەتەوە خۆشدەوێت.
- ساشە گیان، ژیان گەشتێکە لە خەونێکی کورتدا. پاش ئەوەی لە باوەشی تۆ دا بێدار بوومەوە دەمەوێت باشترین گەشتیاری ئەم خەوەبم. بڕوابکە بە ناسنامەی خۆمەوە ناتوانم یاری تۆبم، بۆیە ناسنامەکەم فڕێدەدەم تا تۆم لە دەست نەچێت. من لە وڵاتەکەی خۆم مردبووم تەرمەکەیان هێنام بۆ پاریس لە باوەشت زیندوو بوومەوە.
- تەنیا گیان ژیان ململانێیە، گەر کۆڵ بدەیت لەدەستی دەدەیت.

- ژیانی من یادەوەریی تاڵی دەکات بۆیە دەمەوێت ببم بە کوواگێکی بێ رەگ تا لە یادەوەرییەکانم دابېڕێم.
- نەخێر دامەبڕێ خۆت لەگەڵی بگونجێنە.
- ئەوەی من هەستی پێدەکەم یاد کانییەکە و سەرچاوەکەی وشک نابێت، کە یادەوەرییەکانم دێنەوە یادم ژیانم وشک دەبێ. کە لە یادەوەرییەکانم دەتۆرێم دەبم بە هەڵم و لە شوێنێکی تر دەژییمەوە.
- هەموو کاتێک یادەوەریی لەگەڵ هەست و نەستی مرۆڤ تێکەڵدەبێت، زیرەکی مرۆ لەوەدایە کە بتوانیت بە تێگەیشتنی ئیمڕۆکە ئەوساکە هەڵسەنگێنیت.
- ئەلێکساندەر من لە باوەشی تۆدا ژیامەوە. پاش ژیانەوەم تێگەیشتم; شەکەست و سەرکەوتن و پێکەنین و گریان و لە خۆ بایی و خۆ بە دۆست زانین، هەموویان چرکەیەکن تێدەپەڕن.
تەنیا تۆزێک داما و چاوی بە شەرمەوە هەڵبڕی و درێژەیدایێ :
- بڕوام پێ بکە هەندێک شت هەن تێناپەڕن، بۆیە دەبێت باش بزانیت کە باوەشی تۆ یەکەم باوەشە و بۆتە هاوەڵم و هەرگیز تێناپەڕێت.
- هەرچەندە ئەوە یەکە ئاواتی منە، هیچ ژنێک بەم جۆرە نەکەوتۆتە بەر دڵم وەک تۆ، بەڵام وا مەڵێ جارێ گەلێک زووە ئەم بڕیارە بدەیت.
- تا رۆژی سەرەمەرگ دەڵێن بیرەوەریەکان لەناکاوێک وەک گەردەلول هێکڕا زیندوو دەبنەوە و وەک کۆلکەزێڕینە لە ئاسمانێکی بێ هەور دا دەستەو ئەژنۆ رادەوەستن. لێم دادەبڕێن، وەک چاوتروکانێک ئەم دیمەنە دەبێتە گێژاوێک و دەگەڕێتەوە نێو دەریای مەندی ئەندێشەیی ماتم. ئەوساکە کە هەموو بیرەوەریەکانم دێنەوە ناو هێلانەیی ئەندێشەم، دێنە سەر سینگم و ماچم دەکەن دەڵێن ئینجا ئەی دڵی ماندوو بە ئەسپایی لە باوەشی ئەلێکساندرا لە لێدانی خۆت بکەوە. ئەودەمە من و دەربەندی بیرەوەریەکانم دەبین بە چرکەیەکی بەسەرچوو. ئیتر جارێکی تر بەو ناوە دا گوزەرناکەینەوە.
- گەر خۆشەویستێکت هەبێت تا لە دڵی ئەودابیت نامریت.

- که من نەمام هەر وەک ئەوە وایە شەماڵ لکی دارێک دێنێ و دەبا، ئیتر تا تەمەنی ئەم دارە مابێت هەمان بای شەماڵی پێناکەوێتەوە.
- سەیری زانایانکە پێش هەزار ساڵ نەماون تا ئێستاش وەک کزە با و وەک گەردەلوول یاری بە بیر و ئەندێشەی ئێمە دەکەن. گیانەکەم لەم ژیانە شتێک بکە تا وەک شەماڵ تێنەپەڕیت.
- دەباشە کە سەیری رووبارێک دەکەیت, لات وایە ئەو ئاوەی کە تێدەپەڕێت یان مەنگ وەستاوە هەڵگری یادی تەمەنی چەند هەزار ساڵەی ئەو رووبارەیە؟ بەڵام ئەم بڕوایە زۆر لە راستی دوورە، ئەم تنۆکە ئاوە یەکەم جاریتی ناشارەزایە و بێرە دا تێدەپەڕێ. ناوی ئەم روبارە دێرینەی لێدەنێن بەڵام ئەم تنۆکە ناتوانێ هەڵگری یادی ئەم رووبارەبێت. تا تێمبگەیت من وەک ئەو تنۆکە ئاوەم بە ناشارەزایی بە رووبارێکی کوردستان دا تێپەڕیم، بڕواتبێت ناتوانم هەڵگری یادی ئەم رووبارەبم. من هەڵگری ناوی کوردم بەڵام ناتوانم هەڵگری یادی کوردبم.
ئەلێکساندەر پێکەنی و ویستی رێچکەی ئەم بابەتە غەمگینە بگۆڕێت بەرەو شتێکی خۆشتر. گوتی:
- ئینجا کێ پێتدەڵێ ببە بە مێژوونووس؟
- وایە چۆن تۆ ناتەوێت چێژ لە ناپلیۆن وەرگریت، منیش نامەوێت چێژ لە سەلاحەددین وەرگرم.
- من پیاوم نامەوێ چێژ لە ناپلیۆن وەرگرم، بەڵام خۆ تۆ دەتوانیت چێژ لە دەست و بازووی سەلاحەددین وەرگریت.
- دەزانم بەرەو کوێ دەمبەیت، راستە منیش ژنم و دەمەوێت چێژ لە ژنایەتی خۆم وەرگرم. ئەوەش مافی خۆمە، بەڵام کورد ئەم مافەم ناداتێ.
- خۆ تۆ دایە تریزە نیت، تۆ ئافرەتێکیت وەک هەموو ئەم ئافرەتانەی کە دەیانەوێت بژین. مرۆڤ هەر رێگایەکی ببیەوێت بیگرێتە بەر، دەبێت لەبەر دەرگایماڵی خۆیەوە دەست پێ بکات.
- من تنۆکە فرمێسکێک بووم لە نێو سەهۆڵبەندانی کیوێستانە بەرزەکانی کوردستان، خۆم دائەپۆشی لە گەرمی خۆرەتاو، لە ترسی ئەوەی نەکا ببم بە

تنۆکە ئاوێک و لە نێو جۆگەیەک لە جۆگەکانی ئەو دەڤەرە برژێمە نێو دۆڵی چیا بەرزەکانەوە. لوتکەی بەرز جێ بهێڵم و سەر بەرەو لێژی ملپێوەنێم. لە وەش زیاتر دەترسام ببم بە هەڵم و ئیتر هەرگیز خۆم وەک خۆم نەبینمەوە. بۆیە دانم بەخۆما دەگرت و نەدەگریام تا بێ گۆڕان وەک خۆم بمێنمەوە. ساشە ئەم تنۆکە فرمێسکەم پێ نەگیرا، بووم بە هەڵم و بووم بە باران و لە باوەشی تۆ دا ژیامەوە. ئینجا بڕواتبێت نابمەوە هەمان فرمێسک لە سەهۆڵبەندانی کوێستانەکانا. من دەزانم ئیتر نە رەشەبای دەریای مانش"Manche" دەتوانێ و نە شەپۆلەکانی دەریای سپی لە تووانایان دایە بمگەڕێننەوە داوێنی زۆزانەکانی کوردستان. من دەمەوێت لە داوێنی تۆدا بژیم، تۆ بۆ من لە چیاکانی کوردستان بەرزتریت.
- تۆ واز لە بەسەرهاتی دڵتەزێن بێنە. خۆشەویستی تۆ بۆ من جوانترین دیاری سروشتە.
- ئەی بۆ دیاری یەزدانی نەبێت؟
- من مرۆڤێکی ئیماندار نیم.
- ئەی لەوە زێتر چیت دەوێت خودا هەموو شتێکی پێ بەخشیویت. ئەی بۆ ئەوەندە بێ سیفەتیت و ئیمان بە خودا ناهێنیت؟
- خاوەن کار ئەوەندەمان خوا گەرەکە تا خوا بتوانێت کرێکارەکانمان بۆ مل کەچ بکات، پاش ئەوەش هیچ کارمان بە خوا نامێنێت. نەک هەر ئێمە ئەگەر خودا هەموو شتێک بە هەژاران ببەخشێ ئەوانیش لە بەیانییەوە تا ئێوارە و لە ئێوارەوە تا بەیانی لە خودا ناپاڕێنەوە. ئێمەش کرێکارەکان تۆزێک برسی دەکەین تا لە خودا بپاڕێنەوە و بڵێن خودایە دڵی خاوەن کار نەرم کە تا تۆزێک پارەمان بۆ زیادکات. ئێمەش تۆزێک پارەیان بۆ زیاد دەکەین تا ئەوان ئیمانیان بە هێزبێتەوە. ئینجا ئێمەش کۆتاڵەکانمان بە گرانتر دەفرۆشین. ئێمە ئیمانیان بە دیاری پێ دەبەخشین، دوایی پارەکەیان لێ دەسێنینەوە.
- من هەرچەندە لە پوختەی قسەکەی تۆ نەگەیشتم. راستی دڵی من بێ پێچ و پەنایە لە تەمەنما هەر بڕوام بە خوا هەبوە. ئێستەش هەموو شتێکم داوەتە

دەستی تۆ، بڕوام بە تۆ هەیە. گەر بڕوام پێت نەبوایە هەرگیز بە نرخ ترین شتی ژیانی خۆم لە مستت نەدەنا. تۆش لەبەر خاتری من ئیمان بە خودا بێنە.
- خاوەن کار، کرێکار دەخاتە ناو بیرێکی چوارگۆشەوە لایەکی ئەم چوارگۆشەیە ناو لێدەنێت دیواری کار، ئەوەی تریان ناوی دیواری پارەیە، سێیەم دیوار ناوی توانای کڕینە، واتا بەو پارەیەی کە وەری دەگرێت دەتوانێت چی بکڕێت. لە کۆتایی دا دیواری چوارەمیان ناوی دیواری دیموکراسیەتە. دیموکراسییەت شتێکی زۆر گرنگە چونکە لەو کاتەی کە کرێکاران توانای کڕینیان کەم دەبێتەوە دەکەونە ناو جادەکان و هاوار دەکەن لە چییان کەمە، هەر هاوارێک و هەر داواکاریەک لاوازی و لایەنە بێهێزەکانی خۆپیشاندەر دەردەخات. خاوەن کار کە ئاشنا بوو بە لایەنە بێهێزەکانی کرێکاران، ئینجا بە ئاسانی سەری بیرەکەیان لێ وێک دەهێنێتەوە. بەڵام دایناخات تا بەس ئاسمانیان لێ دیار بێت و لەو کاتەی کە هەست دەکەن کە لە ناو بێرێکن و هاتنە دەرەوەیان دەبێت بە خەون و خەیاڵ. پاش ئەوەی لە پارچەیەک ئاسمانی شین بەولاوە هیچیی تریان بە دەستەوە نامێنێت، ئینجا ڕوو لە ئاسمان دەکەن و دەپاڕێنەوە.
- کە وا بێت خاوەنکارەکان بێ ئیمان و کۆمونیستن.
- تەنیا گیان چۆن تێناگەیت ئەم کۆمونیستانە ئیماندارن. چونکە کرێکارن و ئەم کرێکارانەش لە ناو چاڵی خاوەنکارەکان دا بەندن. ئەگەر گیر و گرفتێکیان هەبێت یەکسەر ڕوو لە ئاسمان دەکەن و دەست لە بەر خودا پان دەکەنەوە. چونکە لە پارچەیەک مافووری شین بەولاوە هیچی تر نابینن. کەوابێت کۆمونیستەکانیش بە شێوەی خۆیان ئیماندارن. ئەوان دەیانەوێت کرێکاران هەڵگێڕنەوە واتا لەم بیرە بیبانهێننە دەرەوە ئاسمانەکەیان فراوان تر بکەن. وەک خۆت دەزانیت ئاسمان هەر ئاسمانە بەڵام شێوەی پاڕانەوە لە ئایینێک بۆ ئایینێکی تر دەگۆڕدرێت. بەم شێوەیە خاوەنکارەکان پیاوە ئایتنییەکانیان تێبەر دەدەن. لەمەودوا پێتناڵێم خاوەنکار پێتدەڵێم بۆرجوازیەت، ئەم بەرجوازییانە بە پارەی خۆیان مزگەوت و کەنیسە بینا دەکەن، پیاوە ئایینییەکانیش بەلای خۆیان دا ڕادەکێشن. ئەم کارانە دەکەن لە دژی ئەو

ئاییینەی کە کرێکاران هاندەدات تا سەر بۆ بۆرجوازیەت دانەنوێنن. بۆیە ئاییینەکانی تر گشتیان دەڵێن سەر بۆ خاوەن کارەکان دانەوێنن.

دوای ئەمەش هەر مرۆڤێک یان هەرکەسێکی، وەک ئێمەمانان لەم کەلێنانە دەگەڕێین کە بە خودا پڕنەکراوەتەوە. بۆ نموونە خودا مرۆڤی دروست کردووە، بەڵام مرۆڤ نافڕێت، ئەوە کەلێنێکە، بۆیە مرۆڤ فڕۆکەی دۆزییەوە تا ئەم کەلێنە پڕکاتەوە، مرۆڤ کەشتی دروست کردووە، چونکە ناتوانێت وەک ماسی لە دەریاکان بدات، دەتوانم بە سەدان شتی ترت بە نموونە بۆ بێنمەوە.

کە مرۆڤی دیندار دەکەوێتە تەنگانەوە، واتا کە مرۆڤ بەرامبەر بە سروشت بێ دەسەڵات دەبێت، و بە تەواوی بێ دەسەڵاتی مرۆڤ بەدیاردەکەوێت یەکسەر مرۆڤ دەکەوێتە سەر ئەژنۆ و لە خودا دەپاڕێتەوە. وەک دەبینیت ناوەرۆکی هەر پاڕانەوەیەک لە پاڕانەوەکان بە بیر خودا دەهێننەوە کە تۆ ئێمەت لە شێوەی خۆت دروست کرد، ئەی بۆ ئێمە ئەوەندە بێ هێز و بێ دەسەڵاتین؟ تەنیا گیان دەزانم پێمدەڵێیت ئەوە کفرە. تا بە باشی تێمبگەیت پاڕانەوەش هەر بۆ پڕکردنەوەی کەلێنەکانە، بۆ نمونە کە دەکەوێتە چاڵێکەوە دەپاڕێتەوە چونکە باڵت نییە بفڕیت و بێیتە دەرەوە.

- بۆیە کرێکار دەبن بە کۆمونیست.

ئەلێکساندەر گوێی نەدا بەم قسەیە و لەسەر قسەی خۆی بەردەوام بوو.

- مێشکی مرۆڤ توانایەکی بێ سنوری هەیە گەر بتوانین بەکاری بێنین. پاڕانەوەش خۆی لە خۆی دا شێوەیەکە لە جادوو، ئینجا ئەگەر ئەو کەسە نەیتوانی بە پاڕانەوەی خۆی بگات بە ئەنجام دەچێت لە شێخێک، جادووکەرێک، شامانێک یان قەشەیەک داوا دەکات کە دوعایەکی بۆ بکات تا بگات بە ئەنجامی خۆی. بە راستی ئێمەی مرۆڤ تا ئێستاش نازانین مێشکی خۆمان بە تەواوی بەکار بێنین، واتا هەندێک لایەنی شاراوەی مێشک هەیە مرۆڤ هەست بە بوونی دەکات، بەڵام جارێ لە توانای دا نییە بەکاریبێنێت. هەندێک لەم جادووکەرانە، ئینجا چ شێخبن، چ قەشەبن یان مەلا هەست بە بوونی ئەم توانایە دەکەن کە لە مرۆڤ دا هەیە. بە شێوەیەک لە شێوەکان بۆ

پەرژەوەندی خۆیان بەکاری دەهێنن، بەڵام بۆرجوازییەت ئیمانی بە ئابووری و ژمارە و پێوان هەیە و بەس، بۆرجوازییەت فلسێک نادات گەر ئەم فلسە دوو فلسی بۆ نەهێنێتەوە. خاوەن کار هەرگیز نابێت بە دڵ بیر بکاتەوە، دەبێت هەردەم بە مێشک بیر بکەینەوە.
- مرۆ پێش هەموو شتێک دەبێت مرۆڤ بێت، واتا بە دڵ بیر بکاتەوە.
- تەنیا ئێستە سەرمایەی هەمە و نیمە دە ملیۆن فرەنگە، واتا بەو خانووەی کە ئێستە لە ناوی داین. بەیانی بە قسەی تۆ دەکەم، نزیکەی سێ ملیۆن بێ کار لە فەرەنسا هەنە، کە بە خۆیان و خێزانیانەوە دەبن بە دە ملیۆن. ئەگەر هەر یەکەیان فرەنگێکی بدەمێ، دەکات بە دەملیۆن مژمژە بۆ منداڵەکانیان. نە کەسیان پێی دەوڵەمەند دەبێت نە کەسیان نانێکی پێ دەکڕێت. من و تۆش خۆمان لە سەر جادە دەدۆزینەوە. لە جیاتی یارمەتی کۆمەڵگای فەرەنسی بدەم، پەنجا کرێکارەکەی خۆشم دەبێت بۆ مژمژەی منداڵێک لە کار دەربکەم. ئینجا خۆت بڕیار بدە، چ بە دڵ بێت چ بە مێشک، پێم بڵێ ئەم کارە کارێکی ڕاستە؟
- ئەی ئەگەر خاوەنکار کۆمونیست نەبن ئەوەندەش بەهێزبن، ئەی بۆ کۆمونیستەکان بەجارێک لەناو نابەن؟
- تەنیا کەست دیوە پەیژەی خۆش بوێت؟ هیچ ماڵێکیشت دیوە بێ پەیژەبێت؟ چونکە پێویستیمان بە پەیژە هەیە تا بەسەرکەوین. ئەو کۆمونیستانەش لە نێو کۆمەڵگا دا وەک پەیژەن، ئەگەر بمانەوێت بەسەر هەر بزوتنەوەیەکدا سەر بکەوین پێویستە هەوڵ بدەین توانایەک دروست بکەین بۆ ئەوەی ئەم بزوتنەوەیە لە چەند چەقێکدا (ناوەندێکدا) کۆکەینەوە، یەک لەم ناوەندانەش پارتی کۆمونیستە.
- ئەم بێنە و بەرەیە بۆ من زۆر زەحمەتە، من بە ئەنگێلا دەڵێم بێت و ئەم گرفتەت لەگەڵ شیکاتەوە. ئەوەی لای من گرنگە گەر منت خۆشبوێت، پێم دەڵێیت تۆ دیاری خودایت بۆ من.
- تۆ بۆ من دیاری خودا و سروشتیت.

- گەر من دیاری خودا نەبم بۆ تۆ، ڕاست دەکەیت من دیاری کۆمەڵگای کوردم بۆ تۆ, چونکە ئەگەر کۆمەڵگای کورد ئەم حیسابانەی تۆی بزانیایە، کورد حاڵی ئەم حاڵە نەدە بوو، منیش لە باخەڵی تۆ دا نەدەبووم.
- تەنیا بە خۆشەویستی من ڕازی نیت؟
- من وا دەڵێم، چونکە تۆ بێ ئیمانیت ،بەڵام ساشە دەبێ ئەوەش بزانیت کاتژمێری من وەستا بوو بە دیتنی تۆ بەگەر کەوتەوە. نامەوێت ئەم جارەیان کاتژمێری دەستم بوەستێتەوە؟
- ئەم جارەیان من تێتنەگەیشتم. بەڵێ ئەو ڕۆژەی کە لەدایک دەبیت کاتی تۆ دەستپێدەکات، ئەوکاتەی کە دەمریت کاتت لەشوێنی خۆی دەوەستێت.
- خۆزیا قسەی تۆ ڕاست بووایە، لای من کات لە مردنەوە دەست پێدەکات. بەڵام بۆ ئافریدەکانی تر، کات بێوچانە، دەڕوا دەڕوا، بۆ کوێ دەچێ؟ کاتژمێری گۆی زەمین بێسرەو دەسوڕێتەوە، بەڵام هەرگیزاوهەرگیز ناگەڕێتەوە. ڕۆژگاری بەسەرچوو، شادومانی کاتی ئێستاکە شوێنیان لە داهاتوو دا لە کوێیە؟ کاتی داهاتوو بە شێوەیەکی گشتی لە نێو کات دا شوێنی هەیە؟ ئەی دەمی ڕابوردوی تازە بەسەر چوو دەمێکی کورت نەبوو تێپەڕی و کەوتە خانەی هەمان چرکەی بەسەرچوی هەزارساڵە، چرکەی نەناسراوی داهاتوش شوێنێکی خنجیلانەی لە دەمی ڕابردوی داهاتوو دا دەکاتەوە. بە زەردەخەنەیەکی ژەهراوییەوە هەناسەیێکی هەڵکێشا و درێژەی بە بیرۆکەی خۆیدا:
- ئەو چرکانەی بێ ووچان تێدەپەڕن لە گەڵ کاتی بەسەرچوی ژیانم تێکەڵ دەبن. ڕاستە کات دەڕوا و بێ وچانە، بەڵام کاتی ڕابوردوو لە مێشک دا پەنگ دەخواتەوە، هیچ دەربەندێک لە جیهان لە دەربەندی کاتگرتوی بیرەوەری مەزنتر نییە. کاتی من لە شوێنێک چەقی بوو، ئێستەش دەمەوێت لەسەر خۆشەویستیمانی ڕاگرم و ئیتر کەس نەتوانێت لە شوێنی خۆی بیترازێنێت.

****

بۆ بەیانی ئێوارەکەی زەنگی تەلیفۆن لێی دا، ئازاد وەک ئاسایی بەرامبەر تەلەڤیزیۆنەکە دانیشتبوو و بۆی هەیە گوێی لە زەنگەکە نەبووبێت. چونکە وا تێکەڵی دەنگ و باس دەبوو ئیتر نەی دەیویست تاکە وشەیەکی لەدەست چێت، بۆیە وەک ئاسایی لە کاتی وا دا سکاڵا تەلیفۆنەکەی هەڵدەگرت.

. Halo oui ...

. سکالا خان من سەپانم، هەر ویستم لە تەندوروستیتان بپرسم.

سکاڵا دەم و چاوی خۆی گرژ کرد تا ئازاد بزانێ کە ئەم تەلیفۆنە هیچ نییە.

باشین لە خوا بەزیاد بێت، لە چیمان کەمە.

. ئەرێ بە یارمەتیت دەتوانم لەگەڵ تەنیا خانا بدوێم.

. نەخێر چونکە ئەوە دوو سێ ڕۆژە خانوویەکی دۆزیوەتەوە و لەماڵی ئێمە ناژییێت. جارێش تەلیفۆنی رانەکێشاوە و تەلیفۆنیشی بۆ نەکردووین.

. سکاڵا خان بڕوات پێ دەکەم کە چەند ڕۆژە نەهاتووەتەوە ماڵەوە. من دوێنێکە تەنیام دیت خۆزیا ئەم دیمەنەم هەرگیز نەدەدیت.

. بۆ...، کوڕە قسەی خێر بکە، خوا نەخواستا شتێکی بەسەر نەهاتبێت؟

. ئینجا قسەی خێر لە کوێ بێنم، خۆزیا شتێکی بەسەر هاتبا بەس بەم شێوەیەم نەدیبا. دوێنێکە لەگەڵ کوڕێکی فەڕەنسیم دیت کە ناوی ئەلێکساندەرە، تەنیا کراسێکی تەنکی لەبەر کرد بوو پشتی ڕووت تەنانەت دەرپێیە مۆرەکەشی تییایا دیار بوو.

. ئەگەر وای کردبێ، دەک خودا روی رەش کات، دەک سەر و بابانی لە خمێ نێن.

. سکالا خان من لە کارم دوایی تەلیفۆنتان بۆ دەکەمەوە، ئێستە بە خوداتان دەسپێرم.

. دەک داوەشێیت کچ ملت شکێ، لە چیت کەم بوو ماڵت بۆ کرابوووە و وەک کچی خۆم سەیرم دەکردی. ئینسانی بێ ئابڕوو هەر وادەبێت.

. ئازاد گوتی :

. سکالا ئەوە چییە؟ بۆڵە بۆڵتە.

- ئەی نابینیت تەنیا خان حەیای بردین.
- ئینجا ئەگەر حەیامان بە هەرزەکارێک بچێت دەبا ئەم حەیایە هەر نەبێـــــــێت.
- کوڕە چی بووە تازە گەیشتووەتە پاریس، ئەوە بۆ وا خۆی ڕسواکرد.
- ئەم قسانەی تۆ دەبوایە ژنێکی نەفام بیکردایە، تۆ خۆت بە مامۆتک دەزانیت و بە تەپڵی مەیمونێک هەڵدەپەڕیت. سکاڵا ئەم تەنیایە گەلێک کچێکی ناسکە، بە شێوەیەکی گشتی ئەم کیژە تەنیایە. بۆیە لە باوکێک دەگەڕێت دەست بەسەری دا بێنێت. لە نێو کوردەکانی خۆشمان کەس ئامادە نییە ببێت بە باوک و بە یار. ساشەش دەم و چاوی سۆزێکی باوکانەی تیایە، ئینجا چی تیایە گەر ببێت بە یار.
- باشە باشە ئەی بۆ جلی سەماکەران لەبەر دەکات؟
- ئینجا تۆ بە شتی وا پڕ و پوچ قەت خۆت سەغڵەت مەکە. گەر یەکێک تۆزی لێنیشت خۆ تۆ لە جیاتی ئەو خۆت داناوەشێنیت. گەر نەتەوێت تۆزت لێ بنیشێ خۆت لێی دوورکەوە. تۆ هەموو ژیانت خەباتت کردووە تا ژن لە هەڵبژاردنی هاوسەریان ئازاد بن، ئەی بۆ ئێستە، کە دەکەویتە بەر مەحەک، خۆتی لێ دەکێشیتەوە؟ ئا ئەمەیە خەباتی ئافرەتان؟
- جا ئەگەر وابێت قسەی مامۆستا راستە هەموو ئازادیەک بەرەو بەڕەڵڵاییمان دەبات.
- ئەگەر ئازادیت ئازاد کرد بەرەو بەڕەڵایی دەتبات. بەڵام گەر ئازادی لە چوارچیوەی خۆی دابێت بەرەو قووڵی ئازادیت دەبا.
- تێگەیشتم گرفت لە مەلەوانی نییە. ئەوەی مەلە نەزانێت و خۆی فڕێداتە ناو قووڵایی دەریاوە، بێ ئەوەی لە لێوارەکانی فێری مەلەوانی بووبێت، وا بە ئاسانی سەر ئاو ناکەوێت. ئینجا ئەوەش ڕۆژەکەیە ئەگەر ئەم کچە بێ شەکست بەسەر ئاو کەوێتەوە. دەستی لە رانی خۆی دا و گوتی :
- ئەوا من قۆلێکی خۆم دەبڕم.
- بۆی هەیە قسەی تۆ ڕاست نە بێت و تەنیا ببێت بە کچێکی فەڕەنسی و وەک هەر ژنێکی فەڕەنسی ژیانی خۆی بە سەر ببات، ئەگەر واشی لێهات چی

تیایە. گەر زیرەک بێت و هەر لەدوای رابواردنی خۆی رانەکات، ئەوا بۆی هەیە ببێت بە باڵوێزی ئافرەتانی کوردستان، نەک لە فەرەنسا بەڵکو لە هەموو ئەوروپا.
ـ ئەگەر ببێت بە باڵوێزی ژنانی کوردستان، قسەی سەرکەوتە لاڵ راست دەردەچێت؛ ئەوەی سنگی دەرپەڕێنێت، لە فەرەنسا ئەو لێهاتو و دانا و بە هێزە. سینگی هیچ پیاوێکیش لە سینگی تەنیا بەرز تر نابێتەوە، هیچ ژنێکی کوردیش بەم شێوەیە ناتوانێت خۆی رووتکاتەوە، و سینگی بەڕەڵا کات. با بژین ئەوانەی باڵوێزی ژنان هەڵدەبژێرن. وابزانم هەر وایە پیاوەکان دادەنیشن و ژنەکان لە سەر شانۆ لەبەردەمیانا تێدەپەڕن، ئەوەی بە دڵیان بوو ئەویان هەڵدەبژێرن، دەیکەن بە باڵوێز.
ئازاد کەم جار بەم شێوەیە دەوروژا ئەمجارەیان پەنجەی ئاماژەی لە مێزەکەی بەردەمی خۆی دا و بە توڕەیەکی ساردەوە بە سکاڵای گوت :
ـ نەخێر ژن ئەو ژنەیان گەرەکە کە لە مێشکی خۆی دا ئازاد بێت، ئازادی ژنان بپارێزێت، نەک لە نێو چوارچێوەی دیکتاتۆریەتێکی شارراوە دا ئازادییەکەیان وەک بیور داپاچێت.
ـ ئێستە تۆ لەگەڵ ئەوەیت کچێکی کورد بێتە ئەوروپا و خۆی بدۆڕێنێت؟
ـ هەرگیز لەگەڵ ئەوەدانیم مرۆڤ خۆی بدۆڕێنێت، ئینجا لە لای من گرینگ نییە ژن بێت یان پیاو. بەڵام هەر کەسەی خۆی لە شوێنێکا دەدۆزێتەوە، هەر کەسەی لە لایەکەوە دەچێتە ناو کۆمەڵگاوە. دێتە یادت چیرۆکی شاهەکەی کە دەیویست لەگەڵ شاهێکی ترا بجەنگێت، دوو سیخوڕی ناردە ناویان تا بزانێ کار و باری ئەم شاهە چۆن چۆنییە؟ یەکەم سیخوریان هاتەوە گوتی، شاهم دەتوانین لە دژیان بجەنگێین و بەسەریان دا زاڵ بین، چونکە گشتیان دامێن پیس و قومارچی و پارە پەرست و هیچ و پوچن. شاە پێیگوت، راست دەکەیت. ئەوەی دووەمیان هاتە ژوورەوە و گوتی، شاهم ئەوانە نەتەوەیێکی زۆر بەهێزن ئەوەندە شاهی خۆیان خۆشدەوێت ئەوەندە راست گۆن، جەنگاوەری بێ هاوتان و برواناکەم بە ئاسانی بەسەر کەوین. شاە پێیگوت، راستەکەیت. وەزیرەکە گوتی، شاهم تۆ بەهەردووکیانت گوت راست دەکەی

دەبێت یەکێکیان ڕاست بکات یەکێکیان درۆ بکات. شاە گوتی، نا کەسیان درۆ ناکەن، هەر یەکەیان لە دەرگایەکەوە چووەتە ژوورەوە.

سکالا گیان پاریسیش هەزار دەرگای هەیە. جگە لەمەش پاریسی ئیمڕۆ وەک بەغدای هارۆنە ڕەشیدی ئەوساکە وایە. تا ئێستاش عەلی بابا و سیندیباد، هەزار و یەک شەوەی بەغدا لە مێشکی پاریسییەکانا پەنگی خواردووەتەوە. وادەزانن تا ئیستاش شەهرەزاد لەبەردەمی سوڵتانا سەما دەکات. پاریس خاڵێکە لە سەر نەخشەی جیهان کە ڕۆژئاوا و ڕۆژهەڵات خەونی پێوە دەبینن. ئینجا بۆ ئەم خەڵکە پاریسی ئێستاکە بەغدای ئەوساکەیە.

هەرکەسەی بە ئامانجێکەوە دەگاتە پاریس. یەکێک دەگاتە پاریس خۆی بە زانستی نوێ دەوڵەمەند دەکات، ئەوی تریان هاتووە تا جزدانی پڕ لە پارەکات و بڕوات. ئەوی دیکەشیان لە سەمای شەهرەزاد دەگەڕێت لە تەنی کچێکی فەڕەنسی دا. کاتی خۆشی هەر شەهرەزاد بۆ باوە سوڵتانی بەغدا سەمای دەکرد. دەبا ئێستەش تەنیا سەما بۆ ئەلێکساندەری پاریس بکات. وەک گوتم خەڵکی لە شەهرەزاد دەگەڕێن لە تەنی کچێکی فەڕەنسی دا. وا دیارە ئەلێکساندەریش شەهرەزادی لە تەنی خۆی دا دۆزیوەتەوە.

- ئینجا ئەگەر هەر کوڕێکی کورد ژنێکی فەرەنسی بێنێت و هەر کچێکی کوردیش مێرد بە فەڕنسییەک بکات، بەم شێوەیە گشتمان لە نێو کۆمەڵگای فەرەنسی دەتوێینەوە. ئێمە هاتینە ئێرە تا خۆمان بە هێز کەین و بە توانایەکی ترەوە بگەڕێینەوە وڵاتەکەمان.

- ئەم بیرۆکەیەی تۆ بە بڕوای من بۆچوونێکی ڕاستە، چونکە ئێمە دەمانەوێت بە هێز و توانایەکی نوێوە بگەڕێینەوە کوردستان. جا بۆیە نابێت هێز و توانای کچێکی بچکۆلانەش لەدەست خۆمان بدەین. تا پێمان بکرێت دەبێت لە خۆمانیان نزیک کەینەوە، نەک پاڵیان پێوەنێین بەرەو خراپتر بچن و لە خۆمانیان دوورکەینەوە.

- دەبینیت هەر بۆ بەیانی هەموو کوردەکانی پاریس بەم هەواڵە دەزاننەوە. چونکە ئەم دوو دەم رووتە چۆن بە ئێمەیان ڕاگەیاند بەم شێوەیەش بە گشتیان ڕادەگەیێنن.

- ئینجا چی تیایە با گشتیان بزانن، خۆ یەکەم جار نییە کچە کورد لە کوردستان رەدوو دەکەوێت. ئینجا کوا کوردستان وەک جاران ماوەتەوە، با تەنیا چەند فلسێک بۆ کەس و کاری بنێرێتەوە، دەبینیت چۆن سوێند بە سەری دەخۆن.
- وا بزانم راست دەکەیت، بەڵام نامەوێت ئەم کچە بێتەوە ماڵی من.

****

پاش ماوەیەک، تەنیا وای لێهات بوو لەم خانووە مەزنە دا هەستی بە تەنیاییەکی بێ سنوور دەکرد. ئیتر دەیزانی کە هەموولایەک وازیان لێ هێناوە و ئیتر کەس نایەوێت قسەی لەگەڵ بکات. ئەو ئێوارەیە، پاش ئەوەی لە وەرزش هاتەوە، هەستی بە ماندوویەتی دەکرد و لە گیانی خۆی وەرس بوو بوو. یەکسەر بە شێوەیەکی نا ئاسایی، پانتۆڵە کاوبۆییەکەی داکەند و لە سەرشۆرکی ماڵەوە ئاوێکی بە خۆی داکرد. پەشتەماڵێکی سپی درێژی هەبوو لە خۆی وەرپێچا و لە سەر قەنەفە یەک نەفەرییەکەی بەرامبەر دەرگا سەری لە نێو ئەژنۆی خۆی ناو بێ جوله لە شوێنی خۆی چۆن هەڵتروکابوو بە هەمان شێوەش سڕ بوو، و خەو بردییەوە. وا دیار بوو تەنیا کە نەیدەویست بیر لە هیچ بکاتەوە، یان پەژارەیەکی مەزن لە یادبکات. کە جار بە جار وەک ژانێک لە ناخی دا پێچی دەخواردەوە. سەری لە نێو ئەژنۆی خۆی دەنا و لە کۆتایی و لە سەرەتای داوە ئاڵۆزەکە دەگەڕا کە هۆی سەرەکی پێچەکانی ئازاری لەشی بوون. وا ڕاهاتبوو کە کۆتایی پێچەکانی ژانی دەروونی خۆی بە چەند فرمێسکێک ئاو بدات. هەندێک جار ژانەکەی بە دوو ئەسرین ڕازی نەدەبوو، و لە دوو فرمێسکی سادە و ساکارەوە دەبوون بە هەنسک بێ گریان لە نێو گەرووی پەنگیان دەخواردەوە و دەکولان تا لە کانیی چاوەکانی دەبوون بە ئەشک و هەڵدەکولان. ئەم گریانە ئازاری دەرونی تەنیایان کەم دەکردەوە و ئازاری ئەژنۆشیان لە ناو دەبرد. ئەم جارەشیان بە هەمان شێوەی پێشوو دانیشت بوو، خۆی نەیدەزانی خەوی لێدەکەوێت، بەڵام وا دیار بوو هەموو کاتێک بەم شێوەیە خەوی لێدەکەوت.

ئەلێکساندەر هاتەوە ماڵەوە، دەرگای کردەوە دیتی تەنیا لە شوێنی خۆی خەوی لێکەوتووە. بۆیە بە ئەسپایی جلی خۆی گۆڕی و هات بەرامبەر تەنیا دانیشت. وا دیار بوو تەنیا لە خەوێکی قووڵدا بوو. ئەلێکساندەر کە سەیری دانیشتنەکەی تەنیای کرد یەکسەر ئیلهامی ئەوەی بۆ هات کە چەند وێنەیەکی تەنیا بەم جۆرە بگرێ. چەند وێنەیەکی گرت، دیتی کە تەنیا نووستووە چوو چەند چرایەکی هێنا تا بە جوانی تیشکەکان دابەش بکات. لە نکاوێک تەنیا بێدار بووەوە و سەیری ئەلێکساندەری کرد ئەوە خەریکی وێنە

گرتنە، یەکسەر خۆی داپۆشت و گوتی کورە ئەوە چی دەکەی؟ خۆ بەتەمانیت بەم شێوەیە وێنەم بگریت؟ ئەیەڕۆ خۆ هەر وێنەم دەگریێ. بە هەر شێوەیێک بێت نزیکەی بیست و چوار وێنەی گرت تا ئەو کاتەی کە فلیمەکەی تەواو بوو ئیتر لە وێنە گرتن وەستا. ئەلێکساندەر داوای لە تەنیا کرد کە بێتە هۆدەی وێنەگرتن، بەڵام تەنیا بە هیچ جۆرێک رازی نەبوو چونکە لای وابوو کە وێنەکانی گەلێک ناشیرین دەردەچن، بۆیە یەکسەر رایکردە بەر دەمی ئاوێنەکەی ناو دالآنی لای دەرگا و بە هەژمەتەوە سەیری خۆی کرد و هیچ لە خۆی رازی نەبوو. لە هەمان کات دا ئەلێکساندەر فلیمێکی تری خستە سەر کامیرەکەی و دیسان دەستی بە وێنە گرتن کردەوە. تەنیاش جارێک پشتی تێدەکرد و جارێک دەسوڕاوە و جارێک دادەهاتەوە و ئەویش وێنە لەسەر وێنە وێنەی دەگرت. ئەلێکساندەر لە دڵی خۆی دەیگوت لە بەیانییەوە خۆم ماندو دەکەم لەگەڵ ئەم کچە لینگ باریکانە، هەر حەیای دەربێ و سوخمەکانی منیان بردووە. من شەو نخونی دەکەم تا کەل و پەلم لەبەر رانێکی تۆزێک گۆشتن بکەم نەک لەبەر بتێکی لە ئێسک داڕێژراو. من چەند لە مێژە خەو بە ڕانێکی پتەوی وەک رانی تەنیایەوە دەبینم. هەر بەیانی ئەم فلیمانە دەشۆمەوە و بۆ هەفتەی بێتەوە لەسەر بەرگی یەکەمی گۆڤاری ELLE (گۆڤارێکی هەفتانەی ئافرەتانە)دەبێت بڵاو بکرێنەوە. ئەلێکساندەر بە تەنیای راگەیاند، کە ئەم وێنانە دەتوانن، نەک هەر لە فەرەنسا، بەڵکو لە هەموو جیهانی وێنە کێشانی نمایشکەران شۆڕشێک بەرپابکەن، چونکە تا ئێستەش هەر وا باوە کە کچی نمایشکەر دەبێت لاوازبێت و کچی لاوازیش ڕانەکانی وەک ئێسک و پێستە وایە. من زۆر لەمێژە هەستم بەوە کردووە کە کچی لینگ باریک سووی نێرینە ناکاتەوە. بەڵام ڕانێکی پتەو سەرنجی هەموو پیاوێک ڕادەکێشێت.

تەنیا تازە لە خەو هەڵسابوو، ئەم هەموو تیشکە و فلاش و هەرا هەرای ساشە و ئا... ئا ... ئەوها، ئێستە بسووڕێوە، ئینجا دانیشە، لە ئاوێنە سەیری خۆت بکە. تەنیا خۆشی نەیدەزانی بۆ بە قسەی دەکرد و بەگوێرەی خواستی ئەو هەڵسوکەوتی دەکرد.

ـ ساشه، تێناگەم بەم وێنانە بەتەمایت چەک بکڕیت تا شۆڕش بەرپا بکەیت؟
ـ تەنیا گیان، چەک لە مێشکی خۆت بێنە دەرەوە. چونکە چەک هەرگیز نەیتوانیوە شۆڕش بکات. چەک هەموو کاتێک تێکدەرە و هەزارەها خانووی رماندووە. لە تەمەنی چەکدا نەمان بیستووە توانیبێتی خانووێک بنیات بنێت. تفەنگ هەیە پیاوی کوشتووە تفەنگ هەیە تەقەی کردووە کەسی نەکوشتووە، تفەنگی واش هەیە یەک تەقەی پێنەکراوە. بەڵام ئەوە هیچ شتێک لە واتای تفەنگ ناگۆڕێ، چونکە بۆ کوشتن دروست کراوە. ئەوەی بۆ کوشتن دروست بکرێت هەرگیز ناتوانێت شۆڕشێک بەرپا بکات. هەر بیرێکی بتوانێت هەزارەها بیری تر بەرەو خۆی راکێشێت و بتوانێت شێوەی ژیان و پەیوەندی کۆمەلایەتی ئەم کۆمەڵگایە بگۆڕێت هەر وەها پەیوەندی مرۆ بە ئامرازی کارەوە بگۆڕێت دەتوانین ناوی لێ بنێین شۆڕش.
ـ ساشە گیان من نازانم تۆ بیر لە چی دەکەیتەوە، بەڵام من بیر لە هۆدەیەک دەکەمەوە تا دەستە خوشکەکانم بتوانن بێنە لام و پێکەوە دانیشین و بە کوردی قسەیان لەگەڵ بکەم، خواردنێکی کوردەواری خۆمان لێنێم و لە گەڵیان دانیشم و تۆزێک قسەی ژنان بکەین.
ـ ئینجا ئەگەر هەر بۆ ئەوەت بێت، ئەی ئێرە ماڵی خۆت نییە؟ بۆ نایانهێنیت بۆ ئێرە و لە گەڵیان دانشیت و قسەی ژنان بکەن. بۆ خواردنیش برۆ بۆ بازار و هەرچیت بە دڵ بێت بیکرە و لێینێ، ئیتر قسەت ما؟ ئەگەریش لە کردەوەی ئیمرۆکەم زوێر بوویت ئەوا داوای لێ بووردن دەکەم و بەڵێنت دەدەمێ جارێکی تر بێ خواستی تۆ من هیچ کارێک ناکەم، کە لەگەڵ هەست و نەستی تۆدا نەگونجێت. وا دیارە کردەوەی ئیمرۆکەم زۆر منالانە بوو، بۆیە لێم تورە بوویت؟ بەڵام پێش ئەوەی تۆ وەڵامم دەیتەوە من پێتدەڵێم، مرۆڤی داهێنەر هەموو کاتێک شتێک لە ژیانی دا کەمە و بەدوای دا وێڵ و سەرگەردانە. هونەرمەند بە باڵا مەزنە و هەڵس و کەوتی لە کردەوەی منالان دەکات. من چەند نموونەیەکت پێدەدەم: گەر نەقاشێک بەلای بەردێکا تێپەڕێت و لەم بەردە ناتاشراوە خامە دا لووتکەی داهێنان و شاکاری خۆی لە ناوی دا ببینێت، هەرگیز ناتوانێت سەرپێیی بەلای دا تێپەڕێت. بە پێچەوانەوە بۆی هەیە

داوای ڕەشماڵێک بکات و لە لای بخەوێت نەکا ئەم شاخە بەردە وەک چۆلەکەیەک بفڕێتە سەر شاخێکی تر. بۆی هەیە ئەم نموونەیە تۆزێک دژواربێت، با بڵێین ڕەسامێک تەختەیەکی ئامادە کردووە تا شاکارەکەی ناو مێشکی کە پەنگی خواردووەتەوە لە سەریدا بەرجەستە بکات. کە ڕەنگەکان و فڵچە و تەختە و بیر پێکەوە کۆ دەبنەوە، ئیتر وێنەکێش ناتوانێت چیتر خۆی لە پشت تەختەکە بشارێتەوە. گیانەکەم تۆ ئەو شاخە بەردەی گەر داتنەتاشم دەفڕێتە سەر شاخەکانی کوردستان، نا، نا وا دابنێ تۆ ئەو تەختە سپیەیت منیش وێنەکێشەکەم گەر شاکاری مێشکم نەهێنمە دی تۆش وەک هەزاران تەختەی وێنە لەسەر نەکێشراو بە بێ نرخ لە گۆشەی ماڵێکا بە هەمان شێوەی هەزاران ژنی تر ون دەبیت. ئاواتی من ئەوەیە تیشک بخەمە سەر ئەو نرخە ڕاسەقینەیەی کە خۆت نرخەکەی نازانیت. تەنیا گیان کلیلی کەلەپچەی دەستم لە سەر پەیڤێکی سەر زمانی تۆ وەستاوە. گەر دەستەکانم ئازاد کەیت ئەوا نرخ دەدەیتە بیری من. بیری منیش هەمووی لە نێو لەشی تۆ دا تواوەتەوە. گیانە تۆ واتێدەگەیت هەر کەسێک کە بەلات دا تێدەپەڕێت دەتبینێ و بە سەرنجێکی سەرپێی ڕوانین نرخت دەزانێت؟ تەنیا گیان کاتێک کاروانچییێک کە دەگاتە ئەو شاخە بەردەی کە ناوم برد، بۆی هەیە لە سایەی ئەم بەردە دانیشێ و خۆی لە تیشکی خۆر بپارێزێت. بە پێچەوانەوە نەقاشەکە ئەم بەردە دەداتە بەر چەکوچ و کوتک تا شاکاری خۆی لێدەردەهێنێت. تەنیا هونەر گیایێکی بێ ڕەگ نییە لە شوێنێکا بە گوێرەی خواستی خۆی بڕوێت. هونەر لە هەموو ماڵێکا، لە شەقام و چایخانەکانا هەیە، هەر کەسێک بەلای دا تێدەپەڕێت و هەستێکی سەرپێیی پێ دەکات، بەڵام کاری هونەرمەند ئەوەیە تیشک بخاتە سەر لایە شارراوەکانی ئەو بابەتەی  کە دەبێتە هەوێنی هونەر.

- تۆ دەڵێیت هونەرمەند وەک مناڵ وایە، لە ژیانی دا هەموو کاتێک هەست بە بۆشاییەک دەکات، بۆیە هەردەم وێڵ و سەرگەردانی پڕکردنەوەی ئەم بۆشاییانەیە. وابزانم تۆی مناڵ ئاسا دەتەوێت بۆشایەک لە بۆشاییەکانی ژیانت بەمن پڕکەیتەوە. ساشە تۆ وێنەی من وا بە ڕووتی پیشانی خەڵکی بدەیت، دووایی دەمهێنیت؟ یان وەک مناڵ یاریم پێ دەکەیت و لە دوایی دا

فرێم دەدەیتە سەر گوفگی بیرەوەرییەکانت. بە باوەڕی تۆ من نابم بە سۆزانییەک لە سۆزانییەکانی سەر شەقامی سان دێنی saint Denis.
- تۆ نرخی خۆت نازانیت تۆ سۆزانی نیت. تۆ هەوێنی هونەری منیت. ئاخ تەنیا گیان تۆ لە چی دەترسیت و من لە چی دەترسم. من دەترسم کە هەستت بە نرخی خۆت کرد لە دەستم بفریت. وەرە بەیانی مارەت دەکەم، هەرچەندە من ئیمانم بە مارەیی نییە، بەڵام گەر تۆ ئەوەت بوێت، بەسەر هەر دوو چاو، کورد گوتەنی (لە بەر خاتری خاتران دەچنە سەر دینی کافران).
- ساشە بڕوات بێت من هەرگیز بەجێت ناهێڵم، خوداوەندی گەورە گیانێکی ئافەرکرد و کردی بە دوو کەرتەوە ، بەشێکیانی دا بەمن و ئەوەی تریانی دا بە تۆ، ئەوا من بەشەکەی خۆمت پێشکەش دەکەم تا خوداوەند لێت رازیبێت. چونکە پێشی تۆ هیچ پیاوێک ئەولا و ئەولاشی ماچ نەکردووم، تۆ یەکەم و دوایین باخەوانی لەشی منیت.
هەر بەیانی تەلەفۆنی شیرین و ئەنگێلە و سکاڵا خان دەکەم تا بێنە ئاهەنگی مارەییمان، و لێیان دەپرسم بزانم کاتیان هەیە بێن بۆ کڕینی شت و مەک.
- تۆ بەس بانگیان بکە، من کارەکانی تر دەکەم. دەتبەم بۆ باشترین شوێن تا جلی بوکێنی هەڵبژێریت، من خۆم لە چێشتخانەیەکی گەورە بۆ میوانان شوێنێک ئامادە دەکەم.

****

پاش چەند هەفتەیەک بەیانی زوو تەنیا تەلیفۆنی ئەنگێلای کرد و ئەنگێلا گەلێکی پێ خۆش بوو کە تەنیا بەتەمایە شوو بکات. ئەنگێلا خۆی پێنەگیرا هەر لە تەلەفۆنەکە ئەملا و ئەولای تەنیای ماچ کرد و زۆر بە گەرمی پیرۆزبایی لێ کرد. تەنیا بە دڵپاکییەکی منالانەوە لە ئەنگێلای پرسی، خۆ کوردەکان لێم تورە نەبوون؟

- گوێمەدە قسەی خەڵکی، ئەوەی گرنگە با لە شوێنێک یەکتر ببینین.

وا دیار بوو ئازاد بە ئەنگێلای گوت بوو کە واز لە تەنیا نەهێنێت و پشتی بگرێت، نە کا بەرەو خراپی هەڵخلیسکێت. جگە لەمەش ئازاد دەیزانی کە ئەلێکساندەر دەستێکی باڵای لە نێو پارتی سۆسیالیست دا هەیە، بۆیە ئازاد دەیویست بۆ کاری سیاسی سوود لەم هەڵە وەرگرێت.

ئەنگێلا بە تەنیای راگەیاند کە کاک ئازاد زۆری پێخۆشە ببینێت، بۆیە تەنیا ئەوەندەی پێخۆش بوو، ئیتر لە خۆشیا نەیدەزانی چی بکات.

بە ئەنگێلای گوت:

- وەرە بۆ لام.

- ئیستە شیرین دێت بۆ لام ،بۆیە ناتوانم بێم بەڵام، ئەگەر بتەوێت دەتوانیت بێیت بۆ ماڵی من، شیرینیش زۆری پێ خۆش دەبێت بتبینێت.

بەم بۆنەیە تەنیا چوو کولیەکی (گاتۆ، کێک) گەورەی کڕی و بەرەو ماڵی ئەنگێلا بەڕێکەوت. شیرین کە بیستی تەنیا دێت بۆ لای ئەنگێلا، ئەو داوای لێبوردنی لە ئەنگێلا کرد و پێیڕاگەیاند گەر بە قسەی من بکەیت نایهێنیتە ماڵی خۆت، و لە هیچ شوێنێکیش ژووانی لەگەڵ دامەنێ خوانەخواستە یەکێک لەگەڵ ئەم سۆزانییە بتبینێت تۆش بە ئاگری ئەوەوە دەسوتێیت. ئەوەش هەر بەتەنیا باوەڕی من نییە، بەلکو سکاڵا خانیش وا بیر دەکاتەوە، دیارە ئەوە بیری کاک ئازادیشە.

شیرین گوتی:

- بە قسەی من بکە.

تەلەفۆنەکەی داخست. ئەنگێلا خۆی لەم قسانە گێل کرد و وەڵامی شیرینی نەداوە.

پاش ئەم گفت و گۆیە کورتە، ئەنگێلا لەبەر خۆیەوە دەیگوت ئێمەی ژن خۆمان دژی ئازادی خۆمانین و پیاوانیش تاوانبار دەکەین، ئازادیمان پێنابەخشن. هەر ژنەی زمانی لە زمانی مارێک درێژترە، ژەهرمان بۆ یەکتری لە ژەهری ماریش پیستر و کوشندە ترە. سەیرە، گەر سەیری جل و بەرگی سۆزانییەکانی چەرخی نۆزدەم بکەیت و بەراوردیان بکەیت بە جل و بەرگی کیژە بە ئابڕووەکانی چەرخی بیستەم، بێگومان سۆزانییەکان زۆر بە ئابڕوتر دەردەچن، بەڵام لە سەردەمی ئێستاکە دا سۆزانییەکان نازانن، چۆن خۆیان پیشان بدەن تاوەکو خۆیان گوایە لە ئافرەتە بە ئابڕووەکان جیاکەنەوە. بەم شێوەیە بووەتە کێبرکێیەکی بێچێژ لە نێوان هەردوو جۆرە ئافرەتەکە دا.

نازانم تەنیای بەستەزمان چی کردووە؟ تەنیا تاوانی تەنیاخان ئەوەیە کە دەیەوێت وەک هەر ژنێک چێژ لە ژنایەتی خۆی وەرگرێت. ئەوەی سەیرە، پیاو و ژنانی ئێمە روویان لە ئەورۆپا کردووە و دەیانەوێ هەر وەک جاری جارانیش لێخوڕن، واتا بژین و هیچ شتێک لە ژیانیانا نەگۆڕێت. کچەکانیان لەسەر دەستووری جاری جاران بە شووبدەن و کوڕەکانیان کچێکی کورد بهێنن و بە پەیمانێک ماڵەوادەی کچەکەش دەبێت بناسن. دەیانەوێت هەر وەک چۆن ئاغایە بێ زەوییەکانی خۆمان ژن لە خۆیان دەهێنن، ئەگەر لە بەرە باوکەوە ئاغا نەبن کچیان نادەنێ. ئینجا ئەم ئاغایە بێ زەوی و هەژارانە لەم جۆرە ژن هێنانە هەر نەخۆشی نەژادییان بۆ دەمێنێتەوە. لە کۆتایی دا ئێمەی بێ وڵاتیش بەتەماین لاسایی ئەو ئاغایە بێ زەویانە بکەینەوە.

لە وڵاتی ئێمەدا گشتمان وەک میلی کاتژمێر ئازادین. هەرگیز ناتوانین لەو بازنەی کە بۆمان داندراوە دەربچین. نە بازنەکەمان گەورەتر دەبێت نە بچوکتر دەبێتەوە، هەر کەسەشمان خاڵێکین لەسەر میلێک لە میلەکانی ئەم کاتژمێرە نەسرەوە. جا ئەگەر یەکێک جورئەتی ئەوەی هەبێت شوێن خاڵی خۆی ببەزێنێت، ئەوا لەسەر میلی کاتژمێرەکە دەکەوێتە خوارەوە و هەرگیز شوێنێکی تری لەسەر ئەم میلە دەستناکەوێتەوە.

لەم کاتەدا تەنیا لە دەرگای دا. ئەنگێلا یەکسەر بێ ئەوەی بڵێ کێیە دەرگای کردەوە و زۆر بە گەرمی پێشوازی لە تەنیا کرد و دایینیشاند. تەنیا چاوی گێڕا و گوتی:

ـ ئەی شیرین خان نەهاتووە؟

ئەنگێلا تێی گەیاند کە جارێ زۆر زووە، و تۆزێک کاتی دەوێت تا گشتیان بەوە رازی دەبن کە تۆ شوو بە یەکێک بکەیت کوردنەبێت جا بۆیە باوەڕ ناکەم ئیمڕۆکە شیرین بێت بۆ لام.

ـ ئەنگێلا من لە کەس توڕەنابم، من نامەوێت جارێکی تر لە نێوتانا بتوێمەوە، نە دەشمەوێت لە ناومدا بتوێنەوە، ئەوەی من لە ئێوەم دەوێت، نامەوێت سەیری ئێستاکەم بکەن، وەک رابردوو سەیرم بکەن و لەگەڵم بدوێن، چوونکە رابوردووی من ژیان و ژانی ئێوەیە. گەر دۆخی ئێستاکەم بە باوەڕی ئێوە شکستی بێت، دیارە شەکەستی ئێستاکەشم سەرەنجامی ژان و ئازارەکانی ئێوەیە. بۆیە تا دەتوانن چاو لە ئێستاکەم بپۆشن گەر ژان و شەرمی ئێوەشبێت. ژان و ئێش و ئازاری منالیم وای لێکردم ببمە شەرمی ئێستاکەی ئێوە. تا دوێنێکەش لە نێو کوردان من لە باوک و براییێک دەگەڕام کوردێک نەبوو ببێت بەباوک ببێت بە برا ئەلێکساندەر شوێنی هەردوکیانی گرتەوە. من ئامادەم ئەوەی شەرمتان پێیە بیسڕمەوە گەر نرخەکەی ژیانیشم بێت، بە پەیمانێک تێمبگەن. هەرچەند نازانم گۆڕی دایکم و باوکم و حەمەی برام لەکوێن، بەڵام لە گۆرستانێکی کوردستانا بمنێژن بۆنی باپیرانمی لێدێت. من لەم بڕوایەدام کە تێمناگەن، بۆیە بە گشتیان رابگەێنە کە من خۆشەویستی ئەلێکساندەر بۆ رازی بوونی ئێوە لەدەست خۆم نادەم.

زەنگی تەلەفۆن لێیدا:

ـ بەڵێ شیرین گیان ئەوە تۆی؟

شیرین دەمی کراوە:

ـ ئەنگێلا توخوا توخوا بڕۆ خووارەوە لای ماڵی خۆتان سەیری یەکەم بەرگی گۆڤاری ئێل ELLE بکە، یان بڕۆ ناو میترۆ دیوارەکانی میترۆ هەمویان بە

وێنەی ڕوت و بێشەرمی ئەم بێ ئابڕووە سۆزانییە داپۆشراون. ئەو سۆزانییەی کە هەمومان خۆشماندەویست و لەسەر چاوی خۆمان دانا بوو.
ئەنگێلا ئەم قسانەی زۆر پێناخۆش بوو بۆیە بە شیرینی گوت:
- ئەوەی من بزانم ELLE وێنەی سۆزانیان بڵاوناکاتەوە.
- دە ئێستە تۆ تۆزێک زەحمەت بکێشە و بڕۆ ناو میترۆ، هەموو شتێکت بۆ ڕووندەبێتەوە. ئینجا تەلیفۆنەکەی داناوە و گوتی چاوەڕێی تەلەفۆنی تۆ دەکەم.
- ئەرێ تەنیا گۆڤاری ELLE وێنەی تۆیان گرتووە؟ یان هیچ گفتوگۆیەکیان لەگەڵت سازداوە؟
تەنیا یەکسەر تێگەیشت مەسەلە چییە، یەکسەر سەری لە ناو دەستی خۆی ناو دەستی کرد بە گریان. هەرچەندە ئەنگێلا دەیویست بیدوێنێ و ئەم شتەی لەیادباتەوە. هەر چەند هەوڵی دا نەیدەتوانی ژێریکاتەوە. لە کۆتایی دا تەنیا هەموو شتێکی بێ پێچ و پەنا بۆ ئەنگێلا گێڕاوە.
ئەنگێلا گوتی:
- خوشکم تۆ خۆت لە دینیش مەکە و لە ئیمانیش مەکە، سواری کەر عەیبێکە و هاتنە خوارەوەش دوو عەیب. تازە تۆ کۆمەڵگای کوردت لە دەست چوو کۆمەڵگای فەرەنسیش لە دەست خۆت مەدە.
- ئەنگێلا من بێ تاوانم نازانیت چەند بە دڵ پێمخۆشە جارێکی تر وەک ئەوساکە کە تۆم ناسی لەگەڵتانا کۆبمەوە و دانیشم وابزانم ئەو ڕۆژانەش هەرگیز ناگەڕێنەوە. ئەو ڕۆژانەش بۆ من کەوتوونەتە ریزی دوایین ماچی دایکم. هەموو ڕۆژێک دایکم ماچی دەکردین و بەڕێی دەکردین و پێشوازی لێ دەکردینەوە، بەڵام بۆ هەموو ئەو ڕۆژانەم بە ئاستەم بەیاد دادێتەوە، بەڵام دوایین ماچی دایکم دوایین نیگای دایکم هەموو جیهان و کەلێنێکی لێ پڕ کردوومەتەوە. خودایە بۆ واتێدەگەم دایکم دەیزانی جارێکی تر نامبێنێتەوە؟ خودایە بۆ منیش وا تێدەگەم جارێکی تر کۆمەڵگای کورد نابینمەوە. خودایە گەر تۆ وەڵامت بۆ ئەم پرسیارە هەبێت، بەزەییەکت پێم دا بێتەوە.

ئاخ ئەنگێلا من ئاواتەکانم فێر دەکرد لە هوما بگەڕێن نەک هوما لێیان بگەڕێ، وەک هەنگ ئاسایی لە گوڵ بگەڕێن، نەک گوڵ لەوان بگەڕێت. بەڵام کوا ئێستاکە ئاواتەکانم لە کوێن؟ ئاواتەکانم وەک پەروانە یەکە یەکە خۆیان دەخەنە نێو ئەو مۆمەی کە دامگیرساند تا ڕێگام بۆ ڕەوشەنکاتەوە. من بەتەما نەبووم خۆم رووتکەمەوە، من دەمویست خۆم بدۆزمەوە و ببم بە ژن. ئێستاکە ئاواتەکانم سووتاند و لەسایەیان دا بووم بە ژن. لە بەر ڕۆشنایی سوتانی ئاوەتەکانم، ڕێگای ژیانم بە تاریک و نوتەکی دەبینم. زاری دەستی خەڵک شەش لایە، زاری دەستم بوو بە حەوت لا و بەیازێکی زێدەکرد. کە دەیانهاوێم دوو بەیازم بۆ دەردەچێ. ئەنگێلەخان وا تێنەگەیت من لە هوما دەگەڕام ببم بە شاژن، ئاواتم ئەوە بوو هوما بێت لەسەر شابەردێکی وڵاتەکەم بنشێتەوە. دەمویست هەموو کورد ئاسودەبێت. بەڵام داخی گرانم ئاسودەیی و کامەرانی و نەگبەتی پیاوانی نەتەوەکەم لە ژێر ناوکی ژنانە.

ئەنگێلا بە پێکەنینەوە قسەی بە تەنیا بڕی و گوتی:

- جێگای شادمانی ئێمەیە کە هەرگیز لەم شوێنە تێپەرناکات. تەنیا گیان زۆر سەیرم پێ دێت لە وڵاتەکەی ئێمەدا، ئەگەر ژن هەموو تەمەنی خۆی، خۆی بپارێزێت، خوانەخواستە بایەک کراسەکەی هەڵداتەوە ئێتر یەکسەر دەیکەن بە قەحپە وەک پەندەکەی خۆمان دەڵێ "قسە کەوتە زارەکی کەوتە شارەکی" ئینجا واتۆ "شائیعة" بڵاودەبێتەوە، باس و خواسی ئەم شارە لە دەرپێی ئەم ژنە هەژارە تێپەڕناکات، خوای دەکرد دوژمنان لایەکی کوردستانیان داگیر دەکرد. دەنگ و باسی کوردستان دەبێت بە دەنگ و باسی دووەم، چونکە دەنگ و باسی یەکەم ئابڕووی ئەم ژنەیە.

- ئەنگێلا گەر تۆ لە شوێنی من بوویتایە کەس ورتەی لێوە نەدەهات، چونکە تۆ دیانیت دەتوانیت مێرد بە ئەوروپاییەک بکەیت، خۆ کەس فزەی لێوەنایێت. بەڵام چونکە من دیاننیم بۆیە وا دەکەن.

- ئاخر وانییە، بە هەڵەدا چوویت، ئێمە لە ئێوە رەگەزپەرستترین، بە راستیش لە ئێوە خراپترین، چونکە واتێدەگەین ئێمە زمانی یەسوعمان پاراستووە،

دورمەبینە پاپای ڤاتیکانیش بەم مێردکردنە زۆر دڵشاد نەبێت. ئینجا خۆت بە مەغدور مەزانە، لە وڵاتی ئێمە دا کەس لەکەس باشتر نییە.
- ئەنگێلا تازە من تێچووم، "تیر لە کەوان دەرچوو ناگەڕێتەوە"، منیش لەگەڵ ئەم تیرەی کە هاوشتوومە دەڕۆم با بزانم بۆ کوێ دەچێ، تازە پەشیمانی دادم نادات. من تۆزێک ماندوم ئێستا دەگەڕێمەوەماڵەوە پێویستیم بە پشوێکی بچووک هەیە. ئەوەش ژمارەی تەلەفۆنی ماڵەوەمان. بەڵێنم بدەیە کە نایدەیت بە کەس. داوای لێبوردنت لێ دەکەم، چوونکە بۆ تۆ بووم بە هۆی تەنگ و چەڵەمە و سەخڵەتی.
ئەنگێلاش گەلێک دڵی داوە و گوتی:
- ئەوەندە رەشبین مەبە. تەنیا وتەکەی تۆ راستە تیر لە کەوان دەرچێت ناگەڕێتەوە بەڵام گەر ئامانجەکەت دیاری بکەیت، و رەشبین نەبیت و دەستت نەلەرزێت و ئامانجت بپێکیت، ئەوا سەرکەوتوو دەبیت. ئەگەریش سەرنەکەوتیت دەبیت بە بنێشتی نێو زاری خەلک و گاڵتەت پێ دەکەن. ئینجا بە قسەی خوشکی خۆت بکە، من ناڵێم پێت لە سەر مێردکردن دامەگرە، بەڵام مەیکە بە ئامانج، چونکە ئەم فەرەنسییانە ئەوەندە حولحولین، بە هیچ و خۆڕا یەکتر مارەدەکەن لەسەر دەرزیەک بەشەڕبێن لەیەک جیادەبنەوە. تۆ هەوڵبدە بزانە لە چی کەمە تا بۆی پڕکەیتەوە، بە مەرجێک ئەو کەلێنانەی کە بۆی پڕ دەکەیتەوە، دەبێت وای بکەیت کە بەم جۆرەی تۆ پڕی دەکەیتەوە بە یەکێکی تر پڕنەکرێتەوە.
- ئینجا ئەگەر مەخسەدت ناوجێیی بێت ئەو لەگەڵ هەزار کچ ناوجێیی کردووە هەر یەک لەو ژنانەی کە ئەو ناوجێیی لەگەڵیان دا کردووە، هەزار پیاوی تریان پێشی ئەو دیوە، ئینجا منێک کە ئەلێکساندەر یەکەم پیاوە لە ژیانم دا دەتەوێت وەک ئەو ژنانە ناوجێیی لەگەڵ دا بکەم؟
- تەنیا دیارە مەخسەدی من ناوجێیی نییە، چونکە ئەگەر ناوجێیی لەگەڵ تۆ بە دڵ نەبوایە ئەوا لە یەکەم شەو دا وازی لێ دەهێنایت. کە وابێت لە شتێکی تر بگەڕێ، بەڵام نەکەیت یەکسەر لێی بپرسیت لە چیت کەمە تا بۆتی پڕکەمەوە.

ـ ئەوەی من بزانم ئەو پێویستی بە نمایشکەرەکی پێشەنگایی هەیە کە بگونجێت لەگەڵ داهێنانەکانی. دەیەوێت بە یەکدیگیری پیشاندەر و داهێنانەکانی شۆڕشێک بەرپا بکات.
ـ ئاگات لە خۆتبێت نەبیت بە سووتەمەنی شۆڕشەکەی ئەو. چونکە کە دەبیت بە خۆڵەمێش کەس دڵی پێت ناسووتێت، ئەویش بە پەڕۆیەکی پیس فڕێتدەداتە دەرەوە.

تەنیا خوداحافیزی لە ئەنگێلا کرد و بەرەو ماڵەوە بە ڕێ کەوت. لە ناو میترۆ چاوی بە وێنەیەک کەوت کت و مت وێنەی خۆی بوو. بە هەر لایەک دا چووبایت ئەم وێنەیە بە بێ شەرم سەیری نێو چاوی دەکردیت. ئەو کچەی کە وەک تنۆکە ئاوێک بە خۆی دەچوو، بە دەرپێ و سوخمە و زەردەخەنەیەکەوە سەیری نێو چاوی خەڵکی دەکرد. تەنیا لە نێو خۆیدا دەکولا و نەیدەوێرا سەیری خەڵکەکە بکات و لە دڵی خۆی دا دەیگوت، لایان وایە پێدەکەنم. کە گوێی لە هەر پێکەنینێک بوایە وای دەزانی ئێستە بەدوای دەکەون. لە دالانەکانی نێو میترۆ دا رایدەکرد و لینگی تێک دەئالا و لە دڵی خۆیدا دەیگوت، دەشێ ساشەش پێم رانەبوێرێ؟ دەنگی پێکەنینی ئەویش بە دەنگی پێکەنینی ئەم پیاوانە نەچێت؟ دەبێت قاقای پێکەنینی ساشە لە دەنگی پێکەنینی پیاوی بۆگەن کە لە دۆڵی نێو مەمکەکانی ژنە سۆزانییەکان دەدەن پیستر نەبێت؟ نامەوێت چی تر نە گوێم لە دەنگی پێکەنینی پیاوەکانی ناو میترۆبێت نە لە پێکەنینیی ساشە بێت. دەبێت ساشەش وەک پیاوە بۆگەنەکان کە سەری سۆزانییەکان بە سینگی خۆیان دەکەن سەرم نە گرێ و لە نێو سنگی خۆی دانەنێ تا ئەوکاتەی من لەگریانم ماندوو دەبم. دوایی هێدی هێدی سەرم لەسەر ئەو سینگەی کە من لامولیە سنگی حەمەیە لابدات. پاش ئەوەی بێهێزی منی بەکارهێنا دەشێت وەک دەستەسڕی کاغەز خۆیم پێ نەسڕێتەوە. من وا دێتە بەرچاوم تا لە دەستی دێت بەکارم دێنێت دوایی پێشکەشی پیاوێکی بۆگەنم دەکات. کەی ئێسکم چیتر گۆشتیان پێوە نەما هەر گورگەی ئێسکەکانم فڕێ دەداتە بەردەم گورگێکی دیکە. دەشێ

ئەلێکساندەریش یەکێک بێت لەم گورگانە یان سەگی گورگانگاز نەبێت؟ دەنا بۆ وێنەی من بەم جۆرە بڵاودەکاتەوە؟ با بێتەوە بزانە چی پێدەکەم.

****

تەنیا گەیشتبووە نزیک ماڵی خۆیان، لەبەر ئەم بار و دۆخە ئاڵۆزە هیچ ئاگای لە خۆی نەبوو. لە خەیاڵی خۆی دا لەگەڵ خۆی و لە گەڵ ساشە بە شەڕ دەهات. ساشەش لە خۆشی بڵاو بوونەوەی وێنەکان ئەو سەرکەوتنە بێ وێنەیەی کە بەدەستی هێنابوو، چەند جارێک تەلەفۆنی ماڵەوەی کردبوو, بەڵام پێی نەکرابوو تانیا لە ماڵەوە بگرێت، بۆیە زووتر دەستی لە کار بەردابوو تا بێت و لەگەڵ تەنیا بیکات بە جەژنە. تەنیا هەر ئەوەندەی زانی یەکێک بەرامبەری هات و لە باوەشی کرد و گوتی:

ـ Félicitations تەنیا گیان پیرۆزباییت لێ دەکەم. تەنیا راچڵەکی و کە بە هۆش خۆی هاتەوە، خۆی لە باوەش ئەلێکساندەر دۆزییەوە. هەموو ئەو کینە و تورەییەی کە لە دەروونی دا پەنگی خوواردبووەوە، وەک گڕکانێک، وەک دەسەوسانی یەزدانی لە شوێنی خۆی دامرکاوە، لە جیاتی گڕ بوو بە سەهۆڵ و بە سینگی ئەلێکساندرەوە نووسا و دەستی کرد بە گریان، و بە کوردی پێی دەگوت حەمە بۆ رسوات کردم؟

یەکسەر ساشە تەنیای بردە قاوەخانەکەی لای ماڵی خۆیان سەری لەسەر شانی خۆی دانا و دەستی بەسەری دادەهێنا و بە دەستی خۆی چاوی دەسرییەوە و بە دەنگێکی نەرم دەیگوت، تەنیا گیان بە فەرەنسی یان بە ئینگلیزی پێمبڵێ بۆ وا دەگریت؟ خۆ کەس دڵی نەشکاندوویت؟ ئەم حەمەیە کێیە دڵی تۆی شکاندووە؟ تەنیا هەر دەم گۆرانیەکی کوردی لە بەر خۆی دەگوتەوە، وا دیار بوو ساشەش گۆرانیەکەی ئەزبەر کردبوو ، لەم کاتە ئەم گۆرانییەی بۆ تەنیا گوت، (دەمەگری مەگری چاوانت چووانە هەرچەند تۆ دەگریت ماڵم وێرانە). یەکسەر تەنیا دای لە قاقای پێکەنین چونکە ساشە وشە کوردییەکانی بە جوانی بۆ دەرنەدەهات هەموو (ر) دەکرد بە (غ) و (هە) دەکرد بە (ئە) و (چ) دەکرد بە (ش) بەم شێوەیە هەر تەنیا لە گۆرانییەکە دەگەیشت. ساشە بە تەنیای گوت تەنیا گیان نامەوێت بگریت، هەر چیت هەیە پێم بڵێ، دەهەڵسە بابچینەوە ماڵەوە. لە ئیمرۆ بەولاوە تۆ تەنیایەکەی جاری جاران نیت، تۆ تەنیاێکی تریت. من و تۆ دەرگای شۆڕشێکمان کردووەتەوە، هەرچەندە نازانم ئەم شۆڕشە بەرەو کوێمان دەبات، بەڵام دەزانم پەڕێکی

نوێ لە لەش و لاری نمایشکەران دەکەینەوە. لەم ڕۆژانە مامۆستایەک دێت بۆماڵەوە تا فێری چۆنیەتی ڕۆیشتنی نمایشکەرانت بکات. دەبێت بە زووترین کات فێری هەڵس و کەوتیانببیت، و فێری چۆنیەتی وەڵام دانەوەی ڕۆژنامەنووسانببیت. تەنیا گیان ئێمە دەبێت پێشی کات بکەوینەوە، ئەگینا کات لێمان دەباتەوە و دەیدۆڕێنین. ئەگەر ئەم جارەیان بیدۆڕێنیت ئیتر هەرگیز نایبەیتەوە. تەنیا گیان تۆ ئەو تاشە بەردەیت کە من دەمەوێت نەخشی ئەندێشەمت پێ بەرجەستەکەم. بەڵام سەرم سوڕماوە و نازانم لە کوێوە دەست پێ بکەم دەترسم خەونەکانم هەڵبزڕکێن، تاشە بەردەکە بە چەکوچی دەستی من بشکێت.

- ساشە گەر ڕاستگۆبیت، بڕواتبێت قەت جێتناهێڵم.

****

لەو کاتەی کە تەنیا پێشوازی لە جیهانێکی نوێ و ژیانێکی نوێی دەکرد. کوردەکان بە تەلەفۆن یەکتریان ئاگادار دەکردەوە کە چۆن کچێکی کورد لە دەستووری کوردەواری لایداوە. ئەم پاریسە مەزنە، نەخێر هەموو ئەورووپا بوو بە گوندێکی بچووک. لە نێو کوردان باس هەر باسی تەنیا بوو. یەک دەیگوت ئەم کچە بۆ وا خۆی دۆڕاند؟ ئەوی تریان دەیگوت کاکە بێ باوک و دایک گەورە بووە، هەر ئەوەی لێ دەردەچێت. هەر کاک ئازاد بە تووڕەییەوە بە کوردەکانی دەگوت:

ـ کێ هەیە نەچووبێتە مەلەوانی؟ گشتتان دەرپێیەکی کورت لەبەر خۆتان ناکەن؟ ژنەکانی کە لە تەکتانەوە مەلە دەکەن، هەر دەرپێ و سوخمەیەکیان لەبەر نییە؟ ئێوە دەڵێن ئەوانە فەرەنسین، ئەورووپاین، یان هەر لە ڕەگەزیانەوە بێ ئابڕوون بۆیە لێیان ناگیرێ. ئەی چەند کوڕی خۆمان هەیە ژنیان فەرەنسیە، ئەی ئەم ژنانە، من باسی شتی تر ناکەم، قەت مەلەیان نەکردووە؟ هەر تۆزێک شەرمتان هەبێت ئەگەر ئێوە ئەم کۆمەڵگایە بە کۆمەڵگایەکی پیس و بۆگەن و گەندەڵ دابنێن، ئەی بۆچی خۆتان لەپشت دەرپێی ژنەکانیان لە سەدام دەشارنەوە و لە لایان داوای پەناهەندەیی دەکەن؟

بەڵام ئازاد بە تەنیا لە تواناى دا نە بوو بیر و باوەڕی ئەم خەڵکە بگۆڕێ، تەنانەت نەیدەتوانی تەنیاش بانگ کاتە ماڵی خۆیان، چونکە دۆستە نزیکەکانی ئامادە نەبوون لەگەڵ کچێکی بەدووکەوتوو دانیشن.

وەک ئاسایی تەنیا ساڵی دووەمیش هەر لەسەر خوێندنی زمانی فەرەنسی بەردەوام بوو. ڕۆژێک نا ڕۆژێک دەچوو بۆ وەرزش، ڕۆژێک نا ڕۆژێکیش دەچوو بۆ دەرسی فێربوونی ڕۆیشتن و خۆپیشاندان و دانس و هەڵسوکەوتی ڕۆژانەی ئافرەتە بە ناوبانگەکان. بە گشتی تەنیا کاتی ئەوەی نەبوو سەری خۆی بخورێنێت. کە دەهاتەوە ماڵەوەش، ساشە دەرسی هەماهەنگی ڕەنگەکان و چۆنیەتی پۆشینی جل و بەرگی پێدەگوت. سەرەڕای ئەم هەموو ماندو بوونەش تەنیا هەر بیری لە دانیشتنەکانی ماڵی کاک ئازاد دەکردەوە. دەمێک بوو دەیویست تەلەفۆنی ئەنگێلا بکات، یان کاتی نەبوو یان دوودڵ بوو. هەر جارەی بە گەرمی دەهاتە لای تەلەفۆنەکەو لەنکاوێک

ساردده‌بووه‌وه‌. ئه‌م جاره‌یان بێ ئه‌وه‌ی بیر بکاته‌وه ته‌له‌فۆنه‌که‌ی هه‌ڵگرت و ته‌له‌فۆنی ئه‌نگێلای کرد. ئه‌نگێلا ته‌نیای بانگ کرده ماڵه‌وه‌. بارانێک بوو ده‌تگوت کونده‌ی سه‌ر به‌ره‌و ژێره‌. دونیا گه‌لێک سارد بوو. ته‌نیا ته‌له‌فۆنی بۆ ته‌کسی کرد و به ته‌کسی چوو بۆ لای ئه‌نگێلا. له دڵی خۆی دا ده‌یگوت ئه‌مجاره‌یان ده‌بێت بچمه فێرگه‌ی ئۆتۆمۆبیل لێخوڕین، ده‌نا بۆم ده‌رناهێنێ هه‌موو جارێک ته‌کسی بگرم. بۆیه بێ بیرکردنه‌وه که گه‌یشته ماڵی ئه‌نگێلا پێی گوت ئه‌گه‌ر فێرگه‌یه‌کی باش بناسیت ده‌چم له‌وێ فێری ئۆتۆمۆبیل هاژۆتن ده‌بم. ئه‌نگێلاش پێی گوت به‌خوا منیش پێم خۆشه فێری ترومبێل لێخوڕین ببم، به‌ڵام تا ئێستا جورئه‌تی ئه‌وه‌م نه‌کردووه ناوی خۆم له فێرگه‌یه‌ک بنووسم. ئه‌گه‌ر وابێت وه‌ره پێکه‌وه ناوی خۆمان بنووسین. با بزانم به‌یانی یان دووبه‌یانی له براده‌ره‌کانم ده‌پرسم کام فێرگه باشه تا بچین و ناوی خۆمانی تیا بنووسین. بۆ ئێواره‌که‌ی که ساشه هاته‌وه ماڵه‌وه‌، ته‌نیا پێی راگه‌یاند که به‌ته‌مایه له‌گه‌ڵ ئه‌نگێلا ناوی خۆیان له فێرگه‌یه‌کی هاژۆتن بنووسن. ساشه‌ش گه‌لێکی پێخۆش بوو، گوتی:

ـ ئا...ئا من وام گه‌ره‌که‌، که خۆت بڕیاری ئه‌و شتانه بده‌یت که به پێویستی ده‌زانیت. من دوستێکی نزیکم هه‌یه خاوه‌نی فێرگه‌یه‌کی هاژۆتنی زۆر باشه‌. هه‌ر به‌یانی ده‌تبه‌م بۆ لای.

ـ ئه‌ی ئه‌نگێلا؟

ـ من نه‌مگوتووه ئه‌نگێلا نه‌یت، با به‌یانی کاتژمێری هه‌ژده‌ی ته‌واو بێته ماڵمان لێره‌وه هه‌رسێکمان پێکه‌وه ده‌چین بۆ لای نێکۆلای براده‌رم. ئێسته زووکه من دوو تکێتی تیاترم کڕیوه با زوو شتێکی سه‌رپێی بخۆین و خۆمان بگۆڕین و کات له ده‌ستی خۆمان نه‌ده‌ین تا له قاوه‌خانه‌که‌ی ناو تیاتر قاوه‌یه‌ک یان به‌سته‌ڵه‌کێک بخۆین.

ته‌نیاش ده‌یویست که‌سایه‌تی خۆی بسه‌پێنێت به‌سه‌ر ساشه‌دا، بۆیه به نادڵییه‌وه به ساشه‌ی گوت:

ـ ئێنجا خۆ لێرانه ده‌توانین قاوه‌ی خۆمان بخۆینه‌وه‌، بۆ بچین به ده جار گرانتر له وێ قاوه بخۆینه‌وه‌؟ خۆ ئه‌و پاره‌یه‌مان نه‌دۆزیوه‌ته‌وه‌. ئه‌وا من هه‌ر

لە بەیانییەوە تۆ نابینم تا ئێوارە تا دوو فلس پەیدابکەیت. ئای بەزیای خێرم نەکرد بۆ وا سەیرم دەکەیت؟ ئەی وا نییە؟

ـ گیانەکەم قسەکانت شەکرن، بەڵام نامەوێت ئەم سەرە بچکۆلانەی خۆت بە بژێوی ژیان بێشێنیت. با زوو پارچە نانێک بە کەرە بخۆین، چونکە ئەگەر زۆر بخۆین دوایی لە تیاتر خەوماندێت، ناشیرین تر شت ئەوەیە لە تیاتر باوێشکت بێتێ. ئەگەر خوانەخواستە باوێشکت هاتێ دەبێت وابکەیت کە کەس هەست بە باوێشکت نەکات.

بە شێوەیەکی گشتی زۆر لە خاوەنکارەکان و پیاوە دەوڵەمەندەکان لە قاوەخانەی تیاتر دادەنیشن، شوێنێکی پایە بەرزە بۆ پێکگەیشتن زۆر جار گەورە ئەکتەرەکانیش هەر لەوێ پێکدەگەن. ساشەش هەر بیری لەوە دەکردەوە کە لەم شوێنە بە رێککەوت ئەکتەرێکی گەورە ببینێ و ئەویش لە تەک کچێکی جوان خۆی پیشانی کۆمەڵگای بەرزی فەڕەنسی بدات. کە گەیشتنە قاوەخانەکە بە دەردی خۆمان دەڵێین قاوەخانەکە مۆنجەی دەهات. بە هەر جۆرێک بێت شوێنێکیان دۆزییەوە و دانیشتن، و خەریکی وت و وێژی خۆیان بوون. ئەوەی لای تەنیا گرنگ بوو چۆن بەیانی بچێت و لە فێرگەی هاژۆتن ناوی خۆی بنووسێت. لە خەیاڵی خۆی دا دەیگوت ئەمجارەیان گەر خودا ئاسانی کات و بچمەوە کوردستان منداڵانی گەڕکی خۆمان بەڕێز سواری ئۆتۆمبیل دەکەم. هەر لەبەر خۆشییەوە دەیگوت تا دەچمەوە منداڵەکانی گەڕەکی خۆمان گشتیان گەورە دەبن. هەر لەم خەیاڵانە زەردەخەنەی دەهاتێ و جاروبار سەیری ساشەی دەکرد و بە دەنگێکی نزم پێدەکەنی کە ئەوەش ئەوەندەی تر تەنیای جوان تر کردبوو.

لە سەر مێزەکەی تەک مێزی تەنیا و ساشە چوار پیاوی قەیرەی بەخۆوەی تێر و تەسەل دانیشتبوون. ئەوەی بزانم لە گەڵ ئەلێکساندەر یەکتریان باش دەناسی بەڵام وا پێدەچوو بەینیان زۆر خۆش نەبێت. ئەم پیاوانە خەریکی گۆڕینەوەی بیر و باوەڕی خۆیان بوون و هەر مشت و مڕیان بوو. لە نکاوێک سەرنجی تەنیا کەوتە سەر ئەو پیاوانە کە ساشە بە تی چاو و بە ناحەزیەکی شاردراوە سەیری دەکردن. وا دیار بوو ئەم پیاوانە

دەمێک بوو تەنیا سەرنجی راکێشا بوون. بەڵام تەنیا کە سەیریانی دەکرد و گوێی لێیان رادەگرت لە دڵی خۆیا دەیگوت ئێستا باوکم مابوایە بە یەکێک لەم پیاوانە دەچوو، چونکە وا بزانم باوکیشم هەر لە تەمەنی ئەم پیاوانەدا دەبوو. ساشە چاوی لەسەر تەنیا هەڵنەدەبڕی، لە لایەک وا دیار بوو کە کەوتووەتە داوی خۆشەویستی تەنیاوە، لە لایەکی ترەوە ئەوەی من بزانم نەیدەویست چاوی بە چاوی پیاوەکانی تەک خۆی بکەوێت. جێگای سەرسوڕمانە لە نکاوێک هەر چواریان بە دوو ڕوویەکی پاریسیانەوە روویان لە ساشە کرد و لە هێکڕا وتیان Alexandre Danton زۆر دڵشادین بە دیتنت، ئەوە چییە وا پێدەچێت کارت ئەوەندە زۆربێت ئیتر کەس ناتبینێت. ئەلێکساندر هەستی بەوە کرد بوو کە دەبێت شتێک لە مەیدانابێت، دەنا ئەوانە قەت بەم شێوەیە چاک و خۆشی لەگەڵ کەس ناکەن. یەکسەر داوای شەش شەمپانیایان کرد و پەرداخەکانیان لێک دا بە بۆنەی پێکگەیشتنێکی شاد. ساشە چاوی لە تەنیا کرد تا دەم لە شەمپانیاکە نەدات; یەکەم شت دەیزانی کە تەنیا لە تەمەنیا شەرابی نەخواردووەتەوە. دووەم شت ئامانجی ئەم شەمپانیایە دیار نییە. سێیەم شت پێش چوار مانگ دەبوایە لە گەڵ ساشە کۆنتراتێت مۆر بکەن بۆ دروینی هەندێک جلی مێژوویی، بەڵام ئەم هەڵەیان دا بە یەکێکی تر. بۆیە ئەلێکساندر زۆر بەم شەمپانیایە دڵشاد نەبوو. ئەو پیاوانە باش لە زەردەخەنەی یەکتری دەگەیشتن بۆیە یەکسەر لە زەردەخەنە دووڕوییەکەی ساشە گەیشتن و گوتیان میسیۆ دانتۆن بە راستی ئێمە زۆر بێ سەروبەرین هەر چوارمان باش دەزانین کە تۆ تۆزێک دڵت لێمان شکاوە، بە راستی تۆ لە سەر هەقیت. ئەم شەمپانیایەشمان هەر بۆ ئەوەیە تا چیتر تۆ دڵت لێمان نەشکێت. ئێستەش ئێمە فلیمێکمان بەدەستەوەیە؛ ئەکتەرەکە دەبێت بەم کیژۆڵە ناسکەی بەرامبەرت بچێت. ئەلێکساندەر گوتی:

- ئەمە خێزانمە.

- ئینجا چی تیایە گەر ببێت بە پاڵەوانی فلیمەکەی ئێمە؟

- ئاخر من یان بەڕاستی شەریکەکەمان پەیمانێکی سێ ملیۆنیمان لەگەڵیا مۆر کردووە، کە بۆ ماوەی ساڵێک لەگەڵ هیچ دەستەیەکی تر کار نەکات.

- میسیۆ دانتۆن گەر خێزانەکەتمان پێ بناسێنیت زۆر دڵشاد دەبین.
ساشە پێی گوتن تەنیای خێزانی خۆمتان پێ دەناسێنم. هەر چوواریان بە ڕێزە دەستی تەنیایان ماچ کرد. تەنیا سەری سوڕما بوو لەم باس و خوواسە، بەڵام نەیدەزانی چی ڕوودەدات. تەنانەت ئەو وشانەی بەکاریشیان دەهێنا بەو فەڕنسییەی ئەو نەدەچوون. بە زەردەخەنەیەکی دڵپاکانەی منالانەوە سەیری ساشەی دەکرد. بە تایبەتیش هەستی پێ کردبوو ئەوا بەشی زۆری خەڵکەکە سالۆنی چاوەروانی و قاوەخانەکەیان جێدەهێشت و بەرەو هۆڵی شانۆگەری دەڕۆیشتن، ئەویش ناوە ناوە سەیری ساشەی دەکرد تا زوو لە وت و وێژی خۆی بێتەوە و بچنە هۆڵی شانۆ گەریەکە.
پیاوێکیان گوتی:
- باشە سێ ملیۆن و نیو بۆ تۆ سێ ملیۆن و نیویش بۆ تەنیای خێزانت.
ساشە زۆری پێخۆش بوو، بەڵام وەک هەردەم خۆی بە گران نیشان دەدا.
- باشە ئێوە سیناریۆی فلیمەکەمان بدەنێ سەیری دەکەین ئەگەر بە دڵمان بێت ئەوا بە زووترین کات وڵامتان دەدەینەوە.
پیاوەکان تۆقەیان لەگەڵ یەکدیدا کرد و هەر چووار دەستی تەنیایان ماچ کردەوە.

تەنیا لە ساشەی پرسی ئەرێ ئەم پیاوانە کێن ئەوەندە تۆیان خۆشدەوێت و تۆ وەک بزانم حەز لە چارەیان ناکەیت. تەنیا گیان کە لە تیاتر هاتینە دەرەوە و گەیشتینەوەماڵەوە بە دوور و درێژی باسی وت و وێژی ئیمشۆکەت بۆ دەکەم. لە ماڵەوە ساشە بە ڕێکوپێکی هەموو شتەکانی بۆ تەنیا گێڕاوە و تێی گەیاند ئەم هەڵەی کە بۆ تەنیا هەڵکەوتووە هەزارەها ئەکتەر چاوەڕێی هەڵێکی لەم جۆرەن بیقۆزنەوە. بەڵام با پەلە نەکەین، بەیانیش سیناریۆکەمان بۆ دەنێرن، ئەگەر فلیمێکی هیچ و پوچ بێت و بەرزت نەکاتەوە نامانەوێت. تەنیا بە ساشەی گوت سێ ملیۆن و نیو فرەنگ و نەمانەوێت؟ ئەگەر ئەم پارەیە ڕەتکەینەوە بە ڕاستی مێشکم قەبوڵی ناکات. ساشە بە تەنیای وت ئێمە بەتەمانین ڕەتی کەینەوە بەڵام ئەگەر فلیمەکە فلیمێکی سەکسی بوو دەیکەیت؟ تەنیا هیمای ڕەتکردنەوەی وەک منالێک پیشانی

ساشه دەدا و هاواری کرد نا، نا ،نا نایکەم، گەر دە ئەوەندەشم پێ بدەن. کە وا بێت بە قسەی من بکە ناهێلم زەرەرمەند بیت.

بەیانی کاتژمێری هەژدە ئەنگێلا لە ژێرەوە لە زەنگی دەرگای ماڵی تەنیای دا. تەنیا دەرگای بۆ کردەوە و ئەنگێلاش وەک خۆی ئاسایی جلێکی رێک و پێکی جوانی لەبەر کرد بوو هاتە ژورەوە. تەنیا دەستی لە ملی کرد و هێنایە ساڵۆنەکەوە و داینیشاند. بۆخۆشی چوو قاوەیەکی ئامادە کرد و پارچەیەک کولی لە نێو قاپێک کردبوو و لە بەردەم ئەنگێلای دانا.

ئەنگێلا پێکەنی گوتی:

ـ ئەم کولییە هەڵگرەوە من کولیچەم بۆ هێناویت. تەنیا لە خۆشی کولیچە ئەوەندەی نەمابوو قاوەکەی لە دەست بڕژێت. بەزەیی خودا گەورەیە و قاوەکە نەڕژا. لەم کاتە دا ساشە دەرگای کردەوە و هاتە ژورەوە. تەنیا گورج وەک سوێسکە بەرەو پیلی چوو. ساشە گیان ئەوە ئەنگێلای دەستەخوشکمە. ساشەش دەستی ئەنگێلای ماچ کرد و گوتی فەرموو دانیشەوە. من هەر لە دوورەوە ناوی تۆم دەبیست، ئەوا بە دڵێکی پڕ کامەرانییەوە لە نزیکەوە بە دیداری بەڕێزتان شاد بووم.

ئەنگێلاش، پێی ڕاگەیاند کە تەنیا ئەوەندە باسی ئێوەی بۆ کردووم، لام وایە ئەوا سەردەمێکە یەکتر دەناسین. پاش گۆڕینەوەی ئەم گفت و گۆیانە، ساشە دانیشت و تەنیا قاوە و کولیچەی لە بەردەمی دانا و گوتی ئەم کولیچەیە ئەنگێلا بە تایبەتی بۆ تۆی کردووە. ساشە لە ئەنگێلای پرسی کە ئێستاکە چی دەکات ئەویش گوتی خەریکی خوێندنی بەرزە، چونکە لە عێراق مامۆستای زمانی ئینگلیزی بووە و لێرەش لەسەر هونەری وەرگێڕی "تەرجومە" کار دەکات. ساشە گەلێکی پێخۆش بوو گوتی ئەگەر وابێت عەرەبییەکی باشیش دەزانیت. لە وەڵام دا گوتی ئەی چۆن؟ لە عێراق دانیشتگا تەواو بکەیت و عەرەبی نەزانیت چۆن دەبێت؟ ئەنگێلا چەندمانگێک بوو خاچێکی بچووکی لە مل دەکرد. ئەم خاچە سەرنجی ساشەی راکێشا و گوتی وا دیارە تۆ موسولمان نیت؟ ئەویش گوتی باوک و دایکم مەسیحین. بەڵام ئایینی من یەکسانی کۆمەڵایەتییە. ئەی ئەم خاچە جوانە چییە لە ملتە؟ بڕوام پێناکەیت

گەر پێت بڵێم لەم ڕۆژانە دۆزیومەتەوە و زێڕە و لە ملمی دەکەم. ساشە گوتی، بەڵام ناوەکەشت پێم دەڵێت تۆ دیانیت. ئەنگێلا گوتی من کلدانم. ئەگەروابێت سریانیش دەزانیت. ئەی چۆن نایزانم خۆی کلدانی و ئاسوری زمانیان سریانییە. وا دیار بوو ساشە لە مێژ بوو لە یەکێکی وا دەگەڕا و ئەوا خۆی بە پێی خۆی هاتووەتە بەر دەستی، ئەوانە گرنگ نین ئێستاکە چۆن دەژیت؟ ئەنگێلا گوتی تا ماوەی شەش مانگی تریش ترسم نییە ئەوا حکومەت پارەم دەداتێ ئینجا نازانم دەتوانم بورسەکەم(bourse) "ئەو برە پارەیەی کە بە خوێندکارانی دەدەن پێی دەڵێن بورس" درێژ کەمەوە یان نا. هەر بە پێکەنینەوەش گوتی ئەوا بەتەمام فێری ئۆتۆمۆبیل هاژۆتنبم، کە پارەکەم نەما کاری تەکسی لێخوڕین دەکەم. ساشە گوتی تۆ پێنج زمان دەزانیت و بەتەمایت کاری تەکسی بکەیت؟ ئەگەر تۆ فەرنسی بوویتایە ئەوا وەزارەتی دەرەوە لە باڵوێزخانەیەک کاری بۆت دەدۆزییەوە. بەڵام چی بکەین ئێوەی خەڵکی کوردستان گەلێک بێبەخت و بێکەسن. گەر ڕازیبیت من کارێکم هەیە کە لەگەڵ زانیارییەکانی تۆ دەگونجێن، ئەویش ئیمڕۆکە کارمەندی پەیوەندی دەرەوەی شەریکەکەمان کە هەر ئینگلیزی دەزانی، کارێکی تری دۆزیوەتەوە دەڵێت پارەم لەوێ زیاتر دەدەنێ، بۆیە لێرە تا دوو مانگی تر جێمان دەهێڵێت. ئینجا ئەگەر ڕازی بیت ئەم دوو مانگە هەم کار و هەم فێر بوون وەرە لە بەیانییەوە دەست پێ بکە. بە تایبەتی بەیانی بازرگانێکی گەورەی مەسیحی لوبنانی دێت بۆ لامان، ئەوەی لەسەرت دەبێت ئەوەیە کە بە عەرەبی و بە سریانی قسەی لەگەڵ بکە. جارێ تۆ باسی چی دەکەیت بیکە، بەڵام باسی بازرگانی لەگەڵ مەکە. چونکە ئەم کابرایە تاجرێکە کەس پێی ناوێرێت. ئەگەر بتوانین هەندێک کوتاڵی پێ بفرۆشین با سودیشی لێ وەرنەگرین هەر قازانجمانە. چونکە لە لوبنان نەناسراوین. ئەگەر لە لوبنان بناسرێین ئەوا لایەنێکی بازاڕی ڕۆژهەڵاتمان دەکەوێتە دەست.

یەکسەر هەڵسان و هەر لە نزیک ماڵی خۆیان ساشە هەردووکیانی برد بۆ لای نیکۆلا کە دۆستی منالی ساشە بووە. نیکۆلا تۆقەی لەگەڵ کردن و هەریەکەی ئیزبارەیەکی دانێ و گوتی دەبێت پڕیکەنەوە. گوتی هیوادارم کە

زوو فێرگەکەی ئێمە تەواو بکەن، چونکە ئامانجی ئێمە سەرکەوتنە نەک پارە. ئینجا ئەگەر ئامانجی ئێمەتان بە دڵ بێت، هەر لە بەیانییەوە دەتوانن دەوام بکەن. لە یادتان نەچێت لە ماڵەوە سەیرێکی ئاوێنە بکەن و تۆزێک چێژ لە جوانی خۆتان وەرگرن چونکە ئەگەر ئۆتۆمۆبیل بە خراپی بهاژۆن بۆیهەیە بە روداوێک ئەم جوانییەتان لەدەست بدەن. باشە تا بەیانی. ساشە پارەی تەواوی هەردوکیانی بە تێکڕایی دا بە نیکۆلا. هەرسێکیان پێکەوە هاتنە دەرەوە. ئەنگێلا گوتی میسیۆ دانتۆن ببورە ئێستە من چێکم "cheque" پێ نییە چێکت بدەمێ، هەر بەیانی چێکەکە دەدەم بە تەنیا بۆتانی بێنێت. من زۆر مەمنونی ئێوەم. ئەنگێلا تۆ وەرە بۆ دەوام دووایی قسەی لێوە دەکەین.

## دەرگای پێنجەم

### ئەستێرە لە شوێنی خۆی ترازا دەرژێ

ئێوارە بوو ئازاد و سکالاّ لە ماڵەوە پێکەوە دانیشتبوون سەیری دەنگ و باسی TV۲ کاتژمێری هەشتی ئێوارەیان دەکرد. دیسان پۆلیسی فەرەنسی چەند بیانییەکی بێ ناسنامەیان گرتووە. حووکمەت بەتەمایە بیانێرێتەوە وڵاتی خۆیان. ئەوە رێکخراوە مرۆڤ دۆستەکانی فەرەنسی چواردەوری بیانییەکانیان گرتووە تا پۆلیس نەتوانێت بیانگوازێتەوە بۆ شوێنێکی تر. واتا بۆ ئوتێلی فرۆکەخانە کە لەوێوەش بە ئاسانی دەتوانن سواری فرۆکەیانکەن و بیاننێرنەوە وڵاتی خۆیان. رێکخراوە ئینسانییەکان دەیانەوێت ئەم بێ پاسپۆرتانە لە ژێر چاودێری خۆیان بهێلنەوە. نەکا پۆلیس بە دزی رێکخراوە مرۆڤییەکان، ئەم بەستەزمانانە سواری فرۆکەکەن و بیاننێرنەوە.

- ئەرێ ئازاد پێمناڵێیت ئەم رەش و رووتە بۆ روو لە فەرەنسا دەکەن؟

- کێ دەڵێ گشتیان رەش و رووتن بۆی هەیە هەندێکیان وەک من و تۆ بڕوانامەی بەرزیان پێبێت.... سکالاّ چی بچێنیت ئەوە دەدرویتەوە، سەیرکە ئەوانەی کە دەیانبینیت وەک فەرەنسی بە فەرنسی دەدوێن، ئەوانە زمانی فەرەنسی لە زمانی زگماکی خۆیان باشتر دەزانن. ئەوە دوو سەد ساڵە ئەوانە فەرەنسین، و فەرەنسا لە سەر پشتی ئەوانە بوو بەم فەرەنسایەی کە ئیمرۆکە تۆ دەیناسیت.

- ئازاد گیان ئەی فەرەنسا پێویستی بە دەستی کار نییە؟

- سکالاّ گیان، هەر کارگەیەک بە گوێرەی رەواجی کۆتاڵەکانی گەورە دەبێت، یان بچوک دەبێتەوە. گەورەبوون و بچوکبوونەوەی کارگەکان بەستراونەتەوە بە تەنگوچەڵەمەی ئابوری جیهانەوە. ئینجا کارگە چەند گەورەبێت ئەوەندە پێویستی بە کرێکار دەبێت. لە کاتی بچوکبونەوەشی دا پێویستی بە دەستی کرێکار نامێنێت، نەک کرێکاری نوێ بەڵکو کرێکارەکانی خۆشی دەردەکات.

هەر لەبەر ئەوەشە ئێستا فەرەنسا بێگانەکان دەنێرێتەوە وڵاتەکانی خۆیان. بۆ ئاگاداریشت چەند خەڵک لە کار دەربکرێن دەسەڵات ئەوەندە پێویستی بە زیادەکردنی دامودەزگای پۆلیسی زیاد دەکات؛ تا دەرکراوەکان دەمکوت بکات.

ئا سکاڵا گیان بڵی ئیمرۆکە کێم دیوە؟

- دەی دیسان مەیکە بە یاری و مەتەڵ، بڵێ کێت دیوە و ببڕێتەوە.

- ئیمرۆ کاک سالار هات بۆ لام و گوتی.

- بە خوا چەند رۆژە دەمەوێت تەلەفۆنت بۆ بکەم، بەڵام هەر بۆم هەڵنەدەکەوت. خەبەرێکی خۆشم پێیە.

- دەی کاک سالار لۆتۆت Loto بۆ دەرنەچووبێت؟

- کورە نا لە کوردستان پێشمەرگە بووین، لێرە بەتەمام ببم بە پێشدەرگە.

- چۆن؟

- لە دابەش کردنی رۆژنامەی واتۆیەکان (دیعایە) و لە ئێشکچی شەوان ماندوو بووم. هەر لە بەیانییەوە دەچووم تا ئێواە ئینجا پێڕانەدەگەیشتم، بۆیە بڕیارم دا لە کارێکی تر بگەڕێم. لە دائیرەی کار لێیان پرسیم لە ژیانت دا چ کارە بووی. گوتم پێشمەرگە بووم لەم کارەش بەولاوە هیچ کارێکی تر نازانم. فەرمانبەرەکە کچێکی لاو بوو سەیری، کردم گوتی وابزانم کارێکم هەیە زۆر بە دڵت دەبێت. منیش هیچ وەڵامم نەداوە خۆی گوتی، رێکخراوێک هەیە کە خەڵکی ناسراو و بە ناوبانگ دەپارێزن، گەر پێت خۆشبێت من دەتنێرم بۆ لایان و تۆ خۆت برۆ لە گەڵیانا بدوێ، یان نامەیەکیان بۆ بنوسە واتا CV. ئەوان خۆیان وەڵامت دەدەنەوە. من خۆم پێنە گیرا پێمگوت تەلەفۆنیان بۆ بکە ئێستە دەچم. ئیتر یەکسەر چوومە لایان و بە ئاسانی قبوڵیان کردم.

- هەر باشە ئەگەر پارەکەی باشتر بێت.

- پارەکەی عەیبی نییە، لە سەرەتا دا هەر وەک کاری ئێستاکەم وەردەگرم، جگە لەمەش بۆ ماوەی مانگێک راهێنانی خۆیان هەیە فێرم دەکەن. بە قسەی ئەوان ئێمەی پێشمەرگە پیاو کوژین، بەڵام کاری ئەوان پیاو کوشتن نییە، بەڵکو پاراستنی گیانە. منیش پێم گوت ئێمە پیاو کوژنین. بەڕێوەبەرەکەیان

گوتی گەر لەگەڵ ئێمە کار بکەیت، ئێمە سیاسەت ناکەین. چەپڕەوەکان پێمان بڵێن، ڕاستڕەوە توندڕەوەکان بڵێن، سۆزانییەکان پێمان بڵێن بمان پارێزن دەیان پارێزین. من بۆ نموونە پێت دەڵێم، پێرێ شەو ڕاستڕەوەکان داوایان لێ کردین و چوین تا بە ئاسوودەیی کاری خۆیان بکەن. دوێنێ شەو نێرەمێینەکان (حیز) داوایان لێکردین کە بیان پارێزین. ڕاسرەوەکان هێرشیان کردە سەریان، ئێمەش هێرشەکەمان پوچکردەوە.

سالار پێی گوتم، منیش بە پێکەنین پێم گوت پەندێکی کوردی هەیە دەڵێ (کێ مێردی دایکم بێت ئەو باوکمە). ئەویش پێی گوتم :

- ئەم پەندە پەندێکی ڕاستە ئێمەش بەم شێوەیە دەیگۆڕین، کێ پارەمان پێ بدات ئەو باوکمانە.

ئینجا سالار بە پێکەنینەوە پێیگوتم :

- ئیتر کاک ئازاد; پێشمەرگایەتی فت، بیر و باوەڕ فت.

- سکاڵا گوتی :

- بە ڕاست لە یادم نەبوو ئیمڕۆکە کاک سالار نیوەڕۆ بوو تەلیفۆنی بۆ کردی، منیش پێم گوت کە نیوەڕووان تۆ لە ماڵەوە نان ناخۆیت؛ بۆیە هاتووەتە دوکانەکەت. وا بزانم دڵیم شکاند.

- چۆن؟

- کاک سالار ویستی تەلیفۆنەکە دانێتەوە پاش ئەوەی زانی کە تۆ لە ماڵەوە نیت. - چییە ناتەوێت قسەم لەگەڵ بکەی؟

- نا بە خوا هەر خوشکی گەورەی منیت.

- بە پێکەنینەوە گوتم، دەی دەی تەمەنی دەقیانوست هەیە هێشتاش بە من دەڵێیت خوشکی گەورە، من بە کچی کچت دەشێم نەک بە خوشکی بچووکت.

- خۆزیا وا بوایە، ئەوساکە من لە سەر گۆی زەمین دەبووم بە شادترین مرۆڤ.

تێگەیشتم هەڵەیەکی گەورەم کرد کە نەدەبوو بیکەم.

ئازاد گوتی :

- دەرروونی هەر یەکەمان لە شوێنێکەوە بریندارە کە نزیک ترین دۆست پێی نازانێت. ئەمریکییەکان چەند ساڵێک لە ڤێتنام جەنگان هەندێکیان شێت بوون و ئەوی تریان بوون بە پیاو کوژ و ئەوەی تریان بە کش و ماتی لە ماڵی خۆیانا گۆشەگیر بوون، پەیوەندیان بە هیچەوە نەما. ئێمە لە نێو جەنگ دا لە دایک بووین و لە نێو ئاشوبێکی گەورەدا مەزن بووین. هیچ ماڵێک نەما ئاگری نەپرژێتێ و گۆشەیەکی لێ نەسوتێ. ئینجا چۆن دەتانەوێت دەروونمان بریندارنەبێت؟

دەمێکی باش سکاڵا مات بوو ئینجا بە دەنگێکی بەرز گوتی :

- منیش ویستم رێچکەی وت و وێژەکە بگۆرم، بۆیە بە کاک سالارم گوت، نازانم یەکێتی و پارتی چییانە، لە ژێر ناوی پێشکەوتوو خواز و پاشکەوتوو خواز، ئەوا هەموورۆژێکی خودا دایناوە شەریانە بەرد بە بەرد کۆلان بە کۆلانی کوردستان بەش دەکەن. ئینجا نازانم ئەوە کوردستان خۆی پێنج پارچەیە، دەیکەن بە چەند پارچەی تر؟

- کچێ جارێ چیت دیوە گەر دەسەلاتیان هەبێت هەریەکەی شارێک داگیر دەکات و حووکمەتێکی لێ دادەمەزرێنێ، ئینجا لەولاتر چی دەبێت با ببێت.

- قورِ بە سەر کورد.

- وا دیارە جارێ زووە زۆربەی کورد تا ئێستەش نەگەیشتوونەتە پلەی نەتەوە. سەرکردەکانیش زیرەکانە لە سەر پێشکەوتوو و پاشکەوتوو و دەرەبەگ و بەرجوازی یاری دەکەن.

- من دەترسم، سەرکردەکانیش نەزانن سەری ئەم پەتە لە کوێیە. یارییان پێ بکەن و وەک داشی دامە بیانهێنن و بیانبەن. بڕواتبێت خۆشیان نازانن چی دەکەن.

- بە خوا خۆیان دەزانن چی دەکەن، ئەوە رەش و رووتەکەیە نازانێت ئەوان چی دەکەن و چییان لە بن سەرە. بڵێ کردارێکی زیرەکانە نییە دەڵێم بەڵێ، کورد گۆتەنی کالا بەقەدەر بالا. لەم نەتەوەیە هەر ئەم سەرکردانە هەڵدەکەون. ئەوەی کە تۆزێک زیرەک بێت و بناسرێت ئەوا لە شەڕی برا

کوژی بە کوشتی دەدەن و وەک داشی دامە دەیانگۆڕنەوە. ئەگەر شەڕی براکوژییان نەکردایە ئەوا کوردستانیان ئازاد دەکرد.
- سکالاّ بە ئازادی گوت:
- ئەی بۆ بانگت نەکردە ماڵەوە؟
- سکالاّ گیان بە چاوی تۆ پێم گوت ئەی ئێستا کەی دەتوانین بتبینینەوە؟
گوتی، جارێ نازانم; چونکە ڕۆژی هەشت سەعات دەرسمان دەدەن فێرمان دەکەن، چۆن هەڵس و کەوت بکەین لەگەڵ ئەو ڕوداوانەی کە دەکرێ ڕوو بدەن، ئەوەی بیزانم لە بەیانییەوە تا ئێوارەیە. ئینجا دوایی نازانم چۆن چۆنی دەبێت. من هاتوومەتە لات لێتبپرسم ئەم کارە بکەم یان نا؟
- ئینجا کاکی خۆم بۆ نایکەیت، هەرنەبێت مانگێک دوو مانگ دەرست پێ دەڵێن. دە بڕۆ هەرنەبێت شتێک فێر دەبیت، ئینجا دووایی خوا کەریمە، لەم دوو مانگە تێدەگەیت کارەکە چییە. خۆی بە باوەڕی من کۆمەڵگا دەبێت هەموو توێژێکی تیابێت و هەر توێژەش دەبێت پارێزراوبێت، تا خۆی خۆی دەگۆڕێت یان لەنێو توێژێکی تردا دەتوێتەوە. من وابزانم لە هەر کۆمەڵگایەکدا گرنگ ئەوەیە کە نەهێلین هیچ توێژێک بە زۆرداری توێژێکی تر لەناو ببات. لە کاتی خۆی چەند چینێکی دژ بە یەک و چەند توێژێکی جییاواز لە نێو کۆمەڵگا دا هەبوون. ئەم چین و توێژانە نە بێ یەکتر دەیان توانی، نە لە نێو یەکتری دا دەتوانەوە. بۆ نموونە جووتیارێک نەدەبوو بە ئاغا و ئاغاش نەدەبوو بە شاە. بەم شێوەیە دژایەتییەکە هەماهەنگیەکی وای وەرگرت بوو هەموو لایەک پێی ڕازی بوون. کەچی ئیمرۆکە کرێکارێک دەتوانێت ببێت بە سەرمایەدار، سەرمایەدارێک یان کرێکارێک دەتوانێت ببێت بە سەرۆک کۆمار. وەک دەبینیت هاوسەنگییەکەی جاران کاری پێناکرێت. بە باوەڕی من لەم سەردەمەدا شۆڕشیش دادمان نادات. هەر چۆن لەسەردەمی کۆیلەتی ئامانجی کۆیلە ئەوە بوو خۆی ئازاد کات و خۆی ببێت بە خاوەن کۆیلە. لەم سەردەمەشدا هەرچی دەکەین، دەبین بە سەرمایەدار، تا دەوڵەتە سۆسیالیستەکانیش دەوڵەتی سەرمایەداری بوون. ئیمڕۆکە هاوسەنگییێکی نەگۆر هەیە کە ئەویش; ١- سەرمایە. ٢- کارگە یان کۆمپانیا. ٣- کار. ٤-

بەرهەم. ٥ـ کڕیار. سەردەمی ئێمە سەردەمی سەرمایەدارییە ئەم سەردەمەش بێ چینی کرێکار و بێ سەرمایە ناتوانێت لە ئارادا بمێنێت. تا ئەم پێنج کوچکەیە هەبێت سەرمایەداری لە ئارادایە. بۆی هەیە لایەکی ئەم پێنج کوچکەیە بکەوێتە ناو کێشەیەکی مەزنەوە، بەڵام ئەوە ئەوە ناگەێنێت کە سەرمایەداری لە ناودەبات، چونکە لایەنەکانی تر لایەنی پێنجەمی گرفتەکە پڕ دەکەنەوە، و جارێکی دیکەش بەرزی دەکەنەوە. بۆیە جارێ کاتی شۆڕش نەهاتووە و بە شۆڕشیش ئەم گرفتە شینابێتەوە.

ـ کاک ئازاد گیر و گرفتی من نە خەباتی چینایەتییە نە دژایەتی چینەکانی کۆمەڵگای فەرەنسییە. من دەمەوێت رای تۆ وەرگرم کار بکەم؛ ئا یان نەء؟

ـ گەر بە قسەی من بکەیت بڕۆ کار بکە هەرنەبێت شتێک فێر دەبیت، ئەوەش هەر باشە بەدەردی دەڵێن موویەک لە بەراز بێتەوە.

****

ماوەیەکی دوور و درێژ بوو سکاڵا ئاگای لە دەنگ و باسی شیرین نەمابوو. بۆیە سکاڵا خۆی پێ نەگیرا و چوو بۆ ماڵی شیرین. شیرین دەستی لە ملی کرد. سکاڵا پێیراگەیاند کە زۆر لێی توورەیە، دڵی لێی شکاوە، چونکە ئەوە چەند ڕۆژە بێ دەنگ و باس خۆی ون کردووە. ئەویش بۆی روون کردەوە کە کارێکی دۆزیوەتەوە هەموو بەیانییان زوو، لە شەشی بەیانییەوە تا نۆی بەیانی دەچێت چەند نووسینگەیەک پاک دەکاتەوە، پاش کارەکەشی دەچێت بۆ زانکۆ. سوێندی بۆ سکاڵا دەخوارد کە هەموو ڕۆژێک لە کات ژمێری چواری بەیانییەوە لە خەو هەڵدەستێ تا کاتژمێری پێنجی بەیانی بە یەکەم میترۆ رابگات تا سەعات شەش بگاتە سەر کار. بە قسەی خۆی، بڕوا بەوە ناکات کە چۆن دەگاتەوە ماڵەوە و بە پەلە پەل شتێک ئامادە دەکات و دەیخوات یان هەندێک جار هەیە، بێ خواردن سەر ئەنێتەوە و ئەخەوێ. دەیگوت سکاڵا بۆ خۆت دەزانیت من لە تەمەنما لە کوردستان ماڵی خۆمانم پاک نەکردبووەوە، ئەوە لێرە فێر بووم ئەم هۆدە بچکۆلانەیەی خۆم پاکەوەکەم. ئینجا وەرە دوو کاتژمێری تەواو نووسینگەی خەڵکی تر پاککەیتەوە چیت بەسەر دێت؟ ئەوەی باوەڕی بە جادوش نەبێت دەمی توووک و دوعای دەکرێتەوە. هەندێک جار بیر دەکەمەوە، با وا دابنێم ئەم مانگە نان و ئاو بخۆم، بە خۆم دەڵێم ئەی چۆن کرێی خانوی ئەم مانگە دەدەیت؟

- کچێ شیرین هەزار پیاو دەستت ماچ دەکەن، بۆ شوو ناکەیت؟ کچێکی وەک تۆ جوان چاوەڕێی چی دەکەیت؟ چییە چاوەڕێی شاسوارێک دەکەیت بێت و کڕنۆشت بۆ ببات؟ دە کچێ زوو خۆت لەکۆڵکەوە. بە خوا پیاو ئەوەندە پیسن پاش چەند ساڵێکی تر هەزار بەڵگەنامەی بەرزیشت هەبێت کەس ناتهێنێ. شیرین پیاو دیپلۆم ناهێنن، پیاو ژن دەهێنن وەک ژن نەک وەک مێشک و زیرەکی. ئینجا بۆیە گوێ لە خوشکی گەورەی خۆت بگرە، و زوو خۆت دابینکە.

- سکاڵا گیان کێ بێت پێی خۆشنەبێت شوویەکی چاک بکات و بچێتە ڕێگای خۆی. بەڵام بەساقە ئێرە هەمووی دە، پانزە کوردی لێ نییە، بە پێکەنینەوە

گوتی لەوانەش چێنەر و سەپانیان لێ فتکە، دای لە قاقای پێکەنین مەگەر مێرد بە ئەبوونە بکەم دەنا لەکوێ مێردێکی باش بدۆزمەوە؟ خۆ وێنەی خۆشم لە ئەڵمانیا و سوید و بەریتانیا بڵاو ناکەمەوە. جاڕ بدەم پیاوینە وەرن شیرین ببینن، شیرین لە شوو دەگەڕێت. ئەوەش خۆت دەزانیت بە کەس ناکرێت. کە دەڵێیت پیاو لە ئافرەتی زیرەک ناگەڕێن، قسەکەت ڕاستە، بەڵام بەشی زۆری ئەم پیاوانە دەبەنگن و من لە یەزدان دەپاڕێمەوە کە دوژمنم نەزان نەبێت هەرگیز نەزان یارم نەبن، ئینجا گەر دەبەنگێک مێردم بێت چیم بەسەر دێت؟

- ئینجا ئەوەی تۆ بێنێت، ئەی چیت دەوێت ژنێکی جوانی دەبێت. و بە قسەی تۆ بێت بەشی زۆری پیاوان دەبەنگن و هەمووشیان ژنیان هەیە. باوکمان و برایەکانمان یەک لەم پیاوانەن، ئینجا دەبا ئێمەش یەکێک بین لەم ئافرەتانە. بۆ ئێمە خۆمان لە ئافرەتانی تر بە زیرەک تر بزانین؟ خوشکۆڵە ئاگات لە خۆت بێت پاش جەنگی ئێران و عێراق و شەڕی براکوژی نێوان حیزبە کوردستانییەکان پیاو کەم بونەتەوە. ئەوەی پیاوێک بەلای دابێت بە نینۆک دەبێت بیگرێت، تا لەدەستی دەرنەچێت، تۆش پیاوی دونیا دڵخوازتن. تا ژنیش ئێرەیی بە جوانی تۆ دەبەن. نازانم بۆ خۆت وا لالوت کردووە بۆ خوێندنێکی هیچ و پوچ. ئەوە سەد کەس هەیە مێردیشیان هەیە و دوکتۆرا دەکەن. نازانم بۆ هەر خوا لە تۆی گۆڕیوە.

- دە سکاڵا خان تۆ واز لە شوو کردن بێنە. من فەرەنسام بە ڤیکتۆر هیگۆوە خۆشویست. پاش ناسینی ڤیکتۆر هیگۆ و بەلزاک و ئەلێکساندەر دوما و..... بە ئەدەبی فەڕەنسی ئاشنا بووم شادییەک لە ناخم دا زا. لەم شەوانە پەرتوکەکەی دیدرۆم دەخوێندەوە وەک خەوێک دیدرۆ بە غەمگینی هاتە بەر چاوم. گوتم ئەی گەورە ئەدیبی فەرەنسا ئەی کەڵە پیاو بۆچ غەمگینیت؟ نەمدەزانی ئەم کەڵە پیاوە نە پێدەکەنێت نە دەگریەت. گوتی ئەی بێگانەی پرچ ڕەش. چۆن من دەتوانم کامەرانبم. لە وڵاتەکەم ئازاری هەزاران ئاوارەی وەک تۆ دەبینم. گوتم من زادەیی خاکم و لە هیچ لایەکەوە نە هاتووم. من لەبەر خۆشەویستی نووسەری وەک تۆ رووم لە وڵاتەکەی تۆ کرد. هەر بە هۆی ئەم خۆشەویستییەش دەتوێمەوە و هێدی هێدی دەبم بە لمی بیابان.

ئاواتم ئەوە بوو ببم بە دارێکی بەبەر و لەژێر سێبەری ئەڤینی پەیڤی تۆ دا بژیم. وڵاتەکەشت پرشنگی خۆی دەدات بەو کەسانەی کە سەیوانیان بەدەستەوەیە و منەتیان بە تیشکی ئەو نییە.

سکاڵا تۆ واتێدەگەیت من هاتم بۆ فەرەنسا تا شوو بکەم، راستییەکەی من هاتم تا هەموو بەیانیەک چاوم بە وێژەی فەرەنسی بشۆم. تا لە کوردستان هەڵگر و باڵوێزی ئەم وێژەیەبم. من وامدەزانی گشت فەرەنسا وەک نووسەرە گەورەکانیان مرۆڤدۆستن. وامدەزانی سەیری زانینت دەکەن، نەک سەیری ڕەنگت دەکەن و ئینجا هەڵتدەسەنگێنن. وام دەزانی هەریەکێکیان فەیلەسووف و وێژە دۆست و مێژوزانێکە. نەمزانی چاو چنۆکن، چاوەڕێی دەرفەتێکن بیقۆزنەوە، دەیانەوێت لەسەر ئەوانە بژین کە لە وڵاتی خۆیان دەربەدەرن.

ـ ئەوکەسانەی وڵاتەکەیان فڕێیاندەدات، وەک بڵێیت سروشت وای گەرەکە. هەندێک ئافریدە لە نێو دەریا دەژین، لە نیشتمانی خۆیانا دەژین، ئەوانەی کە دەریا قبوڵیان ناکات لەسەر ئافریدەکانی نێو دەریا دەژین. خۆ تۆش بەتەما نیت لەسەر میللەتی فەرەنسی بژیت، جا چی تیایە تا خوێندنەکەت تەواو دەکەیت کارێکیش بکەیت. کاریش هیچ لە مرۆڤ کەم ناکاتەوە.

ـ سکاڵا خان تا تێمبگەیت من وامدەزانی فەڕەنسا بۆ من وەک کوردستان خۆشەویست دەبێت بەڵام فەڕەنسا ئەو فەڕەنسایە نەبوو کە لە ئەندێشەی من دا پەنگی خواردبووەوە. ئیتر فەرەنسا ناتوانێت بکەوێتە ناو دڵم.

سکاڵا ڕۆژێک لەماڵی خۆمان بێ پەژارە دانیشتبووم. بێ لەدەرگادان سەگە بەعسییەکان بە ماڵمانەوە وەربوون. وەک سەگ ئاسا هەموو شتێکیان بۆن دەکرد سەیری هەموو شتێکیان دەکرد. دەرپێی ناو دۆلابەکانیان بۆن دەکرد تا بزانن بۆنی باڕودی لێ دێت. هیچیان نەدۆزییەوە، کاکمیان گرت. پاش چوار مانگ گوتیان تاوان بارە و لە سێدارە دەدرێ. من و براژنم و برازایە سێ مانگەکەم بە تەنیا و بە بێ کەس ڕووبەڕوی ڕەشەبا و زریانی کوشندە بووینەوە. سەرکەوتی ئامۆزام کچێکی خۆش دەویست براکانی جاش بوون ئەویش چەکی لەگەڵیان هەڵگرتبوو. برایە بچوکەکەم عەسکەری فیرار

بوو. منیش تازە زانکۆم تەواو کردبوو. چونکە بەعسی نەبووم دانەمەزرابووم. ئەو شەوەی کە کاکم لە سێدارە دەدرا تا بەیانی نەخەوتین. کاکم وای دانابوو ناو لە کوڕەکەی بنێت ئاشتی. ئەم شەوە براژنم سوێندی خوارد ناوی دەگۆڕێت و ناوی لێ دەنێت تۆڵە. براژنم تا بەیانی لایە لایەی بۆ دەکرد

| | |
|---|---|
| لایە لایە کۆرپەی شرینم لایە | لەمێژە کەس بەلامان دا نایە |
| تۆڵە بخەوە دەنگی دەفێک دێ | لە دەنگی زەنگی فریشتان دەچێ |
| یا گوێچکەی منە و دەبێ بزرنگێ | یان هاواری تۆ بۆ ئاسمان دەچێ |
| ڕۆلە دەنگێک لە دوورەوە دێ | ئەی کوڕی شەهید خەوت لێکەوێ |
| کۆچی باوکی تۆ زۆری پێ ناچێ | تیرێژی گیانی لە نێو ڕۆژ هەڵدێ |
| وەک گەردەلوولێک لەوێ هەڵدەستێ | جڵەوی کاروانی شەهیدان دەگرێ |
| بە ئالآی تۆڵەوە لە نێو ڕۆژ هەڵدێ | شمشێری ڕەوا لە مستی دەگرێ |
| فەرمانی خوا یە و شەهید نامرێ | چییە، دەنگی کلیل لە دەرگاوە بێ |
| لای خودا چییە باوکت بێتەوە | کلیلی دەرگا بسووڕێتەوە |
| چرای شادیمان هەڵگیرسێتەوە | ئێش و ئازارمان لەیاد چێتەوە |
| ڕۆلە لایلایە، کۆرپەم لایلایێ | ڕۆڵە پێم بڵێ بۆچ خەوت نایێ |
| ڕۆلەم بخەوە دەنگی دەرگادێ | باوکی شیرینت بەرەو پیلم دێ |

- کچێ شیرین گیان چی بووە ئەوەندە ڕەشبینیت. تەنگ و چەڵەمە دێت و دەڕوات، پاشی هەورازان نشێو دێ.

- پاشی هەورازان کەندەڵانە و کەوتنە ناو دۆڵیش مردنە. لە بەد بەختێکی وەک ئێمە بەولاوە کێ ئاواتی مردن بۆ خۆی دەخوازێ. تۆ لەو باوڕە دایت ئەوەی خەڵکی تر دەشکێنێتەوە پێی خۆشبێت، خۆشی وەک ئەوان بشکێننەوە؟ لەم ڕۆژانە سەرقاڵی سڕینەوەی هەندێک شت بووم. ئەو ژنەی کە لە مەکتەبەکە کاری دەکرد بەر لە کاتی خۆی هات و خاوەن کارەکەی ئێمەش، گوتی مەدام دەتوانیت لە سەر مێزەکەی خۆت کار بکەی سەیرکە پاکە یان نا؟ ژنەش بێ ئەوەی سەیربکات بە لووت بەرزییەکەوە گوتی من نازانم من لە تەمەنما

پارچە پەڕۆکم بەدەستەوە نەگرتووە تا شوێنێک پاککەمەوە. بۆیە هەر جۆرێک بێت تۆ بەرپرسیاریت لە پاک و خاوێنی نووسینگەکەم. گەرمێزەکەم پاک بێت ئەم کارەکەرە دەتوانێت کار بکات گەر پیس بێت ئەوا ئەو کارەکەرەی ئەم کارەی کردووە لە کار دەرکە. سکالاَ دەزانیت مردنم لا خۆش تر بوو لەوەی کە گوێم لێبێت ژنێکی بێ مێشکی لووت درێژی دەم کلۆش و رەقوتەق و ئێسک گران بە من... بە من... بە من... بڵێت کارەکەر. ئەم ڕستەیە بەسە تا دەریا و بیابان لێک جیاکاتەوە، ئاگری کینە لە دەروونما هەڵگیرسێنێت کە بە ئاوی دەریایەک نەکوژێتەوە.

- کچێ گوێ مەدەیێ هەزار شتی وا دێن و دەڕۆن، فەرەنسا هەر وڵاتی مرۆڤدۆستییە (هومانیزم) وڵاتی دیدرۆ، سارتەر، ئێمیل زۆلا و مۆنتیسکۆیە. دوای ئەمەش فەرەنسا وڵاتی (برایەتی و یەکسانی و ئازادییە)

- سکالا پەندێکی رووسی هەیە دەڵێ هەرکەسەی باسی ئەو شوێنەی دەکات کە دەییەشێت. واتا هەرکەسەی باسی دەردی خۆی دەکات. دەردی فەرەنساش دیارە کە دەردی زۆرداری و بێدادییە; بۆیە گەورەپیاوانی لە مرۆڤدۆستی دەکۆڵنەوە، ئەوەش هەرگیز ئەوە نابەخشێت کە فەرەنسا مرۆڤدۆستە. هەر وەک چۆن مارکس و هیتلەر هیچ پەیوەندیەکی هیزرییان پێکەوە نییە، ئەگەر چی هەردووکیان ئەڵمانن. بۆیە پێت دەڵێم وێژەی راستی رەنگدانەوەی ژان و شادی ئەو گەلەیە کە نووسەر لەسەر ئاوێنەیەکی بێگەرد دا پێشکەشی مرۆڤایەتی دەکات. هوونەر وەک تیشکێک وایە لە نێو جەرگەی تاریکی دا کە دەکەوێتە سەر شوێنێک، ئەو شوێنە رەوشەن دەکاتەوە. راستی دەخاتە سەر ئاوێنەیەکی وەک هەسان، بە گوێرەی قووڵی هونەرەکە سێبەر لە سەر ئەم شوێنە لادەدات واتا لەسەر ئەو گرفتە لادەدات کە تیشکی هونەری ئاراستە کراوە، چونکە هەر کەسێک لایەنەکی راستی دەبینێت. بەڵام هونەری راستی تیشک دەخاتە سەر جەرگی راستی. کە وا بوو هونەر ئەوە ناگەێنێت کە راستی نیشان بدات، یان دووپاتی کاتەوە نە ئەودیوی راستی شیکاتەوە، بەڵکو وەستایی و لێهاتوویی و زانایی هونەرمەند چۆنیەتی ئاراستە کردنی تیشکی هونەرە، بۆ سەر ئەو شوێنە تاریکانەی کە لە بەشی زۆری خەڵکی

شاردراونەتەوە. بۆ نموونە لە کۆمەڵگایەکی بێ داد دا هەموو کەسێک دەزانێت کە بێ دادی هەیە. گرینگ ئەوەیە کە بتوانیت ئەو خاڵە بدۆزیتەوە کە زەبری ئەم بێدادییە لەسەر خەڵکی نەهێڵێت یان هەرنەبێت کەمی کاتەوە. هەر بۆیەش فەرەنسا خاوەنی ئەم جۆرە نووسەرانەیە.

کە باسی "برایەتی، یەکسانی و ئازادی" دەکەیت، ئەوەش بنێشتێکی گەڵێک کۆنە، هەر دەیجوون و دەیجوونەوە. ئەوە دروشمی شۆڕشی فەرەنسییە، وەرە سەیرکە، بابزانین چی زیادی هێناوەتە سەر دروشمی ئیسلام "موسوڵمانان برای یەکن، خودا لە قورئان دا دەفەرموێ "ئێمە ئێوەمان لە سەر شێوەی نەتەوە و خێڵ ئافریدەکرد تا بە یەکتر ئاشنابن، پایە بەرزیتان لای خودا پەیوەندە بە پەرواتان" (فەرمودەی خوداوەندی مەزن رەوایە). ئیمامی عومەر درودی خودای لە سەر بێ دەفەرموێ "ئێوە کە لە دایکتان دەبن ئازادن." سەیرێکی پێشی ئیسلامیش بکە. هەموو هاووڵاتییانی رۆمان بەرامبەر یاسا یەکسان بوون، هەمووشیان ئازاد بوون. وەرە با یەک دەوڵەت بڵێ من لە سەر ئەم پەیڕەوە دەڕۆم. لە دیموکراتیترین دەوڵەت، گەورەترین تاوان بار باشترین پارێزەر بۆ خۆیان دەگرن. بێ تاوانیش لە سێدارە دەدرێن، چونکە پارێزەری باشیان نییە.

سەیرکە هەمووکاتێک دەوڵەتی فەرەنسا، لە هەر هەڵێکی کە بۆی هەڵکەوتبێت دروشمی دابەش نەکردنی عێراقی بەرزکردووەتەوە، واتە دژی دامەزراندنی دەوڵەتی کوردستان راوەستاوە و رادەوەستێ. خۆ دەنا فەرەنسا هەر باسی ئازادی و یەکسانی دەکات، ئینجا دژی ئازادی کوردستانە و دژی یەکسانی کوردە بە نەتەوەکانی تری جیهان. بەم شێوەیە هەر کەسەی بە شێوەیەک لە یەکسانی دەگات. بێجگە لە مەش یەکسانی هەر سەردەمێک و هەر چەرخێک، بە یەکسانی سەردەمی پێش خۆی ناچێ. هەر نەتەوەیەکیش یەکسانیەکی تایبەت بە خۆی هەیە. لە نێو هەر نەتەوەیەکیش لە سەردەمێکی دیاریکراودا بەکارهێنانی یەکسانی بەستراوەتەوە بە چەند هۆکارێک: وەک چێژ و پلەی تێگەیشتنی کاربەدەستان. چێژ و پلەی تێگەیشتنیش دەوەستێتە سەر کەسی بەکارهێنەری ئەو رەوایە. بۆ نموونە لە نێوان باوک و منداڵان،

دادوەر و تاوانبار. لە هەر چەرخێکدا بە گوێرەی پێویستی کۆمەڵگا، کۆمەڵگا رادەیەک بۆ دەسەڵات داران دادەنێ. ئینجا لەم سنوورەدا دەسەڵات دار مێرخاسی خۆی پیشان دەدات. مێرخاسی دوێنێ دزێوی ئیمرۆکەیە، مێرخاسی ئیمرۆکەش دەبێتە دزێوی داهاتوویەکی نزیک. هەر بۆیەش یەکسانی دوێنێکە، بێ دادی ئیمرۆکەیە.

گەر باسی ئازادیش بکەین ئەوا ئەویش بە گوێرەی جێگاو سەردەمە. لە سەردەمی ئێمەدا ئازادی تاک لەو شوێنە کۆتایی پێ دێت لە کوێ بەرژەوەندی تاکێکی تر دەکەوێتە مەترسییەوە، ئەمە لەسەر نەتەوەش دە چەسپێت. بۆ نموونە کەنداوی فارسی لە کوێ و وڵاتە یەک گرتووەکانی ئەمریکا لە کوێ. بەڵام ئەمریکا دەڵێت کەنداوی فارسی لە ناو سنووری بەرژەوەندییەکانی منە، بۆیە ئەمریکا هەموو شتێک دەکات تا کەنداوی فارسی بە تەواووەتی بخاتە ژێر رکێفی خۆی. بەم شێوەیە ناوچەی کەنداو دەبێت بەرژەوەندییان لە گەڵ بەرژەوەندییەکانی ئەمریکا بگونجێنن. ئەمریکای وڵاتی "ئازادی" ئامادەیە لمی ئەم ناوچەیەش بسووتێنێت، لە پێناوی بەرژەوەندی خۆی. ئا ئەمەیە ئازادی چەرخی بیستەم.

- کچێ هەر نەبێت بەختت هەیە و دەبێت شانازی پێوە بکەیت ئەوا دەستت لە خوێندنەکەت گیر بووە و تۆش کچێکی زیرەکیت، ئەی خوێندکار لەمە زیاتر چی دەوێت؟

- هەموو کاتێک دەڵێم، بەختم رۆژێکیش لە بەردەمما هەڵنەتروکا. ئەم بەختە رەشەم لەبەر چاوی خەڵکی هێند جوان و بەرزە، بۆیە تۆش گلەییم لێ دەکەیت و دەڵێیت بۆچ شانازی پێوە ناکەی. چۆن شانازی پێوە بکەم هەرگیز بەختم یارم نەبووە. شانازی بە شتێکەوە دەکرێت کە پارچەیەک بێت لە خۆت، بەلام ئەم بەختە کەی هی من بووە تا ببێت بە پارچەیەک لە من؟ من دەزانم ژووانی من و بەختم کەی دەست پێدەکات. ئەوساکە کە پیر دەبم بە چاوە کزەکانم سەیری دەکەم، کات مۆڵەتم نادات چێژی لێ وەرگرم. ئەوساکەش من پێی دەڵێم گەر هەبێت یاخود نە بێت هیچ شتێک، تا تۆزقاڵێکیش لە کاتی کە دەبوایە ئەستونی ژیانم بێت ناگۆڕێت. کرداری ئێستە لە رابوردو هیچ

ناگۆڕێ و کاتی داهاتووش کاتی من نییە، پیرۆزی ئەو کەسەبێت کە تێیدا شادومان دەبێت.
- کچێ شیرین گەربتەوێت هیوا وەک کۆرپەیەک لە باوەشتا نەمرێت، دەبێ بەرنامەیەکت هەبێت ئامانجەکەی دیاربێت، تا بیکەیتە نیشانە و نەهێلیت لە بەرچاوت گوم بێت. ئەوەی گەشبین نەبێت ئامانجی نابێت. چونکە گەشبینی ئەستونی بەرنامەیە و ئامانجیش دەبێت وەک چرا وابێت. خۆی بچووک و تیشکی بێ مەودا بێت، بۆیە کردەوەی هەر مرۆڤێک بە گوێرەی ئامانجە داڕێژراوەکەی بەرز یان نزم دەبێتەوە. ئینجا ئامانجی خۆت بە هێزکە و بە کردەوەی خۆشت دەتوانیت تەگەرەی بەر دەم ئامانجەکەت پێشێل بکەیت. ئامانجەکەت وەک رۆژ بەرزکەوە تا پێویست بە پەنجەی ئاماژە نەکات. گەر تیشکی ئامانجت وەک رۆژبێت بە بێژنگ ناگیرێت. ئا ئەوساکە من دڵنیام دەگەیتە ئامانجی خۆت.
- کچێ سکالاّ گیان دڵم ئەوەندە تەنگە، ئەوەندە ماندووم بۆی هەیە تۆزێک پشوو بدەم بێمەوە سەر خۆم.

****

سکاڵا یەکسەر چووە لای ئازاد تا پێیڕابگەیێنێ کە رەوشی شیرین زۆر باش نییە. ئازاد گوتی من تەلەفۆنی بۆ دەکەم تا بێتە لام و خۆم قسەی لەگەڵ دەکەم بزانم چی روویداوە. هەر لەوکاتەی ئازاد خەریکی داخستنی دوکانەکە بوو ئەوەندەی زانی مامۆستا هاتە ژورەوە و سڵاوی کرد. ئازاد گەلێک پێی شاگەشکە بوو، چونکە دەمێکبوو مامۆستای نەدی بوو. داوای لێ کرد دابنیشێ تا کۆگاکەی دادەخات. تەلەفۆنەکەی سکاڵای لە یاد کرد و بە مامۆستای راگەیاند کە زۆری پێ خۆش دەبێت ئەگەر قاوەیەکی لەگەڵ بخواتەوە. مامۆستاش گەلێکی پێ خۆش بوو، بۆیە خۆی لەگەڵ چەند گۆڤارێک و رۆژنامەیێک خەریک کرد، پاش ئەوەی ئازاد لە کارەکەی تەواو بوو لە گەڵ مامۆستا پێکەوە دانیشتن و دەستیان کرد بە گۆڕینەوەی ئەو دەنگ و باسانەی کە دەیانزانی.

مامۆستا بە ئازادی گوت کاک ئازاد خۆت دەزانیت لە مزگەوتێک دەرسی زمانی عەرەبیم بە منالە موسولمانەکان دەوتەوە، ئێستە حووکمەت ئەو مزگەوتەی داخست. من ناڵێم ئەو کارە پارەی تێدا بوو، بەڵام هەرنەبێت کرێی خانووەکەم دەدا و لەگەڵ موسوڵمانانیش پارچە نانێکم دەخوارد، بەڵام ئەم سەری مانگە پارەی ئەوەم نییە کرێی خانووەکەم بدەم. ئازاد رەزامەندی خۆی دەربڕی و گوتی بەسەر چاو مامۆستا لە خوا بەزیادبێت من پارەم هەیە و دەتوانم کرێی خانوەکەت بۆ بدەم. بە پێکەنینەوەش گوتی ڕیباشت لێ وەرناگرم. مامۆستا لە وەرگرتنی پارەکە دوو دڵ بوو بەڵام دژ نەبوو، وادیار بوو مامۆستا شتێکی تری دەویست. ئازادیش هەستی بەوە کرد. بۆیە گوتی مامۆستا ئەوەی من بتناسم شتێکت لە دڵە و نایدرکێنیت. ئەویش بە پێکەنینەوە گوتی زەندیق راستەکەیت، چونکە من بیر دەکەمەوە دەڵێم ئەگەر مزگەوتێکی ترم دەست نەکەوت چی بکەم؟ ئەی چۆن وامی خۆم بدەمەوە، ئەی چەند مانگ دۆست و یاران دەتوانن یارمەتیم بدەن؟ ئەوانە هەموویان پرسیارن و چاوەڕوانی وەڵامم لێ دەکەن. بۆیە ئازاد گیان ئەگەر کرێکاریشم بۆ بدۆزیتەوە هەر مەمنوونتم.

ئازاد دەیزانی دوکانێکی ڕۆژنامە فرۆشی بە نرخێکی هەرزان دەفرۆشن، چونکە ئەو دوکانە گەلێک بێ کەلکە و کەس نایەوێت. بەڵام بۆ تاکە کەسێک کە هەر بۆ پارچە نانێکی بێت سەروزیادە. مامۆستا گوتی ئازاد من پارەی کرێی خانوم نییە ئینجا پارەی کڕینی دوکانم لە کوێ هەیە؟ ئازاد دڵنیای کرد کە ئەو خۆی بە تەنیا ئەم پارەیە دابین دەکات، ئەگەر پێویستیش بوو داوا لە کاک سالار دەکات. گوتی مامۆستا دڵ لە دڵ مەدە دەتوانم یارمەتیت بدەم و دوکانەکەت بۆ بکڕم و پارەکەشی لەو زۆرانە نییە. بە هەر جۆرێک بێت مامۆستا ڕەزامەندی خۆی دەربڕی. ئازاد یەکسەر تەلەفۆنی دەلالەکەی کرد، وکاتێکیان دانا بۆ دیتنی کۆگاکە تا بڕیاری کڕین مۆربکەن. پاش چەند ڕۆژێک ئازاد و مامۆستا پێکەوە چوونە لای دەلاڵەکە و دوکانەکەیان خستە سەر ناوی مامۆستا. لەو ڕۆژەوە مامۆستا ئیتر لە دوکانی خۆی کاری دەکرد، ڕەوشی ژیانی زۆر لە جاران چاکتر بوو. بەلام لە ناخیدا لە کارەکەی خۆی ڕازی نەبوو. چونکە بەرگی یەکەمی گۆڤارەکانی فەرەنسا زۆرجار بە ئافرەتی ڕووت دەڕازێننەوە، ئەوەش گەلێک مامۆستای سەغڵەت دەکرد. بەلام هیچی لەدەست نەدەهات. بۆیە بە ناچاری گۆڤارەکانی دەفرۆشت.

بۆ ئاگاداری یاسای فەڕەنسی دەڵێ هەر ڕۆژنامەیەک کە بە شێوەیەکی فەرمی دەردەچێت لە سەر ڕۆژنامەفرۆش پێویستە کە بیفرۆشێت. ئینجا وەک دەزانن ڕۆژنامە هەیە ئاینییە و ڕۆژنامە هەیە چەپە و ئەوی تریان ڕاستڕەوە و ئەوی تریان وێنەی ڕووتی ژنانە و هەندێکیان زانیستین. ئینجا لەسەر دوکانی ڕۆژنامەفرۆش پێویستە کە شوێنێک بۆ هەر یەک لەم ڕۆژنامانە تەرخان بکات. ئەم یاسایە یاسای دیموکراسیەتی فەڕەنسایە.

بەم شێوەیە مامۆستای هەژار کەوتبووە داوی دیموکراسیەتی فەرەنسی و کۆگاکەی هەموو جۆرە ڕۆژنامە و گۆڤارێکی تیا بوو. بەڵام ئەو گۆڤارانەی کە بە دڵی مامۆستا نەبوون، شوێنێکی لە پشتی دوکانەکە بۆ کردبوونەوە، ئەوەش دڵی زۆر ژن و پیاوی پیری بۆ لای دوکانەکە ڕاکێشا بوو. کاتی خۆی دەیانگوت دوکانەکە باش کار ناکات، بەڵام بەدەست

ماموستاوه ئەوەندەی تر خراپ ببوو. بە دەردی ماموستا دەیگوت خۆ کرێی خانووەکەم دەدەم و نانێکیش دەخۆم، ئینجا من چی ترم لەوە زیاتر دەوێت؟ هەر خۆشی دەیگوت لە خوا بەزیادبێت بەسمە.

رۆژێک سەپان بیستی کە ماموستا دوکانێکی کڕیوە، ئینجا حەوسەڵەی پرسیاری کراوە و چی دەفرۆشێ؟ و چۆن دەستیان بۆ دەبات؟ و چۆن واتۆیان بۆ دەکات. سەپان دەیگوت ئیستا بڕۆن لە ماموستا بپرسن فلانە شێخ دەڵێت چی؟ پێتان دەڵێت جارێ گۆڤارێکی سێکسم لەلا بکڕن ئینجا وەڵامتان دەدەمەوە. وای لێهات ماموستا دوکانەکەی نەدەکردەوە و کەوتبوە ژێر قەرزێکی زۆر. ئازاد و سالار چونە لای مامە قەشە و هەرسێک لەسەر کورسییەکانی کەنیسە دانیشتن. باس باسی ماموستا بوو چۆن لەم تەنگ و چەڵەمەیە نەجاتی بدەن. مامە قەشە گوتی من دەتوانم داوا لە کەنیسە بکەم مانگانە موچەیەکی بۆ ببڕنەوە و خانوێکی پیاوە ئاینییەکانی بدەنێ. ئازاد گوتی تا قەرزەکانی پارەی زیادەیان نەیەتە سەر من بە زووترین کات قەرزەکەی لە کۆڵدەکەمەوە. سالار گوتی بە باوەڕی من کاک سامان کوڕێکی زۆر رێک و پێکە دەتوانین بیهێنینە سەر دوکانەکە و بەڕێوەی ببات. موچەیەکی بۆ تەرخان دەکەین، ئەوەی ماوەش قەرزەکەی پێ دەدەینەوە، تا ئەو کاتەش ئەبونە گوتی ئەوەی پێمبکرێ درێغی ناکەم. هەرسێک لەسەر ئەم شتە پێک هاتن.

ئازاد گەلێک زیرەک بوو لە بڵاو کردنەوەی واتۆی چەواشە، بۆیە لە نێو کوردان بڵاویان کردەوە کە گوایە کاک سامان کۆگاکەی ماموستای بە پارەیەکی کەم کڕیوەتەوە، ئینجا کەس ماموستای لە یاد نەما، نە کەس دەیپرسی ماموستا چۆن دەژێت؟ چۆن کرێی خانوو دەدات؟ چۆن پارەی تکێتی میترۆ پەیدا دەکات؟ ئەوی لایان گرنگ بوو ماموستایان بە چەپڵە رێزان لە دوکانەکە دەرکرد. ئینجا لایان گرنگ نەبوو ماموستا چی بەسەر دێت.

کاک سامان گەنجێکی لێهاتوو و جوان و دەم بە پێکەنین و نیگایەکی سەرنج راکێشی هەبوو، دوکانەکە کاری لە جاری جارانیش باشتر ببووەوە. جگە لەمەش سامان دەستی گەلێک پاک بوو. هەر بۆ بازرگانی تۆزێک کاغەز

و نوقڵ و پێنووس و شتی تری هێنا بوو بۆ دوکانەکە و سودی ئەوانەشی دەدا بە مامۆستا. مامۆستاش بە زووترین کات وامەکەی خۆی پڕکردەوە و بە سامانی گوت؛ ئەو شتانەی کە بۆ دوکانەکەت زێدە کردووە، سوودەکەیان بۆ خۆت بگێڕەوە. بەم شێوەیە نانی سامانیش کەتە ڕۆنەوە و مامۆستاش دڵنیا بوو کە غەدر لە سامان ناکات، چونکە پاش گێڕانەوەی ئەم شتانە و پاش پڕکردنەوەی مافی حووکمەت و مووچەی سامان مامۆستا هەر پارەی کرێی خانوو و نان و زگەکەی بۆ دەماوە.

سامان دەیزانی کە تەزرە لە تەمەنیا بووکەشووشەی نەبووە و بۆی هەیە خەوی پێوە ببینێ. هەرچەندە سکاڵاخان بووکێکی بچووکی بۆ کڕی بوو. سامانیش هەر ڕۆژەی شتێکی بۆ دەکڕی. ئەویش گشتیانی لەسەر دۆلابەکەی تەنیشت خۆی بە ڕیز دادەنا. کە سامان دەچوو بۆ لای دەیدیت قسەیان لەگەڵدەکات و جلیان لەبەر دەکات، بۆیە ئەمجارەیان سامان بووکە شووشیەیەکی بۆ کڕی لە بە بەژنی منالێک بوو. پاش ئەوەی سامان تۆزێک کارەکەی بەرەو باشی چوو، هەموو جارێک نوقڵی و کراسی جوانی بۆ دەکڕی.

ڕەوشی تەزرە تا دەهات خراپتر دەبوو. ڕۆژێک سامان و کاک ئازاد پێکەوە چوون بۆ لای تەزرە، دکتۆرەکان لە لای دانیشتبوون و تاجێکی زەردیان لە سەر سەری دانابوو. ئازاد لە سامانی گەیاند کە ئەمە تاجی ماگە زەردەشتییەکانە "موغەکان" کە هاتن و موژدەی لە دایک بوونی عیسا پێغەمبەریان بە جیهان ڕاگەیاند. بەم بۆنەیەوە ماگەکان کولێرە بە ڕۆن و میوەیان بەسەر خەڵکا دابەش کرد بوو. هەر بۆیە تا ئێستاش مەسیحییەکان بەم بۆنەوە هەمان کولێرە دەکەنەوە و دابەشی دەکەن.

دوکتۆرەکەی تەزرە دەستی لە سەر شانی ئازاد دانا و بە ئەسپایی سەری لە بن گوێی ناو بە شێوەیەکی فەرمی پێی ڕاگەیاند کە ئیتر ئەم کچە چارەی نەماوە و لەم ڕۆژانە تەواو دەبێت. ئینجا ئەگەر دایک و باوک و کەس و کاری هەیە، ئەوا بە زووترین کات بیبەنەوە تا لە ناو کەس و کاری خۆی تەوا و بێت. ئازاد خۆی پێنەگیرا و دوو ئەسرینی گەرم لە چاوەکانی هاتنە

خوارەوە و رووی وەرگێڕا تا تەزرە و سیستەرەکان نەیبینن کە دەگرێت. ئازاد دەستی دوکتۆری گرت و لە هۆدەکە چووە دەرەوە و دوکتۆریش بەدوای کەوت لە دەرەوە درێژەیان بە قسەکانی خۆیان دا. وا دیار بوو دوکتۆر تێگەیشت کە ئازاد پیاوێکی هەست ناسکە، بۆیە پێیگوت من نالێم دەمرێت ئێمە دەرمانی پێدەدەین ئەم دەرمانانە رێک و پێک بەکار بێنێت لێرە تا ساڵێکی تر چاکدەبێتەوە، من ویستم پێت بڵێم ئەگەر لێرانە لە نێو چوار دیواردا بمێنێتەوە و خۆی سنگی تەواو چاک نەبۆتەوە ئەوا دەمرێت. ئازاد تێگەیشت کە دوکتۆر باش دەزانێت تەزرە ئیتر ناژیێت، بۆیە درێژەی بە قسەکان نەدا و هاتەوە ژورەوە، سەیرێکی تری تەزرەی کردەوە لە سەر تەختی نەخۆشخانە تاجێکی زێڕینیان لە سەری ناوە و ئەویش وەک شاکچ دانیشتووە. ئازاد کە سەیری ئەم دیمەنەی دەکرد هەر بیری لە شتێک دەکردەوە کە ئەویش گووایە دەبێت راست بێت لەم زووانە ئەم میوانە جوانە، ئەم شاکچەی ئەوەندە دڵی بە ئێمە و بە بیمارگە و دکتۆرەکان خۆشە، وا بە ئاسانی جێمان بێڵێت؟ هەر خۆشی دەیگوت نا تەزرە گیان جینجرۆکت لە ژیان گیرکە و نەکەی بەری بدەیت و جێمان بێڵیت. هێزێکی سروشتی و لە سروشت بەدەر بە سەر ئازادا زاڵ بوو، دەنگێکی پەنهان بە ئازادی دەووت بیگرە نەهێڵیت بڕوات. ئازاد بە سۆزێکی باوکانەوە، باوەشی لە تەزرە وەرهێنا و بە فەڕەنسی هاواری کرد. دوکتۆر لێناگەڕێم ئەم دونیایە جێبێڵێت. لە باوەشما دەیپارێزم، نەخۆشی ئەم کیژۆڵەیە بە سۆزی دایک و باوک چاکدەبێتەوە. سیستەرێکیان فرمێسک لە چاوی هاتە خوارەوە و گوتی خوداحافیز، هەموویان یەک لە دوای یەک چونە دەرەوە. کە ئازاد و سامان پێکەوە لەوێ مانەوە ئازاد بە دزی بە سامانی راگەیاند کە دکتۆر چی پێ گوت. سامان لە شوێنی خۆی تەزی و گوتی ئەی تۆ دەڵێیت چی؟ ئەگەر بە قسەی من بکەیت با لە نەخۆشخانە بیهێنینە دەرەوە و دەیبەینەوە ماڵەوە. با تۆزێک لەگەڵ مناڵەکانا یاری بکات من لەم بڕوایەم کە چاک دەبێتەوە. ئەگەر زانیمان تەندوروستی تێک چوو تکێتی فڕۆکەی بۆ دەکڕین و دەیبەینەوە

باوەشی کوردستان. سامان گوتی (لە ژێر دار گێوژەکە....) وا دیار بوو ویستی بڵێت دەینێژین بەڵام رستەکەی تەواو نەکرد.

بۆ بەیانی تەزرەیان لە بیمارگە دەرهێنا و بردیانە ماڵی ئازاد کە منالەکان چاویان بە تەزرە کەوت شاگەشکە بوون و یەکسەر هەرچی یارییان هەبوو دەریان هێنا و لە بەردەم تەزرەیان دانا. لانە دەیگوت دایە دەتوانێت لەگەڵمان بێتە فێرگە؟ سکالا بە چاوی پڕ لە ئەسرینەوە وەڵامی دایەوە، ئەی چۆن ناتوانێت، دەتوانێت بەڵام یەکەم شت دەبێت ناوی بنووسین ئینجا بیهێنینە فێرگە.

لەم کاتەدا ئەنگێلا هاتە لای تەزرە و دەستی لە ملی کرد و ماچی کرد و وەک هەر دایکێکی بە سۆز لە باوەشی خۆی نا و بۆنی کرد. ئینجا لێی پرسی ئێرە خۆشترە یان بیمارگە؟ ئێرە خۆشترە. باشە مادام وایە دوایی دەتبەم بۆ ماڵی خۆم. بەڵام ماڵی من زۆر بچووکە سەرە تاتکانێی لێ ناکرێت. لە خەیاڵی خۆشی دەیگوت دەیبەم بۆ ماڵی تەنیا لەوێ دەتوانێت بە کەیفی خۆی یاری بکات.

سکاڵا بە ئەنگێلای گوت:

- ئەرێ ئەوە سەردەمێکە شیرین خان دیار نییە. دەبێت دەنگ و باسی چی بێت؟ دەبێ خەریکی چی بێت؟ کچێ هەر تەلیفۆنیشمان بۆ ناکات، دەبێت دڵی لێمان نەشکابێت؟

- دڵنیابە دڵی لێتان نەشکاوە، لە نکاوێک ناوپەلی دەستی بە شێوەیێکی وا لە رانی خۆی دا لەم بڕوایە دام کە جێ دەستی لەسەر رانی بەدەرکەوتبێ. خوایە ئەوەی بەسەر ئەو هاتووە بەسەر کەس نەیێت.

سکاڵا هاواری کرد:

- خێرە کچێ راست بێژە، چی بووە؟

- با بچینە موبەقەوە لەوێ بۆت باس دەکەم. کچێ! سەرکارەکە ئەو بەیانییە یەکەم شت کە بە قسەی خۆش و بە هەڕەشە هیچی پێ نەکرا بوو دووایی ویستبووی بە زۆرداری سواری بێت. بە کورتی بەم شێوەیە کابرا هاتبووە ناو باسەوە:

ـ بۆچ رازی نابیت تۆ چیت لە ژنەکانی تر زیاترە  ئەوانەی لەگەڵم باشبن منیش لەگەڵیان باش دەبم و باشترین کار و ئاسانترین کاریان پێدەدەم.
ـ زۆر سوپاست دەکەم، من بەم کارەی خۆم رازیم. ئەگەر کارەکەی منت بە دڵ نەبێت پارەی خۆمم بدەیە و لە کار دەرمکە.
ـ خۆ تۆ دایە ترێزەنیت. هەرنەبێت دایە ترێزە پیاوی وەک کوڕی خۆی خۆشدەویست، بەڵام تۆ وەک ئاگام لێیە لە کینە بەولاوە بۆ پیاوان هیچی ترت لە دڵدانییە. تۆ وا تێدەگەیت پیاو یان خاوەن کار جزدانێکە کەی دەستی تێڕاکەیت پارەی لێدەردێت. منیش لەگەڵتام ئەگەر تۆ وەک ژنێک جزدانی لەشتی بۆ نەکەیتەوە، خاوەن کار جیزدانە بەڵام جزدانێکی ئیشک و برینگە. ئەگەر پێویستیت بە پارە هەبێت واز لە کینە بێنە، جلی رەبەنی داکەنە.
شیرنیش پێی گوتوە:
ـ تۆ چەند پارەت هەیە سەد ئەوەندەشت هەبێت بە باخی لەشم شادنابیت، چونکە تۆی دەوڵەمەند پارەکەت وەک ئاوی دەریایە تاڵ و سوێرە، من ئەو رووبارە شیرینەم کە لە ناو جەرگی دەریا تێدەپەڕم. ئاوم تێکەڵی ئاوی شۆری تۆ نابێت. هەر بۆ زانین پێت دەڵێم، بەس باشترین دەریاوان رێچکەی جۆباری من پێدەزانن و بە ئاوی شیرینم شاد دەبن. جیزدانی تۆ وەک تەوری ژێر دەریا لە باخەڵتا گیر بووە تا سینگت کون نەکات لێت جیانابێتەوە. تۆ وەک بتێکیت، هیچ نابزێویت، بەڵام چاوت بڕیوەتە بازووی من و ئەو تا جزدانت بۆ پڕ بکەن. باش بزانە چەند جزدانت گەورەبێت، جێگای منی تێدا نابێتەوە. رێچکەی رووباری من بەرزە و بە سەر سەدانی وەک تۆ دا تێدەپەڕێ. باوەرت بێت باوەشی گەورە رامناکێشن، بەڵام دەمێکی تینوی ژیان مەستم دەکات.
ـ لێم تورە بوویت، من وام دەزانی تۆ دەریایت و لێل نابیت. من دەمویست پێت بڵێم کوڕی هەرزەکار فێڵت لێ دەکەن. هەموو شتێکیان بۆ ئەوەیە تا بتگەنێ و لە کانیی دەمت ئاو بخۆنەوە. وەک خۆت دەڵێیت من تەوری ژێر دەریام و پرشنگی رۆژم ناگاتێ. منیش دەڵێم تۆ ساکاریت. شیرین، من بەرامبەرت وەک ئاژەڵێکی دڕندەم، تینووی ئاژەڵی چەموشم من شێتی

گەردەنی ئاسکم لە دەست ماچم بۆ کوێ دەچی؟ ئیتر بەسە ماندووم مەکە، چونکە زوو یان درەنگ هەر دەبێت پێک شادبین. شیرین وەرە بەر سایەی من ئینجا کە کەوتییە ژێر سایەم، بە رابوردووتا وەرەوە و بەراوردمکە لەگەڵ ئەستێرەکانی خەیاڵت. ئا ئەوساکە، تۆ دەزانیت جیاوازی نێوانمان چییە. من دەمەوێ دەست لە سەر سینگ هەموو ژیانم لە راژەتدابم، بەس بڵێ باشە بەراوردت دەکەم.

- نە خۆتکا نە فەرمانتکا رەزا گران هەی ئێسکت خواتەوە، کە بەلامدا تێدەپەڕیت بێزم دەبێتەوە، ئینجا دەتەوێت بەراوردتکەم؟

- من نەمدەزانی تۆ هێندە دڵڕەقیت، من وامدەزانی دڵت بەرامبەر بە جزدانە رەقەکەم وەک پەمۆی لێدێت. ئێستاکە من دەیکەم و بڕۆ بۆ دادگە دەبینیت، دادگە بەرامبەر بە جزدانەکەم وەک پەمۆی لێدێت. بێ گومان بە، دڵم پڕ لە خۆشەویستییە و جێگای کینەی تێدانییە، بۆیە بەخۆشی بێت یان بە ناخۆشی هەر دەبێت بمدەیتێ، چیت لێ کەم دەبێتەوە دەرگای ژیان و کار و کامەرانی هەموویت بۆ دەکەمەوە.

ئا بەم جۆرە هێرشی کردبووە سەر شیرین و شیرینیش بە بێڵچە بچووکەکەی کە زبڵی پێ هەڵدەگرنەوە سەری کابرا دەشکێنێت. کابراش خوێنێکی زۆری لەبەر دەڕوات و دوکتۆری بۆ بانگ دەکەن. پاش ئەم رووداوە شیرین زراوی چووە ئەگەر نەچێت بۆ کار پارەکانی لەدەست دەڕوات و ئەگەر بچێت بۆ کار بەیانی ئەم کابرایە یان دەیکوژێت یان سواری دەبێت. سامان ئەم ڕستەیەی گوێ لێ بوو هیچ قسەی نەکرد.

****

سامان بەیانی زوو لە خەو هەڵسا بوو و بە تەکسی چوو بووە ماڵی شیرین و لە دەرگای دابوو. هەرچەندە شیرین هەموو لەشی دەلەرزی کە زانیبووی سامانە دەرگاکەی بۆ کردبووەوە. سامان لێی پرسیبوو بۆ وا پەشۆکاویت لە چی دەترسیت؟

- لە هیچ ناترسم، بەڵام بەم بەیانییە زووە چییە ڕێگات گوم کردووە، یان خوا لێی گۆڕیویت یان لە ماڵی خۆت دەرکراویت؟

- ڕاستەکەیت خوا لێی گۆڕیوم، شیرین تۆ وا تێدەگەیت کەست نییە؟ تۆ من بە کەسی خۆت دامەنێی؟ بەڵام لەم بار و دۆخەی کە تۆ ئێستاکە تێیدایت هەموو کوردێک کەسی تۆیە. دەی زوو خۆت بگۆڕە و جلت لەبەرکە با پێکەوە بچین بۆ شوێنی کارەکەت. تۆ یەکەم شت بڕۆ ژورەوە وەک بڵێی هیچ ڕوینەداوە و دەست بە کاری خۆت بکە، ئەگەر دەری کردیت ئەوا هیچمان لە هیچ، دێینەوە ماڵەوە و من دەچمە سەر کاری خۆم، تۆش بگەڕێوە ماڵەوە. ئەگەر لێیدایت یەک هاوار بکەو بەس، من لەلای دەرگا ڕادەوەستم، زوو بە هاناتەوە دێم. ئەگەر لەوێش نەبوو من ڕادەوەستم هەتا دێت، تا دڵنیا دەبم لە هەڵوێستی ئەم سەگ بابە.

- ئینجا ئەگەر لە تۆشی دا من چی بکەم؟

سامان پێکەنیبوو پێیگوتبوو:

- ئینجا تۆ لەگەڵ خوای جەنگی یۆنانی کە دوو باڵی هەبوو چیت پێ دەکرێت، خۆی بە کەیفی خۆی دەکات لەسەر کێ بنیشێتەوە، دەنیشێتەوە.

ئەم جارەیان سەرکارەکە پێش کرێکارەکان گەیشتبوە سەر شوێنی کار، کە شیرین دەرگای کردەبووەوە خۆی نەشێواندبوو و لێیگەڕابوو بێتە ژوورەوە. هەرکە شیرین هاتبووە ژورەوە، پێیگوتبوو:

- وەک ئاسایی دەبێت بەیانی باش بکەیت.

شیرین وەڵامی نەدابووەوە.

- جگە لەمەش دەبێت داوای لێبوردنم لێبکەیت.

دیسان شیرین بێدەنگ بووبوو.

ـ چییه بۆچ وەڵام نادەیتەوە من یەک لەبارەخۆم داوای لێبوردنت لێ دەکەم له کاره ناهەموارەکەی دوێنێشت دەبوورم. ئیتر چیت دەوێت؟ پێمناڵێت سوپاس؟

له شیرین چووبوه پێشەوە و پەلاماری دابوویێ. شیرین به هەر جۆرێک بێت چریکەیەکی لێدا بوو و سامان هاتبووه ژورەوه و چاوی بەم دیمەنه کەوتبوو. هێرشی بردبووه سەر کابرا و خستبووه ژێر خۆی و سێ چوار کەلەی له لووتی دابوو. کابرا گێژ بوو بوو و داوای لێبووردنی له سامان دەکرد بوو و "دەیگوت بەخوا نەمزانی که مێردی هەیە، و نەمزانیوه تۆ مێردی ئەویت". بۆ سامان ئەم قسانه هیچیان له هاوسەنگیەکه نەدەگۆڕی بۆیه هەتا دەهات هەر لێی دەدا تا کابرا له دەست و پێ کەوت، پێی گوتبوو:

ـ لای کوردان ئەگەر یەکێک به زۆر سواری کچێک بێت ئەوا بێ وت و وێژ دەیکوژن. بەڵام چونکه تۆ بەس ویستت بەم کاره هەڵسیت با جەزای تۆ ئەوەنده بێت. دەتوانیت به پۆلیس بڵێیت که من وام لێکردیت، بەڵام بڕواتبێت دوو رۆژ نابات کوردێکی تر ئەم جارەیان دەتکوژێت. ئینجا خۆت بڕیاری خۆت بده. چۆنی به چاک دەزانیت وا بکه. من وت و وێژم له گەڵ تۆ دا تەواو بوو. هومێدەوارم جارێکی تر یەکتر نەبینینەوه. لەم کاتەدا شیرین جورئەتی هاتبووه بەر و گەڕابووەوه ژورەوه تا یارمەتی سامان بدات که چاوی بەم دیمەنه کەوتبوو له شوێنی خۆی حەپەسابوو. ویستبووی سامان پەلکێشی دەرەوه بکات، بەڵام هێزی لەبەر نەمابوو و ئەوەندەی نەمابوو ببورێتەوه و خۆی توند به سامانەوه نوساندبوو تا نەکەوێت. ئەویش وەک ستونی خانوو له شوێنی خۆی چەقیبوو، نه دەیتوانی شیرین جێ بهێڵێت، نه دەیتوانی بیباته دەرەوه چونکه چەند قسەیەکی لەگەڵ ئەم پاشەڵ پیسه مابوو. سامان رووی له کابرا کردەبووەوه و گوتبووی:

ـ پارەی ئەم مانگه و پارەی دەرکردنی له کار بۆ رەوانەدەکەیته ماڵەوه پێش ئەوەی من بێم بتبینم.

ئینجا شیرین سامانی راکێشا بووه دەرەوه و پێیگوتبوو:

ـ سامان ئیتر من دەترسم بچمەوه ماڵەوه، نازانم چۆن له ماڵی خۆم بخەوم. گرنگ نییه با ئیستا بچین بۆ دوکانەکەی تۆ و بیکەینەوه منیش تۆزێک

یارمەتیت دەدەم دوایی دەچم بۆ زانکۆ، و لەم بڕوایە دام دەچمە ماڵی ئەنگێلا دەخەوم. تا خانوویەکی تر دەدۆزمەوە و ناونیشانی خۆم دەگۆڕم. ئینجا خۆ لەم پاریسە گەورەیەیەش نامدۆزێتەوە.

- کچێ تازە مەترسە جارێکی تر ناوێرێت بەلای تۆدا بێت.

- سامان تۆ ئەم سەر کارە ناناسیت، ئەم سەرکارە پشتی بە خاوەنکار قایمە. خاوەن کاریش هەموو شتێکیان لە دەست دێت. لەم ڕۆژانە دەڵێن هەندێک کرێکاری تورک لەگەڵ خاوەن کارەکەیان لە سەر مووچە بە شەردێن، هەر ئەوان چوونە دەرەوە بۆ قاوەخانەکەی بەرامبەر شوێنی کارەکەیان هەر لەوێ خاوەن کارەکە یەکێکی بە رەشاشێکەوە بۆ ناردن و هەمویانی کوشت، بۆخۆشی وەک موی ناو ماست بۆی هاتە دەرەوە.

- ئەگەر دەڵێیت دەیکوژم و چی دەبێت با ببێت.

- نا من لەگەڵ کوشتن نیم. وەک پێم گوتیت ناونیشانی خۆم دەگۆڕم و تەواو. من دوێنێکە سەریم شکاند تۆش ئیمڕۆکە کردت بە مەیموون، بە سەگ، ئیتر ئێمە چیمان لێی دەوێت. ئەگەر پارەکەشی نەدا دەبا هەر نەیدات، نامانەوێت.

****

بۆ رۆژی دوایی ئەنگێلا هاتەوە لای تەزرە لەگەڵ سکاڵا کەوتنەوە قسەکردن. پاش ئەوەی لەگەڵ سامانا لێک جیا بوونەوە شیرین تەلەفۆنی منی کرد و پێیراگەیاندم کە دەیەوێت بمبینێت. منیش پێمگوت کە ئەم ئێوارەیە دەچمە ماڵی کاک ئازاد، چونکە تەزرەیان لە خەستەخانە هێناوەتە دەرەوە و واپێدەچێت تەندوروستی زۆر باشنەبێت. پێیم گوت شیرین ئەگەر پێت خۆشبێت وەرە ماڵی کاک ئازاد و ئەوانیش زۆریان پێخۆشە بتبینن. وا پێدەچێت زۆر لەمێژە سەرت لێیان نەدابێت، بۆیە لێت بە گلەیین.

ئەنگێلا دەڵێ چەند رۆژێک بوو تەنیام نەدیبوو، ئێمە وەک خۆت دەزانیت زوو زوو یەکتی دەبینین، بەڵام تەنیا دەچووە وەرزش و خوێندنی زمان. منیش بە هەمان شێوە سەرقاڵی خوێندن و کاری خۆمم. لەگەڵ ساشە واتا میسیۆ دانتۆن نێوانمان زۆر خۆشە.

سکاڵا دەیزانی کە نێوانیان خۆشە بە تایبەتی پاش ئەوەی بە سەرکەوتوویی پەیوەندی نێوان (سید الخوری) و با بڵێین مسیۆ دانتۆنی بەیەکەوە بەستەوە و ئەم پەیوەندییەی بەشێوەیەکی چاوەڕێ نەکراو بە هێز کرد. سید الخوری هەرچەندە دەم بە پێکەنین و زمان خۆش و قسە شیرین بوو، بەڵام رەوشتێکی داخراوی سەیری هەبوو. هەرگیز قبوڵی نەبوو کە بۆ نانخواردن بانگی بکەن و بچێتە سەر سفرەی خەڵکی دیکە. بەڵام بۆخۆی خەڵکێکی هەڵبژاردەی بانگ دەکرد بۆ سەر سفرەی خۆی. ئەم جارەیان ئەنگێلا لە دەمی دەرچووبوو و پێیگوتبوو من جەنابتان و مسیۆ دانتۆن بانگ دەکەمە چێشتخانەیەک و پێم خۆشە پێکەوە نانێک بخۆین.

(سید الخوری) پێکەنی بوو و گوتبووی دەزانم ئەنگێلا ئەم بیرە بیری تۆیە، چونکە دەزانم مسیۆ دانتۆن ئەم شتەی بە تۆ نەگوتووە بۆیە دێم.

****

ئەو رۆژەی کە شیرین تەلیفۆنی بۆ ئەنگێلا کرد دەبوایە تەنیا بێتە ماڵی ئەنگێلا، ئەویش دەیزانی کە شیرین حەز لە چارەی تەنیا ناکات، بۆیە بە هەر جۆرێکبێت شیرینی لە کۆڵ خۆی کردەوە. تەنیا هاتە لایی و شوشەیەک شەمپانیای بچووکی لەگەڵ خۆی هێنابوو و بە جووتە دەستیان بە گێڕانەوەی بەسەرهاتەکانیان کرد. ئەنگێلا گەلێک دڵی بە کارەکەی خۆی خۆش بوو. ساشەش گەلێک رێزی لێدەنا پاش ئەوەی سەرکەوتوو بوو لە گەڵ (سید الخوری) و لە گەڵ کۆمپانیایەکی پۆرتوگالی، کە بە قسەی ساشە بێت شەریکەکەیان قازانجێکی زۆری لێیان کردووە. هەر بۆیەش یەکسەر مووچەیەکی دەهەزار فرەنگی بۆ ئەنگێلا تەرخان کردبوو. ئەم مووچەیەش بۆ گەنجێکی خوێدنکار گەلێک زۆرە. .ئەنگێلا لە تەمەنیا پارەی وای نەدی بوو، خەویشی بە مووچەی وا نە دەدیت.

- ئەرێ ناڵێیت ئەم شەمپانیایەت بۆ هێناوە؟ خۆ گەروت نەنوساوە بتەوێت بە شەمپانیا چەوری کەیت.

- ئەنگێلا ئیمرۆکە من بووم بە فەرەنسی، وەڵامی جنسییەکەم هاتەوە.

- بە راستی ئەم نووچەیە دەتوانێت گەرووی مرۆ بنووسێنێت و بە شەمپانیاش نەبێت بە هیچ نەرم نابێتەوە.

- ئەی بە ئەلێکساندرت گوت؟

- نەء

- بۆ

- کچێ تازە گەیشتمەوە ماڵەوە و ئەم نامەیەم خوێندەوە، ئەها سەیری کە.

- ئیتر تۆ بویت بە فەرەنسی کوردستان کەوتە نێو دەربەندی بیرەوەریەکانتەوە.

تەنیا گوتی:

- دەڵێیت دەربەند؟ راستە دەربەندی ئاو دەرگای ژیانە، چونکە ئاو ژیانە و ژیان دەڕوێنێ. بەڵام بیرەوەریم وەک ژەهرێکە و ژیانم لێ تاڵ دەکات. ئەو پێکەنینانەی کە ژیانمیان شیرین دەکرد دێنەوە یادم. یەکەم شکەستی ژیانم کە بێ باوک و دایک گەورە بووم، یەکەم گریانی بێ سودم بۆ خێزانەکەم. یەکەم

سەرکەوتنم بە سەر سەندرینی لە خۆ بایی، مێردی سەندرینم بۆ خۆم ڕاکێشا، لەجیاتی سەندرین من بووم بە ژنی ساشە. من بە زیرەکی و جوانیم، خۆم کردە گوڵشەنی ساشە و سەندرینم کرد بە کوڵخەنی ماڵی خۆی. لەو کاتەی وەک ئافرەتێک بەسەر تەنگ و چەڵەمەی دونیا دا سەردەکەوم. لە دەروونم چریکەیەک هەڵدەستێ و دەڵێت، سوپاس دایە کە منت وەک ژن هێناوەتە ئەم دونیایە، لە چێژی ژنایەتی بێ بەشت نەکردم. سوپاس ساشە خۆت کرد بە باخەوانی من. ساشە تۆ بێ دینیت دەنا دەهاتمە سەر دینی تۆ، بەڵام ئەوا هاتمە سەر نەتەوەی تۆ و بووم بە فەرەنسی.

- سوپاس بۆ خوا تۆ ئەوکەسەت دۆزییەوە کە دەتویست، ئەی بە ئێمە مانان دەڵێیت چی؟ جارێ هەر لە نیوەی ڕێگاین و لە یەکێک دەگەڕێین بە باخی لەشمان شادبێت. دەزانیت چی بەسەر شیرین هاتووە. دەڵێن "قسە کەوتە زارێک کەوتە شارێک" ئەنگێلا بە دور و درێژی هەمووی بۆ تەنیا گێڕاوە.

- من لام وابوو شیرین کچێکی زیرەکە، بەڵام زۆر بەداخەوەم هیچ زیرەک نییە مادام کابرا دەیویست، شیرین دەیتوانی نرخێک بۆ خۆی دانێت کە بە ڕاستی نرخی خۆی بێت، هەموو شتێک نرخی خۆی هەیە ئەگەر ڕازی بووبا دەبا بیکردبا. چییە چی لێ کەم دەبێتەوە؟ هەندێک ژن هەن وادەزانن خوا ئەوانی ئافراندووە و لەم هەموو کەون و کائیناتە ئیتر خوا هیچ کارێکی تری نییە هەر سەیریان دەکات تا بزانێ دەیدەن بە کێ و نایدەن بە کێ. گوێت لەم چیرۆکە خۆشەبێت:

دەڵێن بازرگانێکی دەوڵەمەند هەبوو زۆر مێباز بوو، هەر ژنێک بیویستایە بە وام شتی لێ بکڕێ، ئەوا بازرگان شتێکی لێ دەویست ئینجا شتی بە وام دەدایێ. ئەم قسەیە گەیشتەوە لای ژنەکەی، ژنەکەی بڕوای بەم قسانە نەکرد. بڕیاری دا خۆی بچێت بۆ لای و بزانێ ئەم قسانە چەند ڕاستن. پۆشەی پۆشی و چوو بۆ لای مێردەکەیی و هەندێک کۆتاڵی بە قەرز لێ داوا کرد. ئەویش خۆی ئاسایی، داوای مافی خۆی لێ کرد. ئینجا لەوکاتەی کابرا کاری خۆی تەواو کرد. خێزانەکەی سەرپۆشی خۆی فڕێدا و گوتی ئەرێ کابرا شەرم لە خۆت ناکەی، کاری حەرام دەکەیت؟ کابراش خۆی نەشێواند و

گوتی ئەرێ ئافرەت هەموو جارێک بە حەرامی وەرە بۆ لام حەرامیەکەت لە حەلالیەکەت خۆشترە.
دە توخوا ئەگەر پێمنەڵێیت، ئەگەر ئەم ژنانە بە پارە خۆیان بدابا لە وە شەریفتر نەدەبوو ؛ هەم بیدەن و هەم پارەی وامەکەشی بدەنەوە. ئەنگێلا دەزانی ئەم کارە نوێیەم ژیانی سەرتاپا گۆریم.

ئەنگێلا ئەم قسانەی گەلێک پێ ناخۆش بوو. چونکە لەگەڵ بیر و باوەڕی ئەو نەدەگونجان، ویستی یەکسەر لە دەمی داتەوە و لە ماڵەوە دەری کات. بەڵام قسەی کاک ئازادی هاتەوە یاد کە دەڵێت ئێمە ناتوانین بڕیار لە سەر هیچ شتێک بدەین ئەگەر زانیارییەکی تەواومان لەسەر ئەم شتە نەبێت. ئەنگێلا گوتی ئەم بێ مێشکە لە تەمەنیا شەمپانیای نەخواردووەتەوە وادیارە ئەوە شەمپانیایەکە لەکەلەی داوە، بۆیە پەرداخێکی شەمپانیای تریشی بۆ تێ کرد.

تەنیا لە جیاتی ئەوەی شەمپانیاکە هێدی هێدی بخواتەوە و چێژ لە چێژ و بۆنەکەی وەرگرێت، بینی پێوەنا و خواردییەوە. درێژەی بە قسەکانی خۆی دا; دەزانیت چەند شەرمم کرد کە دەرهێنەری ئەم فلیمەی کە من پالەوانەکەیم، پێیگوتم کە من هیچ رەوشەنبیرێکی سێکسیم نییە، بۆیە مامۆستای سێکسی بۆ گرتم و هەموو رۆژێک سەعاتێک دەرسی سێکسم پێدەڵێت. ئێستاکە تێگەیشتم کە ئێمەی رۆژهەڵاتی بۆ دواکەوتووین، چونکە رۆژ تا بەیانی بیر لە سێکس دەکەینەوە و نایکەین. پیاوەکانمان ئەگەر گۆزینگی ژنێک ببینن ئەوا هەموو شەوەکەی خەویان لێناکەوێت و بیر لەم گۆزینگە دەکەنەوە تا گۆزینگێکی تر دەبینن. ئینجا بەم جۆرە نەتەوەیەک، ژن کارنەکات و پیاویش بیر لە گۆزینگیان بکاتەوە، چۆن بۆ پێشەوە دەچێت. بەڕاستی ئێمەی رۆژهەڵاتی ژنایەتی خۆمان دەکوژین، ژن ئەو ژنەیە کە هیچ ژنێکی تر لە سەرووی خۆیەوە نەبینێت. و هەردەمیش خۆی وا پیشان بدات کە بۆ رابواردن لە ژنەکانی تر خۆشترە. ژن دەبێت ژن بێت تا نێرینە بەلای خۆیدا راکێشێت. پەیوەندی نێر و مێ ئەلف و بێی سروشتە. کە دەرهێنەری فلیمەکەمان توڕە دەبێت هەر جارەی کچێک دەستی لە ملی دەکات و ماچی

دەکات و دەیبات بۆ هۆدەیەک. من وامدەزانی دەیبەن تا قسەی لەگەڵ بکەن تا هێور بێتەوە. نەمدەزانی دەچن لە گەڵی رادەکشێن تا پشوو بدات. کە بە مامۆستای سێکسم گوت دەیبەن تا قسەی لەگەڵ بکەن پێکەنی و گوتی دوایی تێدەگەیت. ئەو رۆژە نازانم بۆ دەرهێنەر بڵێی دە جار هەمان شتی پێکردمەوە و هەر وێنەیان دەگرت و دەیگوت نا ئەوە باش نەبوو لە کۆتایی دا من زۆر ماندو بووم و دەستم کرد بە گریان. دەرهێنەر یان بڵێین میسیۆ دوبوا دەستی لە سەر شانم دانا هەر وەک چۆن کچەکانی تر ئەویان ماچ دەکرد ئەویش بە هەمان شێوە منی برد بۆ هۆدەکەی کە من وامدەزانی هۆدەی وت و وێژە. لەم هۆدەیە ئەوەندەم زانی مسیۆ دوبوا کەوتە سەرم و شتەکە قەوما منیش ئیتر هیچم لەدەست نەما لەوەی زیاتر کە لە هەموو ژنەکانی تر خۆم بە خۆشتر پیشان بدەم. دوایی هاتینە دەرەوە مسیۆ دوبوا هاواری کرد هەریەکەی بۆ سەر شوێنی کاری خۆی. ئەمجارەیان هەرکە وێنەکەیان گرت وتی ئابەم جۆرەم دەویست واتا چاوت جوان بوو بەڵام سێکسی نەبوو، ئا ئێستاکە ئەوەی دەمویست بوو.

- کچێ نەکا بە ئەلێکساندەر بڵێن و ماڵت لێ تێکبدەن.

- من پێش ئەوەی ئەوان بە ساشە بڵێن خۆم دەستم بە گریان کرد و پێم گوت. ئەویش پێیگوتم، شتی شاردراوە خیانەتە، ئەوەی کە ئاشکرا بێت بۆ ئەو خیانەت نییە. ئەو دەڵێ ئەگەر دڵت چوو بۆ پیاوێک پێم بڵێ، کە من رێگام دایت لەگەڵی بخەویت ئیتر ئەوە خیانەت نییە. گرنگ ئەوەیە ئێمە پێکەوەین و پێکەوە ژیان دەبەینە سەر. من یەک لە بارە خۆم گەلێکم پێ ناخۆش بوو کە میسیۆ دوبوا وای لێکردم و گوتم دەمەوێت وازی لێبێنم. ساشە گوتی نەکەیت بیر لەوە بکەیتەوە و وازی لێبێنیت چونکە تۆ پەیمانێکت لەگەڵیا مۆر کردووە بە دە ملیۆن فرەنگ. ئینجا وەک دەبینیت جارێ نزیکەی سێ مانگت ماوەتەوە لەگەڵیان کار بکەیت.

ئەنگێلا گوتی :

- ئەوە زۆر بە کردەوە و بیری ماسۆنییەکان دەچێت.

ـ بە خوا من چاوم بە چاویان نەکەوتووە و نایانناسم. ئەنگێلا بەم نۆ مانگە ئەوەندە شتیان لێ فێربووم کە بە بیست و یەک ساڵ تەمەنم لە کوردستانا فێری نەبووم. سەیر کە مامۆستای سێکس ئەورۆژە گوتی: چ لە لای ئێمە بێت چ لە لای ئێوە بێت یان لە هەر شوێنێکی تر بێت ئەو شتە دەشارنەوە کە جوان نەبێت ئەوەی لەلایان جوانە پیشانی خەڵکی دەدەن. بۆ نموونەش لەشی ژن لە هەموو شتێک جوانترە، ئەی ئەگەر وابێت ئەم شتە جوانە بۆ بشاردرێتەوە؟

ـ ئەگەر وابێت دەبێت گشتمان خۆمان روتکەینەوە و لە رێگا برۆین تا پیاوەکان بە جوانی بە لەش و لارمان شادبن.

ـ منیش وام پێ گوت، گوتی نەخێر هەموو ژنێک ئازایەتی ئەوەی نییە خۆی رووتکاتەوە، چونکە هەموو شوێنێکی وەک یەکتری جوان نین. بۆیە هەر ژنەی شوێنێک دادەپۆشێت و شوێنێک بەرزدەکاتەوە و پیشانی خەڵکی دەدات.

ـ تێناگەم ساشە رازییە کە تۆ لەگەڵ مسیۆ دوبوادا بەم کارە هەڵسایت؟

ـ نەک هەر ئەوە شتی تریشم پێگوت دەربارەی دوو دۆستەکەی میسیۆ دوبوا، ئەو دوو پیاوەی کە لە تیاتر لە گەڵ مسیۆ دوبوا بوون. پێیگوتم چی تیایە ئەوە کارە و دەتوانێت ببێتە شوێنی روداوی سەیر سەیر. یەکەم شت پێمان ناخۆشە و دوایی بە پێکەنینەوە بە یادمان دا دێتەوە، یان سەردەمێکی تر هەر لە یادیشمان نامێنێت.

ـ تەنیا تۆ باسی ئەو ژنانە دەکەیت و دەڵێیت چی تیایە ئەگەر بە پارە خۆیان بفرۆشن. من لەم بڕوایە دام کە ئەو ژنانە، ژنی لێقەوماو و بێ چارەن.

ـ ئینجا لە ئێمەمانان لێقەوماوتر هەبێت دەبێت کێبێت؟ ژنێک بێ وڵاتبێت، بێ پیاوبێت، بێ ماڵبێت و بێ پارەبێت، لەمە زیاتر لە چی دەگەڕێی؟

ـ تەنیا، رووالەت شتێکە و ناوەرۆک شتێکی ترە. تەنیا گیان یەکەم شت ئێمە بێ وڵاتنین، بەڵکو لە وڵاتی خۆمان دەرکراوین دووەم ئێمە بێ پیاونین، چونکە بێ کەسنین. ماڵی هەموو کوردێکیش بۆمان کراوەتەوە. دەربارەی پارەش ئەگەر لە پارەی ئاسان نەگەڕێین وەک هەموو کەسێک دەتوانین کار بکەین وپارەش پەیداکەین. سەرەڕای ئەوەش من ناڵێم تۆ خۆت بەم جۆرە

دۆڕاندووه. بەڵام نابێت بڵێیت کە ژنی تر دەبێت بەم جۆرە خۆیان بدۆڕێنن. تەنیا گیان ئافرەت رەوشتێکی سەیری هەیە یان دۆخینی خۆی دەگرێت و نایهێنێتە خوارەوە، ئەگەر هێنایە خوارەوەش ئیتر پێی لێ هەڵدەبڕێ. وەک پەندێکی ئەڵمانی دەڵێ ژنم دیوە کە هەرگیز خیانەتی لە مێردی خۆی نەکردبێت، بەڵام تاکە ژنێکیش ناناسم کە یەک جار خیانەتی لە مێردەکەی کردبێت.

- ئەنگێلا ژیان فێرگەیە، لە ناخم دا نەفرەت لە باوەشی پیاوان دەکەم، لە رووالەتیش پێشوازییێکی گەرم لە ساشە دەکەم. ئەی گەر وا نەکەم وەک ژنێک ئەی چی بکەم؟ هەرچەندە ساشە هیچ ئاگای لێم نییە هەر خەریکی کاری خۆیەتی. جاری وا هەیە تا کاتژمێری چواری بەیانی کار دەکات کە دێتە ناو نوێنەوە هەموو لەشی بووەتە پەڕۆ. ئینجا من داوای چی لێ بکەم؟ هەر وەک خۆت تازە باست کرد و گوتت ئەوەندەی نەما بوو سواری شیرین بن. خۆی کار وایە بڕۆ لە هەر کارێک بگەڕێ خاوەن کار دەبێت سوار بێت دەنا شتێکت بۆ دەدۆزێتەوە و لە کار دەرت دەکات. ئینجا بە ناخێری گیانیان پارەی کارەکەش بە تەواوی نادەن. بەراستیت پێ دەڵێم ژن بچێت بۆ هەر لایەک هەر سواری دەبن. ئینجا گەر پارەی سوواربونەکە زیاتربێت لە پارەی کارەکە، بۆ وەری نەگرن؟ تۆ دەڵێیت بیر و باوەڕی ساشە بیر و باوەڕی ماسۆنییەکانە، ئینجا نازانم ئەو دەڵێ بەشی زۆری ژنان بە تاریکی دەیکەن تا کەس نەیانبینێت. ئەو پیاوەی کە ئەم کارە دەکات، ژن و منداڵی هەیە و نایەوێت ماڵی خۆی لەسەر شتێکی وا بچوک تێک بدات. ئەم جۆرە ژنانەش لە رۆشنایی خۆیان وا نیشان دەدەن، وەک بڵێی نە بایان دیوە و نە باران. کە باسی ئابڕووش دێت حەزرەتی مریەم لە چۆکیانە. خۆزیا هەموو شتێک بێ پێچ و پەنا و بە ئاشکرا روویان بدابا. ساشە دەڵێ شتی ئاشکرا شوێن بە درۆ لەق دەکات. گەر لە کۆمەڵگای فەرەنسی هەموو شتێک بە ئاشکرا بکرابا، ئیتر درۆزن چێژی لە درۆی خۆی وەرنەدەگرت. بەشی زۆری ژنە بە ئابڕوو و زمان درێژەکان زمانیان لاڵ دەبوو. ئەوساکە خۆشەویستی شوێنی بە کینە بەتاڵ دەکرد. ئێمەی مرۆڤیش دەگەڕاینەوە سەر سروشتی رەفتاری

سروشتیی. گەر لە سەر پەیڕەوی سروشت بڕۆین پێویستیمان بە نهێنی نامێنێت، لەهەموو کەسێک نزیک دەبینەوە. پێویستیمان بە درۆ و دەلەسە نامێنێت. ساشە دەڵێ ئێستاکە هەر کەسێکی کە بیگریت پڕە لە بیرەوەری شیرین کە نابێت هەرگیز بیاندرکێنێت بۆیە لەنێو سینگی دەبن بە ژەهرێکی کوشندە لە نێو هەناسەیان دا دەتوێنەوە و دێن و دەچن تا ئەو ڕۆژەی دوایین هەناسەی ژەهراوی لە نێو سییەکانیانا رادەوەستن و کۆتایی بە هەموو شتێک دێنن. ئەم بیرەوەریانە لەگەڵ هەناسە ژەهراوییەکەیانا تێکەڵ بە یەک دەبن و دەچنە ژێر خاکەوە. کچێ ئەنگێلا کە دەکەوینە نێو قسان کاتمان لە یاد نامێنێت. ئێستا تەکسییەکم بۆ بانگ کە تا بچمەوە ماڵەوە.

## دەرگای شەشەم

## گەڕەلاوژێی ئەستێرەکان

وەک ئاسایی گشتیان لە ماڵی کاک ئازاد کۆبونەوە. ئەم جارەیان شیرین یەکەم کەس بوو لە دەرگای ماڵیانی دا و هاتە ژورەوە. سکاڵا گوتی ئا ئەم جارەیان خۆت بە پێی خۆت هاتیتە ژورەوە و دەبێت بێیت بۆ ئاشپەزخانە، ببیت بە کابان و یارمەتیم بدەیت. شیرین تەزرەی لە باوەشی خۆی ناو ماچی کرد و تۆزێک شیرینی کڕی بوو بۆ مناڵەکان دای بە تەزرە و گوتی :

- تۆ بەشیکە.

ئینجا چوو بۆ موبەق هەموو شتێکی بۆ سکاڵا گێڕاوە لە کۆتایی دا گوتی :

- من لەم بڕوایەم کە مرۆڤ دوژمنی مرۆیە، یان مرۆڤ مرۆ خۆرە، بۆیە هەرگیز ناتەبایی تەواو نابێت.

- نەخێر گەر مرۆڤ دوژمنی مرۆ باوایە لە گوندەوە شار دروست نەدەبوو. شیرین گیان کۆتایی هەر ڕووداوێک لە گەڵ سەرەتای دەسپێکردنی دەست پێ دەکات. ئەم جۆرە ڕووداوانە نەیەکەم ڕوودانون لە مێژوی مرۆڤایەتی ڕوویانداوە نە دوایین ڕووداویشن. کەوابێت وەک ئازاد دەڵێ با ئەم ڕووداوە زل نەکەین. دەچین لە دادگەی گلەیی سکاڵا لە دژی بەرز دەکەینەوە. بەم جۆرە ئەم خاوەن کارە سزای خۆی وەردەگرێت، دەبێت پارەیەکی زۆریشت بداتێ. چونکە دەستدرێژی کردووە.

- ئینجا توخوا ئەمە قسەیە من بچم لە دادگە ڕاوەستم بڵێم ئا ئەم پیاوە دەستدرێژی کردە سەر ئابڕووم؟ تو خوا کاک ئازاد ئەمە قبوڵ دەکات من بچم باسی ئابڕووی خۆم بکەم لای کۆمەڵێک کە ئابڕووی خاوەن کار زۆر بە نرخ ترە لە ئابرووی کارەکەرێک یان بەرامبەر پارێزەرێکی بێ ئابڕوو ڕابوەستم و گوێی لێ ڕاگرم چۆن ئەم بێ ئابڕووە دەپارێزێت.

ـ من لەم بڕوایەدام کە ئازاد ئەم کردارەی سامانی بە دڵ نابێت. بەڵام تازە شتەکە رویداوە، با بزانین چۆن چۆنی لێی بێینە دەرەوە.
ـ کچێ سوپاسی خوا بکە سەرکەوتی ئامۆزام بەم رووداوەی نەزانیوە.
سکاڵا گوتی :
ـ هەر بۆیەش ئازاد پێیگوتم ئیمشۆکە سەرکەوت بانگ مەکە، تا کارەکە لەدەست دەرنەچێت. ئێستەش نەکەیت بەم شێتە بڵێیت. دوای ئەمەش با کوردەکان نەزانن چی روویداوە، ئەگینا شتەکە ئەوەندەی تریش زل دەکەن تا لە تام دەردەچێت.
ئازاد ئەم کۆبونەوەی بەتایبەتی بۆ ئەوە سازدا بوو تا باسی رەوشی تەزرە بکەن. بەڵام دەربارەی شیرین ئەو پێی خۆش بوو بەتەنیا لەگەڵ شیرین باسی بکات.
مامۆستا و ئەبونە وەک هەموو جارێک پێکەوە هاتنە ماڵی کاک ئازاد. سکاڵا کە چاوی پێیان کەوت گوتی :
ـ ئەوە دوو نورانییەکە گەیشتن ماڵەکەمان ئاوەدان بووەوە.
مامۆستا دەستی بە سینگییەوە گرت و گوتی :
ـ سکاڵا خان دەک رووت سپیبێت. خوایە لە دونیا و ئاخیرەت لە ژێر سایەی خودا بیت. ئێمە لە ژیانمان دا هەر گیانمان پاک دەکەینەوە، دەیپاڵێوین و رێگای راستتان نیشان دەدەین تا کاری باش بکەن و لە کاری خراپ خۆتان دوورکەنەوە. ئێوەش تا پێتان دەکرێت لە سەر رێنماییەکانمان بڕۆن هەرگیز زیانتان پێناگات.
ـ سامان بە خێرهاتنی لێ کردن و گوتی :
ـ بە پێچەوانەوە، لەم چەرخەدا لە ئێوە بەولاوە کەسی تر سنوور بۆ کاری چاک و خراپ دانانێت. گەر بە قسەی من بکەن ئێوەش واز لەم بابەتە بێ سودە دێنن. چونکە ئابوری دەستی بە سەر هەموو شتێک داگرتووە، وەک گشتمان دەزانین هیچ کەلێنێکی بە پاکی نەهێشتووەتەوە، بۆیە قسەی باش کەلکی نەماوە، تا گیانیشمانی پیس کردووە.

- سامان پێمخۆش نییە وا ساکارانە سەیری گیان بکەیت. تۆ وا دابنێ بوونەوەر لە ئێستاوە دەستپێدەکات، چونکە ئێستا و کۆتایی بۆ ئافەری ئەم بوونەوەرە جیاوازی نییە. مرۆڤیش وەک گیانلەبەرێک گیانی هەیەو گیانیش لە هەربوونەوە هەر هەبووە و لە کات بەدەرە. ئینجا تۆ باسی گیانی پاک و گیانی پیس دەکەیت. تا بە باشی تێمبگەیت. تۆ وەرە پتێک لە زێر دروست بکە، تا خەڵکی کڕنۆشی بۆ بەرن. هەر ئیمان دارێک پێدەڵێ ئەم زێڕە پیسە فڕێیدەنە دەرەوە. بەڵام هەر ئەوەندەی زێڕەکەمان تاواندەوە دەتوانین گومبەتی مزگەوتەکان "چاوێکی لە ئەبونە کرد" کلێسەکان بە هەمان زێڕ بڕازێنینەوە. یان هەندێک جار گوێت لێدەبێت کە دەڵێن پارەی پیس. بەڵام هەمان پارە دەکەوێتە دەستێکی تر پاک دەبێتەوە. ڕۆحیش بە هەمان شێوە ئەگەر بە خراپی بەکارمان هێنا دەڵێین پیس بووە، بەڵام هەر ئەوەندەی کە شوێنی گۆڕا ئیتر دەتوانێت پاکبێتەوە. هەر بۆ ئاگاداریت کە دەڵێین ئەم زێڕە پیسە، ئەوە هیچ لە ناوەڕۆکی زێڕەکە ناگۆڕێت. زێڕ هەر بە پاکی خۆی دەمێنێتەوە، بۆیە زێڕینگەر تاوانبار دەکەین نەک زێڕ.

شیرین گوتی :

- مامۆستا ئەی گیانە شەڕئەنگێزەکان چین؟

- شیرین خان ئاسن کە وەک کانزایەک، هەندێک کەس بۆ کاری خێر بەکاری دەهێنن و هەندێکیش بۆ کاری شەڕ. شەڕ و خێر پەیوەندییان بە ئاسنەوە نییە، واتا بۆمبای لێ دروست دەکەن. ئێمە ناتوانین بە بۆمبایەک بڵێین ئاسنی خێر، چونکە ئاسنی شەڕە، بە هەمان شێوە ڕۆحیش ئەگەر بۆ ئامانجی شەڕ بەکار هات دەبێت بە گیانی شەڕئەنگێزە، بەڵام وەک گوتم ئەوە هیچ لە ناوەڕۆکی ڕۆح ناگۆڕێت. بۆ نموونە، نەک بۆ پێکچوون، ڕۆح وەک پاترییەک وایە، ئەگەر لە ئامرازەکە دەرمانهێنا ئەوە ئامرازەکە لە شوێنی خۆی دەوەستێ. بە ڕاستی ئێمە لەو ئاستەدا نین وەڵامی ئەم پرسیارە دەینەوە. هەرچەندە گوناهیشمان دەگاتێ زۆر لەسەری بڕۆین، بۆیە پێتان دەڵێم؛ ناتوانم بڵێم ڕۆح چییە بەڵام وەک ووزە وایە ئەگەر خستمانە سەر ماتۆڕێک ماتۆڕکە دەخولێنێتەوە، ئەگەر چرابێت پێدەبێت، ئەگەر ئوتی بێت گەرم دەبێت.

وەک دەبینیت ئەم پاترییە بۆ کاری خێر و بۆ کاری شەڕ بەکاردێت. ئینجا ئێمە دەڵێین ئەم وزەیە وزەی شەڕە و ئەم وزەیە وزەی خێرە، بەڵام بێینە سەر راستی پاترییەکە یان وزەکە لە بەکار هێنانی خۆی تاوانبار نییە.

زەنگی دەرگا لێیدا سکاڵا دەرگای کردەوە، کە چاوی بە سەپان و چێنەر کەوت، دەم و چاوی تێک چوو. ئەوانیش هەستیان بەمە کرد، بۆیە پێکەوە داوای لێبوردنیان لە سکاڵا کرد پێیان راگەیاند کە زۆر بەداخەوەین بەم جۆرە و بێ بانگکردن سەرمان بە ماڵتان داگرتوە. ئازاد بێ ئەوەی بزانێ کێیە هاواری کرد فەرموون، لەو کاتەدا ئەوان داوای لێبوردنیان لە سکاڵا دەکرد، پاش فەرمانی ئازاد سکاڵاش دەرگایەکەی بەردا و هەردووک هاتنە ژورەوە.

سەپان بە دەنگێکی بەرز و لە خۆ بایی گوتی :

- دەرگای ماڵی کاک ئازاد وەک دەرگای مزگەوت و کلێسە وایە؛ هەموو کاتێک کراوەتەوە، دیندارەکانیش وەک مێروله لەناوی دا دەژین و کاردەکەن و لە ناوی دا دەتوێنەوە. بۆیە ئەبوونە و مامۆستا ئەم ماڵە بە ماڵی خۆیان دەزانن. ئێمەش سەیرێکی چێنەریشی کرد، خۆمان بە یەکێک دادەنێین لەم ماڵە وەک تنۆکە ئاوێک کە لە دەریا جیادەبێتەوە هیچ لە دەریا کەم ناکاتەوە کە دەگەڕێتەوە ناویشی، دەریا پێی زیاد ناکات، ئێمەش لە گەڵ ماڵی کاک ئازادا هەر بەم جۆرەین.

- "مامۆستا سەیری سەپانی کرد و گوتی" وابزانم تۆ هەموو شتێک بە بەراوازی تێدەگەیت. مالی کاک ئازاد دەتوانێت گەورە ماڵ بێت، یان هەر ناوێکی تری لێبنێیت. بەڵام ناوی دەرگای مزگەوت و کلێسەی نابێت لێبنێیت.

ئەبونە چاویلکەکەی لە چاوی کرد و سەیری سەپانی کرد و گوتی :

- هەریەکەی بە جۆرێک لە راستی دەگات هەر سەپان نازانێت راستی لە کوێیە. چونکە نوێژ ناکات نوێژیش ئەو کلیلەیە کە دەرگای راستی پێدەکرێتەوە. من یەک لەبارەخۆم هەر نوێژێک لە لای من چرکەی کلیلێکە بۆ کردنەوەی دەرگای پەروەردیگار.

چێنەر وەڵامی داوە و گوتی :

ـ ئینجا ئەبونە رەبەنی وا هەن هەر لە بەیانییەوە تا ئێوارە چرقە لە کلیلەوە دەهێنن و هەر وەک چرقەی دەنگی تەزبیحی شێخەکانی ئێمە. بڕواتانبێت ئەم چرقە چرقە نە دەرگاتان بۆ دەکاتەوە نە فرۆکەیەکتان بۆ دەفڕێنێ. ئەوا دونیا گەیشت بە کوێ و شێخ و مەلا و قەشەی ئێمەش هەر خەریکی چرقە چرقن.
ئەبونە بێ ئەوەی سەیری کەس بکات وەک بڵێی لەبەر خۆیەوە بیری دەکردەوە و سەری بادا و گوتی :
ـ بەداخەوە هەندێک هەن خۆیان لە ژورێکدا دەبەستنەوە، هەر لەگەڵ پێنج هەستەکەی خۆیاندا دەژین. گەر مرۆڤێک نەزانێت ژورەکەی خۆی بە مومێک ڕووناک کاتەوە، بە بڕوای ئێوە جیاوازی مرۆڤێکی وا و ئاژەڵێک چییە؟ ئەوانەی کە ڕێگایان گوم کردووە با باش بزانن کە هەر ئەندێشەی ئازادە مرۆڤ لە ئاژەڵ جیادەکاتەوە. مرۆڤ ئافریدەی هەڵبژاردەی خوداوەندە، خودا مۆمێکی پێمان بەخشیوە، ئاگرەکەشی داوەتە دەست خۆمان، هەر ئەوەندەمان لەسەرە بە مێشک بڵێین دایگیرسێنە. سەپان گەر دایگیرسێنیت بێگومان هەست بە گۆڕانێکی بنەڕەتی دەکەیت. ئەم دیوارە ئەستورەی نێوانی تۆ و بونەوەر دەبێت بە شوشە وەک کوێرێک لەنکاوێک چاوی بکرێتەوە و لە هەموو لایەک مۆمە هەڵگیرساوەکان تیشکیان بە سەری دا دەبارێنن. تۆ نازانیت جیهانی بڕوا بە خودا چییە: بۆیە دوو دڵیت لە هەڵگیرسانی مۆمی بڕوا. ئێوە بە پێچەوانەی ئەوەن کوێرە چیت دەوێت؟ چاوێکی ساغ. خودا هەزاران چاوی ساغی پێ بەخشیون. دە مۆمی دەروونتان پێکەن، تا هەست بە کامەرانی راستەقینە بکەن. ئێوە وا تێدەگەن کامەرانی پارە و پول و لەشی جوانە؟ لێتدەپرسم مۆمدانێکی زێڕین بە لەعل و مرواری بڕازێتەوە، گەر لە شوێنێکی تاریک دا بشاردرێتەوە دەبێت جوانییەکەی چی بێت؟ باش بزانە ئەم لەشەی تۆ وەک مۆمدانێک وایە و هەڵگری مۆمی خودایە، گەر بتەوێت جوانییەکەت نە فەوتێت، زوکە مۆمەکەت داگیرسێنە.
ـ مامۆسا گوتی راست دەفەرمووێت.
سەپان خۆی قیت کردەوە و گوتی :

ـ مامۆستا لێگەڕێ با مۆمی جەنابتان بسووتێ و جیهانی ردێن پانەکان رووناک کاتەوە. تێناگەم چاو ساغێکی وەک جەنابتان نابینن کوێرە بێ ئیمانەکان بەسەرتانا زاڵ بووون. ئەم جیهانە بەرین و پڕ مۆمەی کەسانی وەک ئێوەی بەڕێز بووەتە کونە مشک لە دەست بێ دینە رۆژئاواییەکان. هەر ئێوە بوون سوێندتان بە ریشیان دەخوارد، ئاوڕێک لە تاوانەکانی ئەمریکا دەنەوە. ئینجا باسی مۆم و مۆمدانم بۆ بکەن. نازانم ئێوە بە چاوە ساغەکانتان چی دەبینن؟... بەڵێ، بەڵێ هاتەوە یادم بە چاوە ساغەکانتان، ئێوە تەنیا سەرپۆشی ژنان دەبینن. باسی شادومانیم بۆ دەکەیت، گوایە پول و پارە و تەکنۆلۆژیا کامەرانیمان پێ نابەخشێت، بەڵام لە هەمان کات دا هەژاری و پێخواسی و برسییەتیش کامەرانیمان پێ نابەخشێت. تۆبڵێت رۆژێک ئەم مۆمەی ئێوە ئەم نەگبەتییە ببینێت؟ بەخۆتان دا وەرنەوە سەیرێکی هەژارەکانی خۆتان بکەن. ئەوانەی خودا بەسەری کردوونەتەوە و هەژاری کردوون، لە لای دۆستە کوێرە رۆژئاواییەکانتان خەریکی دزی و دەرۆزنی و خۆ فرۆشتنن. ئاگاتان لە چییە؟ ئەوا کچە کورد لە پاریس بۆ پارچە نانێک خۆیان دەفرۆشن.

ـ ئازاد قسەی بە سەپان بڕی و گوتی :

ـ دە هەندێک واز لە ئاین بێنن با باسی نەگبەتی خۆمان بکەین. سەیرکەن نرخی نەوتی ئێمە لە ئاوی کانیاوێکی ئەوروپایی هەرزان ترە. نەوتەکەمان مۆمێکە و دەسووتێ رۆشناییەکەی بۆ رۆژئاوایە و دوکەڵە رەشەکەشی نەگبەتییەکە و رۆژهەڵات دەخنکێنێت. خێر و بەرەکەتی بۆ خەڵکی ترە و خێرەکەی کە بۆ رۆژهەڵات دەمێنێتەوە ئەویش دەبێتەوە بۆمبا و بەری رۆژمان لێدەگرێت. با پێکەوە بیر بکەینەوە و بڵێین بۆ ئاوی کانیاوەکانیان بە نرخێکی گران دەگەنە زێرابەکانمان. بۆ نموونە نرخی لیترێک کۆکاکۆلا بەراوردکە بە نرخی لیترێک نەوتی خام. گشتمان باش دەزانین ئەوانیش باش دەزانن بێ نەوتی ئێمە ناتوانن بستێکیش بڕۆن.

چێنەر قسەی بە ئازاد بڕی و گوتی :

ـ ئینجا کاک ئازاد بەم دوو چاوساغە بڵێ با ئەم دوو هاوکێشەیە بەراوردکەن. با پێمان بڵێن چۆن کوێرەکانی رۆژئاوا واتا بێ ئیمانەکانی رۆژئاوا ئەم کارەساتە بەسەر چاوساغەکانمان دێنن؟ جا مامۆستای بەڕێز من ئەم مۆمە بێ دەستکاری دەدەمەوە دەست خاوەنەکەی، چونکە گەر خاوەنەکەی بیویستایە بەکاری بێنێت خۆی بە داگیرساوی وەک ئەندامەکانی تری لەشم پێی دەبەخشیم. بۆیە داوای لێبوردنت لێ دەکەم برۆ ئەم ئامۆژگاریانە بە یەکێکی تر ببەخشە.

سالار ئاگای لێ بوو ئازاد ئەم وت و وێژەی زۆر بە دڵ نییە و خۆشی لەم بابەتانە دورە پەرێز دەگرێت. بۆیە ویستی بابەتەکە ئاراستەی لایێکی تر بکات :

ـ براینە ئێوە چییە هەر بە دینتان گرتووە. لە یەکێک وابێت گیر و گرفتی ئێمە هەمووی دینە. ئەوەی من بزانم ئێمە ئاخر شت بیر لە دین دەکەینەوە. بەراستیشتان پێ دەڵێم کاک سەپان و کاک چێنەر لە تەمەنیانا باسی دین ناکەن، بەڵام هەر ئەوەندەی ئەبونە و مامۆستا دەبینن دەکەونە باسی دین. دە باسی نەتەوە بکەن باسی کرێکاران بکەن، باسی مافی ژنان بکەن. باسی شتێک بکەن کە گرفتی ئمرۆکەبێت، نەک کێشەی بە زۆر سەپێنراو بێت.

سەپان بە هێمنیەوە دەستێکی بەسەری خۆی داهێنا و هەناسەیەکی هەڵکێشا وەک بڵێی ئازارێکی زۆر دەخوات کە ئەم راستییە روون دەکاتەوە :

ـ هەتا کەی ئێوە باسی میللەتان و کرێکاران دەکەن؟ ئەمانە وەک بنێشتە تاڵەن باویان نەماوە و کاتیان بەسەر چووە.

ئازاد بە گاڵتە جارییەکەوە گوتی :

ـ قوربان تەلەڤیزۆنەکەی ماڵەوەت چەند جوانبێت، بە فلسێک ئەگەر کەهرەبا نەبێت، چینی کرێکار ئەو وزەیە کە ئابووری دەبزوێنێ. دەقسەی خۆت تەواو بکە دەی.

سەپان خۆی نەشێواند.

ـ با باسی هێزی بزوێنەری نەتەوە بکەین. با باسی ئابووری بکەین.

- دەتەوێت بێ چینی پرۆلیتاریا باسی ئابووری بکەیت؟ هەرنەبێ دەبێ بزانیت کە سامان سەرمایە نییە. کەی سامان بەکارهات دەبێت بە سەرمایە، بێ کرێکاریش بەکارنایەت.

- ئەو میللەتانەی کە دەوڵەتیان نییە، چ کاریان بە دەوڵەت هەیە، دەوڵەت چییان بۆ دەکات؟ هەر نان و زگ نییە؟ ئەو میللەتانەی دەوڵەتیان هەیە لە دەوڵەتی خۆیان هەڵدێن تا لە شوێنێک بە نان و زگ کار بکەن. بۆ ئەوانە ئەو دەوڵەتەی لێی هەڵاتوون باشترە یان ئەو دەوڵەتەی نانی لێ دەخۆن باشترە؟ بۆ نموونە بروتۆن و نۆرماند زمانی خۆیان لە یاد کردووە و بە فەرەنسی دەدوێن، هیچیشیان لێ کەم نەبووەتەوە، وەک هەر پاریسییەک لە کار دەگەڕێن و کار دەکەن. فەرەنسا هەوڵدەدات ستراسبورگ کە پایتەختی ناوچەی ئەلزاسە کە بە رەچەڵەک ئەڵمانن بکات بە پایتەختی ئەوروپا.

- ئەرێ بۆ کلکی رێویمان نیشاندەدەیت و سەری دەشاریتەوە؟ تۆ ئەڵمانێکت دیوە بڵێ من هۆڵەندیم یان دانیمارکیم؟ بەڵام گشتیان دەڵێن ئێمە ئەوروپین. سریانییەک، ئاسوورییەک، کلدانییەک، ناڵێن ئێمە کوردین، بەڵام دەڵێن ئێمە کوردستانیین. ئێمە نامانەوێ بە زۆرداری بیبانکەین بە کورد، و خۆشترین گەڕەکی هەولێر عەنکاوەیە.

سەپان گوتی:

- با قسەی جەنابتانبێت. ئێستا چەرخی سەرمایەدارییە، هەموو کەسێک دەیەوێت ببێت بە سەرمایەدار. سەرمایادارەکانیش پێیانخۆشە، لەوەش زیاتر کەس لاری لەسەر ئەوە نییە کە کرێکارێک ببێت بە سەرمایەدار، بگرە با ئەم کرێکارە فەرەنسیش نەبێت. بەڵام تواناى ئەوەی هەبێت ببێت بە سەرمایەدار. تۆزێک بە مێژوودا وەرنەوە.

ئازاد گوتی :

کاتی خۆشی کوێلەکان خەونیان ئەوەندە بە ئازادی خۆیانەوە نەدەدیت ئەوەدەی گیرۆدەی ئەوە بوون، کوێلەیان هەبێت، بەڵام کوێلایەتی هەر لەناوچوو.

لێمگەڕێ با قسەکانم تەواو بکەم :

- سەیرێکی سۆمەری و بابلییەکان بکەن بێ زۆرداری خۆیان لە نێو نەتەوەکانی تر دا تواندەوە. وەک تنۆکە ئاوێک کەوتنەوە ناو ئاوی دەریا، هەزارانی وەک من و تۆ تا ئیمڕۆکەش بێ ئەوەی بیانناسین سەریان بۆ دادەنوێنین. ناپلیۆن فەرەنسی نەبوو بە رەچەڵەک کۆرس بوو، فەرەنسا شانازی پێوە دەکات. ئەلێکساندەری مەزن گریک نەبوو، یۆنان شانازی پێوە دەکات. سەلاحەددین عەرەب نەبوو، عەرەب شانازی پێوە دەکات. بۆی هەیە پێمبڵێن ئەوانە تاکە کەسن؟ بەڵام با وابێت ئەی بۆ یەکەم دەوڵەتی رووسی ئوکرانییەکان دایانمەزراند؟ دەبێت ئەوانە هەمویان هەڵەی مێژوویی بن؟

- کاکی خۆم کاتی خۆی ئەوانەش یەک نەتەوە بوون وەک کورد و فارس.

- ئینجا ئەوە گرنگ نییە، گەر ئەوانە گشتیان هەڵەبن، مێژوو لە سۆمەریەکانەوە دەستپێدەکات، کە هێزی ئابوورییان کەوتە شکستی خۆیان لە نێو میللەتەکانی دەور و بەریان تواندەوە. گەر فەرمایشتی ئێوە راست بێت، هەر لە سەرەتاوە مێژوو بە هەڵە دەستی پێکردووە و بیر و بۆچوونی مارکس دەربارەی مێژوو فت.

ئازاد ویستی قسەی پێببڕێ :

- کاکە سەپان هەرچەندە خۆتان بە مێژووزان دەزانن، بەڵام من پێتدەڵێم، مێژوو کەرپووچی کات نییە لەسەریەکیان ریزکەیت و بڵێیت، مێژوو ئەوەیە. دەبێت باش تێبگەیت ئەوانەی کە تۆ باسیان دەکەی مێژوو نین رووداوی مێژوویین. بۆ نموونە تۆ دەبیت بە عەرەب یان هەرنەتەوەیەکی تر پەیوەندی بە مێژووەوە چییە؟ راستە میللەتان لەنێو یەکدا دەتوێنەوە، بەڵام کرداری ئاوێتەیی دوو نەتەوە بە ساڵێک و دوو ساڵ نابێت. ئەوە سەدان ساڵی دەوێت گەر زیاتر نەبێت. وا دیارە هەنێک شت هەیە نایانزانیت. لە مێژوودا خێلی وا هەیە چەندین نەتەوەی گەورەی لێکجیاوازی لێبۆتەوە، وەک خێڵەکانی "هوون". زۆر بەداخەوەم تۆ وا دەزانیت ئایین هەر ریشێکی پانە. من پێتدەڵێم ئامانجی ئایین ئەوەیە کۆمەڵگا بەڕێوە ببات، بەشێوەیەک لە تاکەوە بۆ گشت واتا لە لە ئەندێشەوە بۆ گشت لە گشتەوە بۆ ئەندێشە. ئێمە دەڵێین لە سستێمێکی مەتریالیستەوە دەستپێدەکەین بۆ سەرەوە بە شێوەیەکی حەلەزۆنی.

له ساڵی ١٧٦٩ جیمس وات James watt که دیتی هەڵم له توانای دایه شت بەرزکاتەوه، یەکەم ئامرازی هەڵمی درووست کرد. ئەوه بوو بە هەوێنی پێشکەوتین ئابووری، نەک وەک جەنابت بیردەکەیتەوه که پوول و پاره کۆمەڵگا بۆ پێشەوه دەبەن.
سەپان قسەی به ئازاد بڕی :
ـ دیندارەکانمان باسی خودای گەورەمان بۆ دەکەن، له مێژوو دا هەر گوندێک و هەر شارێک و هەر خێڵێک خودایەکی گەورەی خۆی هەبوو. شار و گوند و خێڵەکان یەکتریان گرت، خوداکانیان کرد به یەک خودا.
رووی له ئازاد کرد، کاک ئازادیش ئەوه باش دەزانێ.
ئازاد قسەی پێبڕی و گوتی :
ـ بەیارمەتیت بەناوی خۆت قسه بکه، ناوی من مەهێنه.
سەپان داوای لێبوردنی کرد :
ـ خودا بچووکەکانیش بوون به فریشتەی خودای گەوره. میر و ئاغا و بەگ و پاشای شارەکان بوون به راوێژکار و وەزیری شای نوێی ئەم کۆمەڵگایه. ئیمڕۆکەش هەمان شت رودەداتەوه، جاری جاران له ناوچەیەکی بچووک دا سێ زل هێز پەیدا دەبوون، به شێوەیەک له شێوەکان دەبوون به زل هێزێک، یان ئەوەندەیان لەیەک دەکوشت تا زلهێزێکی لاوەکی دەهات و هەرسێکیانی هەڵدەلوشی. هەموویان پێکەوه دەبوون به زل هێزێکی نوێ. ئێستەش کورد و عەرەب و تورک و فارس ئەوەندەیان لەیەک کوشتووه، بێ ئەوەی ئاگایان له سێ زل هێزی جیهانی بێت که خۆیان گەلاڵه دەدەن: وڵاته یەککگرتووەکانی ئەمریکا، وڵاته یەککگرتووەکانی ئەوروپا، بێچووه پڵینگەکانی رۆژهەڵاتی ئاسیا. جا دەمەوێت باش بزانن، چەند ددانمان تیژبێت چەند مێژوومان کەون بێت، نابین به پاروێکی هەر یەک لەم زلهێزانه. ئیتر پێویست ناکات بەرگری له رابردوویەکی بەسەرچوو بکەین. واتا کۆنەکا بەبادەینەوه، ئێ...، خودا بکات دانەوێڵەیەکی تیا بدۆزینەوه.
ئەبوونه گوتی:

ـ سەپان کوری خۆم، دەزانم زانیاریت زۆرە، بەڵام تۆ هەموو زانیارییەکان و رووداوەکان وەک تۆپێک لێژدەکەیتەوە، ئیتر بەر چی دەکەوێت و بەر کێ دەکەوێت گرنگ نییە. بەس پێمبڵێ کەی کورد تاران یان ئەستەمبول یان بەغدای داگیر کرد؟ دەزانم وەڵامەکەت پێنییە. بۆیە کورد داگیرکەر نییە لە پێناوی ئازادی خۆی دەجەنگێ، بۆیە هەموو شتێک تێکەڵمەکە.
ـ هەریەکەی بە زمانی خۆی بە شان و بازوی خۆیدا هەڵدەڵێ؛ عەرەب رۆژ تا ئێوارە پەسنی زمانی خۆیان دەدەن، ئەو زمانەی هیچ عەرەبێک پێی نادوێت. ئێمەی کوردیش تازەبەتازە بە تەماین زمانی یەکگرتووی کوردی دابنێین، واز لە تورکی بێنە خۆ کە دەدوێن دەڵێی بەرد لە بەرد دەدەن. بە راستیتان پێ دەڵێم ئەوروپاییەکان مێژووی ئێمەیان قبوڵە، ئینجا پێویست ناکات کۆنە کا بە بادەینەوە. چی تیایە گەر بە بەئینگلیزی بنووسین و وەک هیند و پاکستان بە زمانی خۆمانیش بدوێین.
ئەبوونە گوتی :
ـ دیسان هەمووت تێکەڵ کرد، پاکستان و هیندستان زمانی ئینگلیزی لەلایان زمانێکی سەرەکییە، بەڵام پاکستان بە پیتی عەرەبی دەنووسن هیندیش زمان و پیتی خۆیان بەکار دەهێنن.
سەیری دێهاتییەک بکە تەنها بیر لە پارچە زەویەکەی خۆی دەکاتەوە، نیشتمانپەروەرێک بیر لە خاکی نەتەوەکەی دەکاتەوە، بەڵام کۆسمۆپۆلیتێک بیر لە خڕۆکەی زەمین دەکاتەوە. هێدی هێدی خڕۆکەی زەمین دەبێت بە گوندێکی بچکۆکلانە. گوندێکیش وەک جاری جاران پێویستی بە یەک خودا و یەک ئاین یەک زمان هەیە. مێژوو خۆی دووپات دەکاتەوە. ئەوەندەی خوداکان ببن بە یەک ئەوەندەش دەوڵەت بەهێز دەبێت. سەیرێکی ئیسلام بکە رۆژێک لە رۆژان ئاینێکی بەهێز بوو، هەرکە تورکە مەنغۆلییەکان هاتن، تا دەست بەسەر یەکپارچەیی و گەورەیی ئیمپراتۆرییەتی ئیسلام بپارێزن، بوون بە ئیسلام. ئیسلامیان کرد بە ئەنگوستیلەیەک و لە پێناوی بەرژەوەندی خۆیان بە کاریان هێنا. لەو رۆژەوە کە تورک بوون بە ئیسلام ئەستێرەی

ئیسلام کزدەبێت و گلۆرەی سەربەرەو لێژی دەڕوات، ئیتر لەوە زیاتر چیتان دەوێ؟

ئازاد گوتی :

- سەیرە ئەم هەموو زانیارییە تا راستی چەواشەکەیت؟ کاک سەپان باسی زل هێز دەکات. بە ئێمەش دەڵێت باسی میللەتان و کرێکاران مەکەن باویان نەماوە. باشە ناوی دەوڵەتێکم پێ بڵێ کە نەتەوەکەی لە کرێکار و جوتیار و بازرگان پێکنەهاتبێت. شتێکی گرنگ بۆ کاک سەپان ڕووندەکەمەوە کە ئەویش هەر نەتەوەیەک دەتوانێت زمانێکی هەبێت بە هیچ زمانێک نەچێت، ئایینێکی تایبەتی خۆی هەبێت، کە رەگی لەگەڵ هیچ ئایینێکی کە ئێمە دەیانناسین نەبێت، هەرنەبێت دەبێ لە کار کردن وەک نەتەوەکانی تر بێت تا لە ریزی نەتەوەکانی تر بوەستێت. بە بڕوای من رەنگ، زمان یان ئایین، نەتەوەیەک بەسەر نەتەوەییکی تر ناخات. هەر کار و سەرەنجامی کار واتا بەرهەم دەتوانێت نەتەوەیەک بەسەر نەتەوەیەکی تر بخات. هیچ هێزێک ناتوانێ بە بێ بەراتی کاری کرێکارەکانی ببێت بە زلهێز. وەک دەبینیت لە سەرەنجامی کار هێز پەیدا دەبێت. چۆن دەبێت سەرەنجام واتا هێز باوی هەبێت بزوێنەری سەرەنجام کە بەرهەمهێنەرە باوی نەبێت؟

تۆ باسی زمان دەکەیت و نازانیت بۆ زمانێک بەسەر زمانێکی تر دەکەوێت. ئابووری نەتەوەیەک زمانی نەتەوەیەک بەسەر زمانی نەتەوەیەکی تر دەخات. وەک دەشزانیت هیچ ئابوورییەک بێ کار و کرێکار ناتوانێت هەبێت. وەک دەبینیت لێرەش هەر کرێکار دەستێکی باڵای هەیە لە بڵاوکردنەوەی زمانەکەی خۆی.

چێنەر بە لوتبەرزییەکەوە سەیری ئازادی کرد و گوتی :

- ئێوەی مارکسی نەخۆشی چینی کرێکارن و لاتان وایە چینی کرێکار چینێکی پیرۆزە و لە ئاسمان هاتۆتە خوارەوە، "بۆچ بەم شێوەیە سەیرم دەکەن"، من کە دەڵێم ئێوە نەخۆشن، واتا لێتانبووەتە نەخۆشی دەروونی، بە خۆڕایی وا ناڵێم: ئەگەر پەرداخێک نیشانی ئارەق خۆرێک بدەیت لێ بپرسیت ئەمە چییە؟ دەڵێت ئەم پەرداخە بۆ ئارەق خواردنەوە باشە. ئەگەر نیشانی فیزیاییەکی

بدەیت ئەوا بۆت باس دەکات ئەگەر ئەم پەرداخە بەم شێوەیە بکەوێت چۆن دەشکێت و ئەگەر بەم شێوەیە بکەوێت بە شێوەیێکی تر دەشکێت یان ناشکێت. ئەگەر نیشانی کیمیاوییەکی بدەیت ئەوا بۆت باس دەکات کە ئەم پەرداخە لە چی پێک هاتووە. لە کۆتایی دا ئەگەر پیشانی مارکسییەکی بدەیت ئەوا بۆت باس دەکات چینی کرێکار چەند کاری تێدا کردووە و چەن چەوسێندراوەتەوە تا ئەم پەرداخە دروست کراوە.
بە قسەی ئێوەبێت زمانی ئێمە زمانی کوێلەکانە، نەک زمانی خاوەن کوێلەکان. ئەوەی من بزانم زمان زمانی بەڕێوە بردن و دەوڵەتە، نەک زمانی بەڕێوە براو، واتا وەک خۆت دەفەرمویت، زمان زمانی ئابورییە، کێ ئابوری بەهێز بێت زمانی ئەو بەسەر دەکەوێت.
سکاڵا خۆی پێنەگیرا وا هێرش بکەنە سەر ئازاد بۆیە لە مەتبەخەکە هاتە دەرەوە و دەستی لە ناوقەدی نا و گوتی :
- ئای ئای ئەی زمانزان، مامۆستای زمانی کوردی، بڕۆ بۆ لای ئاسینگەرێک دارتاشێک بزانە ناوی ئامرازەکانیان دەزانی؟ کاکی خۆم سووک و ئاسان ئەوەی بە ئامرازێک کاربکات یان داهێنەرییبێت ئەوا ناوی لێدەنێ، هەروەک چۆن ئێمە ناو لە منداڵی خۆمان دەنێین، ئەگینا کەس ناویان نازانێت.
- خوشکی گەورەمی نامەوێ باسی زانیاری خۆمت بۆ بکەم. لە کۆتایش دا ئەگەر ئەو چینە پیرۆزەی ئێوە، چینێکی زیرەک بووایە و شایەستەی ئەم هەموو قوربانیەی کە ئێوە بۆی دەدەن بووایە ئەوا سەرم بۆتان دادەنەواند. دەبا تۆزێک ئەم کرێکارانە خۆیان ماندو بکەن و بخوێنن نەک لە سەر شەقامەکان بسووڕێنەوە. ئەوانیش دەبوون بە ئەندازیار و کیمیاوی و دوکتۆر. دیارە ئەم چینە هەر شایەستەی ئەوەیە کە هەیەتی، ئەگەر زیرەک بووایە دەیخوێند. خاوەن کارەکان نەیان دەچەوساندنەوە بەڵکو مافی خۆیان دەدانێ.بۆ نموونە دیارە ئێمە پیرۆزترین لەو دارەی کە وەک سووتەمەنی یان بۆ بژێوی ژیان بەکاری دەهێنین. کرێکاریش سووتەمەنییە بۆ چینەکانی تر دەسووتێ.
ئازاد سەیری چێنەری کرد و گوتی :

ـ كاك چێنەر، قسەكانت وەک بای ناو دەبدەبە وان كە لە نێو مەجلیسێک دا دەتەقنەوە و لە دەنگ بەولاوە هیچی ترت بۆ نامێنێتەوە. تەقینەوەی دەبدەبەش هێندە ناخۆشە, بەڵام چی بكەین منداڵ پێیان خۆشە. بۆ ئاگاداریت تۆ هیچ زانایەكت دیوە ملیاردێر بێت؟ بەشی زۆری فیزیاوی و كیمیاوی كە باسیان دەكەیت لە لای ملیۆنێرەكان كار دەكەن یان كار بۆ ئەوان دەكەن بە بیری ماركسی ئەوانیش كرێكارن كە وا بوو كرێكار ئەو كەسەیە كە كارێک ئەنجام دەدات. ئینجا ئەم كارە كارێكی فیكری یان كارێكی ماسولكەیی بێت گرنگ نییە پێیدەگوترێت كار. ئینجا پێم خۆشە بە بیرۆكەی خۆت دا بێیتەوە، تا وەک دەبدەبە نەتەقیتەوە. تۆ باسی زمان دەكەیت وەک بڵێیت زمان زمانی سەرمایەیە. لە راستی دا زمان زمانی كارە وەک، سكاڵا دەڵێ، گەر بچیتە لای نەجارێكی خۆمان، هەر ئامرازەی كە لە لایەتی ناوێكی بە كوردی هەیە، بەڵام ئەو ئامرازانەی كە لە دەرەوە بۆی هاتوون بە هەمان وشەی بێگانە ناوەكەیان دووپات دەكاتەوە. ئینجا ئەم وشەیەش دارتاشەكی بێگانە ناوی لێناوە و بۆ دارتاشەكەی ئێمەی ناردووە. بۆ زانیاریت ئەگەر بە زمانی سەرمایەدارەكەش لە سەرمایە دارەكە بپرسیت واتای ئەم وشەیە نازانێت كە لە دارتاشە بێگانەكە فێری بووە. وەک دەبینیت زمان زمانی كارە نەک زمانی سەرمایە. ئێستاكە تۆ خۆت بچیتە لای ئاسنگەرێكی كورد لە دەزگا و چەكوچ بەولاوە ناوی هیچ ئامرازێكی تریان نازانیت. جەنابی كاک چێنەر دەتوانم بە دەیان نموونەت بۆ بێنمەوە كە كرێكار بونەتە خاوەن كار و ئەو ئەندازیارەی كە تۆ دەڵێیت زیرەكە و خوێندوویەتی لە لای ئەم كۆنە كرێكارانە كار دەكەن. ئێمە دژی چەوسانەوەی مرۆڤین بەدەستی مرۆ. وەک دەبینیت ئێمە بەدوای ئامانجدا وێڵین و خۆمان بە كوشت دەدەین، ئێوە بەدوای هەست و نەستی خۆتان كەوتوون "وەک كوێلەكان دەتانەوێت ببن بە خاوەن كوێلە" بەڵام ئێمە دەزانین ئەم هەستە نامانگەیەنێتت بە ئامانج واتا نەمانی سەرمایەداری، بۆیە ئێمە شادین بەوەی كە ئاشناین بە ئامانجمان. ئێمە لەو بڕوایەداین كە ئامانجی ئێمە كامەرانی گشت مرۆڤایەتییە. هەر بۆیەش كاكی برا من و تۆ لەگەڵ یەک تەبا نین و بیرمان لەگەڵ یەک ناگونجێت ئێمە بە پێویستی دەزانین هێڵی نێوان

دەوڵەمەندی و هەژاری رەشکەینەوە و پشتگیری ئازادی نەتەوە ژێردەستەکانیش بکەین.
مامۆستا سەیرێکی ئازادی کرد وەک بڵێی رێگام بدە من دەیقۆزمەوە:
. هەستکردن شتێکە لایەکی راستیمان پیشان دەدات، ئەویش ئەوەیە کە هەستی پێدەکەین و دەیبینین. بۆیە کە دەگەینە راستی ئەوا دەیان لایەنی ترمان لێ ون دەبێتەوە. بۆی هەیە بە هەست کردن بەرەو راستی برۆین، لە هەمان کاتیشدا راستی دورمان دەکاتەوە لە هەست. لەوکاتەی ئەندازیار هەربەردێکی ئەم خانووە دروست نەکراوە دەپێوێ و ئەندازەی بۆ دادەنێ، بە دەستی کرێکاریش بە ئەنجامیان دەگەیێنێت، وا هەست دەکات کە بەسەر سوروشت دا زاڵ بووە. جا ئەوە گرنگ نییە ئەوە خانوبێت، پرد بێت یان دەربەند بێت، بۆ سروشت هەمووی وەک یەکە و پێکەنینی بە ئەندازیار و کرێکاران دێت. چونکە سروشت دەزانێت لە کۆتایی دا هەر خۆی بەسەریان دا زاڵ دەبێتەوە. دەمەوێت تێمبگەن سروشت لەلای من واتای کردەی کردیگار دەگەیێنێت. ئێمەی دیندار ئەگەر کارێک هەڵسەنگێنین ئەوا بە گوێرەی گونجانی لەگەڵ ناوەرۆکی دەروونمان هەڵی دەسەنگێنین. تا بڕیار بدەین ئەم کارە تا چ پلەیەک رەنگدانەوەی ئیمانمانە. بۆ نمونە هیچ ئیماندارێکی موسڵمان ریبا و سەلەم قبوڵ ناکات، هیچ ئیماندارێکی موسڵمان ئیماندارێکی تر ناکوژێت، با لە دینی خۆشی نەبێت.
سالار گوتی:
. بەڵام لە یادت نەچێت لە رۆژهەڵاتی ناوەڕاست دا کورد لە هەموو نەتەوەکانی تر بە ئیمان تر بووە بۆ ئیسلام. بەڵام چ عوسمانییەکان کە گووایە کۆڵەگەی ئیسلام بوون دەستیان تا ئانیشکیان بە خوێنی کوردە موسوڵمانەکان سوورە. ئێران لەوان خەراتر گوایە ئێستەش کۆمارێکی ئیسلامییان هەیە، لە خوێن رێژتن هەر بەردەوامن. مامۆستا کە باسی سروشت دەکەیت ئەوا سەرمایەداری سروشت تێک و پێک دەدات و هێدی هێدی بەرەو گەرمی دەبەن. ئەو سروشتەی تۆ باسی دەکەیت بەرامبەر بە سەرمایە بێ هێز و تووانا راوەستاوە. کە باسی ریبا و سەلەم دەکەیت ئەوە

داهێنانی جوولەکەیە و دەڵێن لە تەوراتا حەلال کراوە، هەر بۆیەش گەر سەرمایەداری سەروەری ئابووری سەردەمی ئێمەبێت، جوولەکەش سەروەری سەرمایەداری ئیمڕۆکەن. سەیرکە سەرمایەی جوولەکە سروشت لە رەگەوە هەڵدەتەکێنێ، خوداش بەنی ئیسرائیلی لە نەتەوەکانی دیکە بەرزتر هەڵسەنگاندووە.
مامۆستا گوتی :
- من نامەوێت بکەومە ناو ئەم باسەوە، بە پێچەوانەوە سروشت خۆی سروشتە چ سارد بێ چ گەرمبێت، ئینجا هێدی هێدی مرۆڤ سروشت بەرەو گەرمی دەبات، یان بڵێین بە هێزی تەکنەلۆژیا بەرەو گەرمی دەیبەن، تا رۆژێک دێ مرۆڤ گۆڕی خۆی بەدەستی خۆی لێدەدات و بەرگەی گەرمایەکە ناگرێ و لە ناو دەچێت. ئینجا پاش نەمانی مرۆڤ سروشت هێدی هێدی دەگەڕێتەوە بار و دۆخی جاری جارانی. تا باش بزانیت مرۆڤ بەسەر سروشتا زاڵ نابێت.
ئەبونە گوتی :
- ئەوەی من تێیبگەم ئەوەیە کە مرۆڤ دەستکاری کاری خودا دەکات و خوداش درەنگ یان زوو کینەی خۆی بەسەریان دا دەبارێنێت. خودا پێی خۆشە کار بکەن تا بژین نەک کار بکەن تا تێکبدەن. خودا پێی خۆشە هەریەکەی لە شوێنی خۆی کار بکات کەس چاوی لە شوێنی کەس نەبێت. پێشبڕکێ لە پێناوی رەزامەندی خودا بکەن نەک لە پێناوی پارە پەیدا کردن.
ئەنگێلا دەستی ئومێدی گرتبوو تا دەستی بشۆرێت، لە شوێنی خۆی راوەستا وەک بڵێیت چاوەڕێی ئەمەی دەکرد. هەڵیدایێ و گوتی :
- لە چەرخەکانی ناوەندی سەدی هەفتای زەوی لە ژێر دەستی کەنیسە و شێخ و مەلا و ئەوقاف دا بوون. ئینجا "چەپەڵۆکێکی لە رانی خۆی دا و سەیری هەموویانی کرد" جووتریاریش لە برسانا دەمرد. ئەبونە، تۆ باسی ئەم چاکەیە دەکەیت؟ بەرنامەی کەنیسە ئەوە بوو لە سەر زگی برسییەکاندا بژیت؟ ئامانجی کەنیسە پارە پەرستییە یان خواپەرستییە؟ من ئەم قسەیەم قەت نەدەکرد ئەگەر ئیمڕۆکە ئایین پشتگیری لە سەرمایەداری نەکردبایە. تا

دوێنێکەش کەس نەیدەوێرا باسی دابەشکردنی زەوی بە سەر جوتیاران دا بکات. ئەوا یەکسەر مەلا و شێخەکان دەمیان دەکراوە و دەیانگوت ئەوە کوفرە چونکە ئەوە زەوی باب و باپیرانی ئاغایەکانە؛ نالێن بە چ زۆر و زۆرداریییەک دەستیان بەسەر ئەم زەوییانە داگرتووە. ئینجا تا ئێستەش کێ دەوێرێت لای پیاوی ئاینی باسی سۆسیالیزم بکات یەکسەر بە کافر و زەندیقی لە قەڵەم دەدەن، چونکە خودا هەژار و دەوڵەمەندی داناوە دەبێت پێی رازی بین بە قسەی ئەبونە "خودا پێی خۆشە هەریەکەی لە شوێنی خۆی کار بکات کەس چاوی لە شوێنی کەس نەبێت"،کورد گوتەنی، خودا لە کێو دەنۆڕێت ئینجا بەفری تێدەکات. بەم قسەیەبێت ئەوەی بێ بەشە مستە حەقیەتی کە نییەتی، چونکە خودا نەیویستووە بیداتێ. کە هەست دەکەن ناتوانن جووتیارەکان بە لای خۆتانا راکێشن ئەوا دەکەونە درۆ و دەلەسە، بێ شەرمانە دەڵێن ئەم سۆسیالیستانە سواری خوشکی خۆیان دەبن. هەر خۆشتان دەڵێن درۆ دوژمنی خودایە. سەیرکەن ئەو خودایەی کە گوایە ئامانجی ئێوەیە چی لێکردن؟ چاوتان لەو جیاوازی ئابروویی نێوانی خۆتان و ئەوروپا دەپۆشن. بۆ ئەوروپا ئابووریتان بەسەر ئابروو دەخست. بۆ نەتەوەکەی خۆشتان هەر خەریکی چنینی درۆ و دەلەسە بوون. فەرمون ئەوا رۆژئاواتان هێنا ناو وولاتەکەمان، قورئان نەما نەی سووتێنن ، مزگەوت نەما نەیرووخێنن، مەرقەد نەما تۆپی پێوە نەنێن؛ سەرەڕای ئەمەش، لە ژێرەوە هەر ئەوانتان لە ئێمە زیاتر خۆش دەوێت. زۆر بەداخەوەم کە دەکەونە قسە کردن. راستگۆیی هەر لە ئێوە دەبارێ، بەڵام هەرگیز ئەو راستییە نادرکێنن کە بە دڵ سەرکەوتنی ئەمریکییەکانتان پێ خۆشە. چونکە ئەگەر دەستکاری ئابڕووتان بکەن دەستکاری سەرمایەکەتان ناکەن. یەکسانی بەفری کێوەکانیش هەر بەتەرازوی ئێوە دەکێشرێت. ئەی نوێنەرانی خودا لە سەر خاک گەر ئازایەتی ئەوەتان هەبێت بە مێژووی خۆتانا بێنەوە داوای لێبوردن لە خودابکەن و بڵێن خودایە لێمان ببورە لەسەر رووی زەمین ئێمە نوێنەری تۆ نەبووین، ئینجا نوێنەری کێ بووین نازانین.

مامۆستا رووی لە ئەبونە کرد و بە پسکە پسک گوتی :

ـ ئەبونە کۆمەڵگای ئێمە ئەوەندەی ئیمانداری تێدایە ئەوەندەش بێ ئیمانی تێدایە، بۆیە لە شوێنی خۆمانا هەڵدەپەڕین و نە بۆ پێشەوە دەچین نە پاشەوپاش دەگەڕێینەوە. نە دەژین و نە دەمرین. گیروگرفتی ئێمە ئەوەیە زۆربەی ڕەوشەنبیرەکانمان بێ ئیمانن؛ لە گەڵ ئەو بێ ئیمانە ڕەوشەنبیرانە دەتوانین وڵات بۆ پێشەوە بەرین، بەڵام وڵاتەکەمان وەک ڕۆژئاوای لێدێت. زۆر کەم لە بە ئیمانەکانیش دەتوانن وڵات بۆ پێشەوە بەرن. ئەبونە نازانم چی بکەین دەست لە هەرکامێکیان بەردەین نابێت دەست لە هەرکامێکیان گیرکەین نابێت.

ـ ئەبونە سەیرێکی مامۆستای کرد و وەڵامی نەداوە. دوایی سەری لە بن گوێی نا و بە پسکە پسک پێی گوت :

ـ زیرەکی مرۆڤ لەوەدایە کە بتوانێت هەڵس و کەوت لەگەڵ ئەو شتە بکات کە لە ژێر دەستییەتی. وەک دەبینیت ئێمە هەردوکمان نەتەوەیەکی نیوە کافرمان لە ژێر دەستە. نیوەی خۆمان شوانیانین چۆنمان بوێت وا دەڕۆن، نیوەکەی تریان سەد پارچەیە ئینجا دەبێت بیانکەین بە هەزار پارچە و بەگەڵ ڕانە بەرخەکانیان دەینەوە. هەندێکیان بیری نەتەوەیی لایان لە ئایین بەهێزترە و هەندێکیان چەند پەڕێکیان لە فەلسەفەی فێرباخ خوێندۆتەوە و هەندێکیشیان گەر دونیاش خرابێت بەلای ئاییندا نایەن، ئا ئەم تۆزەیانە ناهێڵێت نەتەوەکەمان بژێت.

وا بزانم سالار گوێی زۆر سوک بوو گوێی لە پسکە پسکیان بوو دەڵێن چی، سالار هاتەوە یادی چۆن لە کەرکوک "ژنەکەیی و کچەکەیان کوشت" بۆیە خۆی پێنەگیرا بە دەنگێکی نەرم وەڵامی مامۆستا و ئەبونە داوە :

ـ بۆی هەیە لە زۆر شت ڕاست بکەن ئێمەی کورد نە دەژین و نە دەمرین. ناژین چونکە کوێلە و بندەستین، دەژین چونکە خەبات لە پێناوی ئازادیدادەکەین. ئێمە ناژین بە قسەی جەنابتان بێ ئیمانین، بەڵام بە قسەی من بێت، چونکە ئایینی زەردەشتمان جێهێشت، بۆیە هەردەم لە سەر لێوی گۆڕەکەمان دانشتووین. ئێمە دەژین چونکە ئایینی ئیسلاممان وەک عەرەب و فارس و تورک لە بەرژەوەندی خۆمان بە کار نەهێنا. ئەوان لە بەر

چاوچنۆکی، ئیسلامیان لە نێو نەتەوەکانی خۆیانا لاواز کرد، وەک جاڵجاڵۆکە خوێنەکەیان مژی و خوێنیان تیا نەهێشت. ئێستاش بێ وچان لەسەر لاشە بێ گیانەکەی ئیسلاما لە دەستکەوتێک دەگەڕێن. تا بۆ بەرژەوەندی خۆیان بەکاری بێنن، بەڵام ئێمەی دڵپاک هەڵگری ئەم لاشەین کە بە دەستی عەرەب و تورک و فارس کوژراوە. ئێستەش بەس ئەم لاشەیە بنێژین، بارێکی گران لەسەر شانمان لادەچێت. ئا ئەوساکە هەست بە بای ئازادی دەکەین. من سورم لەسەر ئەوەی کە کورد دەگەڕێتەوە سەر ئایینە پیرۆزەکەی زەردەشت.

سەپان هەڵیدایێ و گوتی :

ـ دەک دەمت خۆشبێت پیاوێکی کەمدووی وەک جەنابت لە بنی کوولەکەت دا، دەزانم مامۆستا دەڵێت ئەوا ئەوروپا و ئەمەریکا زراویان لە هێز و توانای ئیسلام چووە. مامۆستای بەڕێز وەڵامەکەی هاسانە: هەموو شتێک پێشی مردن دەگەشێتەوە هەروەها مێشکی ئادەمیزادیش لەم یاسایە بەدەر نییە مێشک بەر لە مردن وزە و توانایەکی زۆری دێتەوە بەر هەروەک چۆن پشکۆی ئاگرێک لە کۆتایی کوژانەوەیدا دەگەشێتەوە ئینجا دەکوژێتەوە. ئیمرۆکە ئیسلام لە پلەی گەشانەوەی ئەم پشکۆ ئاگرە دایە و زۆری نەماوە بکوژێتەوە. بە پێچەوانەوە زلهێزەکان لێی ناترسن خۆیان لە ئاگرەکەی دەپارێزن. بۆ زانیاری دەڵێم خۆ پاراستن لە مەترسیەک نە لە تەمەنی مەترسییەکە کەم دەکاتەوە نە لە تەمەنی زیاد دەکات. جگە لەمەش ئەم گەشانەوەیە توانای ئەوەی نییە دارستانێک ئاگر تێبەربدات. بۆیە باشتر وایە بە زووترین کات واز لە بیرۆکەی بەرهەڵستی بێنن. ئیسلام دەبێت خۆی رادەستی فەلە بکات. چونکە فەلە خۆیان رادەستی جووە عیسا کوژەکان کردووە. جوولەکە زیرەکەکانیش خۆیان رادەستی خووانەناسەکان کردووە. هەر جارەی جوولەکە خۆیان رادەستی خوانەناسەکان دەکەن خوا پەیامبەرێکیان بۆ دەنێرێت. ئەم جارەیان خودا ئەمریکای بۆ ناردوون. وەک حەزرەتی ئیبراهیم چۆن پتەکانی شکاند، ئەمریکاش مزگەوت و مەزارەکان

کاول دەکات، دەڵێت لێیان بپرسن کێ وای لێ کردن؟ بەڵام ئێوەی گوایە بە ئیمان، بێ ئیمانن و تێناگەن.

جا هەر بۆ نمونە دەڵێم؛ ئەگەر کۆمەڵە کەسێک لە سەر پشتی کەشتییێک بن، لە کاتی مەترسی دا هەرکەسەی بیر لە پارچە تەختەکەی ژێر پێی خۆی کردەوە، ئەوساکە هەمویان پێکەوە ژێر ئاو دەکەون. ئەگەر بە پێچەوانەوە هەموویان گوێڕایەڵی کەشتییەوانەکەبن و بە تێکڕایی بیر لە گەمییەکە بکەنەوە، ئەوساکە بۆی هەیە کەشتییەکە ژێر ئاو نەکەوێ. بەم شێوەیە گەر ئێمە گشتمان بیر لە خڕۆکەی زەمین بکەینەوە، لە داهاتوو دا دەتوانین زەمین و ژیان لەسەر زەمین بپارێزین. ئینجا ئەگەر کەشتییەوان ئەمریکی بێت بەسەر هەردوو چاو، بۆچ پشتی نەگرین و کەشتییەکەمان لە نقوم بوون رزگار نەکەین.

کاک سالار داوای لێبووردنت لێدەکەم، هەر لەسەرەتای دروست بوونی ئایینەوە تا ئێستاش ئایین هیچ شتێکی نەپاراستووە، بەڵکو ئینسان خۆی ئایینی پاراستووە. بۆیە حەزرەتی ئیبراهیم توانی پتەکان بشکێنێت و ئەمریکاش دەتوانێت قورئان بسووتێنێت. سەیرێکی مزگەوتی ئەلئەقسا بکە کە جوولەکە ئاگریان تێبەردا، فەلستینییەکان خۆیان بۆی بە کوشت دا ،بەڵام مزگەوتەکە وەک هەر خانوویەکی ئاسایی ئاگری تێبەر بوو. کە لە گۆڕی ئیمامی عەلییان دا هیچ دەستەوسانێک رووینەدا. کە حەزرەتی ئیبراهیم پتەکان دەشکێنێت، لێی دەپرسن کێ پتەکانی شکاند دەڵێت لە خۆیان بپرسن. وەک دەبینن ئایین خۆشی خۆی پێ ناپارازرێت، بۆیە نابێت بیر لەوە بکەینەوە ئایینێک بنێژین و بچینە سەر ئایینێکی تر، یان بگەڕێینەوە سەر ئاینێکی مردوو. من بە راستیت پێدەڵێم گەر ئێستاکە ماگێکی زەردەشتی لێرە بووایە ئەوا ئەویش لە تەک ئەبونە و مامۆسا هێرشی دەهێنا سەرمان.

مامۆستا سەپانی راگرت و گوتی :

- من پێتدەڵێم گەر دەتەوێ بژیت بیر لە مردن بکەوە. ئەوەش ئەوە ناگەێنێت کە بیر لە خڕۆکەی زەمین نەکەیتەوە. بۆ بیر لە خڕۆکەی زەمین دەکەیتەوە ئەمریکییێک بیپارێزێت. بۆ بیر ناکەیتەوە کە کوردێک بیپارێزێت؟ بۆ دەڵێیت

ئیسلام دەمریت و پشکۆ ئاگرەکەی گەشاوەتەوە، بۆچ وا تێناگەیت ئەوە دوایین جەنگی کافرە بێ ئیمانەکانە؟ سەیرکە تۆ مێشکی مرۆڤ بە پشکۆ ئاگرێک دەشوبێنی. من بەس ئەوەندەت پێدەڵێم ئەوەی دەگەشێتەوە مێشک نییە بەڵکو رۆحی ئادەمیزادە. دیارە زۆر بە هەڵەدا نەچوویت، چونکە رۆح یان رۆناهی واتای روناکی دەبەخشێت، کەوابێ رۆح تیشکە، تیشکیش پێشی نەمانی دەگەشێتەوە. لەو کاتەی کە رۆحی خۆت رۆناهی خۆت دەدەیتەوە خودای گەورە، چۆن خودای گەورە بە گەشاوەیی ئەم رۆناهییەی بە تۆ بەخشیوە دەبێت تۆش بە هەمان شێوە بە گەشاوەیی بیدەیتەوە دەستی خاوەنەکەی نەک بە دامرکاوی. مادام تێدەگەیت شایەتمانی خۆت بێنە.

ـ جەنابتان ئەم قسانە بۆخۆتان بێڵنەوە، من دەڵێم مێشک تۆ دەڵێیت رۆح، ئێمە بەم شێوەیە هەرگیز لە یەکتری ناگەین. چونکە ئەوەی من بیزانم هەموو شتێک لەسەر رووی ئەم زەمینە دەسووتێت، ئێمە دەسووتێین و پلەی گەرمیمان ٣٦ پلەیە، ئاسن دەسووتێت ژەنگ هەڵدێنێت، ژەنگ خۆڵەمێشی ئاسنە. نامەوێت زۆر لەسەر ئەم شتە برۆم، بە راشکاوی پێتدەڵێم من بڕوام بە رۆح نییە. بە پێچەوانەی ئێوە کە ناتانەوێت لەم تەمەنەدا بژین من دەمەوێت لەم تەمەنە کورتەی خۆمدا بژیم. مادام وایە تەمەنەکەی تریش هەر پیرۆزی ئێوەبێت. پەیامی ئێوە سەیرە! پێمان دەڵێن مردن رەوایە کێ هەیە نەزانێ دەمرێ؟ روو لە رەوا دەکات. مەنتقێکی سەیرە، گەر مردن رەوابێت کەوا بوو ژیان رەوا نییە، بۆیە بەرەو رەوا دەڕۆین، ئەی خودا بۆ ژیانی ناڕەوای دانا؟ ئەی کە باوە ئادەم و دایە حەوای ئافەر کرد ژیانی پێ نەبەخشین؟ بەڵام مردنی بۆ دانەنابوون، ئەوەی ئێوە پێی دەڵێن رەوا. وەک دەبینن بەم شێوەیە ژیان رەوایە نەک مردن. من دەزانم مردن هەیە، هەر بۆیەش پەیامی ژیانی من ژیانە.

مامۆستا لە وەڵام دا گوتی :

ـ من نامەوێت زۆر لەم باسە بکۆڵمەوە ئازادی وەک مانای ئازادی بۆ هەمو گیانلەبەرێک و مرۆڤێک کردارێکی رەوایە، بەڵام هەر مرڤێک کە تاوانێکی کرد دەخرێتە بەندیخانەوە ئەمەش کارێکی رەوایە. کە سزای خۆشی تەواو کرد

ئازادی پێدەبەخشنەوە ئەمەش کاردارێکی رەوایە. ئینجا تێمبگە باوە ئادەم و دایە حەوا تاوانێکیان کرد، هەر بۆیەش بە سزای خۆیان گەیشتن. وەک دەبینیت مرۆڤ تاوانێکی کردووە و دەبێت سزای خۆی وەربگرێت. ئینجا تۆ چ باکت بە سزای یەزدانی هەیە. لای تۆ وابێت، پارە و پولت هەیە، سالێ سێ تا چوار سەفەر دەکەیت. وەک لای گشتمان ئاشکرایە و دەزانین تۆ مەلێکی بێ باڵیت، ئیمشۆکە کچێک لە باوەشتا دەخەوێت، بەیانی خۆت لە باوەشێکی تردا دەدۆزیتەوە. وا تێدەگەیت رۆژێک لە رۆژان خودا سزات نادات؟ من لە کامەرانی ئێوە ناگەم، واتێدەگەن گەر بچنە سینەما و چێشتخانە گشتییەکان ئەوە کامەرانییە. ئێوە کە لەگەڵ دیندارەکانا دەدوێن کینەی خۆتانیان پێدا دەرێژن. ئەگەر خوا نەخواستە دیندارێکتان لە دین دەرکرد ئەوا ئەم دیندارە دەکەن بە گاڵتەجاری سەر رووی زەمین. بەڵام ئێمە ئەگەر کافرێک بێنینە سەر دینی خۆمان ئەوا شانازی پێوە دەکەین و بەرزی دەکەینەوە. بەپێچەوانەی هەڵس و کەوتی ئێوە کە لەگەڵ دیندارە بەزیوەکەی دەکەن. ئێمە کە بەتەنیا دادەنیشین هەست بەکامەرانی دەکەین، چونکە دەتوانین زیاتر کڕنۆش بۆ خودای گەورە بەرین. کە دێینە دەرەوەش لە پێناوی خودای گەورە دێینە دەرەوە. گەر بە قسەشبێت هەر پێمانبکرێت خێرێک بکەین ئەوا لە پێناوی خودا دەیکەین. بەڵام کە ئێوە بەتەنیا بن دڵتان دەکوشرێت، نازانن چی بکەن، کە دێنە دەرەوەش دەتانەوێت بۆ سوودێکی کاتی هێز و توانای خۆتان نیشان بدەن. ئینجا بە خۆتان داوەرنەوە ژیان هەمووی چرکەیەکە، کە تێپەڕی ناگەڕێتەوە.

سەپان گوتی :

- مامۆستا ئێوە مەنتیقێکتان هەیە خۆشتان لە خۆتان ناگەن. گریمان باوکم تاوانێکی کردبێت بۆچ من بە تاوانی باوکمەوە بسووتێم؟ بۆچ ئاژەڵێک بە تاوانی باوە ئادەمەوە بسووتێت؟ گەر خودا لە ئادەم و حەوا خۆش بوو ئەی بۆچ لە نەوەیان خۆش نابێت کە لە کرداری باوکیان بێبەرین. مامۆستاینە ئێوە بەسەیری نازانن کە ئەوەی تاوان بارە لە بەهەشتا خۆشترین شوێنی بۆ تەرخان کراوە و نەوەکانیشیان لە بەر تاوانی باپیرە گەورەیان دەبێت تامی

مرن بچێژن؟ زۆر بەداخەوەم هەموو شتێک لە لاتان دەستدەکەوێت هەر ژیان لە لاتان قاتە. خۆتان لە هۆدەیێک دەشارنەوە تا بێدادی ئەم دادوەرە نەبینن. ئێوە ناتانەوێ هەست بە ناڕەوایی ئەم دادوەرییە بکەن. چونکە لاتان وایە هەستکردنیش بەم نارەواییە تاوانێکە و خودا لێتان خۆش نابێت. کە دەبینن ئەم دادوەرییە رەوا نییە، وەک نەعامە سەرتان لە نێو لم دەشارنەوە، واتا کڕنۆش دەبەن.

- ئەبونە تا مامۆستا لەمەیدانا بەتەنیا نەبێت بەم شێوەیە بە هانای مامۆسا هات:

- بە پێچەوانەوە ئێمە کە نوێژ دەکەین چاومان دەکەینەوە. گەر بتەوێت بگەیتە لوتکەیەک بێگوومان هەر دەیگەیتێ. بەڵام کە گەیشتیتە دوندی چیا هەردەبێت لێی بێیتە خوارەوە، چونکە گەیشتیت بە ئامانجی خۆت. وەرە تۆزێک بیری خۆت فراوانکە، بڵێ بەرەو لووتکەیەک دەڕۆیت و لووتکەکە نابینیت و بێ ووچان هەنگاو بەرەو ئەو لووتکەیە ئەنێیت ئەڕۆیت و ئەڕۆیت، لەبەر ئەوەی لووتکەکە نابینیت نازانیت نە لە ژێر پێی چییاکەیت نە لە سەر دوندیت هەر دێیت و هەر سەردەکەویت هەرگیز بەرەو لێژی ناڕۆیت. سەیری ئەم خۆشییەکە کە ئێمە نوێژ دەکەین، یەکەم نوێژ و دووایین نوێژمان بە هەمان شێوە و پەرۆشەوە ئەنجام دەدەین، لای ئێمەی ئیماندار هەر نوێژێک هەنگاوێکە بۆ گەیشتن بە خۆشەویستی خودا. بەڵام نوێژەکانمان مەودای گەیشتنمان بە ئامانج پیشان نادەن. بۆیە نازانین لە چ ئاستێکی هەورازەکەین. ئا ئەمەیە جیاوازی نێوانی دیتن و نەدیتن، یان بە قسەی تۆ خۆ شاردنەوە و کڕنۆش بردن.

- ئازاد وەک ئاسایی ویستی هەر دوو تیپ لەیەک جیاکاتەوە، گوتی:

- من بە وشەی نازانم بەرەو زانین دەرۆم، کە دەگەمە لووتکەی زانین ئەوساکە دەزانم لە سەر لووتکەی نەزانی راوەستاوم. ئەم جارەیان لە گۆمی زانیاری دا بناو لێدەدەم. لەگەڵ هەربناوێکا فێری بناوی قوڵتر دەبم، گۆمی بێ پایان وورەم ناشکێنێ.

سامان گوتی:

ـ وا دیاره بناوی ئایدیالیستەکان لە بناوی مادییەکان قوولترە بۆیە ئەوان مەلەوانی لەو شوێنانە دەکەن کە مادییەکان دەستیان ناگاتێ.
چێنەر گوتی:
ـ راستەکەی لە لای ئایدیالیستەکانی جاران زەوی راست و راست بوو، رۆژ و ئەستێرەکان لەو لاو و لەم لای هاتووچۆیان دەکرد. زەوی چەقی بوونەوەر بوو. دەربارەی دیاردەی بروسکە دەیانگوت ئەوە دوو مەلائیکەتن بە گورز و قامچی لێکدەدەن. دەتوانم هەزاران شتی ترت بۆ بێنمەوە. بناوی ئایدیالیستەکان لەم شتانە بەولاوە تێپەر ناکەن. بە شێوەیەکی گشتی هەرشتێکی کە تێی نەگەیشتن ئەوا هێزێکی رەهای دەخەنە پشت.
شیرین هەڵیدایێ :
ـ ئادەمیزاد لە بیر و روانگەی نوێ دەگەرێت، تا بە شێوەیەکی پێشکەووتوتر دەست بەسەر بوونەوەر داگرێت. چۆن مادییەکان دەیانەوێت، دینداریش بە هەمان شێوە دەتانەوێت دەست بەسەر ئەم بوونەوەردا دا بگرن. بە پێچەوانەی بیر و باوەرِی ئایدیالیستەکان، بە باوەرِی ئێمە ناکۆکی نێوانی پاپا و دەلایلامە و حاخام و ئایەتوللە و شێخە گەورەکان لە سەر راژەی خودا نییە، بەڵکو لەسەر داگیرکردنی تەختی خودایە. چونکە ئەو خەڵکەی دەچنە کلیسە و کنیسێت و مزگەوت و پەرستگاکان بۆ خودا و خودا پەرستی دەچن. ئینجا هەر ئایینەی لە توانای دا بێت خەڵکێکی زۆر کۆکاتەوە ئەوا دەتوانێت هێز و بەهرەی ئەو خەڵکە بەکار بێنێت بۆ ئەوەی دەست بەسەر جیهان دا بگرێت. هەر بۆیەش دیندارە گەورەکان لە هەر شتێک دەترسن لە توانای دابێت پێشبرکێیان لەگەڵ بکات و نزیک بێتەوە لە داگیرکردنی تەختی کردگار. دیندارەکانی لای خۆشمان لە زانست دەترسان و دەترسن، نەکا زانست پێشیان کەوێتەوە و بگاتە تەختی کردگار.
سەپان گوتی :
ـ ئێستا مامۆستا دەڵێت مرۆڤ بە زانست و دەستکردەکانی خرِۆکەی زەمین گەرم دەکات و خۆی بەرەو نەمان دەبات.
ئازاد داوای لێبوردنی کرد و گوتی :

ـ سەپان، دەڵێن دونیا بە هۆی گازە ژەهراوییەکانی  کارگە و ئۆتۆمۆبیل و فڕۆکە و پاشماوە پیسەکانی کارگە کیمیاوییەکانەوە گەرم دەبێت. بێگومان ئەوە راستە کە دونیا بە گشتی بەرە بەرە گەرم دەبێت. تەکنەلۆژیاش هۆیەکە، بەڵام ناتوانێت ببێتە تاکە هۆ و هۆی راستی ئەم دیاردەیە. بە باوەڕی من زەمین لە دەورەی ڕۆژ ئەسوڕێتەوە سەرەنجامەکەی ئەم چوار کەژەیە کە دەیانناسین. ئینجا ئەگەر لەسەر پشتی ئەسپبین یان لە ناو ئۆتۆمۆبیلبین هاوین دێت و زەمین لە ڕۆژ نزیک ئەبێتەوە. ڕۆژ بۆ ئێمە واتا بۆ هەر نۆ ئەختەرەکەی لە چەقی خۆی وەستاوە و ئەختەرەکان لە چواردەوی ئەسوڕێنەوە. ئێوە وادابنێن کە ڕۆژ خۆی لە چوار دەوری شتێکی لە خۆی زلتر ئەخولێتەوە. من ناتوانم راست و رەوان پێتان بڵێم بە چەند هەزار ساڵ ڕۆژ لە دەوری ئەم زەبەلاحە خولێک ئەخواتەوە، دەتوانین ناوی لێبنێین ساڵێکی کەونی. وەک بۆمان روون بۆتەوە کە زەمین بە چەند چەرخێکی بەستەلەکدا تێپەڕیوە، واتا بە چەند زستانێکی سەرانسەری کەونی دا تێپەڕیوە. وابزانم گەر بە زستان دا تێبپەڕین ئەبێت بە بەهار و هاوینەکەشی دا تێبپەڕین. وەک بۆمان روون ئەبێتەوە ئەم کەژانە لە کەژەکانی ڕۆژ بەهێزترن، واتا زستانەکانیان سارد تر دەبن و هاوینەکانیشیان گەرم تر دەبن. ئەمەیان بەڵگەیەک، لە لای من بەڵگەی دووەمیان بزوتنەوەی توێژەکانی زەمینە کە ئەبن بە هۆی بوومەلەرزە. ئالێرانەش وەک بۆمان بە دیار ئەکەوێت هێدی هێدی دوو جەمسەری تر شوێنی جەمسەری باکوور و جەمسەری باشوور ئەگرنەوە، شاخەکانی هیمالایە ئەبن بە قوتبی باکوور، وەک بۆمان بە دیار ئەکەوێت ئێمە بەرەو هێزێکی موقناتیزی گەورە ئەڕۆین کە لەتوانای دایە شێوەی خڕۆکەی زەمین بگۆڕێت. من دەتوانم بڵێم لە ساڵێکی کەونی دا جەمسەری باکوور و جەمسەری باشوور شوێنی یەک دەگرنەوە، واتا زەمین لە ساڵێکی کەونی دا خولێک لە دەورەی قوتبەکانی خۆی دەداتەوە. بەم شێوەیەیە دوو جەمسەری تر پەیدا دەبن. هۆی ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ هۆی ، لاربونەوەی جەمسەرەکانی ڕۆژ بەرەو ئەم زلهێزەی کە باسی لێوە دەکەین. من ناتوانم بڵێم کەی کە هەر دوو کیشوەری ئەمریکا پارچەیەک بوون لە

کیشوەری ئەوڕوپا و ئەفریقیا، بەڵام لێی جیابوونەوە. ئەوەش هێزی ئەم موقناتیزە شاراوەیەمان پیشان دەدات.
سەپان، وەک گاڵتە پێکردنێک بە ئازادی گوت :
ـ کاک ئازاد ئەگەر بتوانیت ئەم بیرۆکەیەی خۆت ئیسپات بکەیت کە چەقێکی تر هەیە کە رۆژ خۆی لەدەورەی دەسوڕێتەوە ئەوا گەرم بوونی زەمین لە سیاسەت دوردەکەیتەوە، ئەم تاوانەش لە ئەستۆی سەرمایەداری لادەدەیت. من لە جیاتی تۆبم هەر لە بەیانییەوە وتارێک لەسەر ئەم بابەتە بڵاو دەکەمەوە.
دیسان ئازاد هەستی کرد کە وت و وێژ زۆر گەرم دەبێت بەرەو باشە ناڕوات، ویستی وت و وێژ بەلایەکی تردا رابکێشێت :
ـ خزمینە ئێوە هەست ناکەن کە مرۆڤ سێ جۆرە: یەکەمیان رەوشتی لە رەوشتی گورگ دەچێ؛ هەرگیز کوێلایەتی قبوڵ ناکات و لە برساش بمرێت هەر روو لە شاخ دەکات. دووەمیان رەوشتی لە رەوشتی سەگ دەکات؛ ئامادەیە هەرلە بەیانییەوە تا ئێوارە کلکی بادات بۆ پارچە نانێک واتا رەوشتی کوێلەتی بەسەری دا زاڵە. سێیەمیان وەک پشیلەیە؛ لە نێوانی گورگ و سەگ دا یاری دەکات، زراویشی لە هەدوکیان دەچێت بەلام واز لە بەرماوەیان ناهێنێت.
چێنەر هەڵی داێ و گوتی :
ـ کاک ئازاد وا بزانم شتێکت لە یاد کرد، ئەویش کە ژن لە قەل دەکەن بۆیە هەردەم بەدوای شتی بە بریسکەدارا وێڵن و زێر و زیو بە خۆیانەوە دەکەن هەر بۆیەش عەرەب جلی رەش لەبەر ژنەکانیان دەکەن، تا بیانگەڕێننەوە سەر رەگەزی خۆیان.
ـ سامان زۆری پێناخۆش بوو کە بەم شێوەیە لە دەمی ئازاد دەنەوە بۆیە بە سەر چێنەردا هاواری کرد و گوتی :
ـ چێنەر بەساقە کاک ئازاد باسی فەلسەفە دەکات خۆ رانابوێرێت.
ـ گەر جەنابی کاک ئازاد باسی سەگ و پشیلە بکات فەلسەفەیە بەڵام گەر من باسی قەل بکەم گاڵتەیە؟ پیاو نازانێت چۆن لەگەڵتانا بدوێت. ئێوە دەڵێن

مارکس گتویەتی کار مرۆڤی کرد بە مرۆڤ، مامۆستاش دەڵێ ڕاستە لە قورئانی پیرۆز دا هاتووە خودا دەفەرموێ "لیس الانسان الا ما سعی" بەڵام منیش وەک هەمووکەسێک دەمەوێت رای خۆم هەبێت، دەڵێم تەمبەڵی مرۆڤی کرد بە مرۆڤ، گەر مرۆ تەمبەڵ نەبوایە بەسەر دارەکە دەکەوت و میوەکەی لێدەکردەوە و دەیخوارد بەڵام، چونکە مرۆڤ تەمبەڵ و لەش گران بوو لە تەمبەڵیا دەستی دا دارێک و میوەکەی پێ هێنا خوارەوە و خواردی. مرۆڤ تاوەکو ئێستاش هەرچی بکات بۆ پشوودانی خۆی دەیکات نەک بۆ کار. مرۆڤ کەوتووەتە داوی تەمبەڵی خۆیەوە واتا داوی کارکردن. ئێستە هەموو فیکری مرۆ بۆ ئەوەیە چۆن خۆی لەم کارە رزگاربکات، بۆیە هەرکەسەی بە ئاسانترین شێوە دەیەوێت پارەی پتر دەستکەوێت تا کار و دەستکەوتەکانی ئەوانی تر هەڵلوشێت. هەندێکیش هەن بە دوای پارەی هاسان دەکەون تا خۆیان لە کاری دژوار دوورکەنەوە. تەنیا خانیش نە لە سەربەستی کۆمونیستەکان و نە لە خۆشەویستی رەهای هەندێک لە دیندارەکانمان "لێرە پەلاری لە ئازاد و مامۆستا گرت" گەیشت. بۆیە گەیشت بەو ئەنجامە دڵتەزێنە. دیارە تێگەیشتنی ئەم کچە هەر ئەوەندە بووە. لە کۆمەڵگایەکی داخراوی شاروچکەیەکی نەناسراوی کوردستانەوە بێت و گوێی لە گفت و گۆی ئازادی ... و خۆشەویستی رەها...، راگرێت هەر ئەوەی لێ دەردەچێت. ئێمە هەر دەبێت سوپاسی خودای گەورە بکەین کە لەگەڵتانا دادەنیشین و وەک تەنیا خان بیر و باوەڕی ئێوە وەرناگرین و پێی ناشێوێین. داوای لێ بووردن دەکەین ئەم ماڵە هەر ئاوەدان بێت، ئێمە دەڕۆین و خودا حافیز.

سەپان رووی لە چێنەر کرد و گوتی :

- نا کاکە جارێ من قسەی خۆم نەکردووە. دەمەوێت لە کاک ئازاد بپرسم، بۆچ ناوی تەنیاخان ناهێنێت؟ بۆ قسەیەک دەربارەی ئەم کچە ناکات؟ کاک ئازاد خۆت دەزانیت پەندێکی پێشینان دەڵێت جام بشکێت نەزرینگێتەوە. جامی جەنابتان نەک بە قسەی من بە قسەی هەموو کوردەکانی پاریس زرینگاوەتەوە. من یەک لە بارەخۆم زۆر جار و لە هەموو شوێنێک پشتگیریت دەکەم. بەڵام چیبکەین ئابڕووی کچێکی کورد، لەو کەونەی کە باسی دەکەیت

و له دەنگی big bang گەورە ترە. تەقینەوەی ئابڕووی (تەنیا) جیهانی کوردی لەرزاندووەتەوە. ئابڕوی ئەم کیژە گەلێک لە گۆڕانی جیۆلۆجی کە جەنابت باسی دەکەیت گەورەترە. کوردەکانی پاریس وا دەزانن ئابڕووی کورد تکاوەتەوە و من لەوە دەترسم جارێکی تر کەس سڵاوتان لێنەکات. جاران کەس ناوی نەدەهێنایت و لە پەنایەکدا خۆت کڕ کردبوو. من گومانم هەیە ئەم بێدەنگییە تا سەربێت. هەرنەبێت لەبەر خاتری ئێمە کە برادەری تۆین دەبێت بە کوردەکانی پاریس بڵێیت بۆچ ئەم کچە بەم شێوەیە لە ماڵی جەنابتان دەرچوو. خۆت دەزانیت دەمی خەڵک کونە دیوار نییە بە تۆپە قوڕێک بگیرێت. ئەم خەڵکە لەم گرفتە دەکۆڵنەوە و بێ دەنگ نابن. خۆت دەزانیت کورد لە هۆی ئابڕوو چوون دەکۆڵێتەوە و کڕ نابێت. بۆیە کاک ئازاد، هەرچی دەبیینم چاوەڕێی وەڵامتان لێ دەکات.

ـ ئەبوونە گوتی :

ـ ئینجا کچ هەیە لە ماڵی باوکی رەدوو دەکەوێت، ژن هەیە لە باخەڵی مێردی دەردەچێت و رەدوو دەکەوێت. ئینجا کاک ئازادێک کە هەمووومان دەیناسین دەستی وەک پرد بۆ گشتمان کردووەتەوە تا بەسەریا تێپەڕین. چۆن زمانتان لاڵ نابێت؟ لەسەر کچێکی هەرزەکار پاشەو ملە باسی بکەن. براینە ناوی خوابێنن و واز لە قسەی هیچ و پوچ بێنن.

ئەنگێلا خۆی پێنەگیرا و هەڵسا پێوە و بە توورەیی بە سەپان و چێنەری گوت :

ئێوە خۆتان؛ یەکێکتان دەهۆڵی بەدەستەوە گرتووە و ئەوی دیکەتان زوڕنا دەژەنێ. وا تێدەگەن ئێمە کەڕین؟ باسی کش و ماتیمان بۆ دەکەن. دەنگی زوڕنای ئێوە کە لە زەڕڕەی کەر ناخۆشترە هەموو دونیای پڕ کردووە. ئێوە خۆتان کردووە بە فەیلەسووف و مامۆستای ئازادی، بەڵام بە راستی ئێوە مامۆستای هەڵبەستنی درۆ و تەڵەکە بازین. ئەوەی من بزانم ئێوە باش دەزانن لەم وڵاتە کەس ناتوانێت بە کەس بڵێت وا بکە و وا مەکە. جا بۆی هەیە دەنگی واتۆ بتەقێتەوە و دەنگ بداتەو. بڕوام پێبکەن دەنگی درۆ دەگەڕێتەوە گەروی درۆزن و لە گەرووی دا دەتەقێتەوە، بۆیە ئاگاتان لە

گەرووتانبێت. بۆ ئاگاداریت کاکی فەیلەسووف و پیشتیوانی ئازادی ئافرەتان. باش بزانە دەنگی واتۆ هێندەی پێناچێ لە هەمووﻻیەک کپ دەبێتەوە. جا من لە جیاتی گشت ئافرەتەکانی کە تۆ چەندین ساڵە بە ناو خەباتیان بۆ دەکەیت؛ پێتدەڵێم زۆر سوپاست دەکەین و وازمان لێ بێنە. ئێستاش بڕۆنە دەرەوە و بەخێرنەچن. ئەنگێلا دەرگای کردەوە و لە لای دەرگاکە وەستا، تا هەردووکیان بە کرێ چوونە دەرەوە و ماڵەکەیان جێهێشت.

ئازاد هەناسەیەکی هەڵکێشا و گوتی :

ـ براینە ئیمڕۆکە ویستم باسی رەوشی تەندوروستی تەزرە بکەین، بەڵام وەک دەبینن میوانی بانگ نەکراو دانیشتنەکەیان لێ تێکداین. ئیستاش نەچووە بچێ، مادام هەر خۆمان ماینەوە دەتوانین باسی بکەین.

دەمێکی باش داما وەک بڵێی بیری لە شتێک دەکردەوە. سەری خۆی بادا و گوتی :

ـ وەک دەزانن ئەم کچە بە بەر کیمیاوییەکە کەوتووە و دوکتۆرەکان دەڵێن دەرمانی شەش مانگی دەدەینێ با بچێتەوە کوردستان، چونکە ئاو هەوای ئەوێ لە ئاو هەوای پاریس پاکترە.

ئەم قسانەی لەبەر سامان کرد دەنا خۆی باش دەیزانی کە دوکتۆرەکان پێیان گووتووە ئەم کچە چارەی نەماوە. چونکو سییەکانی سوتاون، بە قسەی دکتۆرەکان کۆتایی ژیانی دورنییە.

ـ مامۆستا لە بەر خۆیەوە پرتە پرتێکی لێوە هات :

ـ تەمەن بەدەستی خودایە و نازانن لە چ خاکێکا دەمرن، هەمو گیان لەبەرێک دەبێت مردن بچێژێت.

ـ بۆیە پێم خۆش بوو رێگایەکی ئاسان دابنێین بۆ ناردنەوەی تەزرە، یان ئەگەر دەڵێن ناینێرینەوە و با لە ماڵی ئێمە بێت. نامەوێت خۆم بەتەنیا ئەم بارە گرانە بخەمە ئەستۆی خۆم، دوایی بڵێن ئازاد وای کرد، دەمەوێت گشتتان بریاری لەسەر بدەن تا من بەتەنیا تاوان بار نەبم. وەک ئەم دوو بێ ئابڕووە تازە منیان تاوانبار کرد بە شتێک کە خۆم ئاگام لێی نییە.

سامان گوتی :

ـ کاک ئازاد دوکتۆر دەرمانی شەش مانگی پێمان داوە، دەتوانین ماوەی شەش مانگ لە کوردستان بین دوایی بێینەوە ئێرانە بۆ بەردەوام بوون لە سەر دەرمانەکانی.

گشتیان بڕیاریان دا کە تەزرە بنێرنەوە کوردستان و شیرین لەسەر دوکانەکەی مامۆستا لە شوێنی سامان دانێن. سکالاّ بە کورتی باسی ئەوەی کرد کە سامان چووە و لە کابرای داوە. ئازاد یەکسەر گوتی ئەمە کارێکی باش نییە. بۆی هەیە کابرا شکاتتان لێبکات و ئەمەش ئەنجامەکەی باش نابێت. بەلاّم چی بکەین ئەوەی روویداوە ناگەڕێتەوە. ئازاد گوتی، بە باوەڕی من بێت بەیانی شیرین خان دەبێت بچێت بۆ پۆلیس و شکاتی لێبکات واتە دەستی خۆی پێشخات. سامان گوتی نەخێر من لەم هەفتەیە سەفەر دەکەم ئەگەر لە شیرین خانیان پرسی؛ با پێیان بڵێت من ئاگام لە هیچ نییە و من لێیمنەداوە و ناشزانم کێ لێیداوە. ئەوەندە دەزانم کە هێرشی کردە سەرم یەکێک گوێی لە هاواری من بوو و هاتە ژورەوە و منی لە نێو دەستی ئەم دڕندەیە دەرهێنا. منیش یەکسەر رامکردە دەرەوە و لە ترسانا گەڕامەوە ماڵەوە. لەبەر ئەوەی هەڕەشەی لێکردم و گوتی هەر دەتکوژم. وویسم بە جارێک خۆمی لێ بشارمەوە لە بەر ئەم هۆیەش نەموێرا شکاتی لێ بکەم. دەمزانی کە ناونیشانی ماڵی منی لەلایە بۆیە لەوە دەترسام نەکا شەوێک خۆی لێم ماتکات و دەستێکم لێ بوەشێنێت. لەم ترسە لەو رۆژەوە لە ماڵی خۆم نەخەوتووم. ئەگەر کابراش قسەی نەکرد و لە لێدانەکەی خۆی خۆش بوو ئەوە باشتریش، وەک دەڵێن هیچمان لە هیچ.

****

پاش چەند رۆژێک شیرین نامەیەکی فەرمی لە شوێنی کارەکەی خۆی بەدەست گەیشت کە بە کورتی دەڵێت ئەوە چەند رۆژە بێ هۆ و بێ رونکردنەوەیەک ئێوە نایێنە سەر کاری خۆتان. هیوا دارین کە هۆ و بەڵگەکانی نەهاتننتان بۆ سەر کار، فەرمییانە ئاشکراکەن و بە زووترین کات بۆمانی رەوانە بکەن. لەگەڵ رێز و سڵاو. واژۆ بەڕێوەبەری گشتی.

شیرین راسەوخۆ چوو بۆ لای بەڕێوەبەری گشتی و هەموو شتەکانی بۆ گێڕاوە و بەڵام نەیگوت کە سامان هات و لێیدا. گوتی یەکێک بە هانام هات و منیش لە ژێر دەستی هەڵاتم و لە ترسی ئەو نەهاتومەوە سەر کاری خۆم. بەرێوەبەری گشتی یەکسەر ناوبراوی بانگ کرد. پاش وت و وێژێکی کەم پێی راگەیاند کە چیتر ناتوانێت، لە شەریکەکەی ئەو دا سەرکاربێت.

****

چێنەر و سەپان بیریان لە پیلانێک دەکردەوە تا تۆڵەی خۆیان لە ئازاد و دۆستەکانی بکەنەوە، چونکە هەردووکیان وا بە سووک و چرووکی لە ماڵی ئازاد دەرکردن. هەردووکیان پێکهاتن لەسەر ئەوەی کە چەند کوردێکی چەقاوەسوو و چەند کوردێکی دەمڕاست بانگ بکەن تا ناوی ئازاد بەد بکەن. ئەوەندەی پێ نەچوو چێنەر و سەپان نامەیەکی چاپکراویان ئامادە کرد کە تیایا رونکردنەوەیەکیان نووسی بوو و ئاراستەی هەموو کوردەکانی پاریسیان کردبوو و بە بەرید بۆ بانگ کراوەکانیان نارد. بە کورتی دەتوانین بڵێین ناوەرۆکەکەی ئەوە بوو "خوشک و برایانی بەڕێز، نووچەیەکی دڵتەزێنمان بیستووە، نامانەوێت بەتەنیا لە لای ئێمە بە شاردراوەیی بمێنێتەوە، هەر بۆیەش دەمانەوێت ئەم کێشە نوێیەی کە لە نێو کۆمەڵگای کوردە ئاوارەکانی فەرەنسا سەری هەڵداوە لە گەڵتانا لەسەری بدوێین و لێی بتوێژینەوە. بابەتەکەی کە دەمانەوێت لەسەری بدوێین زۆر دڵتەزێنە. خوشک و براینە هەندێک کەسی ناپاک لە نێو کوردەکانی پاریس پەیا بوون و کچێکی کوردیان بەرەو کاری خراپ راکێشاوە. ئەگەر کاتتان هەبێت لە کاتژمێری ١٥ تا ١٨ لە ناو نیشانی:

av. Jaen Joures ٢٤

لە خواردنگەی بەیروت یەکتر دەبینین، بە هاتنتان شاد و گەورە دەبین. ئیتر سوپاستان دەکەین، چاوەڕێتانین.

ئەم نامەیە بە شێوەیکی راسەوخۆ بە دەستی ئازاد و دۆستەکانی نەگەیشت، بەڵکو لە رێگای چەند هەڤاڵێک بەدەستیان گەیشت. هەموو کوردەکانی پاریس بەم نوچەیەیان زانی. کوردەکان هەریەکەی لە لایەک و هەریەکەی بە شێوەی خۆی لەم گرفتەی دەکۆڵییەوە لە نێو کوردان بوو بە دەنگ، دەبێت کێ لە یاسای کوردەواری دەرچووبێت و کاری خراپ بە کچە کوردێک بکات. هەموویان خۆیان ئامادە کردبوو، تا ئەم چەند کەسە ڕیسوا بکەن. وا دیار بوو سەپان و چێنەر نەیان دەویست ئەم نامەیە بەدەستی ئازاد و دۆستەکانی بگات، بەڵام چونکە هەمووی بیست یان بیست و پێنج کوردی باشوور لە پاریس هەبوون بۆیە هەر نووچەیەک هەبوایە ئەوا هەموو

کوردەکان دەیانزانییەوە. جگە لەمەش تا بەباشی ئابڕووی ئازاد ببەن بانگی چەند کوردێکی باکور و ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوای کوردستانیشیان کرد بوو. ئەم نووچەیە لە لایەن ئەنگێلاوە بە تەنیا و ئەلێکساندەریش گەیشتەوە. هەر چەندە ئەنگێلا بە تەنیای گوت بوو کە نەچێت بۆ ئەم کۆڕە، بەڵام تەنیا بە ئەنگێلای ڕاگەیاند کە بێگومان بۆ ئەم کۆڕە دەچێت چونکە باسی ئەوی تیایا دەکرێت. ئەلێکساندەر داوای لە پارێزەرەکەی خۆی کرد کە بێت لەم کۆبوونەوەیە دا ئامادەبێت، بەڵام پارێزەرەکەی گوتی ئەم کۆبوونەوەیە لە نێوانی کوردەکانە و سەدی سەد بە کوردی دەدوێن و من هیچ تێناگەم کە وابێت هاتنی من هیچ لە گرفتەکە ناگۆڕێت، ئێوە خۆتان بڕۆن و شتەکان لەسەر شریتێک تۆمارکەن تا بیدەین بە وەرگێڕی فەرمی و ئەوساکە بەیاسای کۆماری فەرەنسا لە دادگەی گلەیی سکاڵایان لەسەر تۆماردەکەین. ئەم بیرۆکەیە بە دڵی ئەلێکساندەر بوو. ئەوانیش بڕیاریان دا کە لە سەرەتای دانیشتنەکە نەچن، بەلکو ئەنگێلا بەخۆی و تۆمارگەیەکەوە "موسەجەلە" بچێ و وەک هەموو بانگکراوەکان لەوێ دانیشێ. پاش ئەوەی کە قسەکان کران ئیتر پاشەگەزەی تیا نییە. ئەنگێلا ئەمەی بە ئازاد ڕاگەیاند، ئەویش ئەم بیرەی بە دڵ بوو و گوتی باشە ئێمەش پاش سەعاتێک دەچین بۆ شوێنی کۆبونەوەکە.

سەپان و چێنەر هەموو مێزەکانیان ڕازاندبووەوە و لە سەر هەر مێزێک مومێکیان پێ کرد بوو و شوشەیەک شەڕابی باشیان لەسەر دانا بوو. لەگەڵ تۆزێک فستق و فندق و زەیتون و هەندێک شتی تر. کوردەکان یەکە یەکە و بە دوو و سێ سێ دەهاتن و لە لایەن سەپان و چێنەرەوە پێشوازیان لێوە دەکرا. ئەنگێلا تۆزێک دواکەوت بەڵام کە گەیشە شوێنی دانیتنەکە جارێ باسی هیچ نەکرا بوو بۆیە ئەنگێلا هەناسەیەکی هەڵکێشا و بە ڕوویەکی خۆشەوە چووە پێشەوە و هەمویان بەخێر هاتنیان کرد و لە پێشەوە دایان نیشاند و ئەویش گەلێکی پێ خۆش بوو، چونکە شوێنێکی باشی بە دەست کەوت و ئەویش تۆمارگەکەی پێکرد و لە شوێنی خۆی دانیشت. ئەنگێلا هەستی پێکرد کە سەپان و چێنەر زۆر دڵشاد نەبوون بە هاتنی ئەو; بەڵام

ئەنگێلا خۆی نە شێواند، چونکە خۆی باش دەیزانی کە بانگ نەکراوە. ئەوشەوەش ئەنگێلا خۆی دەرگای بۆ خستنە سەر پشت و دەری کردنە دەرەوە. خۆی لەبەر خۆیەوە دەیگوت ئەی چۆن بمەوێت دڵیان بە هاتنی من خۆشبێت. هەرچوندە لەم ماوەیەی دووایی دا ئەنگێلا هەڵس و کەوتی تەنیای پێ خۆش نەبوو. دەتوانم بڵێم لە پەنایەکی دڵیەوە رقیشی لە تەنیا دەبووەوە. من لەم بڕوایەدام کە ئەنگێلا هەرگیز ئەم دەنگ تۆمارکردنەی نە بۆ تەنیا نە بۆ ئەلێکساندەر دەکرد، بەڵام کار لە کار ترازا بوو ئەم دەستەیە دەیانویست ئازاد تاوانبار بکەن. بۆ ئەم مەبەستەش ئامادەبوون هەزار درۆ بۆ ئەم بێ تاوانە هەڵبەستن. هەر لەبەر ئەم هۆیە ئەنگێلا ئامادە بوو یارمەتی تەنیا بدات.

ئەنگێلا خۆی تێکنەدا و چووە لای سەپان و گوتی :

- دەتەوێت یارمەتیت بدەم.

سەپان گوتی :

- ئەنگێلا خان دانیشە و پشو بدە، چونکە من لێڕاهاتووم لە چێشتخانەکەم میوانم زۆربێت، بۆیە خۆم دەزانم چۆن هەڵس و کەوتیان لەگەڵ دا بکەم.

خۆی و چێنەر لە نێو مێزەکان دەهاتن و دەچوون و شەڕابیان بۆ ئەوانە دەکردەوە کە داوایان دەکرد.

سەپان بە دزیەوە بە چێنەری گوت :

- دەڵێی چی ئەنگێلا بە لای خۆمانا راکێشین تا دانیشتنەکەمان لێ تێکنەدات؟

- ئینجا بۆ نەء، ئەگەر فێڵێکت هەبێت، لەوە باشتر چی دەبێت.

چوونە لای ئەنگێلا و گوتیان :

- وەرە مەتبەخەکەوە لەوێ شتێکمان هەیە دەمانەوێت پێتی بڵێین.

ئەویش لەگەڵیانا چووە مەتبەخەکەوە.

سەپان گوتی :

- خوشکە ئەنگێلا دەزانی کارمان بە یەکێک هەیە هەندێک خواردنی کوردیمان بۆ ئامادە بکات. ئەگەر پێت خۆشبێت ئەوا رۆژی دوو سعاتێک دەتوانیت بێیت بۆ ئێرانە و یارمەتیمان بدەیت. وەک خۆت دەزانیت ئێمە دەزانین شت ئامادە

بکەین بەڵام هەرگیز وەک لێنانی دەستی ژنان نابێت. هەر بۆیەش هەردووکمان هەردوو دەستەکانت ماچ دەکەین ئەگەر ئامادەیی خۆت دەربڕیت و کارمان لەگەڵ بکەیت.

ـ ئەنگێلا بە پەلارەوە رووی لە سەپان کرد، کاک سەپان ئەی دەست و پلم بە کارکردن تێک ناچن.

ـ سەپان قسەی خۆی ناسییەوە، ئەنگێلا خان خۆ جارێ شووت نەکردووە، کەی مێردت کرد ئیتر من مووچەی خانەنیشینیت بۆ دەبڕمەوە. هەرسێکیان دایان لە قاقای پێکەنین، و ئەنگێلا تا پیلانەکەی سەربگرێ پێی گوتن باشە. گەڕاوە شوێنەکەی خۆی و دانیشتەوە. لەم کاتەدا سەپان هاتە دەرەوە و بە دەم و چاوێک وەک بڵێیت تازە لە ژێر ئەشکەنجە هاتۆتە دەرەوە. رووی لە میوانەکانی کرد و گوتی :

ـ خوشک و برایانی بەڕێز، ئیمڕۆکە من و کاکە چێنەر بڕیارمان دا بانگتان بکەین تا ئەو شتانەی کە لە نێو کۆمەڵگای ئێمە رودەدەن لە ژێر پەردە نەمێننەوە. وەک خۆتان دەزانن لە کۆمەڵگای کوردەواری هەندێک دابوو نەریتمان هەیە کە پەیوەندن بە ئابڕوو و مێرخاسی و میوان دۆستی و راسگۆیی و لە سەرووی هەمووشیانەوە خۆشەویستی کوردستانی پیرۆزە. خوشک و برایانی خۆشەویست، وەک خۆتان دەزانن گشتمان بێ جیاوازی کە گەیشتینە فەرەنسا بێ شوێن و جێ بووین. هەر وەک ئاشکرایە و خۆشتان دەزانن بۆ پیاوێک ئەوەندە دژوار نییە کە لە ماڵێک بخەوێت تا شوێنێک دەدۆزێتەوە، بەڵام ئێوە خۆتان بخەنە شوێنی هەندێک کچی لێقەوماوی نەتەوەکەمان، کە بێ شوێن و جێ لەم پاریسە مەزنە نازانن چی بکەن. ئەوەی بیزانم ئەوە یەکەم جارە کە کچێکی کورد کەوتۆتە دەستی پیاوی ناکەس بەچە. ئەم پیاوانەش کە کچێک دەبینن ئیتر لە دەستووری سروشت بەولاوە هیچ دەستوورێکی تر نایانگرێتەوە. هەر لەبەر ئەم هۆیەشە ئەم پیاوە بێ شەرمانە، کچێکی تازە پێگەیشتووی کوردیان لە خشتە بردووەتەدەر.

کاک پۆلا وەک نوێنەری کوردەکانی باکوور لەم کۆبونەوەیەدا بانگ کرا بوو:

ـ قوربانێ تە کاک سەپان تە هەما دزڤڕی، بێژە کییە؟ ئەم نەهاتنە گۆهداری ل ئەدەبیاتا کوردی بکەین، ئەم هاتنە زانبین کییە وسا خەرابیێ ب کەچێن کوردا را دکا؟

سەپان پێکەنی :

ـ کاک پۆلا تۆزێک ئارام بگرە ئێستە هەمووشتێکت بۆ ڕووندەبێتەوە. خۆتان دەزانن کە تەنیا هاتە پاریس لە ماڵی کورێکی کورد بوو بە ناوی کاک سالار. ئەم کاک سالارە نزیکەی پانزە رۆژێک ئەم کچەی لای خۆی گلداوە، تا تام و چێژی خۆی لێوەرگرت. ئینجا کە زانی سگی هەیە و دووگیانە، دایە دەستی کاک ئازاد. کاک ئازادیش وەک هەموو پیاوێکی بێ گوفت کچێکی ناسکی بکەوێتە بن دەست، دەبێت چی لێ بکات؟ پاش ئەوەی خێزانەکەی زانی کە ئازاد پەیوەندی لەگەڵ ئەم کچەدا هەیە، ئەم کچەی دەرکردووەتە دەرەوە. ئینجا وەک خۆتان دەزانن و وێنە روتەکانی ئەم کچەتان دیت، ئیتر پێویست بە بەڵگە ناکات.

ـ کاک سەپان، ئەز نابێژم تە چما تەنیا بانگ نەکریە، چێ دبە، وەک کەچەک فەدی بکە و نەێ. لێ تە چما کاک ئازاد و کاک سالار بانگ نەکریە؟ ئەگەر ئەو بخۆ ل ڤر بان ئەو بخۆ دکاران خۆ بپارێزن. ئەڤ وسا نابە تە بتەنێ دئاخڤی. کاک سەپان قوربانێ چاڤێ تە، دادگەهی ب ڤی تۆنی نە تێ کرن. نە تەنیا و نە کاک ئازاد و نە کاک سالار ل ڤرن. دادگەهـ نکارێ وان مەحکوم بکە ژ بەر کو ئەو بخۆ ل ڤی دادگەهێ ئامادە نەبونە. بڕاستی ژی ئەز بخۆ ڤان دوو کەسا کاک ئازاد و کاک سالاری پڕ باش ناس دکەم ئەز باوەڕم تە ب چەوتی ژ وان فێم کریە.

کاک ناکام گوتی :

ـ ئەگەر بە قسەی من بکەن، باشترین چارەسەر بۆ ئەم گرفتە ئەوەیە کە پەرتەی لێبکەن. یان ئەگەر هەر سوورن لەسەر دانیشتن باسی شتێکی تر بکەن. خوشک و براینە لە یادتان چووە ئێمەی دەربەدەر بۆ ئا لێرانەین؟ کە لە مەهاباد سەرداری برامیان گرت بێ دادگە لە بەر دەرگای ماڵی خۆیان پێیان لە دوو ئۆتۆمۆبیل بەستەوە و هەریەکەی بەلایکدا لێیان خوڕی. ئێوە خۆتان

دەزانن جەمهوری ئیسلامی چی بە کورد کردووە و چی بە کورد دەکات. لە جیاتی ئەوەی گشتمان کۆبینەوە و باسی رەوشی کوردستان بکەین، باسی چۆنیەتی گەیشتنمان بە ئامانجەکانمان بکەین. زۆر بەرداخەوەم دەتانەوێت باسی کچێک بکەن رەدوکەوتووە. لێتاندەپرسم ئەم دیاردەیە لە کوردستانا روونادات؟ من تێناگەم بۆچ باسی ئەوە ناکەن کە لە یاسای ئیسلام نابێت کچێک بکوژرێت کە پاکیزەبێت واتا مێردی نەکردبێت. ئینجا بۆ ئاگاداریتان بە فەرمانی جەمهورییەی ئیسلامی بڕیار دراوە ئەم کچانەی کە لەسەر کێشەی کورد دەگیرێن و مێردیان نەکردووە بە زۆرداری بیان دەن بە دەرگەوانەکانی بەندیخانە بۆ یەک شەو و بۆ بەیانی بەرەو پەتی سێدارە دەیانبەن. خوشک و براینە ئێمە دەتوانین کۆبینەوە و دوژمنانی کورد و کوردستان ریسوا بکەین. جا بۆیە تکاتان لێدەکەم بە زووترین کات ئەم بابەتە دابخەن و وەرنە سەر بابەتێکی تر کە نەتەوەکەمان پێویستی پێهەیە.

چێنەر گوتی :

- خۆزیا بە خۆت جارێ هەر باسی کورد و کوردستان دەکەیت، پێڵووەکانت لە ساڵی شێستەکانەوە داخراون. چاوەکانت بە خەیاڵی مێژووی رابردوو، رووداوی ئیمڕۆکە دەبینن. چاوەکانت لێڵ بوونە و نە دەور و پشتی خۆت دەبینیت نە دەتوانیت بە راستی رووداوەکانی ئیمڕۆ هەڵسەنگێنیت. پاش ئەوەی کورد وەک بەردێک و شاخێکی چەقیوی سەر خاکی باب و باپیرانی بونەتە کڵاوی بابردو هیچ زەویەک بەخۆیانەوە ناگرێت. کورد گوتەتی بەرد لە شوێنی خۆی لەقی شوێنی خۆی ناگرێتەوە. کاکی برا خۆزیا هەر لەقین بووایە، کورد بووە بەو بەردە لەقیوەی کە لە هەندەران تەقیوەتەوە و ئاداری لەسەر پاداری نەماوەتەوە. گەر لەولا بۆ شەوێک کچە کوردەکان مارەکەن، لێرە بێ مارەیی بۆ بەرژەوەندی شەوێک کچە کوردەکانمان دەچنە پاڵ پیاوێکی بێگانە، تۆش هەر لافی جاری جارانمان بۆ لێدە.

- کاک چێنەر من دۆزێکم هەیەو بڕوام بەم دۆزەیە من بڕوام بە کورد و کوردوستانە، بۆ ئاگاداریت من لە شوێنی خۆم نەلەقیوم و وەک شاخەکانی

کوردستان دەچەقمە نێو چاوی دوژمنانم. ئەوا پێمگوتیت من بڕوام بە چی هەیە ئەی جەنابت بڕوات بە چی هەیە؟
- من بروام بە ئارایە ئەوەی رابوورد رابوورد، ئەوەی دێ لە دەستمان نەچێت. کە باسی مێژوو دەکەین باسی دوێنێکە دەکەین تا بەیانی وانەی لێوەرگرین. هەڵەی دوێنێکە دەبێ ببن بە وانە بۆ ئیمڕۆکەمان. بەڵام کوا ئێمە وانە لە هەڵەکانمان وەردەگرین؟ باسی مێژوو دەکەین چۆن پار گوێزەکانمان دەژمارد ئیمساڵیش بە هەمان شێوە دەیان ژمێرینەوە. ئەگەر بمان زانیبایە وانە وەربگرین ، ئەوا حاڵمان ئەم حاڵە نەدەبوو. ئەی بۆچ ئێمەی کورد بەم واقیعە  رازی نابین کە ئەوە دوو سەد ساڵە کورد لە پێناوی مافە رەواکانی خۆی ماڵی خۆی کاول دەکات گوایە شۆڕش دەکات. دەتانەوێت دووسەد ساڵی تریش ماڵی خۆمان بڕمێنین ئەوە چییە شۆڕش دەکەن. ئێوەی شۆڕشگێڕیش پاش چەندین بەسەرهاتی دڵتەزێن و ماڵ کاولی کە بە هۆی شۆڕشەکەتانەوە بەسەرمان دا هاتووە هەر وازناهێنن. خەڵکی لەنێو مانگ دابەزین ئێوەی شۆڕشگێڕیش تازە بە تازە لە ئەوروپا دادەبەزن و قوربەسەرەکانیشتان رادەستی پاسداران کردوە. هەی ئافەرین بۆ ئەم شۆڕشگێڕانە چاو و رووشیان هەیە بێنە ناو خەڵک و قسەی پان پانیش بکەن.

کاک پۆڵا ئەوەندە لە قسەکانی چێنەر تورە بووبوو، ئەگەر خەنجەرت لێبدابا خوێنی لێ نەدەهات. بەڵام دانی بەخۆیا گرت و گوتی:
- کاک چێنەر ... کاک سەپان، من بە هەردووکتان دەڵێم ئەگەر ئێستە تەلەفۆنی کاک ئازاد و کاک سالار نەکەن ئەوا من  ئێستا دادگەی شۆڕشگێڕیتان بۆ پێکدێنم. چونکە من لەم بڕوایەدام کە حکومەتی عێراق دەستی لەم کۆبونەوەیەی ئێستاکەدا هەبێت.
- سەپان سوێندی خوارد گوتی :
- من تەنیام بانگ کردووە بەڵام نازانم بۆ نەهاتووە. هەروەها سوێندی خوارد کە بە نامە نامەی بۆ کاک ئازاد و کاک سالار نووسیوە و بە تەلەفۆنیش بەبیری هێناونەتەوە، بە قسەی خۆی ئینجا نازانم بۆ دواکەوتوون. پاش

ئەوەی چەند کەسێکی تریش لەسەر ئەم بابەتە دووان، هەندێکیان لەم بڕوایە دا بوون کە سەپان ڕاست دەکات و پێویستە ئازاد و سالار سزا بدرێن.

لەم کاتەدا مامۆستا و ئەبونە و سالار و ئازاد و شیرین و سکاڵا پێکەوە هاتنە ژورەوە. هەموویان بۆیان هەڵسانە پێوان چونکە گشتیان پیاوی ناسراو و سەنگین بوون. گشتیان چوونە سەر مێزێکی بەتاڵ و دانیشتن هەرچەندە داوایان لێکردن کە بێنە ریزی پێشەوە داوای لێبوردنیان کرد و گوتیان ئێرە زۆر خۆشە. ئەبونە وەک پەلارێک بە دەنگێکی ناسکی هێمنی قەشانەوە گوتی :

ـ میوانی بانگ نەکراو نانی لەسەر خۆیەتی.

سەپان یەکسەر چوو شەرابێکی سووری هێنا و لەگەڵ مەزە و شتی تر لەبەردەمیانی دانا. ئەوانیش سوپاسیان کرد، بەڵام دەمیان لە هیچ نەدا.

سکاڵا هەڵسایە سەرپێ و دەستی لەسەر مێزەکەی بەردەمی دانا و خونچەی دەمی پشکوت:

ـ خوشک و براینە بۆ بێ دەنگ بوون، بۆچ نازانین باسی ئازادتان دەکرد کە باوکی مناڵەکانی منە. ئالێرانە ئەوەی یەک خراپەی لە ئازاد دیووە با هەڵسێتە سەر پێ و بیڵێ. نەک بە نامەردانە پاشەو ملە باسی پیاوێک بکەن کە ژن و مناڵ و نیشتمانەکەی خۆی خۆشدەوێت. بەداخەوەم هەندێک روو لێرانەن چاوەڕێم نەدەکرد ئا لێرانە بیانبینم، بەڵام دەی با وابێت، بزانین چیتان لە هەگبەدایە بیرێژن. من بەو کەسانە دەڵێم کە دەیانەوێت خەنجەر لە پشتەوە لە ئازاد بدەن، "رۆژ بە بێژنگ ناگیرێت".

ـ نەبەز کوڕێک بوو لە دانیشتگا بەشی مافی دەیخوێند. رووی لە سکاڵا کرد و گوتی :

ـ خوشکە با تۆ خێزانی کاک ئازاد بیت بەڵام کەس تۆی بە تاوانبار لە قەڵەم نەداوە ئینجا لێگەڕێ ئەوکەسەی کە بە قسەی تۆ تاوانیان بۆ هەڵبەستووە، ئەو بۆ خۆی بدوێت.

ـ مامۆستا گوتی:

ـ چۆن دەتانەوێت بدوێ، ئەگەر نەزانێت چ تاوانێکیان خستۆتە پاڵی. جەنابت پارێزەری بۆیە باش دەزانیت پارێزەر پێش گومانلێکراو ئەگەر پێویست بکات دەدوێ.

نەبەز هەڵسا و بە رێک و پێکی وشە بە وشە هەموو شتەکانی بۆ یان گێڕاوە، ئینجا وتی :

ـ فەرموون ئەگەر شتێکتان هەیە بیڵێن.

ـ کاک سالار هەڵسا و بە دورو درێژی باسی ژیانی خۆی بۆ کردن و لە کۆتایی دا گوتی :

ـ من پیاوێکی بێ دەسەڵاتم، بۆیە دەژیم ئەگینا لەمێژ بوو ئەبوایە بکوژرابام. با راستییێکتان پێ بڵێم پیاو بمرێت باشترە لەوەی بەرامبەر هەندێک نا پیاو وەک تاوانبار رابوەستێ. ئێوە سەیری ئەم سەپانە درۆزنە بکەن، بە بڕوای من ئەوەندەی درۆ کردووە خۆی بۆتە بەشێک لە درۆکانی خۆی.

ـ نەبەز گوتی :

ـ جارێ جەنابتان هیچتان نەسەلماندووە تا بە کاک سەپان بڵێن درۆزن.

ـ سامان هەڵسا و بەرەو نەبەز چوو، هاواری کردە سەری و گوتی :

ـ خوێڕی دەم رووت، دەمت داخە بەرانبەر بە کاک سالار ورتە بکەیت سوێندم بە کوردستان مێشکت دەپرژێنم. من دوو حەرفم نەخوێندووە بەڵام پیاو پیاو دەناسێت بۆیە دەزانم کاک سالاری هاو چەکم درۆناکات. لێگەڕێ با دۆستە درۆزنەکەت خۆی بدوێت و خۆی بپارێزێت، نەک جەنابی نا موشەرەفت بیپارێزیت.

سکاڵا تا کار لە کار نەترازێت زوو هەڵسا و گوتی :

ـ خوشک و برایانی ئازیز، من یەک بەڵگەم پێیە، نازانم چۆن نەمدڕاندووە پیشانتانی دەدەم بۆتان روندەبێتەوە کێ درۆزنە و کێ راست گۆیە. سکاڵا پسولەکەی کە بۆ تەنیای نوسی بوو و تەنیاش وەڵامەکەی هەر لەسە هەمان کاغەز نوسیبووەوە، دەرهێنا و پیشانی گشتیانی دا و گوتی :

- بەڕاستیشتان پێدەڵێم و دەشتوانم سوێندیشتان بۆ بخۆم لەوساکەوە کە ئەم کچە لەماڵی ئێمە دەرچووە تاوەکو ئیستاش پەیوەندی پێمانەوە نەکردووەتەوە، چەند ئێوە ئاگاتان لەم کچە هەیە منیش هەر ئەوەندە.

یەکێک لەبەر خۆیەوە گوتی :

- ئینجا کێ دەڵی ئەوە واژۆی تەنیایە، کەس واژۆی تەنیای نەدیوە تا بەراوردی کات و راست و ساختە بەدیار بخات.

کاک پۆلا زۆر تورە بوو و بە دەنگێکی بەرز هاواری کرد.

- من بەرێ ژی گۆ، ئەڤ دادورییەکا گەمارە، ژ بەر ڤی یەکێ ئەز رجایێ دکەم و بوەرا دبێژم کەس نەئاخڤە، بلا سەپان بخۆ بەرپرسبە و وەلامێ وان بدات.

دووایی رووی لە سامان کرد و گوتی :

- کاک سامان ئەز ژ تە فێم دکەم لێ ڤر نە دادگەهە و نە مەیدانا شەڕییە ژ بەر ڤی یەکی روونە و بلا هەرکەس چ دخوازە بێژە، لێ براکۆ تە باوەڕبە ئەڤ وسا ب سانایی ل سەر سەپان و چێنەر دەرباز نابە.

سەپان لەلای دەرگای ئاشپەزخانەکە راوەستا بوو سەرنجی دەدا دەموچاوی بانگ کراوەکان. ئینجا بە دەنگێکی هێمن وەک بلێیت سەری هەموو داوەکانی لەدەسەت بێت گوتی :

- خوشک و برایان بڕواتانبێت من کە ئێوەم بانگ کردووەتە  ئێرە هیچ بەرژەوەندیەکم تیا نییە لە سەر ئێشە بەولاوە. بە ڕاستیتان پێ دەڵێم ئەم چیرۆکەم نە هۆنیوەتەوە. ئەو ڕۆژە نازانم بە تەواوی چەندی مانگ بوو تەنیا هاتە لام و ئا لەسەر ئەم مێزەش دانیشت بوو کە ئیستاکە کەس لە سەری دانەنیشتووە. ئەم کچە هات و دەستی کرد بە گریان و ئەم شتانەی بۆ باس کردم کە تازە بۆتانم گێڕاوەتەوە. جا داوای لێبوردن لە گشت لایکتان دەکەم، ئەگەر ئەم شتە راست نەبێت، دیارە تەنیا بۆ خۆی کچێکی درۆزنە.

- سکالا قسەی پێ بڕی گوتی :

- توخوا شەرم ناکەیت. ئەی تۆ خۆت تەلیفۆنت بۆ من نەکرد و گوتت ئیمشۆکە تەنیا و کوڕێک هاتنە مەتعەمەکەمان، ئەی بۆ ناڵێیت چیت بە من گوت و من چیم پێ گوتی؟ هەر بۆیە سکالا بە دور و درێژی ئەوەشی بۆ

دانیشتوان گێڕاوه. ئینجا دانیشتەوە و گوتی پەرژین بێت لە رووی پیاوە ماقوڵلانی ئێرە ، ئەگەر لەبەر رێزی ئەم پیاوانە نەبووایە ئیستاکە تفێکم دەکردە نێو چاوت تا جارێکی تر درۆ هەڵنەبەستیت. وا بزانم سەپان و چێنەر ئەوەندە پیسن تا کەلەشی بۆگەنیش خۆی لێیان دەپارێزێت، چونکە ئەم دووە لە رادە بەدەر بۆگەنن.

- هەموو ئامادە بووان دەزانن تا ئێستا وشەیەکی پیس لە دەمی من دەرنەچووە، بەڵام ئەوە دەیان وشەی پیس لە دەمی تۆ دەرچوون و کاک سامانیش دەیەوێت بە شان و بازوی خۆی دەنگی رەوا کپکاتەوە. بەڵام با باش بزانێت بۆی هەیە ئێستاکە پێی بکرێت دەنگی راستی دابخات، بەڵام لە دەست راستی بۆ کوێ دەچێت ،هەر بەیانی ئەم دەنگە و هەزاران دەنگی تر دەتەقنەوە. قورتان بەسەر...

لەم کاتەدا تەنیا و ئەلێکساندەر هاتنە ژورەوە. سەپان روی لە چێنەر کرد و بێدەنگ بوو.

تەنیا وەک شاژن دەستی لە نێو دەستی ساشە نابوو، پێکەوە هاتنە ژورەوە. تەنیا بۆنێکی ئەوەندە خۆشی لە خۆی دابوو کە هەموو دەوڵەمەندەکانی پاریسیش ناتوانن لە خۆیانی بدەن یان بیکڕن. تەنیا و ساشە چوونەوە شوێنەکەی یەکەم جاریان دانیشتنەوە. ساشە رووی لە دانیشتوان کرد و گوتی:

- هەمووتان باش فەرەنسی تێدەگەن، بۆیە بە ئینگلیزی نادوێم. ئێوە گشتان کۆبونەتەوە تا باسی تەنیا بکەن؟ سەیرم پێ دێت لەوە بەولاوە هیچ گیر و گرفتی ترتان نییە؟ وابزانم، هەر بۆیەش زانایێکی گەورەتان لێ هەڵناکەوێت چونکە ئێوە سەرتان بەم شتانەوە دێشێنن.

کاک ناکام کە لە رەگەز خەڵکی سنە بوو گوتی:

- کاک دیلتۆن داوای لێبوردنت لێدەکەم، من چاوەڕێی ئەم قسەیەم لە جەنابت نەدەکرد. کورد ئەوەندەی زانا و دانا هەبووە لە ژمارنایێن، یەک لەوانە ابن السیناء کە ئەویش رۆڵەی شارەکەی من بوو واتا سنەیی بوو، هەر بۆیەش کە لە خوراسان شوێنی لەق بوو بەرەو کوردستان هاتەوە و لە هەمەدان کۆچی

دووای کرد و نەگەیشتەوە شارەکەی خۆی. من نامەوێت باسی زانایانی کوردت بۆ بکەم، بەڵام کە ئێمە کۆبوینەتەوە لەبەر خاتری تەنیا خان نییە، ئەگەر ئەم کچە جەنابتانی هەڵبژاردبێت وەک هاوسەرێک پیرۆزتان بێت. هیچ کوردێک درێخی لەسەر ئەوە نییە. بەڵام پێویست ناکات بەم شێوەیە هێرش بکەیتە سەر نەتەوەی کورد. چونکە ئێمە و ئێوە دوو کۆمەڵگای جیاوازین، ئێوە کۆمەڵگایەکی تاکڕەون "individualist" ئێمەش کۆمەڵگایێکی کۆمەڵڕەوین "collectivist"، هەر بۆیەش ناتوانین ئەم دوو کۆمەڵگایە بە یەکتر بەراوردکەین.

ساشە قسەی بە کاک ناکام بڕی و پێیگوت:

- کاک ناکام داوای لێبوردن دەکەم من ئەم قسەیەم بۆ ئەوە نەکرد کە کۆمەڵگای کورد بشکێنمەوە، چونکە من کوردم زۆر خۆشدەوێت. بەڕاستیش بۆ ئەوە نەهاتووم نە کۆمەڵگای کورد نە کۆمەڵگای فەرەنسی هەڵسەنگێنم. من هاتوومەتە ئێرە، چونکە هەندێک هەن دەیانەوێت بە خراپە باسی خێزانەکەم بکەن. ئەگەر ئەوانەی کە لێرە کۆبوونەتەوە فەرەنسیش بوونایە من هەر هەمان قسەم پێ دەگوتن. دوای ئەوە ئەگەر دەتانەوێت باسی یەکێک بکەن بۆ کەسەکە بانگ ناکەن؟ بۆ بە دزی کۆدەبنەوە؟ من لەبەر ئەم رەوشتە ئەم قسەیەم کرد.

تەنیا دەستی ساشەی گرت و داینیشاندەوە و بۆخۆی شوێنی ئەوی گرتەوە و بە زمان هات :

- داوای لێبوردنتان لێ دەکەم نازانم بە چ شێوەیەک باسی منتان کردووە. بە هەر جۆرێک باسی من بکەن من قەبوڵمە. من لە کوردستان برایەک و باوکێکم لەدەست دا "ئینجا باسی مێژووی ژیانی خۆی بۆ گشتیان گێڕاوە" ئا لەم پاریسە برایەک و باوکێکی ترم دۆزییەوە کە ئەوانیش؛ یەکەمیان کاک سالار لەم پاریسە وەک برایەک پێشوازی لێ کردم و دەرگای ماڵی خۆی بۆ کردمەوە. دووەمیان کاک ئازادە کە لە ماڵیان بووم وەک باوکێک دەیلاواندم. سێیەمیان سکاڵا خان نازانم نە پێی بڵێم خوشکی گەورەم نە پێی بڵێم دایە. من ئێستاکە و هەموو ژیانم سەر بۆ ئەم سێیە دادەنەوێنم.

ـ نەبەز هەڵسا و چووە لای تەنیا و گوتی :
ـ تەنیا خان لەسەر ئەم کاغەزەی بەردەمت واژۆیکمان بۆ بکە بە دەنگێکی بەرز تێی گەیاند کە ئەم واژۆیەی بۆ چییە. دوایی چوو بۆ لای سکاڵا، سکاڵا خان بە یارمەتیت پسولەکەم پێ بدە. پسولەکەی برد و بەراوردی کرد بە واژۆی تەنیا و پیشانی گشتیانی دا.

سامان پەرداخێکی لە سەپان گرت و سەپان و چێنەر رایانکردە ئاشپەزخانەکە و دەرگایان لەسەر خۆیان کلیل دا. سامان و چەند کوڕێکی تر ویستیان دەرگاکە بشکێنن و بە زۆر بیانهێننە دەرەوە. بەڵام ئەبونە و مامۆستا ئەم چەند لاوەیان راگرت و هێوریان کردنەوە. ئینجا سەبر سەبرە یەکە یەکە خۆیان کێشاوە و رۆیشتن دواین کەس کە چوونە دەرەوە مامۆستا و ئەبونە و کاک ئازاد و سکاڵا بوون کە بە سەپانیان گوت وەرنە دەرەوە گشتیان رۆیشتن، ئەوا ئێمەش جێتان دەهێڵین.

****

سکالاَ بە زۆر کاک پۆلاَ و کاک ناکامی پەلکێش کرد و سوێندی خوارد و گوتی :
- هەر دەبێت بێن بۆ ماڵمان. لەویٚ وەک بڵێی هاتبن بۆ سەرەخۆشی کەس دەنگی لێوە نەدەهات و گشتیان بە ماتی دانیشتبوون.
دەنگی لانە دەنگی کپی ماڵەکەی هەژاندەوە. :
ئومێدە پیس لاچۆ لەبەر چاوم ونبە.
سکالاَ گوتی :
- ئەوە دیسان چیتانە؟
- دایە تفی کردە نێو چاوی بووکە شووشەکەم.
- بەخوا دایە لیک بوو هاتە خوارەوە، خەتای من نە بوو.
- دەباشە دەنگتان نەیەت. تەزرە گیان کا وەرە لام و بۆم باسکە بزانم ئەم دوو بێعارە بیٚ ئێمە لە ماڵەوە چییان کردووە؟ بەخوا زۆر ژیربوون، شتێکی ئەوتۆیان نەکردووە بۆتی باسکەم.
- کاک ئازاد ڤیٚ نە کەچا تەیە، ڤیٚ کییە؟
- ئەوە خوشکی کاک سامانە کە بە بۆمبای کیمیاوی لێی دراوە و بە دەنگێکی نزم گوتی :
- هیوادارین کە چارەسەر کرابێت.
- کاک سامان ئەگەر پەرەی وە نینە ئەم کارێین پەرا کۆمکەین و ببەین باشترین نەخۆشخانەێن ئەوروپا. تا بباشی بێت چارەسەر کرن.
- کاک ناکام بە ئەسپایی سەیری گشتیانی کرد و گوتی :
- کاک سامان بۆچ بە ئێمەت نەگوتوە، ئێمەش دەمان توانی باشترین دوکتۆری بۆ بدۆزینەوە و لە خوا بەزیاد بێت پارتی ئێمەش پارتێکی دەوڵەمەندە.
- سامان بە دوور و درێژی باسی نەخۆشی خوشکەکەی خۆی کرد و لەسەرەخۆ گوتی :
- براینە وابزانم درەنگە و ئیتر کەس هیچی پێناکرێت، مەگەر خودا شتێکمان بۆ بکات. وا بزانم ئێمە هیچمان لە دەست نەماوە، چونکە دکوتۆرەکان

ڕەوانەی کوردستانی دەکەنەوە. هەر چەندە دوکتۆر دەرمانی بۆ نوسیوە و گوتویەتی پاش شەش مانگی تر ئەگەر چاکتر نەبوو بیهێننەوە فەرەنسا. بەڵام من گەشبین نیم. ئینجا هەر بەتەمای خودا، من نزیکەی دە جار بریندار بووم، لە هەر پێکدادانێک لە پێناوی کوردستان گوللەیەک یان ساچمەیەکم بەر دەکەوت، هەمو جارێکیش بیرم لەم تەزرەیە دەکردەوە و دەژیامەوە. ئەم جارەیان ئەگەر تەزرە بڕوات منیش لەیەکەم شەڕ و پێکدادانا لەسەر خاکی کوردستان دەکوژرێم و بە ئاسوودەیی سەر دەنێمەوە، چونکە من لەم ژیانە کامەران نابم ئەگەر لە پێناوی تەزرەی خوشکم دا نەژیم، لاشم حەیفە گەر کوردستان ئازاد نەبێت من بە مردنی خۆم بمرم.

- پەکوماڵت کاول نەبێت، من لام وا بوو تۆ پیاوێکی گەشبین و بە توانایت "مامۆستا قسەی بە سامان بڕی" ئەوە بۆ وا بێ ورەیت، چیت بەسەر هاتووە، تەمەن بە دەستی خودایە.

بەزەردەخەنەیەکەوە درێژەی بە قسەکانی خۆی دا گوتی :

- وابزانم کاک سامان دەتەوێت وەک پاڵەوانێک بمریت. زۆر بە داخەوەم ئەم هەلەشت لەدەست چوو وا بزانم جارێکی تر شەڕ و ئاشوب ناگەڕێتەوە سەر خاکی کوردستانی ئێمە. ئاسوودە بە کۆتایی ژیانت هەر وەک خالیدی کوڕی وەلید دەبێت، بۆی هەیە دۆشەگی کە لەسەری رادەکشێیت نەرمتریش بێت.

ئازاد گوتی :

- مامۆستا بەیارمەتیت. کاک سامان، هەندێک پارتی بێ هێز و بێ بیر و باوەڕ، تا جەماوەر لە دەورەی خۆیان کۆکەنەوە، پێویستیان بە چەند لاوێکی بە توانا هەیە بەلای خۆیانیانا رادەکێشن تا بیانکەن بە پاڵەوانی مردوو. لای ئەم پارتییانە بیر و باوەڕی ئەم گەنجانە گرینگ نییە با لەگەڵ بیر و باوەڕی ئەوانیشا نەگونجێت. ئەوەی گرینگە ئەم گەنجانە ئامادەن لە پێناوی بیر و باوەڕی خۆیانا بمرن. وەک گوتمان دوورمەبینە کەئەم دوو بیر و باوەڕە پێکەوە نەگونجێن. بۆیە بە زووترین کات بە کوشتیان دەدەن و دەیانکەن بە پاڵەوانی خۆیان و خۆشیانی پێ هەڵدەکێشن. بەم جۆرە دوو چۆلەکە بە بەردێک دەکوژن: یەک پاڵەوانێکی مردوو بۆ پارتییەکەی خۆیان دێننە ئاراوە،

وەک دەبینیت پاڵەوانی مردوو هەرگیز ناتوانێت ببێت بە سەرکردە، یان بیر و باوەڕی خۆی بڵاوکاتە. بەم شێوەیە سەرکردایەتی کورسی خۆی لە رەشەبای بیر و باوەڕی نوێ دەپارێزێت. دوو، ئەو بیر و باوەڕەی کە لەگەڵ بیر و باوەڕی ئەوان نە دەگونجا لە نێو بێشکەکەی خۆی بە کوشتی دەدەن. ئینجا سەرکردایەتی خۆی دەکاتە خاوەنی ئەم بیر و باوەڕە نوێیە، بە ئیفلیجی و پەککەوتەیی پێشکەشی لایەنگرەکانی دەکەنەوە، تا وای لێ دەکەن فڕی بەسەر بیر و باوەڕەکە نامێنێتەوە. ئینجا دەست بە سمێڵی خۆیان دادێنن و لە کاتی تەنگانە دا چەپکە گوڵێک دەخەنە سەر گۆڕی شەهید. سێ،،،.

کاک ناکام گوتی :

- ببورە کاک ئازاد من سێیەمیانت بۆ تەواو دەکەم. بە بڕوای من ئەو کەسەی بۆ دۆزێکی پیرۆز هەنگاو بنێت و لە پێناوی دا شەهید بێت ئەو کەسە پاڵەوانی ئەم دۆزەیە. ئینجا ئەگەر ئەوە گیر و گرفتی کورد بێت یان هەر کێشەیەکی تر بێت.

کاک ئازاد ببورە ئەم جارەیان مامۆستا خۆی پێ نەگیرا و گوتی :

- کاک ئازاد من سەدی سەد لەگەڵ تۆم، بەڵام شتێک هەیە پێم خۆشە بۆتانی ڕوونکەمەوە. وەک گشتتان باش دەزانن کە من لەسەر رەوتی پیری پیران دەڕۆم. بەڵام بڕواتانبێت ئاوێنە هەرگیز ناتوانێت وێنەی بەرامبەر خۆی وەرگێڕێتەوە، بۆیە من چەندی بکەم ناگەم بە پیری پیران، چونکە ئەو کانیاوی ئەم بیر و باوەڕە بوو. ئێمەی شاگرد هەڵگری ئەم بیر و باوەڕەین. بۆ ئاگاداریتان هەڵگری بابەتێک ناتوانێت ببێت بە کانیی بابەتەکە. ئێمەی مرۆڤ دەتوانین لە چەمگێک بگەین، بەڕاستی ناشتوانین، تۆزقاڵێک لەو چەمگە بگۆڕین، یان پەرەی پێبدەین. پاش کۆچی دوایی پیری پیران ئێمە چەند رووەکێک بووین کە لە چوار دەوری کانییەکەی پیری پیران رووابووین. پاش ئەوەی کانیاوەکەمان وشک بوو ئێمە وەک ماسی نێو ئاومان لێ هاتووە وابزانم دوایین هەناسەمان هەڵدەکێشین. تا تێمبگەیت دەڵێم ئەوەی هەڵمانکێشا دەیدەینەوە، بەڵام بابەتی نوێمان پێ نییە. ئێمەی سۆفیش شەهیدی چک

بوونی کانیاوی بیری پیری خۆمانین. براینه هەرچەند لە دەورەی گۆڕی پیرۆزی پیری پیران خول دەدەینەوە بیرێکی نوێمان بۆ نایێت.

من دژی قسەی کاک ناکامنیم کە بە شێوەیەکی رووتکاری لە گرفتی شەهیدی کۆڵییەوە، بەڵام پێم خۆش بوو ئەگەر بیتوانیبوایە شەهیدی زیندوش لە یاد نەکات. کە وەک باسم کرد ئێمەی سۆفی سەدی سەد دەگرێتەوە، وا بزانم گەر کاک ئازاد لێم تورە نەبێت کۆمونیستەکانیش دەگرێتەوە. بۆیەش پێم خۆشە بێمەوە سەر باسەکەی تۆ، کاک ئازاد، راست دەکەیت لایەنگرەکانی ئەو پاڵەوانە شەهیدانە، "وا بزانم تۆ باسی کۆمەڵە دەکەیت" بێگومان دەیانەوێت لەسەر هەمان رەوتی شەهید ئارام برۆن، بەڵام وەک ئێمەمانان ئەوانیش بەرهەمی نوێیان پێ نییە. زیرەکیی سیاسی هەر ئەوە نییە، کە راستی بەرزکەیتەوە، هەندێک جار، ئەگەر سەرومڕ لەسەر رەوتی ئەم شەهیدانە برۆین، ئەم رەوتە سەر لە جەماوەر دەشێوێنێت.

ئازاد سەری لەقاند و گوتی

- راست دەفەرموویت، بۆیە سەلەفییەکانیش سەر لە موسولمانان دەشێوێنن.

مامۆستا خۆی وا لێکرد کە گوێی لەم قسەیە نەبوو، چونکە دەیزانی بەرەو وت و ووێژێکی دیکە دەیانبات، هەر بۆیەش رێچکەی بیرۆکەی خۆی نەبڕی و لەسەری بەردەوام بوو :

- بە ئەسپایی بۆیانی روونکردەوە؛ پێش ئەوەی راستی ئاشکراکەیت پێویستە پاڵەوانەکەت بژێتەوە، ئەوەش هەرگیزاو و هەرگیز ناکرێت. بۆیە رەوشی مارکسیستەکانیش پاش مردنی مارکس و ئێنگلس و لینین لە رەوشی ئێمە باشتر نییە. ئەوەی زیرەک بێت تێمدەگات کە بیر لە مادە گرنگترە، چونکە وەک مادە نە مرۆڤ کۆتایی هاتووە و نە ئابووری لە شوێنی خۆیا چەقیوە، و نە کۆمەڵگا بێ گۆڕان ماوەتەوە. ئەی بۆ مارکسیەکان پاشەوپاش دەگەڕێنەوە؟

کاک پۆلا گوتی :

- ژ بەر ڤی یەکی سەلەفی ژی ل شونا خۆ سەکنینە و دخوازن ئیسلام ژی ب خۆڕا بکوژن. هەما بێژن چەوا پاسەپۆڕت یان ناسنامە بێ وێنە دبە. ل ئالییێکی

دن، ژن ل گوندا چەوا کارە بخەبتە و ئالیکاریێ مێرێ خۆ بکا، ئەگەر چاڤێ وێ هاتبە گرتن؟
شیرین گوتی : کاک پۆلا واز لەم قسانە بێنە، گەر تا ئیستا کەس نەیتوانیبێت ئیسلام لە ناو ببات ئەوا سەلەفییەکان لەناوی دەبەن. ئاخ مامۆستا ئەوڕۆژە ئەنگێلا باسی هەمان شتی دەکرد و دەیگوت، لەم کوردستانە هەرگەنجێک بیر و باوڕێکی نوێی پێ بێت، سەرکردەکانمان پارچە پارچەی دەکەن. کاک ئازاد وابزانم سەرکردەکانمان وەڕس نەبوونە و وەڕس نابن لە گەڕان بە دوای ئەم جۆرە پاڵەوانانەدا. مامۆستا پەرژینبێت لە رووتان من هیچ شتێکم دژی خوێندنی حوجرەی مەلایان نییە، چونکە بەشی زۆری شاعیرو نووسەرەکانمان لە حوجرەی مەلایان بوون بە نووسەر و شاعیر. بەڵام من پێم ناخۆشە کە پارتییە کلاسیکییەکانی کوردستان لەسەر رەوتی حوجرە و تەکیەکان دابمەزرێن. پارتییەکانمان وایان لێ هاتووە؛ چۆن حوجرە لە سۆفی و مورید دەگەڕان، پارتییەکانی گۆڕەپانی کوردستان لە مورید و سۆفی دەگەڕێن. ئەو کەسەی نەتوانێت ببێت بە مورید، یان دووڕوو نەبێت شوێنی لەم پارتییانە نابێتەوە. ئەوانیش دەست و پێی مورید و دووڕووەکانیان کردووەتەوە: تالان کەن ،بدزن، بخۆن، رابوێرن گرنگ نییە جاران هەندێکیان جاش بوون بە قسەی پارتییەکان هەرنەبێت ئێستە موریدی خۆمانن. ئا ئەمەیە لۆژیکی پارتییەکانمان، بۆیە لە کۆنە شۆڕشگێڕەکان ناگەڕێن، بەڵکو پاڵیان پێوە دەنێن تا لێیان نزیک نەبنەوە، چونکە دەزانن ئەوانە نابن بە مورید، بەڵام لە رۆژی تەنگانە دا ئامادەن لە پێناوی کوردستانا گیانیان بخەنە سەر دەستیان، خۆیان بکەنە پاڵەوانی مردوو.
سکالا گوتی :
- کچێ شیرین خان تۆ بۆ بە میللەتت گرتووە، سەرکردەکانمان خۆیان موریدن لە هەر چواردەورەمان لە دوور و نزیک دەفیان بۆ لێدەدەن ئەوانیش خولدەدەنەوە و هەڵدەپەڕن. گرنگ نییە دەفی کێیە گرینگ ئەوەیە دەف لێدەدرێت، دەنگی دەف دێت ئەوانیش هەڵدەپەڕن. کەی دەف لە لێدان وەستا سەرکردەکان بە نوزەنوز و کورنۆش لەم پایتەخت دەچنە پایتەختێکیتر

دەستی شێخەکانیان ماچ دەکەن، دەفەکانیان بە خوێنی شەهیدانی کوردستان بۆ گەرم دەکەنەوە و چاوەڕێی جوولانەوەی دەستی شێخن کەی دەفەکەی لێدەداتەوە، تا پەککەوتە تاساوەکان بژێینەوە و جارێکی تر هەڵپەڕنەوە.
مامۆستا لەبەر خۆیەوە گوتی :
ـ دەبێت ئەوە هیمایێکی کۆتایی رۆژگار نەبێت؟ ئەم کوردە پاکە وای بەسەر هاتووە بە دەفی غەیرەدین و بێ ئیمانان زیکر و فیکری خودای گەورە بکەن. من شەو نییە بۆ موسولمانان نەگریەم کە دەبینم گۆڕی پێغەمبەر درودی خودای لەسەر بێت کەوتۆتە دەستی ماسۆنییەکانەوە. تۆ بەس سەیری پیرامیدە "هەرەم" بەرزەکەی شاری ریاز بکە، چاوێکی رەشیان خستۆتە ناوی گووایە مرواری رەشە. گەر بەراوردی کەیت بە دۆلاری ئەمریکی کە لە پشتەوەی پیرامیدێکی لەسەرە و پیرامیدەکەش چاوێکی تیایە کە ئەویش چاوی مەسیخە چاودێری ئابووری ئەمریکا دەکات و چاوە رەشەکەی هەرەمەکەی شاری ریازیش ئێشکی لە خاکی پیرۆزی ئیسلام گرتووە، تا ئەورۆژەی موسولمانان لە ئایینی پیرۆزی ئیسلام دەکات.
شیرین گوتی مۆستا مەسیخ کێیە؟
ـ خۆی باشتر وا بوو ئەبونە باسی ئەم شتەی بکردایە، بەڵام من بە کورتی بۆتانی باس دەکەم؛ وەک دەزانن جوولەکە ئیمان بە حەزرەتی عیسا ناهێنن. بە بڕوای جوولەکە جارێ حەزرەتی عیسا نەهاووەۆتە سەر رووی زەمین، ئەو کاتەی کە دێتە سەر روی زەمین ئەوساکە ئەو خۆی ئەم جیهانە بەڕێوە دەبات. وشەی مەسیح واتای رزگارکەر دەدات، بە باوەڕی مەسیحییەکان لەو کاتەی کە مەسیح دێتە سەر رووی زەمین، مرۆڤایەتی، لە هەموو جۆرە چەوسانەوەیەک رزگاری دەبێت. بە باوەڕی جوولەکەش مەسیح کە دێتە سەر زەمین دەولەتی ئیسرائیل دادەمەزرێنێت و نەتەوەی ئیسرائیل لە هەموو جۆرە چەوسانەوەیەک رزگار دەکات.  ئیسلامیش ئیمانی بە مەهدی چاوەڕێکراو هەیە وهێمایەکە لە هێماکانی کۆتایی رۆژگار. بەڵام هەندێک لە ئیسلامەکان لەم باوەڕەدان کە مەهدی ئەلمونتەزیر دێتە سەر خاک و مرۆڤایەتی رزگار دەکات. هەندێک لە جوولەکە ئەم بیر و باوەڕەیان قۆستەوە و لە پێناوی

جوولەکە بەکاریان هێنا. بە کورتی بە باوەڕی جوولەکە کە مەسیح دێتە سەر رووی زەمین لەسەر مرۆڤایەتی پێویستە کە سەری بۆ دانەوێنن، چونکە ئەو خۆی دەبێت بە سەروەری خڕۆکەی زەمین و دەبێتە چاوی خودا لە سەر خاک. بە باوەڕی ئەوان لەسەر مرۆڤایەتی پێویستە کە یەکسەر رادەستبن و بێ گفت و گۆ ببن بە کوێلەی مەسیح. واتا مەسیح دەبێت بێتە سەر خوانی ئامادەکراو. "بە بڕوای من ئەگەر مرۆڤایەتی یەکسانی لەسەر خاک بەرپا بکەن و خۆیان رادەستی خوداکەن ئەوساکە چ پێویست بە هاتنە خووارەوەی مەسیح دەکات؟" ئینجا ئەوانەی کە خۆیان بە کوێڵەی مەسیح دادەنێن دەبێت ببن بە ماسۆنی، واتا وەستا کە بە عەرەبی دەبێت بە (البناء)، ئەوەش ئەوە دەگەیێنێت کە مرۆڤایەتی دەبێت جیهان دروست بکات، بە شێوەیەک کە لەو کاتەی مەسیح دێتە سەر خاک شایەستەی مەسیح بێت. خۆی ئەم بیرۆکەیە تا ئێرە بیرێکی خۆڕسک و بێ زیانە.

- ئازاد گوتی :

ـمامۆستا راستە ئەم بیرۆکەیە بێ زیانە. زیانەکەی لە بیری سیاسی ماسۆنییەکانە کە دەیانەوێت پێش ئەوەی مەسیح بێتە سەر خڕۆکەی زەمین جوولەکە جیهان بەڕێوە ببەن. هیچ کەلێنێکی دونیا نەمێنێتەوە کە سەر بۆ جوولەکە دانەنوێنێت. ئینجا ئەم بەڕێوەبەرییە بە هەر شێوەیەک بێت واتا بە خۆشی یان بە ناخۆشی دەبێت بێتە دی.

ئەبونە هەناسەییێکی هەڵکێشا و گوتی :

- مامۆستا بە لاتینی دەڵێت پیڕامید. وەک دەزانن پیڕامیدیش واتای هەڕەمەکانی میسر دەدات. خۆی پیر ئامەد یەکەم هەڕەمی دامەزراند بۆیەش مسرییەکان هەر بەناوی پیرەوە ناویان لەم دامەزراوە نا "هەرەم"، ئەوڕوپییەکان هەر بە ناوە کۆنەکەی ناوی دەبەن و دەڵێن "پیرامید". پیر بە کوردی بە عەرەبی پێی دەگوترێت هەڕەم. بۆ نموونە لە کوردستان چەندین چیامان هەیە کە ئەمەمان بۆ دەسەلمێنن کە پیرامید لە وشەیەکی کوردییەوە هاتووە وەک پیرەمەگرون، پیرمز، پیر مەم هتد... تاوەکو ئیستا لە فەرهەنگە کەونەکانی فەڕەنسی پیرامید واتای پیرێژن دەدات. کورد باخچە

هەڵواسراوەکانی بابلی دامەزراند، کورد ئەسپی برد بۆ میسر، واتا گۆتییەکان. تاوەکو ئیستاش ئەگەر عەرەب باسی شار بکەن ناوی مێد دێنن واتا دەڵێن مەدینە یان مەدائین یان (التمدن) واتا بون بە مێد واتا بەرز ببنەوە و بگەن بە پلەی میدیاییەکان. کورد شیعەی دانا و نەبوو بە شیعە. من نامەوێت باسی هەمووشتێک بکەم، بەڵام چونکە باسی ماسۆنییەکان دەکەن دەمەوێت پێتان بڵێم کە ماسۆنییەکان کورد هێنایانە ئاراوە. من نامەوێت ناوی دوانزە خێزانە کوردەکە بێنم، کە ماسۆنییەتیان دامەزراند. ئەم بیر و باوەڕە لە لایەن کوردەکانەوە وەک پریشکی ئاگر پەڕییە نێو هەندێک سەرکردەی خاچ هەڵگرەکان. ئەم کوردانە بە شێوەیەک لە شێوەکانی ئایینی خۆیان بیر و باوەڕی هاتنە خوارەوەی ڕەوایان "الحق" خستە ناو لەشکری فرنگەکانەوە، ئینجا لە کۆتایی دا بوو بە بیری ماسۆنی کە ئێستاکە لە ئارادایە. هەر بۆیەش دەمویست پێتان بڵێم هەر شتێک کە دێتە ئاراوە لە چەند پێکهاتەی پێش خۆی پێکدێت، واتا ئەم شێوە نوێیەی کە هاتووەتە ئاراوە لە چەندین پێکهاتەی تر پێکهاتووە کە هەریەکەیان مێژویەک و ڕەچەڵەکێکی تایبەتی خۆی هەبووە. ئینجا لە پێکهاتە کەونەکان ئەم پێکهاتە تازەیە لە دایک دەبێت و دێتە ئاراوە. بەداخەوەم کە پێتان دەڵێم کورد زۆر شتی داهێناوە، بەڵام سوودی لە هیچیان وەرنەگرتووە، چونکە کۆمەڵگا شتێک دێنێتە ئاراوە کە لێی کەمە، واتا پێویسی بە بوونی ئەم شتە دەکات، بەڵام شەرت نییە ئەم بیرە بتوانێت دەست بە سەر ئەم کۆمەڵگایە داگرێت، چونکە هەندێک جار ناوکی ئەم کۆمەڵگایە زۆر لەم بیرۆکەیە ڕەق ترە. لەبەر ئەم هۆیە ئەم بیرۆکەیە ناتوانێت بەناوی دا تێپەڕێت. کە خۆی لە ناوکی کۆمەڵگایەکەی خۆی دەدات وەک تۆپێک هەڵدەبەزێتەوە و بە لایەکی تر دا دەڕوات. بۆیە هیچ بیرێکی نوێ لە نێو کۆمەڵگای کوردا نەیتوانوە ببێت بە هێزێکی بە توانا و ڕاکێشەر، واتا بتوانێت جەماوەر لە دەوری خۆی کۆکاتەوە و کۆمەڵگای کورد بگۆڕێت. بەڵکو هێزی پاڵپێوەنان و قبوڵنەکردنی ئەم بیرە وا لەم بیرە دەکات یان پاڵ بەم بیرەوە دەنێت تا لە سنووری خۆی وەدەری دەنێت. بەم شێوەیە هێزی بیری کەون بیری نوێ دەڕەتێنێت. هەر بۆیەش کورد خۆی نەیتوانوە سود لە بیری خۆی

وەرگرێت. کورد پیرئامەدی وەدەرنا و چوو پیرامیدی دروست کرد، کورد زەردەشتی وەدەرنا و چوو ئایینی خۆی لە نێو فارس دا بڵاو کردەوە، کورد وەک بیرێکی سۆفی شیعەی دانا و فارس گرتییە خۆی و دەوڵەتی خۆی پێ دامەزراند، کورد ماسۆنییەتی دانا و جوولەکە ماسۆنییەتی قۆستەوە.
کاک ناکام لەبەر خۆیەوە گوتی :
ـ خزمینە هەر چەندە نەتەوەکانی تری ئێران بیریان لە ئۆتۆنۆمی نەکردووەتەوە. لە ئێران کوردی جارێ سەرنەکەوتوو خۆی بە کوشت دەدات بۆ مافە رەواکانی نەتەوەکانی تر. ئەم نەتەوانە بیریان نە لە ئۆتۆنۆمی و نە لە ئازادی خۆیان کردووەتەوە، کورد چاکەیان لەگەڵ دەکات وەک دەزانن "چاکەی سەربەخۆ سەری خاوەنەکەی دەخوات". لە کوردستانی باشوور کورد جارێ بەسەر نەکەوتووە ئۆتۆنۆمی بۆ تورکمان داوا دەکات.
شیرین گوتی :
ـ کاک ناکام راستدەکات، من دەڵێم کورد بۆ خۆی ناژیەت بۆ خەڵکی تر دەمرێت، کورد وەک ژیان وایە هەموو شتێک دەنووک لە ژیان دەدات، هەر ژیان بێ دەنووکە.

سامان رووی تێیانکرد و گوتی :
ـ ئەرێ براینە من دەمویست باسی گەڕانەوەی من بکەن، نەک باسی ئازادی کوردستان و نەتەوەکانیتر بکەن. من سەرم سوڕماوە نازانم بۆچ دوکتۆر نایەوێت تەزرە چارەسەر بکات؟ بۆچ دەڵێت بیبەنەوە کوردستان. بە باوەڕی ئێوە، ئەگەر بیبەینە لای دوکتۆرێکی تر باشتر نییە؟
ـ ناکام گوتی :
ـ کاک سامان تۆ وێنە تیشکییەکانم پێ بدە، من هەر بەیانی دەیبەم بۆ لای پزیشکێکی باش کە دەیناسم، با بزانیین ئەو چیمان پێ دەڵێ.
ئازاد گوتی :
ـ بەڕاستی کاک ناکام ئەم چاکەیەت هەرگیز لە یاد ناکەین.
ـ کاک پۆلای قارپسی گوتی :

- ئەز قوربانێ تە بێژە دکتۆرێ خۆە ئێ تە ناس دکەی، پەرە نەگرینگە چ قاسی بخوازە ئەم ئامادەین.

سامان لە شوێنی خۆی گەشاوە و زوو وەک شێت هەڵسا و جانتاکەی کردەوە و چەند وێنەیێکی رەشی دەرهێنا و دای بە کاک ناکام. ئەویش سەیری وێنەکانی کرد و گوتی هەر بەیانی زوو دەچم بۆ لای ئەم دوکتۆرە، بزانم چیمان پێدەڵێت. سامان سەیری دۆستە ئامادەبووەکانی ئەم دانیشتنەی دەکرد، وەک بڵێی ئەگەر پەرتەی لێ بکەن، شەو بەسەر دەچێت و زووتر بەیانی دەبێتەوە. پاش ئەوەی کەس گوێی نەداێ لە سەر وت و وویژی خۆیان هەر بەردەوام بوون. سامان هەر هەڵدەستا و دادەنیشتەوە کە سەیری دەکرد کەس گوێی ناداتێ، و هەر خەریکی وت و وێژی خۆیانن و شیرین بێ قسە بە زەردەخەنەیەکەوە سەیری گشتیان دەکرد و ئینجا رووی دەسوورِاندەوە و بە هەناسە و تاسەیەکی شارراوەش بە قوڵیەکی بێ هاوتاوە سەیری ئەویشی دەکرد. سامان لە شوێنی خۆی ساد دەبووەوە.

سامان لەدڵی خۆی دەیویست شتێک بە شیرین بڵێت. وەک هەردەم خۆی ئاسایی نەیدەزانی چۆن چۆنی لەگەڵ شیرینا بدوێت. یان راستییەکەی بڵێین ئازایەتی ئەوەی نە بوو، بەرامبەر بە شیرین دەمی خۆی بکاتەوە. بە باوەڕی من سامان بەوەندە رازی بوو کە هەرنەبێت ئێستا شیرین بەرامبەری دادەنیشێت و لەگەڵیا دەدوێت. ئەگەر رازی دڵی خۆی بۆ بدرکێنێت و شیرین بڵێت نەء، ئیتر ئەوەندەشی لەدەست دەچێت. بۆیە بە پەرۆشەوە سەری هەڵدەبڕی و سەیری شیرینی دەکرد. لە مێشکی خۆیا دەیگوت دەبێت بەم هەموو ژیری و داناییەوە، بە چەکدارێکی نەخوێندەوار رازیبێت؟

بۆ بەد بەختی شیرین لە هەموو شتێک دەگەیشت، بەڵام هەر چاوەڕوانی سامان بوو ئەم رازە بدرکێنێ. خۆشی مەئیوس بووبوو لەوەی سامان توانای ئەوەی هەبێت کە ئەم رازە بدرکێنێ. شیرین بیری دەکردەوە و دەیگوت بۆچ هەر پیاو لە درکانی رازی دڵیان بۆ ژن دەبێت دەستپێشخەربن؟ بۆچ ژن ناتوانێت دەستپێشخەر بێت و بە پیاو بڵێت خۆشمدەوێیت؟ دەمەوێت بتهێنم. هەر بۆخۆشی دەیگوت، ژن بۆ پیاو وەک بەز بۆ پشیلە وایە. وەک

ئاسایی پشیله خۆی لەبەر بەز ڕاناگرێت، ئینجا ئەگەر بەز بە پشیله بڵێت وەرە بمخۆ دەبێت چی ڕوبدات؟ دەشێت سامان لەم پشیلانە نەبێت ئەگەر پێی بڵێم "وەرە بۆنمکە"، بە ڕاکردن نەیەت... لە جیاتی بۆنکردن جنجڕۆکی لێم گیرنەکات و پارچە پارچەم نەکات و تورم هەڵنەدات؟ نەخێر بڕوا ناکەم ئەم کوڕە بەم جۆرەبێت. ئەوەندە پیاوێکی ئازایە و ئەوەندەش بەرامبەر بە من شەرمن و بێ توانایە. بەڵام پیاو هەر پیاوە "وەک ئاگر و ئاو بێ ئامانە" جێگای متمانە نین. نازانم چی بکەم بێ ئاگر و ئاویش ناژین. چۆن بازار دۆست و دوژمنی جزدانە. ئەو جزدانە گرانەی کە نەتوانی خۆی بەرامبەر بە بازاڕ ڕاگرێت، بازاڕ سووکی دەکات و جزدانی بێ پارەش نرخی جارانی ناکاتەوە. ئەو جزدانەی نەکرێتەوەش چەند گران بێت بۆ بازاڕ وەک جزدانی سووک وایە. ئینجا نازانم چۆن ڕەفتاری لەگەڵدا بکەم. شیرین زەردەخەنەیەکی هاتێ وەک بڵێی شتێکی خۆشی بەبیردا هاتبێتەوە. بە ڕاستی شیرین هەر بیری لەوە دەکردەوە چۆن بگات بە ئامانجی خۆی. بە قسەی خۆی دەیگوت، ئێمەی ژن حەز لە تۆپی پێ ناکەین چونکە گەر تۆپەکە کەوتە دەستمان دەیفڕێنین و لە یاری ڕادەکەینە دەرەوە. ئەم تۆپە لە نێو دەستمە هەرگیز شەقی لێنادەم، نایدەم بە کەس و هەر دەیفڕێنم. ئا لەم کاتە دا بۆ گەیشتن بە ئامانجە پیرۆزەکەی خۆی بیرۆکەیەکی سەیری بۆ هات. نزیکەی ناوەرۆکی بیرۆکەکەی بەم جۆرە بوو؛ چی دەبێت ئەگەر پشیلەیەک لەسەر خشخشۆکێک دابنێت و ڕێگای سەرکەوتنەوەی زۆر دژواربێت، کتکەکە فڕێدەیتە خوارەوە و بەزەکەی نیشاندەیت و چاوەڕێکەیت بزانیت تا چ ڕادەیێک ئەم کتکە ڕاست گۆیە. شیرین گوتی لە فڕۆکەخانە پێش ئەوەی بچێتە بەشی فڕینی فڕۆکەکە و بەڕێ کەوێت پێی دەڵێم خۆزیا سامان گیان سەرمان پێکەوە نابا دەمانتوانی کۆریتێک پێکەوە بنیاد بنێین. دوایی کەلێنێکی دڵمی بۆ دەکەمەوە و بە ڕاستی ئەوەی هەستی پێ دەکەم پێی دەڵێم تۆ شتێکت لە دڵی من دا چاند ئیتر لە ژیان دا نامەوێت چیتر تەنیایی بچێژم. من دڵم لە هەموو پیاوێک مردبوو، دڵم بە هەناسەی سادە و ساکاری تۆ ژیاوە. تۆ ئەو پیاوەی کە هەر دەم چاوەڕێم دەکردیت. ئێستەش خەون و زیندە خەونەکانم تێکەڵی

ڕەوتی ژیانی پڕ لە ئاوات و ترسی نەگەیشتنم بە ئامانجم دەبن. هەر شان و بازوو و دەستە پڕ لە دەمارەکانی تۆ دەتوانن ئەم ترسەی کە بووەتە مێردەزمەی ژیانم راوبنێت. هێند دەترسم نەگەم بە ئامانجی خۆم، یەکەم جارە لە ژیانم وا دەزانم گیر و گرفتی کورد وەک بارێکی گران لە سەر پشتم کۆ بووەتەوە. هەندێک جاریش بیر لەوە دەکەمەوە کە بۆی هەیە نەگەم بە ئامانجم وادەزانم من هەڵگری یادگاری شکستی هەموو ئافرەتانی جیهانم هەڵگرتووە. تەمەنم لەگەڵ یەکەم شکەستی یەکەم ئافرەتەوە دەست پێدەکات. سامان گیان نازانم بۆ، بەڵام باوەڕت بێت شکەست دێنم، باوەشم هەرگیز لە باوەشی تۆ گیرنابێت.

- سامان لە لایەک پێی خۆش بوو گشتیان پەرتەی لێ بکەن و بڕۆن تا زوو رۆژ بێتەوە، لە لایەکی تر پێی خۆش بوو تا بەیانی دانیشێت و سەیری هەڵس و کەوت و جولانەوەی شیرین بکات. لە خەیاڵی خۆی دەیگوت، منێک بە ئاستەم دەزانم بخوێنم و بنووسم چییە مەراقی ئەم کچەم داوە، ئەم کچە لە پلە و پایەی من نییە. خۆزیام بەو پیاوەی کە هەر لە بەیانییەوە تا ئێوارە بەرانبەر ئەم پەیکەرە دادەنیشێ. من سووم لەوە دەبێتەوە ئەگەر پیاوێک هەڵبژێرێت و لە پلە و پایەی خۆی دا نەبێت، چونکە دەزانم ئەم جۆرە ئافرەتانە بەشی زۆریان بێ بەختن و نازانن هاوسەری خۆیان هەڵبژێرن. لە نکاوێک پێکەنی، ددانە سپیەکانی بە دیار کەوتن، دەتگوت یەکێک قسەیەکی خۆشی بۆ گێڕاوەتەوە، ئەوەی سەیرە پێکەنینی ئەو و زەردەخەنەی شیرین لە یەک دەمدا بوون، دەتگوت پێکەوە دەدوێن بێ ئەوەی ئاگایان لە یەکتر بێت. سامان پێکەنی و لە دڵی خۆی دا دەیگوت ئەی ئەگەر ئەو بەخت ئەستوورە من بم دەبێت من چی بە خۆم بڵێم. ئەوساکە دەڵێم بەڵێ کچی وا زیرەک دەزانن هاوسەری خۆیان هەڵبژێرن. ئینجا چی دەبێت ئەگەر پێی بڵێم تۆ کچێکی زیرەکیت و دەزانیت، کە دڵ لە پلە و پایە ناپرسێت، کە لەسەر یەکێک نیشتەوە دەنشێتەوە. دڵی منیش لەسە تۆ نیشتووەتەوە بەهیچ جۆرێک ناتوانم لێتی جیاکەمەوە. ئینجا گەر تۆ شتێکت پێ بکرێت یان ئەم دڵەی من سەربڕە

با ئەم چیرۆکە لە بێشکەی خۆی دا کۆچی دوایی بکات، یان بیخەرە باوەشی خۆت و بیلاوێنەوە لێیگەڕێ با گەورەبێت.

وەک بڵێیت لە هێکرا بە هۆش هاتنەوە و چاویان لە نێو چاوی یەکتری بڕی، هەردووک هەناسەیەکی ساردیان هەڵکێشا و سەیری دانیشتوانیان کردەوە. وا دیار بوو میوانەکان چای خۆیان خوادبووەوە و هێندێکیان چاییکی گەرمیان لەبەر دەم بوو وا پێدەچوو کە چای دووەم یان سێیەمبێت. کە سامان دەستی بۆ چاکەی خۆی درێژ کرد چایەکە ئەوەندە سارد بوو دەتوانم بڵێم شلتێنیش نەبوو. سامان زوو چایەکەی خۆی فڕ کرد تا چایەکی گەرمی بۆ تێکەنەوە. شیرین تێگەیشت و زوو هەڵسا و ئیستکانەکەی لە بەردەم سامان هەڵگرت و چوو بۆ مەتبەخ و چایەکی گەرمی بۆ هێنا و لەبەردەمی داناو گوتی نۆشی گیانت بێت. ئەویش سوپاسی کرد. گوێی لە دەنگی ئازاد بوو دەیگوت:

- هەربوون بێ سەرەتا و بێ کۆتاییە، گەر سەرەتایەک بۆ بوونەوەر بدۆزینەوە ئەوا کۆتاییەکەی بێ گفت و گۆیە. بیر پێشی سەرەتا ناکەوێتەوە و پاشی کۆتاییش ناژێت. کەوابێت بیر لە نێوانی سەرەتا و کۆتایی بوونەوەر دایە، بەم شێوەیە بیر بێ بونەوەر نابێت، چۆن مردن بێ ژیان نابێت، بەڵام بوون و نەبوون بێ ژیان دەبن ئەگەر وابێت بونەوەر بێ بیر دەبێت. مردن هەر لە سەرەتای ژیانەوە هەبووە، بەڵام لە هەربوو نەوە "ئەزەل" نەبووە، هەربوون بێ بیر و بێ مردن و بێ ژیان هەر هەبووە.

دەتگوت سامان چاوەڕێی وت و وێژێکی تری لەم پیاوانە دەکرد، یان دەیویست شتێکی تر ببیستێ، دەتگوت لەم باسانە وەڕس بووە. لەنکاوێک ڕوی تێیان کرد بێ هیچ سەرەتایەک وشەکانی ئاراستەی ئازاد کرد و گوتی:

- ئەرێ کاک ئازاد ئەوە ئێوە ماندوو نەبوون لەوەی بیر هەبێت یان بیر نەبێت، تەمەن کاتە یان کات نییە، کات هەبێت یان کات نەبێت. کوڕینە وا بزانم تەمەن و کات و ژیان خاڵێکە و لە ئارادا نییە. ئینجا بە من چی ئەگەر خۆشەویستی هەبێت یان خۆشەویستی نەبێت. وەک دەڵێن "چ بابێت چ باران بێت بۆ بەفر هەر زریانە" منی پەک کەوتە لەم هاوسانگییە هاتوومەتە

دەرەوە. من هەر سووم لە ئەبونە و مامۆستا دەبێتەوە، ئەبونە خۆشەویستی خۆی دۆزیوەتەوە چیتر باسی خۆشەویستی ناکات، مامۆستاش هەموو ژیانی بۆ خۆشەویستی خودا تەرخان کردووە. ئێوەش دەستە گوڵی خۆتان لێداوە. هەر بۆیەش هیچتان بە هیچ شێوەیەک بەلای ئەڤین دا ناچن و ئاوڕی لێنادەنەوە. ڕووی لە برادەرەکانی تر کرد؛ ئێوە لاتان وایە گەر باسی خۆشەویستی بکەن بڤەیە.

لەنکاوێک سامان بێدەنگ بوو، وا دیار بوو بەخۆی دا هاتەوە و لە مێشکی خۆی دا دەیگوت خۆ من ئاگام لێ نییە باسی چی دەکەن ئەی بۆ من بە خۆڕایی فشاریان دەهێنمە سەر، ئەو خۆی بێ دەنگ بوو، کەسیش وڵامی نەداوە وەک بڵێی گوێیان لە قسەکانی نە بوو.

شیرین لەبەر خۆیەوە دەیگوت، ئەم کوڕە هێند مناڵە هیچ لە پشیلەی بەزخۆر ناکات. گەر بەزیشی پێ بسپێریت بۆنی ناکات، من لەم بڕوایە دام زمانیشی بۆ درێژ ناکات. ئینجا چی دەڵێن با بیڵێن من شایەستەی ئەو باوەشەم. من فێری ئەلف و بای خۆشەویستی دەکەم. ناپلیۆن دەیگوت هەر پیاوێکی گەورە ژنێکی لە پشتە. بەس خوا بکات باوەشی بۆم بکاتەوە پەیمان بێت ئەم مناڵە گەورەکەم و بیکەم بە پیاوێکی گەورە.

****

بەڕاستی ئەم پاریسە دیمەنی سەرڕوودەی "سورریالی" وای تیایە بە بیری مرۆڤ دا نایێت. بەم شەوە میترۆ منجەی دەهات. دەرگای فارگۆنێک کراوە سەر پشت، کچ و کوڕەکان دەمیان لە نێو دەمی یەک نا بوو. هەندێکیان لە نێو فارگۆنەکە بیرەیان دەخواردەوە، هیواش هەبوون شوشەیێکی پڕ لە مەیان لەدەسەت دابوو دەیانخواردەوە. بێ ماندو بوون بە بڕوای من بێت بە هیچ و خۆڕایی پێدەکەنین. دوو پیاوی ردێن گەورەی پاک و خاوێن، یەکێکیان جوبەیەکی مەلایانە و کەشیدەیەکی سپی لە سەر نابوو ئەوی تریشیان بە بەرگی قەشانەوە هاتنە ژورەوە. گەنجەکانی نێو فارگۆنەکە واقیان وڕما و گشتیان سەریان بەرز کردەوە تا سەیری ئەم دیمەنە بکەن. ئەوەی ئیسلام بوو لە شەرمی مامۆستا تۆزێک خۆیان لێک جیا کردەوە، دیانەکانیش چاوی خۆیان شۆڕکرد و چاوەڕێی ئەوە بوون کەی مامە قەشە فارگۆنەکەیان جێ دێلێت. گەر پاریس بیابان بایە و دانیشتوانیشی وەک زیخبان مامۆستا و قەشە هەر وەک دوو دەنکە لمی نێو بیابان لە دالانێک لە دالانەکانی ناو میترۆ پاش ئەوەی یەکتریان بە هەمان خودا سوپارد، لێک جیابونەوە و هەریەکەیان بەلای پەرستگای خۆی دا ملینا و رۆیشت.

لەبەر ئەوەی شیرین دەترسا بەتەنیا لە ماڵەوە بخەوێت، پاش ئەم رووداوە ئەنگێلا شیرینی دەبردەوە ماڵی خۆی. سامان خۆی بەگەڵیان دا و پێی گوتن دەتانگەیێنمە ماڵەوە، کچەکانیش پێیان خۆش بوو. دەمی یان سینگی سامان دەتگوت بە حەوت کلیل کلیل دراوە. سینگی پڕ لە بیر و بیرۆکە و رستەیی جوان بوو، ئەویش ئەوەندەی خۆی دەکوشی وشەیەکی بۆ نەدەهاتە دەرەوە. هەرچی دەیویست بیدرکێنێ هەڵیدەسەنگاند و دەیگوت نەخێر یان دەیگوت جارێ زووە یان توخوا ئەوەش قسەیە؟ یان دەترسم تێمنەگەن.

- کاک سامان، شیرین گوتی :

- خۆزگەم بە خۆت لەم رۆژانە پێ دەنێیتەوە سەر خاکی نیشتمان.

- نیشتمان ئەو شوێنەیە کە دڵ تیایا ئاسوودەبێت. وەک دەڵێن "کێندەر خۆشە؟ ئەو جێ خۆشە دڵ پێی خۆشە". من هەموو شتێکم لەولا جێ هێشتووە، کەچی هیچیشم لە وێ نییە. من خۆم دەڕۆم بەڵام دڵم لە پاریس

جێدەمێنێت. ڕاستە من دەڕۆم، نهێنییەکم هەیە پێتانی دەسپێرم هەر وەک لە فۆلکلۆری خۆمان دەڵێ " لەگەڵ تۆمە چاو ئەستێرە.... هەر ئیمشۆکەم ماوە لێرە..... دوو قسەی خۆشم پێ بسپێرە" منیش پێتان دەڵێم چەند ڕۆژێکی تر من ئێرە جێ دێلم، بەرەو شاخەبەرزەکانی لای خۆمان دەگەڕێمەوە. من کە لەوێ هاتمە ئێرە بیرم لە کوردستان جێهێشت. ئێستە دەچمەوە لای بیر و ئەندێشەکانی خۆم. کچینە هەر کە گەیشتمە هەندەران دەستم پێکرد بۆ بیرەوەری و ئەندێشەکانم بگریەم دەزانم کە دەگەمە لای ئەندێشەکانم ئەوساکە بۆ دڵە جێماوەکەم لە پاریس دەگریەم. کە بەیانیان لەماڵەوە دێنە دەرەوە لەسەر پەیژە و سەکۆی بەردەرگای ماڵتان، ئاگاتان لێبێت پێ لە دڵم نەنێن، چونکە دڵم هەر لەسەر سەکۆی بەر دەرگای ماڵتان دەخەوێت.

ئەنگێلا سەیری شیرینی کرد وا دیار بوو دەیویست بزانێت، سامان ئەم ڕستەیەی ئاراستەی کامیان کرد. شیرین خۆی وا لێکرد کە گوایە گوێی لە هیچ نە بووە. خۆی بە دیمەنی سەر شەقامەوە خەریک کرد. هەر بۆیەش ئەنگێلا نەیتوانی هیچ شتێک لە ئادگار و چاوەکانی شیرینا بخوێنێتەوە. لەم کاتە دا گەیشتنە بەر دەرگای ماڵی ئەنگێلا.

ئەنگێلا پێی لەسەر سەکۆی بەر دەرگا چەقاند و هەناسەیەکی هەڵکێشا وبە بێ دەنگ خۆی بە خۆی گوت، هەموو ڕێگایێک کۆتایی دێت، بەڵام ئەو ڕێگایە خۆشە کە لەبەر دەرگای ماڵی خۆتا کۆتایی بێت. من لە تەمەنما لاوازیم بە خۆمەوە نەدی بوو. بەڵام وەک ئەم ڕێگایە هەموو شتێک کۆتایی دێت. ئێستا دەمەوێت ڕێگاکەم لە بەر دەگایەکی تر کۆتایی بێت. وابزانم شتێک لە ناخم دا دەستی پێ کرد لە دایکبێت. بێ گومان کۆتایی بە بێ باکیم لەم داهاتووە نا دیارەم دێنێت. یان ئیمڕۆکە تنۆکە ژەهرێک کەوتە نێو جامی ژیانم. تا ژیانم بەم جۆرەبێت ئەم جامە هەرگیز پاک نابێتەوە. تازە بە تازە خۆزیا بە چایخانەیەک دەبەم کە پڕ لە دوکەڵی جگەرەبێت. خۆزیام بەم دوو سێ کەسە دێت کە لە چایخانەکانا سەر پێکەوە دەنێن، نهێنیی دڵیان بۆ یەکتری باس دەکەن. لە هەمان کاتیش دا لە ڕێبوار و گوێدزەکانی دەور و بەریان دەیشارنەوە. من... منی بێ کەس، کەس شک نابەم نە باسی ڕابردووم

نه داهاتووم، نه باسی گرفتی دڵی خۆمی بۆ بکەم. نازانم بۆ جاران هەستم بەوە نەدەکرد خۆم سەلامم لە دیوارەکانی خۆم دەکرد کەس وەڵامی نەدەدامەوە. هەر دیوارە بە وەفاکانی هۆدەکەم وەڵامیان دەدامەوە. دەمزانی پەڕاوەکانم سڵاوم لێ دەکەن و باوەشم بۆ دەکەنەوە. وا بزانم دیوارەکانیش لە دیمەنی من بێزار بوون و چیتر وەڵامم نادەنەوە. پەڕاوەکانیش دەستیان شل بوو ئەوەندەی باوەشم بۆ بکەنەوە. ماڵەکەشم هێند بچووکە گەر گەرووشم بدڕێنم دەنگناداتەوە. لەم پاریسە لە کەس رانابینم باسی خۆمی بۆ بکەم. گەر باسی ئازاری دەروونم بۆ ژنە کوردێک بکەم، پێمدەڵێت دان بە خۆتا بگرە بەختت ئەوا سواری ئەسپێکی سپی بووە، دێت و دەتفرێنێت. ئەوا بیست و پێنج ساڵە منی داماو چاوەڕێی ئەم ئەسپە سپییە دەکەم. گەر باسی گرفتی خۆم بۆ دەستە خوشکە فەرەنسییەکانم بکەم بە پێکەنینەوە پێمدەڵێن چ زۆرە کوڕ زۆرە. تۆ بەس خۆت تۆزێک بۆیان شلکە دەبینیت هەموو کون و کاڕێژکی ژیانت پڕ دەبێتەوە. وەک دەبینیت وەڵامی هەر دوو لایان دەزانم، بۆیە لە دیوارەکانم بەولاوە نهێنی خۆم بە کەسی تر نەسپاردووە و ناشسپێرم. جار بە جار ئاواتەکانم، نهێنییەکانم، وەک مێرولە بەسە دیواری هۆدەکەما هەڵدەگەڕێن، من پێکەنینم پێیان دێت، ئەوانیش فرمێسکم بۆ هەڵدەڕێژن. گوێم لێیانە کە دەڵێن قورت بەسەر ئەی بێ ئاگا دەمێکی تر، هەر وەک بیست و پێنج ساڵەکەی کە رابووردن ژیان چاو تروکانێکە و تێدەپەڕێت. هەر تۆ بە دایکت دەڵێیت دایە وشەی دایەت ئاراستە ناکرێت. ئەنگێلا لای وابوو دوو هاوڕێکەی گوێیان لە رازی دڵی راگرتووە، بۆیە بە غەمگینی سەیری دەموو چاوی دەکەن.

سامان سەیری هەردووکیانی کرد و گوتی :

ـ کچینە خەوتان دێت؟ ئەگەر خەوتان نایەت وەرن بابچین لە قاوەخانەیەک دانیشین، دڵمان بە شادی ئەم خەڵکە خۆشکەین.

شیرین گوتی :

- من دژی ئەوە نیم کە بچین بۆ قاوەخانەیەک، بەڵام من دژی ئەوەم کە دڵم بە شادی ئەوان خۆش بکەم. چونکە ئەم ئەوروپاییانە، بە شادی ئێمە سەخڵەت دەبن. بە پێشکەوتنی وولاتانی جیهانی سێیەم تێکدەچن.

ئەنگێلا و سامان بێ ورتە بە دوای شیرین کەوتن و بێ ئەوەی بیر لە دووری وشەکانی بکەنەوە گوێیان لێ گرت بوو دەڵێت چی. هەندێک جار لە نێوانی دۆستان گرنگ نییە دەڵێیت چی گرنگ ئەوەیە بدوێیت و نەهێلیت بێ دەنگی سەرکەوێت و بە تایبەتی لە کاتێک دا کە مرۆڤ دەگاتە پلەیەک خۆی لە خۆی ناگات. ئینجا هەوڵ دەدات یان لە دۆستەکانی خۆی بگات یان دۆستەکانی تێی بگەن. یان هەر نەبێت رەخنەیەکی لێ بگرن تا بە هۆش خۆی بێتەوە. بە بەراوردیەکی سەرپێیی دەتوانم بڵێم؛ لەوکاتەی کە مرۆڤ خۆی لە خۆی ناگات وەک بڵێی خۆی لە نێو خۆیدا ون دەبێت. خودی مرۆڤ وەک شارێکی نەناسراو وایە. هەندێک جار مرۆڤ دەکەوێتە گۆشەیەکی دەروونی خۆی و تێیدا گووم دەبێت. سەیری دار و بەرد و ئاسمان دەکات و تا ئاسمانیشی لێ نامۆیە و بە ئاسمانە ناسراوەکەی خۆی ناچێت. بێ ئەوەی رووی رەخنە ئاراستەی کەس بکات. هێرش دەباتە سەر دیوار و ئاسمان و بەردی بەر پێی. سەیری کۆڵانە تەسکەکان دەکات و ئێرەیی دێ بە منداڵەکانی لەوێ یاری دەکەن، چونکە ئەوان دەزانن ئەم کۆڵانە بۆ کوێ دەچێ. لەو کاتەی کە مرۆڤ لە خۆی ناگات دڵی ناسک دەبێت، بۆیە مرۆڤێک کە ون دەبێت گریان لە گەروویا پەنگ دەخواتەوە. فرمێسک لە چاوەکانیا دەژێن. هەندێک جاریش یەکە ئارەزووی ون بوو ئەوەیە بە هۆش خۆی بێتەوە وەک جاری جاران سەرهەڵبرێتەوە، شوێن و جێگا و ئاستی راوەستانی خۆی بدۆزێتەوە. جارێکی تر ناسیاو و دۆست و ئاشناکانی وەک پەڕەکەر لێک جیا کاتەوە، لە نێو دڵیا شوێن و جێگای تایبەتیان بۆ بکاتەوە.

هەموو کاتێک ئاوارە ون دەبن، بەڵام پاش دەمێک نیگای خەڵکەکە بە هۆش خۆیانی دێنێتەوە. لە کۆتایی دا ئاوارە پێویستی بە هەموو کەسێکە و بڕوا بە کەس ناکات، بۆ کوێش ئاراستەیکەن بۆ ئەولا دەڕوا، بەڵام ئەو لەناخیدا هەر راگومە.

ئاوارە کە سەیری دەم و چاوی کەسانی تر دەکات. هەوڵ دەدات وەک پەڕاوێکی کراوە رستە بە رستە نهێنی دڵیان بخوێنێتەوە، بۆیە کورد دەڵێ "دڵ ئاوێنەی دڵە". مرۆڤی ون بوو گومان لە هەموو نیگایەک دەکات. راست یان درۆ هەر نیگایەی بە شێوەیەک دەخوێنێتەوە و لە ناویان دا دەخولێتەوە: "سەیری ئەم بێگانەیەکە لێرە چی دەکات". "بۆ هاتووەتە وڵاتی ئێمە". "دیارە لە برسانا هەڵاتووە". ئێمە خۆمان کارمان نییە ئەم دەم و چاوەشمان بۆ زیاد بووە. هەندێکیشیان کە سەیرت دەکەن لە دڵی خۆیانا دەڵێن وابزانم کارەکەرێکی خراپ نییە. بەڵام کەس ناڵێت دەبێت ئەم مرۆڤە مرۆڤێکی زیرەک نەبێت؟ هەر بۆیەش دەروونی ئاوارە زامدارە، کە دەگەڕێتەوە وڵاتەکەی خۆشی ئەم زامەی ساڕێژ نابێت. پەندی پێشینانی کورد دەڵێ "بەرد لە شوێنی خۆی لەقی شوێنی خۆی ناگرێتەوە."

هەر یەک لەم سێیە بە شێوەیەک لە دەروونی خۆی دا ون بووبوو. (سامان)یش لە جیهانی خۆی وون بوو بوو، چونکە بۆ ئەو پاریس شارێکی نامۆ بوو. سامان لێڕانەهاتبوو بە جلی ئاسایی و بە بێ چەک لەسەر شەقامەکان بخولێتەوە. لەوەش زیاتر رانەهاتبوو لە نێو بیر و ئەندێشەی خۆشی دا بخولێتەوە. وەک هەر سەربازێک فێری فەرمان وەرگرتن بوو. لە تەمەنیا هەر لەگەڵ هاوچەکەکانی پیاسەی کردبوو، ئێستە لەگەڵ دوو کچی نازدارا پیاسەی دەکرد. ئەم شتانە هاوسەنگی دەروونی سامانیان تێکدابوو. هەر بۆیەش سامان لەگەڵ ئەم دوو کچە نەیدەزانی بدوێت، یان دەشێت مێشکی هەر لەلای کچی سێیەم بووبێت. خودایە چی دەبێت دەستەوەسانێکم نیشاندەیت لە جیهان دا بڵاو بێتەوە بڵێن کچێکی بچکۆلانە لە شوێنێکی گەلێک دوور مرد بوو، هات و لە پاریس ژیاوە. خودایە چی دەبێت گەر لە جیاتی کشت کەس و کارم ئەم خوشکەم بۆ چاک کەیتەوە. بێ ئەوەی بیەوێت وەک هەناسەیەکی سارد لە نێوانی گریان و پاڕانەوە دەنگێک لە گەروی هاتە دەرەوە؛ خودایە پێتدەکرێت بە ئا یان نەء وەڵامم دەیتەوە؟

شیرین سەری خستە بن گوێی و گوتی:

- تۆ بپرسە من وەڵامت دەدەمەوە.

ئەنگێلاش گوتی:
- سامان، پێش هەڵسان بە هەر کردارێک پرسیارێک دێتە ئاراوە، کە ئەویش ئەوەیە: ئەو کردارەی کە دەبێت بینوێنمم، دەمەوێت یان نامەوێت ؟ لەتوانامدایە یان نەء؟ هەر خۆشت دەڵێیت، شت نییە نەکرێت و لە توانای مرۆڤ دا نەبێت گەر مێشکی خۆی بەکاربێنێت، بەڵام شت هەیە شیاوە یان شیاونییە. وایە توانای مرۆڤ بێ سنوور و بێ پایانە، مرۆڤ گەر بیەوێت هەموو شتێکی پێ دەکرێت.
سامان گوتی:
- سەد خۆزیام بە دڵی ئێوە دەڵێی سفرەی کراوەیە، هەر خواش دەزانێت ئەم سفرەیە چی لەسەرە. شیرین تازە قسەیەکت کرد گوتت ئەم ئەوروپییانە دڵیان بە شادی ئێمە ناکرێتەوە. ئەو رۆژە کاک ئازاد گوتی، "چەند دەسەڵاتمان زیاتربێت ئەوەندە زیاتر لە شتی دژوار و گیر و گرفتی ئاڵۆز دەترسین، چونکە هەر گیر و گرفتێک دەبێت بە دۆخێکی نوێ و خۆی بەسەر ئەم ئارایەی کە لێی راهاتووین دا دەسەپێنێت، دۆخەکەمان لێ ئاڵۆز دەکات. بۆ زلهێزەکان گیروگرفتێکی نوێ پێویستی بە چارەسەرکردنێکی نوێ دەکات. ترسی زلهێزەکان لە چارەسەرەکەیە، چونکە چارەسەر کردنی گیروگرفتێکی نوێ بار و دۆخێکی نوێ دێنێتە ئاراوە، بۆیە ئەوان لەم بار و دۆخە دەترسن. چونکە نازانن چۆن هەڵس و کەوتی لە گەڵدا بکەن. هەموومان لە داهاتوی نا دیار دەترسین. بۆ نموونە لە شوێنی تاریک بە ئەسپایی دەجولێینەوە. تا لە توانامان دابێت هەوڵ دەدەین ئاگرێک بدۆزینەوە تا مۆمێک داگیرسێنین. وەک دەبینن ئیمڕۆکە دەسەڵات لە دەستی رۆژئاوایە. رۆژئاواییەکانیش لەم یاسایە بەدەر نین. لە کۆتایی ساڵەکانی پەنجای چەرخی بیستەم رۆژئاوا تێگەیشت کە رۆژهەڵات چی تر مناڵەکەی جاران نییە، وا دیارە ئێستە رۆژهەڵات گەورە بووە و گەیشتووەتە پلەی هەرزەکارییەوە. پێش ئەو سەردەمە رۆژئاوا دەیویست نەخوێندەواری لە رۆژهەڵاتا نەهێلێت. بەڵام ئیمڕۆکە دەیەوێت رۆژهەڵات ئەو شتە فێربێت کە رۆژئاوا گەرەکیەتی، چونکە ئێستە ئێمە لە پلەی هەرزەکارین. هەرزەکاریش کەلە گەرمە و سەر بۆ هەموو شتێک

دانانەوێنێ. وەک دەزانن هەرزەکاری مێرمندالّ رقی هەیە، بەلاّم کینەی نییە. کچینە بۆی هەیە ئێوە لەبیرتان نەبێت یان ئاو کاتە ئێوە لەوێ نەبوونە، بەلاّم من ئەم زانیاریانەم هەمووی لە کاک ئازاد وەرگرتوە، ئەو رۆژرە کاک ئازاد دەیگوت، مرۆڤی پێگەیشتو پڕ لە رقە و کینەی ئەستوورە. گەر ئێمە مێرمندالّ بین رۆژئاوا مرۆیەکی پێگەیشتووە. بۆ نموونە کورد بۆ سەرکەوتنی ئیسلام خاچ هەلّگرەکانی شکاند و قودسی ئازاد کرد. بۆ سەرکەوتنی ئیسلام یارمەتی تورکیای دا نیوەی ئەورِوپا بگرێت. دوورمەڕۆن پاش جەنگی جیهانی یەکەم یۆنان تورکیایان داگیر کردبوو، ئەگەر کورد ئازادی نەکردباوە. لەم ناوچەیە ئینگلتەرە و فەرەنسا و رووسیا هەر لە نەتەوەی کورد دەترسن، بۆیە نەیان هێشت کورد وەک عەرەب و تورک دۆڕاوێکی سەرکەوتوبێت. بۆ نمونە ئینگلیز نەیتوانی بە تەنیا بەسەر شێخ مەحمودا زالّ بێت، تا بە هەزاران لەشکری عەرەب و هیندی نەهێنا. بەلاّم بە تەنیا بەسەر شۆڕشی سالّی ١٩٢٠عێراق دا زالّ بوو. ئینجا بە رووالّەت سەری بۆ داواکارییەکانیان دانەواند. چەپلّەی ئافەرینی بۆ عێراقییەکان لێ دا. ئینگلیز و فەرنسییەکان گوایە دوژمنی بابە کوشتەی تورکیا بوون. کە کورد لە سالّی ١٩٢٥ شۆڕشی دژی تورکیا کرد. فەرِەنسا سنووری سوریای کە لە ژێر دەستی خۆی بوو بۆ تورکیا کردەوە تا تورک بتوانن لە پشتەوە لە لەشکری کوردەکان بدەن، بەم شێوەیە بە هەزاران کورد کوژران و شێخ سەعیدی پیرانیش لە سێدارە درا.

کچینە کاک ئازاد پێیگوتم، وەک دەبینی کورد بوو بە قەلّغان و شمشێری رۆژهەلاّت هەر بۆیەش رۆژئاوای بە سالاّ چوو تا هەلّێهاتەکەش لە کورد دەترسا. هەر جارێک کە شۆڕشەکانی کورد سەرنەدەکەوتن، کورد ئێسک و پروسکی خۆی کۆدەکردەوە و دەهاتەوە مەیدانی جەنگ وەک بلّێیت هەرگیز لەشکرەکەی نەشکاوە. بەلاّم پاش هەلّێ هاتەکە کورد تێگەیشت کە جارێکی تر ناتوانێت هەلّسێتەوە. ئێستا رۆژئاوا دلّنیایە کە کورد رادەست بووە. هەر ئەوەندە ماوە دەستەمۆیکەن.

سامان تۆزێک راوەستا و سەیرێکی گوێگرەکانی خۆی کرد و سەیری بەخۆی هات ئەم دوو کچە وا گوێیان بۆ شل کردووە. ئەویش بێ ئەوەی

گویّ بداته باری دەروونی و سۆزی ئەم دوو ئافرەتە ناسکە، هاتەوە ناو باسەکەی خۆی:

- کاک ئازاد دەڵێ، رۆژئاوا ئەوەندەی چەک هەیە کەی بیەوێت رۆژهەڵات لە ناو ببات لە ناوی دەبات، بۆیە رۆژئاوا چیتر پێویستی بە سەرکەوتن نییە، ئێستە ئێمە بۆ ئەوان وەک منالێک واین. کە منالەکە شەق لە تۆپێک دەدات گەورەکان هاواردەکەن ئافەرین گۆڵ بە مەرجێک تۆپەکە بەلای گۆڵەکەشا تێنەپەڕیوە. بۆ ئەم منالە گۆلکردن گرنگ نییە، گرنگ ئەوەیە سەیری بکەن و چەپڵەی بۆ لێدەن. کە لە جەنگ و پێکدادانێکا رۆژئاوا دەیباتەوە و بە تەواوی سەردەکەوێت خۆی بە دۆڕاو پیشان دەدات و چەپڵە بۆ دۆڕاوەکان لێدەدات و هاوار دەکات ئافەرین برتانەوە. ئەو رۆژە کاک سالار بە کاک ئازادی گوت ئەی جەزائیریەکان فەرەنسایان بە چەپڵەڕێزان دەرنەکرد؟ کاک ئازاد گوتی بە پێچەوانەوە فەرەنسا سەرکەوت ئینجا بە جەزائیرییەکانی گوت ئافەرین بردتانەوە.

چەند گەنجێک: دوو کوڕ و سێ کچ بە گۆرانی ووتنەوە بەرامبەریان دەهاتن، کچێک دەستی سامانی گرت و دوو کوڕەکەش دەستی ئەنگێلا و شیرینیان گرت و گوتیان وەرن بۆ ئەم بارەی ئێرە بخۆینەوە. سامان و شیرین و ئەنگێلا داوای لێبوردنیان کرد و گوتیان زۆر سوپاستان دەکەین، ئەوەندە ماندوین نازانین چۆن بگەینەوە ماڵەوە. کچێکیان گوتی من ناوم سیلڤییە ئیمڕۆکە بوومەتە بیست و چوار ساڵ، هەر تازەش دۆستە دەبەنگەکەم لەگەڵ کچێکی تر رۆیشت ودەستی لێ بەردام. وەک دەبینن ئیمڕۆکە لە دوولاوە رۆژی منە. رۆژی لە دایک بوونم و رۆژی ئازادیمە لەدەست دەبەنگێکی نەزان. کوڕەکەی برادەریان گوتی پیاو پیاو بێت چۆن دەست لە کچێکی وا بەردەدات. ئەنگێلاش بە پێکەنینەوە گوتی، ئینجا خۆ بەتەمانیت بیکەیتە رۆژی خۆت؛ رۆژی لەدایک بوونت و دەستبەردانت و دەستگیرانیت؛ پیرۆزبایت لێدەکەم بە بۆنەی هەردوو روداوە خۆشەکانی ئیمڕۆکەت بەڵام بۆ سێیەمیان داوای لێبوردنت لێ دەکەم وەک دەبینیت ئێمە بە هەردووکمان یەکێکمان هەیە و تەنانەت بۆ دە دەقەش پێتی ناسپێرین. هەر

دوو لا دایان لە قاقای پێکەنین و سیلقی دەستی دۆستەکانی خۆی گرت و رایکێشان و گوتی با بەرەو ئەڤینی فەرەنسی بڕۆین، رۆژهەڵات لە ئەڤینی ئێمە تێناگات. خودا حافیزییان لە یەکتری کرد و لێک جیا بوونەوە. شیرین گوتی سەیری تازە یەکێک دەستی لێبەرداوە، لە دوای یەکێکی تر دا دەگەڕێت، ئینجا پێی دەڵێت ئەڤین. ئەنگێلاش گوتی بە ئەقڵی ئەم کچە بێت ئەوەی باش کۆشی هەڵکات ئەو لە ئەڤین دەگات. تا کاتژمێری دووی بەیانی لە باڕێکا دانیشتن و باسی ئەم دونیایەیان دەکرد.

سامان ئەو شەوە خەوی نەدەهات هەر چاوەڕوانی بەیانی بوو، چاوەڕوان بوو کەی رۆژ هەڵدێت کەی کاک ناکام نوچەیەکی خۆشی بۆ دێنێت. هەر دەقەیەک سەیری ئاسمان و سەیری کاتژمێری دەستی دەکرد. کەی رۆژ هەڵدێت کەی سینگە بچکۆلانەکەی تەزرە چاکدەبێتەوە؟ بەیانی زوو زوو لەگەڵ بزوتنەوەی یەکەم شەمەندوفەری میترۆ بەرەو دوکانەکەی خۆی کەوتە ڕێ. بە زووترین کات رۆژنامەکانی جیا کردەوە و دەرگای دوکانەکەی کردەوە و کەوتە کار کردن. بۆ لای نیوەڕۆ شیرین هاتە لای سامان و تۆزێک خواردنی بۆ هێنا. سامان سوپاسی کرد و گوتی بەخوا دڵم هیچ نابات، چاوەڕێی تەلیفۆنی کاک ناکام دەکەم. لای خودا چییە خەبەرێکی خۆشم پێ بدات. وەک بڵێیت لە ناکاو خەنجەرێکی لە دڵی شیرین دا، شیرین راچڵەکی و تەلیفۆنەکەی ئازادی هاتەوە یاد کە کاک ناکام تەلەفۆنی بۆ کردووە و پێیگووتووە تەزرە چارەی نەماوە، چونکە برینەکانی سینگی بوونەتە شێرپەنجە و نەخۆشییە پیسەکە لە هەموو لەشی بڵاو بووەتەوە. بە قسەی دختۆر گەر پێشی ساڵێک بیانهێنابایە بۆ فەرەنسا ئەگەری چارەسەری زیاتر دەبوو. ئێستەش باشترین شت ئەوەیە کە بە زووترین کات بیبەنەوە ناو کەس و کاری خۆی، تا ئەم گرییەشی لە دڵدا نەمێنێتەوە.

ـ ئەوەی بزانم پزیشک گتویەتی بێ باکبن لە بیمارگە باشترین دەرمانیان بۆ نووسیوە. ئەگەر پاش شەش مانگی تر بەرەو باشی نەڕۆیشت ئەوساکە بیر لە دەرمانی تر دەکەینەوە. ئەم پزیشکە گوتویەتی ئەگەر ئەم دەرمانانە بە شێوەیەکی ڕاست و دروست لە با و هەوایەکی پاک وەک با و هەوای

کوردستان بەکار بێنێت لە سەدا سەد چاک دەبێتەوە، بۆیە بە بڕوای من بە زوو ترین کات بیبەیتەوە بۆ کوردستان بۆ تەزرە باشترە. ئێستەش نانەکەت بخۆ، برۆ پشویەک بدە چونکە وا دیارە گەلێک ماندوویت. دوای پشوویەکی باش ئینجا برۆ لای تەزرە با تەزرە بەم شێوەیە نەتبینێت. ئەگەر لاریت لەسەر نەبێت، من دوکانەکە بەڕێوە دەبەم.

وا دیار بوو سامان گەلێک ماندووبوو، بۆیە بێ قسە بە گوێی شیرینی کرد و چووە هۆدەکەی پشت دوکانەکە و لە نێو بۆنی مەرەکەب و چاپەمەنی نوێ یەکسەر خەوی لێ کەوت. شیرینیش ناوە ناوە دەچوو سەرێکی لێ دەدا و بە کەیفی خۆی سەیری دەکرد. سامان لە سەر لایەکی تەختەکە خەوی لێ کەوت بوو، شیرین لە بەر خۆیەوە دەیگوت ئەم شوێنە بەتاڵە چ کچێکی بەخت سپی پری دەکاتەوە. دەبێت رۆژێک من لە تەنیشتی بخەوم؟ یان دەبێت ئەم کچە بەخت سپییە منبم؟

دەمەو ئێوارە پێش داخستنی دوکانەکە سامان دەستی کرد ئەم دیو و ئەو دیو بکات. شیرین زوو قاوەیەکی ئامادە کرد. کە سامان لە خەو هەڵسا، شیرین قاوەیەکی دایێ و بە پێکەنینەوە گوتی خەو خۆش. ئیمرۆکە کارێکی باشمان کردووە، هەموو رۆژنامەکانمان فرۆشران. ئێستا ئێرە دادەخەین تۆش برۆ لای تەزرە، چونکە دەزانم ئێستا چاوەڕێت دەکات، منیش دەچمە لای ئەنگێلا.

## دەرگای حەوتەم

## ئەستێرەکانیش ون دەبن

هیچ شتێک لە گەردونا بێ شوێنەوار نابێ
ئاسەواری دڵ گڕکانێکی نادیارە و تەواو نابێ

دوو مانگ بەسەر ئەو شەوەدا تێپەڕی، پاریس هەر وەک خۆی مونجەی دەهات. سامان تەزرەی گەیاندبووەوە کوردستان. تەزرە گەلێک کامەران بوو بە دیتنی کەس و کاری و بە تایبەتی کە گەیشتەوە ئەو شوێنەی لە کوێ گەورە بوو بوو. سامان ناوەناوە تەلەفۆنی ماڵی کاک ئازادی دەکرد و تەندوروستی تەزرەی پێڕادەگەیاندن. بەیانی زوو بوو سامان لە تەلەفۆنەکەی وا پێدەچوو گەرووی نووسابێ. هەرچەندە سامان نەیدەویست تەلەفۆنی سکاڵا بکات نازانم چۆن لەیادی کرد و تەلەفۆنی بۆ سکاڵا کرد، ئەم جارەیان تەلەفۆنی گشت دۆستەکانی پاریسی کرد بوو. سکاڵا دەمێک بوو بە نووچەکەی زانی بوو. بۆیە هەرکە گوێی لە دەنگی سامان بوو دەستی کرد بە گریان. ئەو سامانەی کە خەڵکی دڵیان دەداوە ناچار بوو دڵی سکاڵا داتەوە و دەیگوت، دایکی ئومێد مەگریێ بە خواستی خۆی لە ژێر دار گێوژەکە ناشتمان. سکاڵا خان ئەو شەوەی کە تەزرە کۆچی دوایی کرد من خەوێکی سەیرم دیت. هەموو جارێک کە دایکم لە خەو دەبینم شتێکم بۆ دێنێت. یان لە نانە خۆشەکەی کە دەیکرد نانێکم بۆ دێنێت و دەستی بەسەرم دادێنێت و دەڵێت کوڕم: ئەوە چییە؟ برسیتە؟ ها ئەم نانە بخۆ. بەڵام ئەم جارەیان دایکم لە سەر هەمان تاتە بەردی سەر کانییەکەی ڕێگای گوندی بالیسان نوێژی دەکرد، منیش تەزرەم بە مەلۆتکەیی لە باوەش بوو. دایکم نوێژەکەی تەواو کرد و گوتی کوڕم زۆرت بۆ تەزرە کرد. ئێستەش دەبێت تەزرەم بدەیتەوە. هات و تەزرەی لێسەندم. یەکسەر بێدار بومەوە و رامکردە ئەو هۆدەیەی کە تەزرە لێی خەوت بوو. دیتم تەزرە بێدارە و بە پێکەنینە جوانەکەی خۆیەوە

گوتی کاکە هاتی، ئەوە چەند لەمێژە دایە بانگم دەکات و دەڵێ دە کچم زووکە وەرە، هەر پێی دەڵێم نا دایە تا کاکم نەبینم نایەم. ئەوە تۆ هاتیت ئێستە من دەچمە لای دایکم. توخوا لە جیاتی من دەستی سکاڵا خان ماچکە. ئەو شەوەی پێش هاتنەوەم بۆماڵەوە، سکاڵا خان سێ سەد دۆلاری دامێ و گوتی کچم کە گەیشتیتەوە کوردستان ئەم پارەیە بدە بە کاکت تا شتت بۆ بکڕێت. منیش قسەم نەکرد و پارەکەم بۆ خستەوە ژێر مافورەکەی هۆدەی خەوتنیان. چونکە دەزانم خۆیان پێویستیان پێیەتی. دوایی گوتی من سۆزی دایکایەتی منداڵیم نایەتەوە یاد، بەڵام دەزانم سۆزی دایکم هەر دەبێت لە سۆزی سکاڵا خان بکات. پاش ئەم خەبەرە سکاڵا ئەوەندەی تر گریا، نە خۆی دەیتوانی خۆی ژێرکاتەوە نە سامان دەیتوانی ژێری کاتەوە. دایکی ئومێد بڕواتبێت پێویست بە گریان ناکات. کە تەزرەیان کفن دەکرد من چومە هۆدەکەی و یارییەکانیم کۆکردەوە و بە ئەسپایی وەک خۆی ئاسا خستمنە ناو باوڵێک و بردمنە سەر گۆڕەکەی و پاش ناشتنی گشتیانم لە چواردەورەی گڵکۆیە بچکۆلانەکەی دانا. پێم گوتن بووکە شووشەکان دڵی نەشکێنن یاری لەگەڵ بکەن. گشت بە دەنگێک گوتیان باشە. ویستم لە لای بخەوم، بەڵام نەیان هێشت.

بووکە شووشەکان گوتیان بڕۆ ئێمە ئاگامان لێیەتی، خۆمان و خاوەنەکەمان جێمان بێڵە. ئیتر لە مڕۆکەوە باسی سینگی تەزرە ناکەین، باسی بۆنی سێویش ناکەین، باسی دوکتۆرەکانیش ناکەین، باسی شەڕ و شۆڕیش ناکەین. دوور لە چاودێری گەورەکانی کە هەموو شتێک دەزانن، یاری دەکەین. ئەی گەورەکان ئەگەر تەزرەتان خۆشدەویێت و دەتانەوێت بێنە سەر گۆڕی، ئامۆژگاریمان ئەوەیە لە دوورەوە تفەنگەکانتان دانێن و جگەرەکانتان بکوژێننەوە، چونکە تەزرە حەزیان لێناکات. سکاڵا خان لە یادم چوو پێت بڵێم بووکە شووشەکان پێیان گوتم نە تۆ نە کەس هەر ئێمە ئاگامان لێ بوو تەزرە هەموو ڕۆژێک دەگریا، بۆیە ئێستاکە حەز لەگریان ناکات. چونکە چاوە بە ئەسرینەکانی خۆی دێتەوە یاد.

هەر لەبەر ئەوەشە پێت دەڵێم گەر تەزرەت خۆش دەوێت بۆی مەگریێ، با لەو دونیاش دڵ تەنگ نەبێت. دوای ئەمەش دایکم تەزرەی لە باوەشی من دەرهێنا خۆ غەدری لێ ناکات. دایکی ئومێد هەرچەندە تەزرە گەلێک لاواز بوو بەڵام کە من لە باوەشم دەکرد لام وا بوو لە تەزرە نەرم و نیان تر نابێت. من کە تەزرەم لە باوەش دەکرد هەستم بە شادیەک دەکرد لە گەڵ هیچ شادییەکی تر بەراورد ناکرێت. خودا ئەوەشی پێ ڕانەدیتم و بردیەوە بۆ لای خۆی. من دەڵێم تەزرە فریشتە بوو خودا ناردبووی بۆ سەر رووی زەمین تا ئێش و ئازاری مرۆڤایەتی لە لەشی خۆی دا کۆ کاتەوە تا بەم ئێش و ئازارە، گوناهی مرۆڤاتی پاک کاتەوە. سکاڵا خان لەمڕۆ بە دوواوە تا دڵە بچکۆلانەکەی تەزرە نەشکێنم چیتر چەک بەدەستەوە ناگرم. دوژمن زوو یان درەنگ بە بێ چەک دەبێت لە وڵاتەکەم بچێتە دەرەوە. لێرە تەلەفۆنەکە بڕا وا دیار بوو کارتی تەلەفۆنی کاک سامان تەواو بوو.

سکاڵا وەک مریشکی بێ سەر لە ماڵەکەی خۆیا دەسووڕاوە و بە هەموو لایەک دا دەڕۆیشت هەر بەلای ژوورەکەی خۆیانا نەدەڕۆیشت واتا ئەو شوێنەی تەزرە بە پەنجە بچووکەکاتی پارەکەی تیاشاردبووەوە. سکاڵا تەلەفۆنی شیرینی کرد گوتی شیرین گیان دڵم زۆر دەگوشرێت ئەگەر دەتوانیت وەرە لام. شیرین لە وەڵامدا بە سکالای گوت ئەگەر دڵت دەگوشرێت ماڵاکە جێ بێڵە یان وەرە لای من لە دوکانم یان بڕۆ بۆ لای کاک ئازاد. ئەگەر بێیت بۆ لای من زۆر باشترە، چونکە منیش دڵم زۆر دەگوشرێت، نازانم چی بکەم. بەڵام وەک خۆت دەزانیت کار کارە و ناتوانم شوێنی کار بەجێ بێڵم، ئەگینا ئەوەندەم پێخۆشە تێر تێر بە دەنگێکی بەرز بگریم تا فرمێسکم وشک ئەبێتەوە. هەرنەبێ منالەکان لە قوتابخانە دەربێنە و بیانبە بۆ باخچەیێکی گشتی و کاتی هاتنەوەی کاک ئازاد وەرەوە ماڵەوە. بەم شێوەیە بە تەنیا نابیت، ئەی من بڵێم چی هەموو کاتێک بەتەنیام.

ئیتر سکاڵا لە تەک تەلەفۆنەکە دانیشت و بە هیچ لایەکدا نەچوو، کردیان بە رۆژی خۆیان. ناوە ناوە دەگریان و ناوە ناوەش باسی کێشەی خۆیان دەکرد. سکاڵا بە شیرینی گوت :

ـ باشتر وایە دەمت نەکەیتەوە، تا دەمی من نەکریتەوە تۆ و ئەوانەی بە تۆ دەچن بۆ هەڵبژاردنی هاوسەرێک هێند لە خۆ بایین، وا دەزانن جوانیتان هەتا سەرە. نازانن گوڵ چەند جوانبێت تەمەنی هەر یەک بەهارە و بەهاری دووەمی لە وێنە و هۆنراوەی هەستیاران تێپەڕناکات. شیرین نامەی دڵداری چەند ناسکبێت باسی ماچی لێوت بکات، هۆنراوە چەند بە هەست و نەست باسی کوڵمە و خەت و خاڵت بکات، وێنە چەند رووەدەیی بێت یارەکەت ماچی بکات، گشتیان پێکەوە کۆ ببنەوە گەر بەرجەستە نەبن و وەک روودە روونەدەن. گەر لێوێک بە لێوت نەکەوێت، وشەی بێ هاوتای سەر کاغەز گەر بە پولێکیش بیکڕیت هەر گرانە.
ـ سکاڵا خان ئەو گوڵەی باسی دەکەیت ئەوە چەند ساڵە لە باو باران و هەتاو دەیپارێزم، تا بە گەشاوەیی و نەگەچراوی پێشکەشی باخچەوانێکی کەم. گرفتی من ئەوەیە دەبێت ئەو باخچەوانە بیپارێزێت و نرخی ئەم گوڵە بزانێت؟ نازانم لای تۆ خۆشەویستی پێویستییە، چێژە، یان هەستە؟
ـ شیرین خۆشەویستی بازنێکی زێڕە دوو عەیاری لەسەر هەڵکەندراوە؛ یەکەم هەستە و دووەم چێژە، جا بۆ ئاگاداریت مرۆ پێویستی بە هەست و بە چێژ هەیە. گرنگ ئەوەیە گەر هەستت بەلای پیاوێکا چوو خودا کردی ببن بە هاوسەر و چێژت لێوەرگرت. هەستت بۆ ئەو پیاوە زیاد دەکات. کەی هەست زیادی کرد چێژیش زیاد دەکات. وەک لە قورئانی پیرۆزدا لە سورەتی رۆم دا دەڵێت "هەر لە دەسەوسانی ئەوە کە هاوجوتیی لە نەژادی خۆتانم، بۆ ئافەر کردن تا پێیان دابین ببن و ئەڤین و دلۆڤانی خستۆتە ناوتان. لەمە دا بەڵگە زۆرە بۆ کەسانی کە بە ووردی سەرنج بدەن".
ـ جاری پێشوو گوتت ئەڤین سێ دووری هەیە؛ یەکەمیان هیوایە، دووەمیان نەسرەوتنە، سێیەمیان چێژ وەرگرتنە لە ئازاری دڵ.من بە کامیان بڕوا بکەم؟
ـ شیرین گیان تۆ یەکەم شت خۆشەویستی لە دەستت بکە ئەوکاتە دەبێت بە ئەڤین ئینجا ئەڤین بە سێ کوچکەکەیەوە دێتە مەیدان.
ـ من دەمەوێت کچێکم ببێت بە تەزرە بچێت و ناویشی لێ بنێم تەزرە.

- ئەی چی تیایە ئەگەر کورێکیشت ببێت و کتومت لە کاک سامان بکات؟ بۆ چەند لە مێژە وات پێ نەدەگوتم، ئاخ بمزانیبایە ئێستا هەموو شتێکم دەبڕاندەوە. خوشکم خۆت رادەستی هەستی خۆتکە، هەستت چەواشەی نەکردوویت ئێستە دەزانم تۆ نیشانچیت و نیشانی خۆت باش پیکاوە. دەک چاوی خوشکت کوێر بێت ئەگەر کاکم لە بەندیخانە نەدەبوو چۆن دەمهێشت بچیتە ناو خێزانێکی تر، دەمهێنایتە ناو خێزانی خۆمان. بەلاّم ئێستاش لە خوا بەزیادبێت گەر ئەم کارە سەر بگرێ بە فیرۆ نەچویت، چونکە کاک سامان پیاوی باشە، هەموو کەسێکی بە شەرەف لێی رازییە.

- ئەرێ خۆ من قسەکەم لە دەم دەرنەچوو تۆ کردت بە راستی، تۆ هەموو کاتێک دەریا لە ئەژنۆتە. بەلاّم دەی خودا بە وێردی تۆ بکات. منیش زۆرم پێ خۆشە چونکە پیاوی وا کەم دەست دەکەون.

****

دەمێکی پێ چوو سامان سێ نامەی لە ناو یەک زەرف نا و بە دەستی کاک سەهەند نامەکەی بۆ کاک ئازاد نارد. ئەم سێ نامەیەی بۆ شیرین و سکالا و ئەنگێلا نووسی بوو. بە کاک سەهەندی ڕاگەیاندبوو کە ئەم نامەیە بدات بە دەستی کاک ئازاد. کاک سەهەندیش بەتایبەتی هاتە دوکانەکەی کاک ئازاد و نامەکەی پێ سپارد. ئەویش خێرا خێرا نامەکەی کردەوە و سەیری کرد چەند وێنەیەکی گۆڕەکەی تەزرەی تیایە. تۆزێک سەری خۆی بادا و گوتی بە داخەوە هیچمان بۆ تەزرە پێنەکرا. سەیری پشتی وێنەکانی کرد لەسەر یەکێکیان نووسرا بوو. "با ئەم گۆڕە و ئەم دار گێوژە ببن بە هیما دژی بەکار هێنانی چەکی کیمیاوی". سەیری سێ نامەکەی تری کرد ئاراستەی سکالا و شیرین و ئەنگێلا کرابوون. بۆیە نامەکانی لولداوە و سەیرێکی کاک سەهەندی کرد و گوتی ئەمەش دونیایە؟! ئەم منالە بچووکە بۆ هاتە ئەم دونیایە؟! لە ناخۆشی بەولاوە چی لەم دونیایە دیت.

- کاک ئازاد ئێمە تا لە ژیانداین هەر ڕۆژێک کە لە ژیانمان تێدەپەڕێت لۆمەی دەکەین تا لەو ڕۆژەش کە تیایا هاتینە ئەم دونیایەوە. لە هەموو ڕۆژەکانی کە دەژین، یەک ڕۆژمان بەدەستەوە دەمێنێتەوە کە ناتوانین لۆمەی بکەین ئەویش ڕۆژی بە جێهێشتنی ئەم دونیایەیە. کاک ئازاد ئەوەی دواین ڕۆژی لۆمە نەکات دیارە زۆر شادە بە گەیشتنی بەو تاکەڕۆژەی کە پێی لۆمە ناکرێت. ئەو ڕۆژەی کە لۆمە نەکرێت دیارە ڕۆژی شادییە، ئێمەش لۆمەی ڕۆژی شادی تەزرە دەکەین. کێ نالێ ئێستە ئەو پێکەنینی بە گریانی ئێمە نایەت؟ جێهێشتنی ژیانێک کە سەر تا پای ئێش و ئازار بێت، ئەگەر شادی نەبێت دەبێت چیبێت؟ دەشێت بە جێهێشتنی ژیانێکی پڕ لە ئێش و ئازار دەرگای ژیانی پڕ لە کامەرانی نەکاتەوە؟

- خۆزیام بەوانەی کە وادەزانن مردن سەرەتای ژیانێکی ترە.

- کاک ئازاد من هەر ئەوەندەت پێ دەڵێم و دەڕۆم، چونکە تۆزێک کارم هەیە. من بڕوام وایە کە ژیان پێشی ژیان دەست پێدەکات، چونکە ژیان لە تیشکەوە دەست پێدەکات.

هەر کە سەهەند چووە دەرەوە ئازاد تەلیفۆنی شیرین و ئەنگێلای کرد و پێی گوتن ئەم ئێوارەیە دەتوانن بێن بۆ ماڵی ئێمە و نامەکانتان ببەن. بۆ ئێوارە ئازاد هاتەوە ماڵەوە، وەک ئاسایی سکاڵا بە بەرەو پیلی چوو و لێی پرسی خۆ زۆر ماندوو نیت؟ ئەویش وەک ئاسایی ماندووش با نەیدەگوت ماندووم. ئەم جارەیان ئازاد لەسەر کورسییەکەی خۆی دانیشت و سکاڵاش هات و لەسەر ئەژنۆی بەرامبەر ئازاد دانیشت و سەری بە رانی کرد. ئازادیش بە هێمنی دەستی بە سەری دادەهێنا و جار و باریش پەنجەکانی وەک شانە لێ دەکرد و پرچە درێژەکەی پێ دادەهێنا و ناوە ناوەش دەستێکی بە رومەت و دەم و لێوی دادەهێنا.

ـ ئازاد گیان شتێکم هەیە دەمەوێت پێتی بڵێم.

ـ ئازاد هەڵسا و چووە ژووری نووستن، چونکە پەنجەرەیەکی گەورەی تیا بوو. سکاڵاش بە دوای کەوت. ئەویش راوەستا و بە هەر دوو دەست سەری سکاڵای گرت و بەرامبەر بە خۆی رایگرت و گوتی، نا من شتێکی گرنگترم هەیە دەمەوێت پێتی بدەم. ئازاد نامەکانی لە باخەڵی خۆی دەرهێنا و نامەکەی سکاڵای جیاکردەوە و دایە دەستی. سکاڵاش یەکسەر نامەکەی کردەوە و زریزەیەکی زێر لە ناو نامەکە کەوتە خوارەوە و کەوتە سەر ئەو شوێنەی کە تەزرە پارەکەی لە ژێری شاردبووەوە. سکاڵا داهاتەوە هەڵیگرێتەوە، کە چاوی بە شوێنی کەوتنی زریزەکە کەوت، لە دەقی خۆی وەستا و دەستی کرد بە گریان. ئازاد دەستی سکاڵای گرت و هەڵیستاندەوە. بە دەنگێکی پڕ لە سۆزەوە گوتی، چی بووە سکاڵا گیان گوڵەکەم بۆ دەگریت؟

ـ ئازاد گیان ئەوە چەند شەوە خەوم لێناکەوێت، دڵیشم نایەت پێت بڵێم. ئیمڕۆ هەر لە بەیانییەوە بڕیارم داوە کە پێتی بڵێم چونکە ئەگەر نەیدرکێنم شێت دەبم. ئازاد گیان، دێتە یادت بڕیارمان دا سێ سەد دۆلار بدەین بە تەزرە؟ ئەو رۆژە کاک سامان تەلەفۆنی بۆ کردم و گوتی تەزرە پێش مردنی پێیگوتم کە پارەکەی نەبردووە و لە ماڵەوە لەم شوێنەی کە ئەم زریزەیەی لێ کەوتووە، بۆمانی جێهێشتووە. دەشێ تەزرە بڕوای وا بووبێ کە خۆمان پێویستیمان بەم پارەیە هەیە.

ئازاد به ئەسپایی داهاتەوه و مافورەکەی هەڵداوه و سێ سەد دۆلارەکەی به دەستەوه گردت و له شوێنی خۆی سڕ بوو. پاش دەمێکی باش، به هۆش خۆی هاتەوه و سەیری زریزەکەی کرد، که به جوانی تێی راما بۆی به دیار کەوت که له سەر نەخشەی کوردستان وێنەی دارێک و گڵکۆیەکی لەسەر هەڵکەنراوه. ئازاد هەڵساوه سەر پێ و سەیری نێو چاوی سکاڵای کرد وگوتی، دەزانم تۆ حەز له زێڕ ناکەیت. بەڵام ئەم زێڕه به زێڕەکانی تر ناچێت. ئینجا زریزەکەی له ملی سکاڵا کرد. و گوتی هەر نەتەوەیەک هێمایەکی هەیه با ئەمەش هێمای نەتەوەکانی کوردستان بێت. ئازاد دەمێک بەرامبەر  سکاڵا وەستا و له ملوانکەکەی ملی راما. ئینجا هەردوو شانی گرت و بەرەو خۆی رایکێشا و له باوەشی خۆی کرد. نه سکاڵا ورتەی لێوه دەهات نه ئازاد هەناسەی هەڵدەکێشا وەک دار و لاولاو تێک ئاڵا بوون. نه هاژەی با دەهات نه خوڕەی ئاو دەهات نه دەنگی هەناسەی سکاڵا و ئازاد دەهات. تا بتوانێت کش و ماتی ئەم ژووره به ئاسانی بشڵەژێنێت. بەم جۆره نەخشەی کوردستان لەم ژووره بێ دەنگه دا کەوته نێوانی لێدانی دوو دڵ. ئەم جارەیان ئازاد به ئەسپایی سکاڵای پەلکێشی ساڵۆنەکه کرد و له سەر  قەنەفەکه داینا و بۆ خۆی چوو بۆ مەتبەخ و قاوەیەکی سەنگینی ئاماده کرد و بەرامبەر به سکاڵا دانیشت و قاوەکەی دەخواردەوه. زەنگی دەرگا لێی دا، ئازاد هەڵسا و دەرگای کردەوه. شیرین و ئەنگێلا ئێواره باشیان کرد و به ئەسپایی خزانه ناو ساڵۆنەکه و دەستیان له ملی سکاڵا کرد و ئەملاوئەولای یەکتریان ماچ کرد و به بێ دەنگی بەرامبەر بەیەک هەڵتروکان.

- کاک ئازاد ئیمڕۆکه تەنیا هاته لام ( ئەنگێلا بێ دەنگییەکەی شڵەژاند هەرسێک سەریان بەرز کردەوه، شادییەکی غەمگین له چاوەکانیان بەدی دەکرا هەرنەبێ یەکێک شتێکی پێیه بیڵێت) و دڵی گەلێک خۆش بوو و گوتی وەڵامی دادگەمان بۆ هاتەوه و چێنەر و سەپان  سزا دراون به ۲۰۰ هەزار فرەنگ: ۵۰ هەزار بۆ ئەلێکساندەر و ۵۰ بۆ تەنیا و ۵۰ بۆ کاک ئازاد و ئەوی تریش بۆ کاک سالار. کاک ئازاد نامەکانی دا به کچەکان و داوای لێ بوردنی

کرد و گوتی دەچم بۆ لای مامۆستا. شیرین هەر وەک بوزییەکانی ڕێچکەی زێن، نامەکەی خۆی لەسەر مێزی کۆمپیوتەرەکەی کاک ئازاد دانا و گوتی ئەوەی لە نامەکەدا هاتبێت ئیتر ناگۆڕدرێت، ئەنگێلا با چایەکانمان بخۆینەوە دوایی نامەکان بە کاوەخۆ دەخوێنینەوە. ئازاد دەرگای پێوەدا و ڕۆیشت.

ئەنگێلاش نامەکەی خۆی لە یاد کرد، وەک بڵێی هیچ ڕووی نەداوە و ئازاد گۆرەپانی بۆ ژنەکان بە جێهێشت. ئەویش بە هەلی زانی باسی تەنیاخان بۆ دوو دەستە خوشکەکەی خۆی بگێڕێتەوە. بێ داپچڕان لەسەر قسەی خۆی بەردەوام بوو: کچینە ئەم تەنیایە شێتە ئیمڕۆکە هاتە لام پێیگوتم من یەک لە بارە خۆم پارەکەیان بۆ دەگەڕێنمەوە. دوێنێکە چوومە لایان ڕەنگیان لە ڕەنگی پەلکی پیاز دەچوو کافر بیدیتبان ئیسلام دەبوو. ئینجا کچێکی وەک من چۆن دڵی پێیان نەسووتێت؟ منیش کە چووم بۆ لایان مینی ژۆپێکم لەبەر کردبوو بە خوا هەموو لەشم تیایا دیار بوو. ئینجا کە بەم شێوەیە چاوم پێیان کەوت دڵم پێیان سووتا پێمگوتن هەی بێ ئەقڵینە ئەوا من لە پارەکەی خۆم خۆش دەبم بەڵام جارێکی تر بێ ئەقڵی وا نەکەنەوە. ئەنگێلا دەزانی شەرمیان دەکرد سەیری ڕانمکەن. منیش ناوە ناوە بە فیلێک چۆکەکانم تۆزێک لێکدەکردەوە. ئەوانیش یەکسەر سەیری ژێر پێی خۆیان دەکرد. پێمڕاگەیاندن کە ساشەش لە پارەکەی خۆی خۆش دەبێت. دەمێنێتەوە سەر کاک ئازاد و کاک سالار. ئەوانیش بەسەر شۆڕییەوە گەلێک سوپاسیان کردم. چونکە هەر سەریان بەرز کردباوە منیش ڕانم لێک دەترازاند. ئەوانیش بە تەنیایان گوت بوو بەخوا وامان دانا بوو چێشخانەکە بفرۆشین تا ئەم پارەیە پەیدابکەین بەڵام مادام ئێوە لێمان خۆشدەبن ئەوەندەمان هەر هەیە بیدەین بە ح.ش.ع و ی.ن.ک.

- سکاڵاش ئەوەندەی پێناخۆش بوو کە وایان گووتووە، بۆیە خۆی پێنە گیرا و گوتی، بەخوا ئەگەر وابێت ئێمە پارەکەمان هەر دەوێت. تا جارێکی تر ئەم ناکەس بەچانە دەمیان دابخرێت.

ئەنگێلا گوێی نەدا قسەکانی سکاڵا تۆزێک سەری خۆی بادا و شانەکانی تۆزێک بەرز کردەوە و لێوەکانی هەرقرچاند و لەسەر چیرۆکی

خۆی بەردەوام بوو.  ئینجا تەنیا پێی گوتم من و ساشە لێک جیا بوینەوە. پێم گوت؛ ئەیڕۆ ئەم سەگ باوکە بۆ وازی لێهێنایت؟
ـ نا کچێ من وازم لێ هێنا، ئەوە کەی پیاوە، هەموو شەوێک دێتە ناو جێگا و لێی دەخەوێت، چونکە تا دوو و سێی بەیانی کار دەکات، کە دێتە ناو جێگا تاقەتی ئەوەی نییە خۆی لەسەر پێی راگرێت ئەی تاقەت بۆ من لە کوێ بێنێت؟ ئینجا پیاوێک بەم جۆرە بێت چی پێدەکرێت؟ هەر خەریکی پارەکۆکردنەوەیە. لە مێژە بڕیارم داوە کە ئەم رەوشە بەم شێوەیە ناتوانێت بەردەوام بێت و شیاوی گۆڕانە، بۆیە منیش بڕیارم دا کە بیگۆڕم. ئەو رۆژە تا لەگەڵم چاکبێتەوە منی برد بۆ ناو پاریس و لەسەر پردی نێف Pont nef پیاسەمان دەکرد. دیتم لەسەر پردەکە منالێک لە دایکی زیز بووە و رکەی گرتووە و نارِوات. منیش لە دایکیم پرسی بۆ ئەم منالە وا بەم شێوەیە دەگرێت؟ دایکیشی گوتی نوقڵی دەوێت نوقڵێشم پێ نییە، با هەر بگریێ تا ماندوو دەبێت، ئەی چی لێ بکەم؟
ئەو رۆژە من بڕیارم دابوو کە لە ساشە جیاببمەوە بۆیە جانتاکەی کە نوقڵەکانی دایکم دابووی بە حەمەی برام چەند ساڵە تیایا هەڵم گرتبوو، لە گەڵ خۆم هێنابوو تا جارێکی تر نەگەڕێمەوە ماڵی ساشە. لە ژنەکەم پرسی ناوی کوڕەکەت چییە؟ گوتی محەمەد. منیش جانتاکەم کردەوە و نوقڵەکانم دەرهێنا و دام بە محمد. منالەکە یەکسەر ژێر بووەوە و دەستی دایکی گرت و رۆیشت. منیش سەیرێکی جانتا بەتاڵەکەم کرد و گوتم ساشە نوقڵەکانم دا بە حەمە ئیتر تەواو من پێناسەکەم لە روباری سێن دا دەشۆمەوە. پاش ئەم رستەیە جانتاکەم بە ئاوی سێن دادا. بە دەنگێکی بەرز هاوارم کرد پێناسەکەم خودا حافیز، رۆژێک دێت بەشادی پێکدەگەینەوە. ئیمڕۆ بڕۆ بەرەو دەریا لەوێ گەر بۆت لوا ببیت بە هەڵم تا کوێستانەکانی کوردستان رانەوەستیت. گەر پێتکرا لەوێ ببارە و لە سەهۆڵ بەندانەکانی ئەولا گیربەوە. بەڵام ئێستاکە لێمگەڕێن با لە کۆمەڵگای پاریسی دا بتوێمەوە. ئەی دۆستەکانی جارانم چیتر پێویستیم بە پێناسەیەکی گەچراوی لەبار یەک دەرهاتوو نییە. ساشە لێی پرسیم: ئەرێ پێمناڵێیت چیت دەوێت؟ یان بە شێوەیەکی تر لە چی دەگەڕێیت؟

دەڵێت منیش پێمگوت: لەمڕۆ بەدواوە لە خۆشەویستی تۆ دەگەڕێم لە تەنی پیاوێکی تردا، چونکە بەڕاستی کەس ناتوانێت منی خۆش بوێت، چۆن تۆ منت خۆش دەوێت. من بە دڵ و بە گیان تا ئێسکەکانیشم هەست بە خۆشەویستی تۆ دەکەن. تۆ هەموو شتێکت پێ بەخشیوم جگە لە چێژ، بۆیە چێژ لە پیاوانی تر وەردەگرم. ئەو پیاوانەی بە دڵ و بە گیان نەفرەتیان لێ دەکەم، چێژیان لێ وەردەگرم. تۆ بەرگ بۆ ئافرەتان دەدرویت، پیاوانی تر چێژیان لێ وەربگرن. تۆ چێژ لە داهێنانی خۆت وەردەگریت، تۆ چێژ لە چێژی پیاوانی تر وەردەگریت. ساشە تۆ لەنێو هەورە سپییەکانی ئاسمانا وەرە خوارەوە، وەرەوە ناو نوێنە سپییەکەی شەوانمان تا چێژ لە ئەڤینی تۆ وەرگرم. ساشە چێژ لە لەشی من وەربگرە نەک لە وەی کە لە بەرم دایە. ساشە ئەڤینی تۆ بەرگ و سوخمەیە، ئەڤینی خۆت داوەتە پارچە پەڕۆک لە خەو هەڵسە بیدە بەوەی کە دەچێتە ژێر سوخمەوە. تۆ هێند خۆ پەرستیت بە شێوەی خۆت چێژ لە لەشی من وەردەگریت. لە پێناوی چێژی خۆت، چێژی منت وەلا ناوە. ئەوە چەند جار لێت پاڕاومەتەوە و پێمگوتوویت لە نێو هەورە بەرزەکانا وەرە خووارەوە و لەسەر سینگم بنیشەوە، تا جارێکی تر وەک جاری جاران، جارێکی تریش هەست بە ئەڤینت کەمەوە. ساشە ئەڤینی تۆ بۆ من کەوتە نێو گۆماوی دەربەندی بیرەوەرییەکانم.

ساشەش پێیگوتم دەڵێیت چی ئەگەر منالێکمان ببێت؟ ناوێکی کوردی بۆ هەڵبژێرین یان ناوێک بێت کە لە نێو کورد و فەرەنسی دا هەبێت "ئالان...دیلان...رۆژێ". منیش گوتم ساشە من چیتر تۆم خۆشناوێت، من ساشەی جاری جارانم خۆشدەوێت. کاتی خۆی تۆ وەک مرۆڤێک هەڵس و کەوتت لەگەڵم دەکرد. من بۆ ساشەی جاران بووکە شووشەیەک نەبووم، مرۆڤێک بووم. ئیمڕۆکە من بۆ تۆ بووکە شووشەیەکم، جلێکم لەبەر دادەکەنیت یەکێکی ترم لەبەر دەکەیت. تۆ لە داهێنانی خۆت ماندوو نابیت، بەڵام من بە بەرگی نەگەچراوەوە شل و کوت دەبم، وەک وێنەیەک لەبەر دەمتا تێدەپەڕم و دەسووڕێمەوە. لەجیاتی ئەوەی پێنووسەکەت لەسەر لەشم دانێیت، سەرت دادەنەوێنیت و وەک بڵێیت من لە ئارادانیم لەسەر کاغەزەکەی

بەردەمت هێلێکی تر لەسەر مەمکدانێکی تر زیاد دەکەیت. ئەوە دوو مانگە پێمدەڵێیت تەنیا ئاگات لەخۆتبێت سکت تۆزێک گۆشتن بووە. ئەوە سکم بوو بە دووانزە حەفتە تۆ ئاگاشت لێی نییە، هەر وا دەزانیت قەڵەو دەبم. تازە بە تازە دێیت ئەم پێشنیارەم پێشکەش دەکەیت؟ بۆ زانینت ئێستا تۆ بە تەنیا دەچیتەماڵەوە چونکە من خانوێکم گرتووە و ئیمشۆکە لەوێ دەخەوم. سەیریشت پێ نەیێت شتەکانی خۆم گوواستۆتەوە. هەر ئەم جانتایەم لە ماڵەکەی تۆ دا مابووەوە ئەویشم فڕێدا ناو ئاوی سێنەوە. تۆش هیچ مافێکت بەسەر ئەم مناڵەوە نییە کە لە سکم دایە. چونکە ئەم مناڵە لە تۆ نییە، لە ئەلێکساندەر دانتۆنە.

- تۆ پەروەردەی دەستی منیت، من تۆم گەورە کرد. من تۆم بە گۆڤارەکان ناساند و تۆم پێگەیاند. بە هۆش خۆت وەرەوە تۆ نەتدەزانی جل لەبەر کەیت، تۆ نەتدەزانی لە رێگا بڕۆیت. من فێرم کردیت جل لەبەر کەیت چۆن لە رێگا بڕۆیت. تەنیا بە هۆش خۆت وەرەوە من تۆم داتاشی، ئێستاش وەک چۆلەکەیەک دەتەوێت لە دەستم بفڕیت بۆ سەر داری ماڵێکی تر.

- نا ساشە تۆ بە هۆش خۆت وەرەوە من بۆ سەر هیچ درەختێک نەفڕیوم. دۆستەکانت وەک قەلە رەش لەسەر لەشم دەنیشنەوە، ئەو لەشەی لە تۆ بەولاوە کەس لەسەری نە نیشتبووەوە. ئێستە خۆشم نازانم چۆن چۆنی خۆم لە دندووکیان رزگارکەم.

- تەنیا من تۆم خۆشدەوێت و بە راستی پێت دەڵێم، نەکا وا تێبگەیت تۆ جێگای خۆت لە کۆمەڵگای فەرنسی دا کردووەتەوە. تەنیا جێگای تۆ هێندە لەقە گەر پشتە ئەستوورەکەی من نەبێت خۆت لە دامێنی کۆمەڵگای بەرزی فەرنسیش نادۆزیتەوە. تۆزێک بە خۆت دا وەرەوە سەیری ئەم خەڵکە کە گشتیان فەرەنسین و لە سەر ئەم خاکە لە دایک بوون، بەڵام وێنەی کەسیان لەسەر گۆڤارەکانا دەبینیت؟ زۆریان هەیە پارەش دەدەن تا وێنەیان لەسەر بەرگی گۆڤارێکا بڵاو بکرێتەوە. تەنیا من تۆم گەورە کرد و بەرزم نرخاندی تا گۆڤارەکان شەڕ بکەن لەسەر بڵاو کردنەوەی وێنەکانی تۆ. پاش ئەو هەموو چاکەیە دەتەوێت وازم لێ بێنیت؟ تەنیا بە گوێی من بکە، تۆ هێدی

هێدی بەرز نەبوویتەوە تۆ لەنکاوێک بەرزبوویتەوە، گەر بکەویت هەرگیز هەڵناستیتەوە. وەک خۆت وتت قەلەڕەشی دوونیا لەسەر لەشت نیشتنەوە، بەڵام تۆ وەک بولبوول سروودی سەرکەوتنت بۆیان دەگەوت. گەر وا بڕۆیت ئەم قەلانە وەک هەورێک دێن و بەسەرتا تێدەپەڕن، هەرگیز ناتوانیت سروودی دۆڕانیشیان بەسەر دا بڵێیت.

تەنیا دەڵێت پێموت، میسیۆ دانتۆن بۆچ نازانم ئەم وڵاتە، وڵاتی بێدادییەو و ژن لەلاتان هەر ئامرازی ناوجێییە. پەیمان بێت چیتر نە تۆ و نە کۆمەڵگاکەی تۆ بمدۆزێتەوە. گەر من رازیبم لە نێو بێدادی دارستانا بژیم جیهان پڕ لە دارستانە، ئەم دارستانە نا دارستانەکەی تر. دەڵێت پاش ئەوە تێر تێر ساشەم ماچ کرد.

****

زەنگی تەلەفۆن لێیدا سکاڵا تەلەفۆنەکەی هەڵگرت، ئازاد گیان ئەوە تۆی؟ خێرە تەلەفۆن دەکەیت؟ وا دیار بوو ئازاد پێکەنی بۆیە سکاڵا زەردەخەنەیەکی هاتێ. سکاڵا دەچم بۆ هەر لایەک کەس لەوێ نییە ئینجا تەلەفۆنم بۆ تۆ کرد، گوتم بزانم ئەگەر بێمەوە ماڵەوە میوان رادەگرن؟ ئازاد من دڵ لە دڵ نادەم دەزانم بۆ هەر کوێیەک بچیت هەرتک هەر دێیتەوە نێو باوەشی من. دەوەرەوە ماڵەوە چاک نییە یەکێکت هەیە چاوەڕوانت دەکات، هەردەم باوەشی بۆت کراوەتەوە. ئەوەی بیزانم ئازاد نەیدەویست بێتەوە ماڵەوە، وا دیار بوو دڵی زۆر دەگوشرا، ئیتر بەرگەی نێو چووار دیواری نەمابوو. هەر بۆیەش لە سکاڵای پرسی: مناڵەکان خەوتوون یان نەء؟

- سکاڵاش گوتی تازە لانە خەوی لێکەوت و بردمە شوێنی خۆی. بۆ ئەم پرسیارە دەکەیت؟ چونکە پێمخۆشە بچینە قاوەخانەیەک دانیشین، لە ناو ئەم چوار دیوارە بێینە دەرەوە. با بزانم شیرین خان و ئەنگێلە خان دەڵێن چی؟... شیرین دەڵێت من لەلای مناڵەکان دەبم و نایێم بۆ قاوەخانە.

نزیکەی کاتژمێری یەکی دوای نیوەشەو بوو، ئەنگێلایان گەیاندەوە بەر دەگای ماڵی خۆی و ئەوانیش بە پاس "ئەمانە" هاتنەوە ماڵەوە چونکە پاش کاتژمێری یەک ئیتر میترۆ نامێنێت. لەسەرەخۆ دەرگایان کردەوە و کپ و بێدەنگ هاتنە ژوورەوە، نەکا مناڵەکان بێدارکەنەوە. سکاڵا بەئەسپایی چووە هۆدەی مناڵەکان و سەیری کردن و سەیرێکی شیرینیشی کرد ئەویش خەوی لێکەوت بوو. کە بە جوانی سەرنجی دا شیرین، دیتی نەخشەکەی کوردستان کەوتووەتە سەر دەمی و لە ژێر سەرینەکەشی لایەکی ناماکەی کە سامان بۆی نوسی بوو دیارە. سکاڵا گوتی وا دیارە، تا خەوی لێ کەوتووە هەر نامەکەی خێندووەتەوە و نەخشەکەشی لەسەر لێوی خۆی داناوە.

بەیانی زوو شیرین و ئازاد لە خەو هەڵسان بە پەلە پەل چوونە دەرەوە تا بە یەکەم میترۆ رابگەن. کاتژمێری نۆی بەیانی پاش ئەوەی سکاڵا مناڵەکانی برد بۆ فێرگە و هاتەوە ماڵەوە یەکسەر تلەفۆنی شیرینی کرد و لێی پرسی ئیمشۆکە باش نووستی یان شوێنەکەت باش نە بوو. شیرین لە وەڵام

دا گوتی ئینجا من بۆ خۆم ئەم شوێنەم هەڵبژارد دەنا دەمتوانی لە ساڵۆنەکە بخەوم.

وا بزانم ژن هەرگیز واز لە قسە و قسەڵۆک ناهێنن. چونکە کە گوێیان لە دەنگ و باسی نهێنی یەکتری رادەگرن پێی دەگەشێنەوە و کامەرانی خۆیانی تێدا دەدۆزنەوە. لە لایەکی ترەوەش ژن دەردی دڵی خۆیان بۆ دەستە خوشکەکانی خۆیان هەڵدەڕێژن، ئەوانیش بە گوێرەی توانا دەستە خوشکەکانی تریان لەم شادییە بێبەش ناکەن. هەر بۆیەش سکاڵا لە تەلەفۆنەکە لە شیرینی پرسی ئەرێ سامان چی بۆ نووسیبووی! هەر ئەوەندە سکاڵا ئەوەی پرسی، وەک بڵێیت شیرینیش چاوەڕێی ئەم پرسیارە بوو. بۆیە بێ ئەوەی بیر لە دارشتنی وشە و رستەکانی بکاتەوە بە لێشاو دەنگ و باسی سامانی بۆ سکاڵا هەڵرشت. شیرین بیر و باوەڕ و بۆچوونەکانی خۆشی تێکهەڵکێشی نامەکەی سامان دەکرد و بۆ سکاڵای دەگێڕاوە. سکاڵا سەری هەڵبڕی و سەیری کاتژمێرەکەی سەر دیواری کرد و گوتی کچێ شیرین گیان هەیرۆ لە خۆم، زۆر درەنگە هیچم بۆ منداڵەکان ئامادە نەکردووە، و ئێستاش دەبێت بچم لە فێرگە بیانهێنمەوە ماڵەوە. شیرینیش گوتی خۆ راست دەکەیت ئەوە دوو سەعاتە ئێمە بە تەلەفۆن قسەدەکەین. هەر شیرین تەلەفۆنەکەی داناوە ئازاد تەلەفۆنی کرد.

سکاڵا بە ئازادی گوت ئازاد گیان هیچ کاتم نییە قسەت لەگەڵ بکەم چونکە هیچم بۆ منداڵەکان ئامادە نەکردووە. ئەویش گوتی ئەوە چەند لە مێژە دەمەوێت قسەت لەگەڵ بکەم تەلەفۆنەکە هەر مەشغول بوو. ئەویش گوتی ئازاد گیان شیرین باسی نامەکەی سامانی بۆ دەکردم. کچێ ئینجا خۆ کاک سامان پەڕتوکێکی بۆ نەنووسی بوو پەڕێکی بچوکی بۆ نووسی بوو. پێت گوتبا بۆمی بخوێنەوە بە دوو خولەک بۆتی دەخوێندەوە. سکاڵا گیان خۆ تەلەفۆن هێلکە نییە و خۆ ئێوەش مریشک نین لەسەر هێلکە کڕبن. کورە ئازاد گیان ئێوەی پیاو مەنتیقێکتان هەیە و ئێمەی ژن مەنتیقێکی ترمان هەیە. بۆیە ئێمە ژنین و ئێوەش پیاون. گیانی خۆم ئێوەی پیاو ئەوەی دەیبینن دەخوێننەوە، بەڵام ئێمە لە نێوانی هەر دوو وشە رستەیەک هەیە کە ئێوەی

پیاو نایان بینن ئێمەی ژن دەیان خوێنینەوە. هەر بۆیەش دەتوانم بڵێم زۆرینەی ژنان لایانگری وت و وێژن. وەک دەبینیت مەنتیقی ژن مەنتیقی وت و وێژە. ئینجا سکاڵا لە تەلەفۆنەکەدا پێکەنی و گوتی ئازاد بە بڕوای من پێویستە دوو وەزارەتی گرنگ هەیە، هەردەم بیاندەن بە ژن ئەویش وەزیری دەرەوە و وەزیری ناو خۆیە، ئەم دوو وەزارەتە گرنگە نابێت بدرێن بە پیاوی گێل و وێڵ.

ئازاد پێکەنی و گوتی :

ـ دەک خودا دەستت نەدات ببیت بە وەزیری ناو خۆ. سکاڵا گیان راستەکەیت ئێستا تۆ تۆزێک مەنتق بخە ناو مەنجەڵێکەوە و تۆزک وت و وێژی بەسەر داکە و بیدە بە منداڵەکان تا بیخۆن.

ـ سکاڵاش گوتی دەی دەی دەزانیت ئێستا کاتم نییە، بۆیە وا زمانی خۆت درێژ دەکەیت. ئەگەر من ببم بە وەزیری ناوخۆ وا دەکەم هەر دەکەس رۆژنامەیەکیان هەبێت ئینجا ئەگەر هەر شتێک زۆر بوو بێ چێژ دەبێت و لە کۆتایی دا رۆژنامە نووسەکان دەکەونە ناو یەک و ئامانجی خۆیان لە یاد دەچێت. پاش ئەوەی باش لێک گیر دەبن کۆیان دەکەمەوە تا پێکیان بێنمەوە بەم شێوەیە دیسان دەکەونەوە ژێر دەستی خۆم.

ئازادیش گوتی :

ـ واتا یەکەم شت تێکیان بەردەدەیت دوایی پێکیان دێنیتەوە تا بەسەریان دا زاڵبیت. بەخوا جوانە دەک خودا دەستت نەدات ببیت بە وەزیری ئاژاوە نانەوە.

ـ ئازاد گیان ئەگەر لە نێوانی هەر وشەیەک و وشەیەکی تر بتوانیایە رستەیەک بخوێنیتەوە، مەنتیقی ژنت نەدەکرد بە هێلکەو ڕۆن و دەرخواردی منالانت نەدەدا. ئێستاش با خودا لێت رازیبێت، من وەزارەتم ناوێت با ئەم وەزارەتانە هەر پیرۆزی پیاوەکانمانبن. ئێستا دەچم منالەکان دەهێنمەوە ماڵەوە، دەی خواحافیز.

****

ئەنگێلا گەلێک ماندوو بوو، بۆیە پەڕاوەکانی لە ناو یەک نا و هاتەوە ماڵەوە. ئەنگێلا زۆر حەزی لە چای سەنگین دەکرد، بە تایبەتی لەو کاتەی کە گیر و گرفتێکی هەبووایە ئەوا چا لەسەر چای دەخواردەوە. جارێ ئەنگێلا فڕی لە چایەکەی خۆی نەدا بوو، یەکێک بە ئەسپایی لە دەرگای دا و دەسکی دەرگاکەی سووڕاندەوە. ئەنگێلا بەرەو دەرگا ڕۆیشت تا دەرگا بکاتەوە، ئەوەندەی زانی، دەرگا کەوتە سەر پشت و تەنیا وەک شاژن لە دەرگاکە هاتە ژوورەوە. تەنیا بە پێکەنینەوە دەستی لە ملی ئەنگێلا کرد و گوتی :

- کچێ هەی بەدبەخت تۆ بۆچ دەرگا کلیل نادەیت؟

ئەنگێلاش گوتی :

- دەی دەی وەرە ژوورەوە سەرم زۆر دێشێت هەر تۆ مابویت ڕەخنەم لێ بگریت. پاش دەمێک لە چاک و خۆشی.

تەنیا گوتی :

- دەزانی بۆ چی هاتوومەتە لات؟

ئەنگێلاش بە پێکەنینەوە گوتی :

- ئەگەر بمزانی بووایە دەرگام لێ نەدەکردیتەوە.

ئەنگێلا واز لەم گاڵتانە بێنە، چونکە من بەڕاستیمە و بۆیە پێم خۆشە بە باشی گوێم لێ ڕاگریت. وەک خۆت دەزانیت لەم پاریسە هەر تۆم هەیە کە بتوانم نهێنی دڵمت لەلا بدرکێنم. من بەتەمام فەڕەنسا جێبهێڵم و بچم بۆ بەڕازیل یان بۆ ئەرژەنتین، بەڵام دەترسم ئەم باوک خێوە بمدۆزێتەوە، بۆیە پیلانێکم هەیە نازانم پێتی بڵێم یان نەء؟ گەر ڕازی بیت یارمەتیم بدەیت ئەوا پێتی دەڵێم. مادام وا بە مۆنی سەیرم دەکەیت و قسە ناکەیت دیارە ڕازیت.

ئەنگێلا ئێمەی ژن گەر سەرکەش نەبین پیاو دەمان خۆن. من پێم وایە کە هەموو فڕۆکەخانەکان وێنەی پاسپۆرتەکان لای خۆیان دەهێڵنەوە، بۆیە پۆلیس دەتوانێت بە زووترین کات ئەو کەسەی کە لە فەرەنسا بچێتە دەرەوە بیدۆزێتەوە یان دەزانێت بۆ چ وڵاتێک چووە ئینجا لەوێ دەیدۆزنەوە. بەڵام پۆلیس ئامادەنییە لە وڵاتێکی تر لە من بگەڕێت، چونکە من هیچ تاوانێکم نەکردووە. ئەوەی ئەلێکساندەر بیەوێت بیزانێت پێی دەڵێن چووە بۆ فڵانکە

دەوڵەت، بەڵام من بیرێکی ترم هەیە. بە فەرمی من خانوویەکم هەیە و تیایا دە ژیم، بەڵام بە پارێزەرەکەم گوتوە کە لە لای تۆ دەژیم. بە فەرمیش شیرین لە خانووەکەی کە بە کرێم گرتووە دەژێت. نامەیەکی فەرمیشم بە پارێزەرەکەی خۆم نووسیوە کە شیرین لە لای من کار دەکات و هەموو کار و بارێکی ماڵەوەم پێی سپاردووە. بۆیە مافی ئەوەی هەیە بە رۆژ و بە شەو لە ماڵەوەبێت گەر من لە ماڵەوەبم یان نەء. بەم شێوەیە من و تۆ بە ئۆتۆمۆبیلەکەی خۆم دەچین بۆ ئەڵمانیا و لەوێش من بە فرۆکە دەچمە لوبنان، "بۆ ئاگاداریت من لە ئێستاوە ترومبێلەکەی خۆم دەدەم بە تۆ، وەک بڵێیت پێتم فرۆشتووە" لەوێش بە ترومبێل دەچم بۆ سوریا ئینجا لەوێوە دەچم بۆ ئەمریکای لاتین و خۆم لەم باوک خێوە ون دەکەم و منداڵەکەش دەبێت بەس بە منداڵی من. لێرە بە فەرمی من هیچ منداڵێکم نەبووە ئەگەر ئەم بیرۆکەیەی منت بە دڵ بێت دەستت لە نێو دەستمنێ زەرەر ناکەیت ئەوا لە نزیکی بۆینۆس ئایرێس هۆتێلێکی پێنج ئەستێرەم دۆزیوەتەوە کە دەفرۆشرێت، ئەگەر ببێت بە نسیب دەیکڕمەوە.

- دەڵێن خودا غەزەب لە مێروو بگرێت باڵی دەداتێ، وا دیارە تۆش بەتەمایت باڵ بگریت. ئەگەر ئێستە مامۆستا لێرەبووایە پێیدەگوتیت، خودا زۆر شتی وەک رەحمەت بە مرۆڤ بەخشیوە یەک لەو رەحمەتانەی کە خودا پێی بەخشیوین ئەویش رەحمەتی لە یادچوونەوەیە هەندێک شت لە یادمان دا دەسڕێنەوە و هەندێکیشیان لە شوێنی خۆیان دەچەسپێن، کاری خودا چەندە جوانە. تەنیا من پێتدەڵێم ئەو هەموو چاکەیەی ساشە لەگەڵتی کرد چۆن وا بە ئاسانی سڕانەوە؟ ئەی پێمناڵێیت چ چاکەیەکی ساشەت لەلا چەسپاوە؟ کچێ تۆ بەم بێ وەفاییەت بەرامبەر ساشە دڵی دۆستانیش لە خۆت دەڕەنجێنیت. تەنیا ئەو رۆژە لەگەڵ ئەلێکساندەر پێکەوە دانیشتین و باسی تۆمان کرد . ساشە دەیگوت من تەنیام ئەوەندە خۆشدەوێت نامەوێت بە هیچ شێوەیەک دڵی لێم بڕەنجێت. من بە ساشەم گوت تەنیا دەڵێت تۆ زۆر کار دەکەیت و کاتێکت بۆ تەنیا تەرخان نەکردووە، بۆیە تەنیا چێژ...

تەنیا گوتی:

- داوای لێبووردن دەکەم، هەر ڕاستییەک درۆیەکی لە خۆی گەلێک زلتر لە پشت خۆی دەشارێتەوە. ئەم ناڕەوایە وەک با یاری بە ڕەوای بابردە دەکات. ئەڤین وەک ڕاستیەک کینە لە پاش خۆی دەشارێتەوە، کینەش وەک بووکە شووشە یاری بە ئەڤین دەکات، بۆیە ئەڤین کینە لە پشت خۆی دەشارێتەوە. هەر بۆیەش لە کینە بەولاوە کەس لە بەری ئەڤین ناخوات. تکاتان لێ دەکەم واز لەم درۆیە جوانە بێنن. ئەڤین ڕەواییکە تا ناڕەوا پێی سەرکەوێت، یان بە سینگی بەرینی خۆی ئەم ناڕەوایە دەشارێتەوە. سەیرکە ئەگەر تۆزێک ئەڤین بە لادا بچێت، کینە وەک ئەژدەها سەری خۆی دەردێنێ و ئەڤینی بەرامبەری هەڵدەلوشێنێ. کینەی بەرامبەریش بێ دەسەڵات ڕاناوەستێ ئەویش ئەڤینی بەرامبەری بەردەباران دەکات، ئینجا دوو کینە بەرامبەر یەک دەمێننەوە و ئەڤینێک لە نێوانی خۆیان بەش دەکەن. گەر خودا بیکات بە منالێک ئەویش کۆرپەلەکەی سکمە.

- دەشێت کینەیی ساشە لە ڕۆحی مرۆڤی وەک تۆ نەبێت؟ دەنا ساشە بێ کینەیە. ساشە وەک فریشتەی خودا وایە.

- بۆچ ڕۆحی مرۆڤی وەک من، بۆچ ڕۆحی مرۆڤی وەک من و تۆ نەبێت. بە گوێرەی قسەی دیندارەکان: ڕۆحی ئێمە بەشێکە لە ڕۆحی خودا، کینەی ئەم جۆرە کەسانە هێند ئەستورە دەگاتە یەزدانی پاک. چونکە ڕۆحی پاکی ئێمە بەکار دێنن تا بیکەن بە پارە. گەر ساشە تۆزێک بیری لە من کردباوە من ببووم بە کوێلەی ئەو ئامادەش بووم هەموو ژیانم بە کوێلەیی بەسەر بەرم. گەر بمزانیبایە تاوانبارم دەگریام، بەلام دەڵێم: من هەویرێک بووم بە گوێرەی ولاتەکەی خۆم شێلدرابووم. ساشە هات و منی بە گوێرەی ئەو گەرەکیەتی گۆڕی. ئێستا من ئەوم بە شێوەی ئەو گەرەک نییە. منی جاران ئەلێکساندەرم خۆشدەویست، منی گۆڕاو ئەلێکساندەرێکم خۆشدەوێت کە بە پلەی گۆڕانی من ئەویش بگۆڕێت. داخی گرانم من پێشدەکەوم و ساشە بۆ پێشەوە ناچێت.

- ئەی ناڵێیت من پێیم گوت من ساشەی جاری جارانم خۆشدەوێت؟ ئێستاش دەڵێیت ساشە هەر ساشەی جاری جارانە و ناگۆڕێت.

. چونکە من دەمویست لەگەڵ ساشە بژیم. من لە دوای ژیان ڕامدەکرد و رادەکەم، وامدەزانی ئەویش لە دوای من رادەکات. پاش ئەوەی بێدار بوومەوە تێگەیشتم ساشە لە دوای من راناکات لە دوای پارە رادەکات و بەدوای پارە کەوتووە. وەک دەبینیت بووین بە دوو ئاسک و هەر یەکەمان بە لایەک دا رادەکەین. ئەو رۆژباش لە کەس ناکات ئەگەر بەرژەوەندییەکی تیا نەبێت و ئەم بەرژەوەندییەش پارەی تیانەبێت. من ساشە دەناسم، گووش بە کڵاوی هەندێک کەس نا پێویت ئەگەر پارەی تیانەبێت. بەڵام کە دەیان بینێت سەری دادەنەوێنێت هەر بووستێک دەمێنێتەوە نێوچەوانی لە زەوی نەدات. لەسەر رای ئەوەش من دەبێت جەوەکە خۆشکەم ئەولا و ئەم لا و ئەولایان ماچ بکەم و لە تەکیانەوە دانیشم و قسەی خۆشیشیان بۆ بکەم. ئەم هەموو کۆمیدیایە، ئەوە چییە یارەکەم دەستە گوڵی بازرگانی خۆی دەوەشێنێ. ئەنگێلا بۆ خۆت گێل دەکەیت ئەی لەگەڵ تۆش وا نییە؟ ئەی بە گوێی خۆم گوێم لێ نەبووە پێیگوتوویت ئینجا چی تیایە ئەگەر لە گەڵ کڕیارەکان نەرم و نیان بیت؟

. تەنیا گیان ئەو پیاوێکی فەرەنسییە و بەم شێوەیە پەروەردە کراوە. لای ئەوان شەرەف و ئابڕو لە لینگی ژنان تێپەڕی کردووە و بەرزتر بۆتەوە، لای ئەوان شەرەف و ئابڕو نیشتمانە، دەسەڵاتە، هێزە توانایە. ئینجا پێویست ناکات بۆت باس بکەم چونکە تۆ ئەم شتانە لە من باشتر دەزانیت. بە هەر شێوەیەک بێت خۆ ئەو بە زۆر نایەت رووتم کاتەوە. ئەو پێشنیازێک دەکات دەڵێت لەگەڵ کڕیارەکان نەرم و نیان بە. ئەوەی تریش لەسەر من دەمێنێتەوە چۆن چۆنی ئەم رستەیە شیکەمەوە. وەک تۆ دەڵێیت دەتوانم خۆم روتکەمەوە دەتوانم قسەم خۆشکەم دەشتوانم تۆزێک لە نرخی کوتاڵەکان بێنمە خوارەوە.

زەنگی تەلەفۆن لێی دا، ئەنگێلا بە دەستێک سەری خۆی دەخوراند و دەستەکەی تری وەک باوەشێن لێکردبوو لە بەر خۆیەوەش خێرا خێرا دەیگوت خێربێت خوایە، ئینجا تەلەفۆنەکەی هەڵگرت. شیرین گیان ئەوە تۆیت. ئەی بۆ تەلەفۆن دەکەیت بۆ نایەیت بۆ لامان ئەوە من و تەنیا دانشتووین و پێکەوە باسی ئەم دونیایە دەکەین. شیرینیش گوتی منیش باسەکەتان تۆزێک گەرم تر دەکەم. کچێ زۆر باشە ئەوە چەند رۆژە لە تەنیا دەگەڕێم، دە توخوا

بەیارمەتیت دەتوانیت تەنیام دەیتێ دەمەوێت هەندێک شتیم هەیە پێی بڵێم؟
فەرموو ئەوە لێرە دانیشتووە.
- ئەلو خێرە شیرین خان.
- کچێ خێرە خۆ شەڕیش نییە. تەنیا پێش چوار ڕۆژ، یەکێک لە دەرگای دا و منیش دەرگام کردەوە، دیتم ئەلێکساندەر لەبەر دەرگاکە راوەستاوە. منیش پێمگوت فەرموو وەرە ژوورەوە. ئەویش بێ قسە هاتە ژوورەوە و چاوی لەسەر هیچ شوێنێک رانەدەوەستا و سەیری دار و بەردی ماڵەکەی دەکرد. دوایی سەیرێکی منی کرد و گوتی شیرین ماڵەکە بۆنی تەنیای لێ نایەت. گوتم ئەی بۆنی تەنیا چۆن چۆنییە؟ خۆ بۆنی مسک و عەمبەریشی لێ نایەت. ئینجا کێ دەڵێت ئەوە ماڵی تەنیایە و ماڵی من نییە. تکام لێ کرد و گوتم دە فەرموو دانیشە با قاوەیەکت بۆ بکەم. ئەویش یەکسەر دانیشت من چاوەڕێی ئەوەم لێنەدەکرد؛ بە زەردەخەنەیەکەوە گوتی زۆریشم پێ خۆش دەبێت. پاش دانیشتنەکەی وا تێمڕاما وەک بڵێی تازە بە تازە دەمبینێت ئینجا گوتی شیرین ئەگەر ئێرە ماڵی تەنیا نەبێت؟ ئەی بۆچ لەسەر دەرگا ماڵی مەدام دانتۆن نەسراوە؟ ئیتر قسەم نەما، پێم گوت تەنیا داوای لێکردم کە ناونیشانی بۆ نامە وەرگرتن لە لای من بێت. شیرین، تەنیا سندوقێکی بەریدی تایبەتی خۆی هەیە کە هەر خۆی دەتوانێت بچێت نامەکان وەرگرێت، کەوا بێت هیچ پێویستی بە ناونیشانی تۆ نییە. دیتم سەری لە ناو دەستی خۆی ناوە و دەگرێت من لە تەمەنما هیچ پیاوێکم نەدی بوو بگرێت. تەنیا خان تۆ خۆشبیت ئەوەشمان دیت. زوو قاوەکەم بۆ هێنا و گوتم بەخوا نازانم تەنیا لە کوێیە، ئەگەر بمزانیبایە پێم دەگوتیت، بەڵام بڕواتبێت نازانم لە کوێیە.
- شیرین من لە بەرەی دانتۆنم دەزانم کە ئێستە نازانیت تەنیا لە کوێیە بەڵام ماڵی پێدەزانیت، گەر بتەوێت ئێستەش دەتوانیت بیدۆزیتەوە. پێم گوت بەخوا ناتوانم بیدۆزمەوە ئێستاش دەبێت بچمەوە ماڵی خۆم. ئەویش گوتی هیچ غەمت نەبێت من چاوەڕوانی دەکەم.

- منیش ڕۆیشتم، بۆ بەیانی هاتمەوە وا دیار بوو کە لەسەر شوێنەکەی من خەوت بوو، بۆیە شوێنەکەم چاک کردەوە، لەو ڕۆژەوە هەموو ئێوارەیێک دەچم و شوێنەکە چاک دەکەمەوە ئینجا نازانم ئەوە چەند دەخایێنێت.
- ئینجا خۆ ئەوەش ئەوەندە زەحمەت نییە بڕۆ لای هەر کلیلسازێک کلیلەکەت بۆ دەگۆڕێت و کلیلێکی تر دەخاتە سەر دەرگا، تۆش دەرگا بۆ هەموو کەسێک مەکەوە.
شیرین گوتی:
- ئیستا درەنگە هیچ کلیلسازێکم دەست ناکەوێت با ئیمشۆکەش لەسەر جێگای من بخەوێت. باشە ئەگەر لاریتان لەسەر نەبێت ئێستا یەکسەر دێم بۆ لاتان.
هەر کە شیرین گەیشتە لایان، ئەنگێلا یەکسەر پرسیاری سامانی لێ کرد و گوتی دەنگ و باسی سامان چییە و چۆنە؟ ئەویش وەک بڵێیت دەیویست باسی سامانیان بۆ بکات. ئەو ڕۆژە سامان تەلەفۆنی بۆ کردم و گوتی:
- هاوچەکەکانم داوایان لێ کردم کە چەکی تۆڵە دانەکەنم. پێم گوتن کە دەچمە سەر گۆڕی تەزرە نا مەوێت بۆنی باڕود و چەک لە جل و بەرگ و لەشم بێت. هاوڕێیانم، بۆیە چیتر چەک هەڵناگرم. شیرین خان پێیان دەڵێم و بە هەموو هەڤالانم گووتووە، تا پێتان دەکرێت رووتان لێم وەرمەگێڕن من هەمان سامانی جاری جارانم، نە گۆڕاوم نە دەگۆڕێم. هەر ئەوەندە سامانی چەکدار بوو بە سامانی بێ چەک. ئەی دۆستانم بەیارمەتیتان وەرنە نێو دڵی من تا تێمبگەن، من بۆ کوردستان هەموو کاتێک دەمردم و دەمرم، بەڵام بۆ تەزرە دەژیام و دەژیم. شیرین هەندێک لە دۆستەکانی جارانم کە لە نێو سەنگەر سینگم بەبەر گولە دەدا تا گولەیان بەر نەکەوێت، دەزانیت چیم پێ دەڵێن؟ دەڵێن کەر بنێریت بۆ بەغدا نابێت بە ئێستر، ئەی بۆ ئێمە ئێسترمان نارد بۆ پاریس و فەرەنسییەکان کەرێکیان بۆ ناردینەوە. توخوا ئەمەش قسەیە، بەڵام هەر چۆنێک بێت لە پێناوی تەزرە بەرگەی هەموو شتێک دەگرم. هەر چی هەیە گلەییم لێ دەکات. خۆشم گلەیی لە خۆم دەکەم. خۆم وەک نەزانێک وەک ڕێبوارێک بە خۆم دا دێمەوە. لە دیوار و لە بەرد و لە جلی

پێشمەرگایەتیم دەپرسم بۆچی گلەییم لێ دەکەن؟ شیرین گیان هەندێک جار دۆلابەکەم دەکەمەوە وەک شێت دەچم و سەیرێکی تری جلە لە سێدارەدراوەکانی پێشمەرگایەتیم دەکەمەوە. گوێم لێیانە پێم دەڵێن ئێمە جلی ئازادی نەتەوەیەکین تۆ بۆچ ئێمەت لە تاریکایی ئەم زیندانەدا بەند کردووە؟ من بەخۆم دا دێمەوە و دەڵێم لەبەر چی گلەییم لێ دەکەن؟ هەڵەی من لە کوێیە؟ ئەگەر هەبێت کەی دەستی پێ کردووە؟ دەبێت لەو کاتەوە کە من ئەم جلەم لەبەر کرد دەستی پێکردبێت؟ یان لەوکاتەی کە بیری تۆڵە کەوتە ناو مێشکم؟ دەشێت ئەوکاتەی کە خزم و کەس و کارم کوژران سەری هەڵدابێت. خۆم لە وەڵامی ئەم پرسیارە دەگەڕێم و نەفرەت لە خۆم دەکەم. شیرین دەزانیت ئێستە کەسم نییە گوێم لێ راگرێت، بۆیە لە جییاتی گشت هاوڕێکانم خۆم بە خۆم دەڵێم راستەکەیت هەڵەی هەرکەسێک لەو شوێنەوە دەست پێ دەکات، کە دەست بە بەراورد کردنی کاری جارانی خۆی بە کاری ئێستاکەی خۆی و بە کاری خەڵکی تر دەکات.

ئێمە لەو کاتەوە کاری خۆمان بە کاری خەڵکی تر بەراورد دەکەین کە بە رەخنەی رەخنەگرەکانمان ئاشنا دەبین. شیرین خان سەیرت پێ نەیەت ئەگەر ئەم رەخنەگرانە ئێمەیان نە ناسیبایە چۆن دەیانتوانی رەخنەمان لێ بگرن؟ خۆی رەخنەگرەکان کێن؟ یان دۆستمانن یان دۆستمان بوون. گەر رۆژێک لە رۆژان جلی پێشمەرگایەتیم لەبەر نەبایە ئەم جلانە دەیانتوانی رەخنەم لێ بگرن؟

هەر دۆستێک کە دێتە ناو بازنەی دۆستایەتی، شتێکمان لێ فێردەبێت و ئێمەش شتێکی لێ فێردەبین. بە گوێرەی پلەی فێربونمان، دەکەوینە نێو بازنەی نزیک لە بازنە سەرەکییەکەی خۆمان. هەندێک لە دۆستانی بازنەی یەکەم لە توانایان دا نییە یان نایانەوێت شتی نوێ فێربن کە وابێت ئەوانە لە بازنەی یەکەمی دۆستان دەمێننەوە. هەندێکیشیان لەگەڵمان دێنە ناو بازنەی دووەم. هەندێکیان دەپەڕنە بازنەیەکی ترەوە، واتا بازنەی سێیەم کە راستەو خۆ دەبن بە دوژمنی بازنەی یەکەم و دووەم. من خۆم لە بازنەی دووەم دا دەبینم، بە راستی من هەر بە رووالەت لە بازنانەی یەکەم هاتمەتە دەرەوە.

گەر دوژمنایەتیشم بکەن من نامەوێت لە دەست خۆمیان بدەم. شیرین دەمەوێت شتێکی گرنگت پێ بڵێم. ئەگەر چەند دۆستێک هەڵگر و داهێنەری روانگەیەکبن گشتیان دەکەونە ناوەڕاست و لێوارەی بازنەکەوە. ئەم جۆرە بازنەیە نە زوو هەڵدەوەشێت نە زووش گەورە دەبێت. بەڵام بازنەکانی دیکە وەک بازنەی دۆستایەتی چایخانە و عەسکەری، ئەم جۆرە بازنانە کەی ناوەڕاستی بازنەکە بۆش بوو بازنەکە لە ئارا دا نامێنێت و هەریەکەی بە لایەکدا دەڕوات. شیرین خان بە دۆستانمان بڵێ با لە بازنەی خۆیان دەرم نەکەن، چونکە روانگە و هەڵوێستی من وەک روانگە و هەڵوێستی دۆستەکانی پاریسم هەر کوردستانە.

ئەنگێلا گوتی:

- کچینە دەڵێن چی تەلەفۆنێکی سکاڵا خان بکەین و با بزانین ئەو بە چییەوە خەریکە. پاش چاک و چۆنی سکالا گوتی کچینە حەفتەی بێتەوە، مامۆستا و ئەبونە و کاک سالار و کاک ناکام و کاک پۆلا دێنە لامان، ئەگەر پێتان بکرێت بێن دانیشتنەکە ئەوەندەی تر خۆش تر دەبێت. هەر بە راستیش دانیشتن بێ ئێوە خۆش نییە. ئەنگێلا گوتی ئەوە تەنیاش لە لامانە، ئینجا چی تیایە با تەنیاش بێت ماڵ ماڵی خۆیەتی. تەنیاش گوتی بەخوا کچینە من لە بازنەی یەکەم و دووەم هاتوومەتە دەرەوە، بە راستیش پێم شەرمە سەیری نێو چاوی کاک ئازاد و ئەبونە و مامۆستابکەم، بۆیە من داوای لێبوردنتان لێ دەکەم.

****

پاش سێ رۆژ تەنیا  وەک مراوی نێو ئاو سەر ئاو کەوتەوە و هاتە ماڵی ئەنگێلا و بە پێکەنینەوە وەک بڵێیت خەبەرێکی خۆشی پێبێت بە ئەنگێلای گوت:

ـ ئەو رۆژە کە لە لای ئێوە رۆیشتم، بەرەو ئۆتۆمۆبیلەکەی خۆم دەچوم و راوستابووم تا لە شەقام بپەڕمەوە، ئەوەندەم زانی یەکێک بە کوردی پێی گوتم رۆژباش. منیش خەنی بووم گوتم دەبێت کێبێت؟ کە ئاوڕم لێی داوە دیتم سەهەندۆکە.

ئەنگێلا گوتی:

ـ سەهەند کێ یە؟

ـ کچێ، کاک ئازاد گوتی سەهەند کوڕێکە زۆر تێکەڵی کوردەکان نابێت، چونکە پێی دەڵێن دایکی خۆی هێناوە. بەڵام لە راستیدا ئەم ژنە ژنی برای گەورەکەیەتی کە لە شەڕێک دا لە بناری سەفین کوژراوە. ئەم ژنە نەوبووک بووە کە مێردەکەی کوژراوە، مێردەکەشی کەسی نەبووە لەم برای بچکۆلانەی بەولاوە. ئەم ژنەش لەسەر ئەم کوڕە دانیشت و وەک کوڕی خۆی بەخێوی کرد و گەورەی کرد. مناڵەکانی تەمەنی سەهەندن وایان دەزانی ئەم ژنە دایکی سەهەندە. بەڵام کە سەهەند گەورە دەبێت براژنەکەی لێ مارە دەکەن. ئێستاش چاو و ڕووی نییە بچێتە ناو خەڵک، چونکە پێی دەڵێن پیرێژنێکی هێناوە.

ئەنگێلا ئەم چیرۆکە گرنگ نییە وەک پێمگوتیت یەکێک بە کوردی گوتی رۆژ باش منیش رۆژباشم لێ کردەوە و هاتەوە یادم لە کوێ ئەم کوڕەم دیوە. ژنێک و مناڵێک لە تەکمەوە راوەستا بوون سەهەندیش لە لایەکەی ترم راوەستا بوو . مناڵەکە بە دایکی گوت دایە با بپەڕینەوە. دایکی گوتی نابینیت چرایەکەی بەرامبەرمان سوورە، تا سووربێت نابێت تێپەڕین کەی سەوز بوو دەپەڕینەوە. سەهەندیش پێیگوتم ئەی تۆ بۆمن کەی سەوز دەبیت؟ منیش پێیمگوت من بۆ تۆ هەرگیز سەوز نابم ئینجا ئەگەر دیتت لە هیچ لایەکەوە ترومبێل تێناپەڕێت لە چرای سوور بدە و بپەڕەوە. نازانم لە خۆشیا یان لە گێلیا جارێ چراکە سوور بوو سەهەند لێی دا، تا بپەڕێتەوە،

ئۆتۆمۆبیلێک ئەوەندەی نەمابوو لێی بدات وا بزانم ئەویش لە شەرما ئاوڕی نەداوە و پەڕییەوە، ئەوەندەی نە مابوو خۆی شەهید بکات. ئەنگێلا دەزانیت بۆ ئەم چیرۆکەت بۆ دەگێڕمەوە؟
- نا بە خوا خوشم نازانم چونکە کەس لە ئایین و ئۆینی تۆ ناگات.
- دەمەوێت جارێک لە گڵۆپە سورەکە بدات، ئینجا بۆخۆمی گل دەدەمەوە و دەیکەم بە پەروەردەی دەستی خۆم.
- هەر وەک چۆن ساشە تۆی کرد بە پەروەردەی دەستی خۆی؟
- ئەنگێلا واز لە بیر و ئەندێشەی پڕ و پوچ بێنە، ئەم کوڕە کوڕێکی زۆر سەرنج ڕاکێشە، حەیفە بەدەستی ئەم پیرێژنەوە بناڵێنێت.
- ئینجا بە تۆ چی ئەو خۆی ئەم ژیانەی هەڵبژادووە. دوای ئەوە کە پێت دەڵێت دەمەوێت لە چرای سەوز بدەم، چونکە تۆ بە سووک دەزانێت، بۆیە ئازایەتی ئەوەی هەیە وات پێ بڵێت، بەڵام ناوێرێت وا بە من بڵێت. تا ئێستاش دەرگای کۆمەڵگای کورد بە تەواوی لێت دانەخراوە، گەر ئەم کارە بکەیت، ئەم دەرگایەت بە جارێک لێ دادەخرێت.
- کچێ هەی داوەشێیت هەر دەڵێیت ژن نیت، چۆن ڕازی دەبیت کوڕێکی وا نازدار لە باوەشێکی ئیشک و برینگ دا بێت؟
- کچێ چیلکە لە ژیلەمۆ وەرمەدە، کێ ناڵێ باوەشی ئایشێ لە باوەشی من و تۆ گەرم تر نییە.
- کچێ دە بڕۆ واز لەم قسە پڕوپووچانە بێنە شت بە چاو دیارە ئەگەر باوەشی گەرم بایە پێینەدەگوتم کەی بۆ من کەسک بدەبیت، دەبا بێت جارێک لە چرای سور بدات بزانە چۆن هەڵدەپەڕێت و نەک هەر زمانی دادەخرێت بەڵکو ئامادەی گەوادیش دەبێت.
- نازانم تۆ رۆژێک دەتەوێت بڕۆیت و فەرەنسا جێبهێلیت ،رۆژێک دەتەوێت لەگەڵ ساشە چاکبیتەوە و رۆژێک سەهەند پەروەردەکەیت. ئەرێ تۆ ئاگات لە خۆتە چی دەکەیت؟

ئەنگێلا قسەکانی شیرینی هاتەوە یاد کە دەیگوت؛ ژنی رۆژهەڵاتی وەک ئەو ئاژەڵە وایە کە لە هۆدەیەکی تاریک دا بەند کرابێت. هەر ئەوەندەی

تیشکێک هاتە ژورەوە و دەرگا کەوتە سەر پشت، ئیتر ئاژەڵەکە نازانێت بە چ لایێک دا را بکات. خۆی بە ئازاد دەبینێت، بەڵام هەر چووار دەوری خۆی لێی نامۆیە. ئینجا بە تەناش کردنەوە رادەکات کە بەرەڵا دەبێت نازانێت بۆ کوێ هەڵێت. بۆیە ئازارێکی زۆر دەکێشێت تا بە ئازادیی خۆی ئاشنا دەبێت. شیرین دەڵێت گەر جلەوی تەنیا نەگرین سەری بە فەتەرات دەچێت.

ـ ئەنگێلا راستەکەیت گەر یارمەتیم دەیت بەیانی زوو پێکەوە دەچین بۆ ئەڵمانیا، من لەوێ دەچم بۆ لوبنان، لەوێوە دەچم بۆ بۆینۆس ئایرۆس.

ـ نا من لەگەڵت نیم، فەرەنسا جێبهێلیت، چونکە ئەوە دوو مانگە تۆ لەلای منیت ساشە چەند جارێک چووە بۆ خانووەکەی تۆ و سەری لە شیرین داوە. بەڵام هیچ داوای لە پۆلیس نەکردووە لێتبگەڕێن. جا پۆلیسیش ناتوانێت تۆ بە زۆر بخاتەوە باخەڵی ئەو. بە بڕوای من گەر بچیتە باوەشی سەهەندەوە زۆر باشترە لەوەی لە بۆینۆس ئایرەس خۆت بخەیتە باوەشی یەکێک کە کەس نەیناسێت. ئەوە دوو مانگە تۆ بە ناو لە لای من دەژیت بەڵام هەمووی چوار شەو لەماڵەکەی من نەخەوتوویت. منیش نازانم تۆ چی دەکەیت. لە لایەک دوو گیانیت و سکت هەیە لە لایەکی ترەوەش قەت لە ماڵەوەدانانشیت. ئەو رۆژە ساشە هاتە لام منیش دەرگام لێکردەوە و دانیشت. لەنکاوێک وەک شێت هەڵسا و دەستی دا پێلاوەکانی تۆ گوتی ئەنگێلا پێلاوی تەنیا لێرە چی دەکات. منیش پێمگوت کە ئەو رۆژە تۆ هاتیت بۆ لام جووتە پێلاوێکی نوێت کڕی بوو ئەوانەت لێرە جێ هێشت. نازانم تەنیا تۆ چیت دەوێت کەس وەک ساشە تۆی خۆش ناوێت هەموو شتێکت لێ دەبورێ. تۆی وەک پەپوولە لە سەر دەستی خۆی دانا  و گەورەی کردیت، تێناگەم چیت لێی دەوێت؟ ئێستاش خۆشت نازانیت شەوان لە کوێ دەخەویت. توخوا ئەمە ژیانە تۆ بەسەری دەبەیت. ئازاری خۆت دەدەیت و ساشەش ئازار دەدەیت. ئەگەر دڵت بەخۆتان ناسووتێت، هەر نەبێت دڵت بە کۆرپەلەکەی ناو سکت بسووتێت.

ـ ئەنگێلا ئەو رۆژە گوتت دەڵێن خودا غەزەب لە مێروله بگرێت باڵی دەداتێ. وا بزانم خودا غەزەبی لێم گرتووە و پێم دەڵێت بفڕە. ئیتر نە تۆ نە ساشە و نە سەهەند دەتوانن رامبگرن. بەیانی بە شەمەندەفەر دەڕۆم، پێشت ناڵێم بە چ

لایەک دا دەڕۆم، نەکا یەکێک بن زمانت دەربێنێت. لەمڕۆ بە دوواوە گەرەکم نییە چارەی کەس ببینم.
- من یەک لە بارەخۆم هیچ پەیوەندیم بە تۆوە نییە. ئەم قسانەی کە کردیشم هەر بۆ چاکەی تۆیە، ئینجا نازانم تۆ بۆ کێی دەیکەیت.
یەکێک بە ئەسپایی لە دەرگای دا. ئەنگێلا هەڵسا و بێ ئەوەی تەپەی پێی بێت، لە کونی دەرگاوە سەیری کرد بزانێ کێیە، چونکە لەوە دەترسا کە ساشە بێت. یەکسەر دەرگای کردەوە. شیرین بە چاوی پڕ لە گریان هاتە ژورەوە. تەنیاش هەڵسا و دەستی لە ملی شیرین کرد و گوتی کچێ چی بووە بۆ دەگریت؟
- کچینە ئیمڕۆ سامان تەلەفۆنی بۆ کردم و گوتی، دوێنێکە پێشی نیوەڕۆ فڕۆکە جەنگاوەرەکانی تورکیا لە گڵکۆکەی تەزرەیان داوە. سامان دەڵێ ئەوەندەی گەڕام نە ئێسکم دۆزیەوە، نە بووکە شوشەکان تا لێیان بپرسم چی بووە؟ کینەی ئەم تورکانە بۆ گەیشتە ئەم گڵکۆ بچکۆلانەیە؟ سامان دەڵێ شوێنی دار گێوژەکە و گۆڕەکەی تەزرە ئەوەندە قوڵ بوو بوو ئاوی تیا زابوو. کچینە وڵاتێکی بێ سەر و بەرمان هەیە نە خۆمان دەتوانین خۆمان بپارێزین، نە کەسیش دەیەوێت بمان پارێزێت. ئەو خودایەی کە هەموو شتێک دەپارێزێت وڵاتی ئێمەی لە یاد کردووە. ئەگەر لەیادی نەکردبایە چۆن، لە سێ لاوە لێمانیان دەدا "تورکیا و ئێران و سووریە". کچینە دەزانن سیاسەتی پارتە ئیسلامییەکانی تورکیا، هەمان سیاسەتی ئەتاتورکە. تەلەڤیزیۆنی تورکیا پیشانی داوە کە فڕۆکەکانیان توانیویانە لە جبەخانەی پ.ک.ک. بدەن. کچینە وەک دەبینن جبەخانەکەی "پ.ک.ک"ش گۆڕە بچکۆلانەکەی تەزرەی بێ تاوان بووە.
تەنیا گوتی:
- ساشە دەڵێ کوردینە ئێوە واز لە ئایین بێنن ئایین وازی لێتان هێناوە. تورک کە ناوی ئیسلام دێنێ بۆ بەرزی ئیسلام نییە بەڵکو بۆ شکانییێتی. تورک لە چارەسەرێک دەگەڕێت تا بزانێ بە چ شێوەیەک ئیسلام لە کوڵ خۆی کاتەوە. دەنا تورک هیچ کاری بە ئیسلامەوە نییە و نەماوە. هەر شتێکی زۆر زۆر

ساکار سەیرکەن، کە هیچ فڕۆکەیەکی جەنگاوەری دەوڵەتە موسوڵمانەکان مافیان پێنەدراوە بەسەر خاکی تورکیادا تێپەڕن، بەڵام، فڕۆکە جەنگاوەرەکانی ئیسرائیل مافیان پێ دراوە کە مەشقی سەربازی لەسەر خاکی تورکیا بکەن. سەیرکەن فڕۆکەیەکی مەدەنی کە راسەوخۆ لە هەولێر بنشێتەوە مافی ئەوەی نییە بەسەر خاکی تورکیادا تێپەڕێت. دەبێت ئەم فڕۆکەیە لە رێچکە ئاسمانییەکەی خۆیدا بە درۆ بنوسێت کە لە بەغدا دەنیشێتەوە ئینجا لە هەولێر دەتوانێت بنیشێتەوە. نازانم بۆ ئێوە ئەوەندە بێ ئەقڵن، پاش ئەم هەموو شتانەش وەک دەوڵەتێکی موسوڵمان باسی تورکیا دەکەن؟
شیرین وەک بڵێی گوێی لە قسەکانی تەنیا نەبووبێ چیرەی بە قسەی خۆی دا و گوتی:
- وابزانم چۆن خودا نەیویست حەزرەتی عیسا گۆڕی لەسەر زەمین هەبێت، دیارە بە هەمان شێوەش نەیویستووە تەزرە گۆڕی لە سەر رووی زەمین هەبێت. لە خۆم دەپرسم دەڵێم دەبێت تەزرەش لە لای خودا لە ریزی حەزرەتی میریەم و دایە رەزبار نەبێت؟
تەنیا سەیری هەردوکیانی کرد و گوتی:
- کچینە ئێوە سەیرن. لاتان وایە زۆرتان خوێندووە و لە من باشتر لە گرفتەکان دەگەن، بۆیە گوێ نادەنە قسەکانم. من زۆر شت لە ساشە فێربووم، بەڵام ئێوە تا ئێستا نە گوێ لە من دەگرن نە دەتانەوێت تێمبگەن. لاتان وایە هەر ئێوە سیاسین و لە گرفتە جۆربەجۆرەکانی کورد و گەمارۆدەری کورد گەیشتوون. داخی گرانم تا ئێوە سیاسی نەتەوەی کوردبن، کورد ئەوەندەی جاران لە تورک گەیشتبوو ئیمرۆش هەر ئەوەندەی تێدەگات. ئێوە بەس سەیرێکی چەند ووشەیەک بکەن تا چیتر ئەم نەتەوەیە لاتان نامۆ نەبێت. بۆ نموونە تورکە کۆچەرەکان خانوویان نەبووە و کەوا بێت پەیژەشیان نەبووە، بۆیە کە لە کوردەکان فێری پەیژە بوون بە مەنتقی خۆیان ناویان لێنا قالدرمە واتا بەسەرمەکەوە یان کە لە کورد و فارسەکان فێری یاپراخ بوون ناویان لێنا دۆڵمە واتا مەیپێچەوە، ئیتر هەر وشەیەکت دیت کە بە "مە" کۆتایی هات واتا مەیکە بەڵام بۆ تورک واتا بیکە. ساشە دەڵێت گەر تورک خۆی پیشان

بدات کە دەیەوێت شتێک بکات واتا نایەوێت بیکات. بە پێچەوانەوەش ئەگەر خۆی وا پیشان دا کە دەیەوێت بە کارێک هەڵسێت یان پێی ناکرێت یان نایەوێت پێیهەڵسێت. وەک دەبینن مەنتقی تورک مەنیقێکی بەراواژە. ئەوەی دەیکەن نایکەن، ئەوەی نایکەن دەیکەن. دوای ئەمەش تورک بە سەلیقە حەز لە شارستانییەت ناکات بۆ نموونە تورک تا ئیستا شارێکی گەورەیان بنیاد نەناوە. کە تورکە مەغۆلەکان لە چەرخەکانی ناوەندی هێرشیان کردە سەر شارستانیەتە دێرینەکانی رۆژهەڵاتی ناوەڕاست، ئامانجی سەرەکییان ئەوە بوو خەڵکێکی زۆر بکوژن تا زەوی و زارێکی زۆر بۆ ئاژەڵەکانیان بمێنێتەوە. وەک دەبینن ئەگەر یەکێک مرۆڤی خۆشبوێت لە پێناوی ئاژەڵێک بە سەدان مرۆڤ قڕ ناکات. ئێوە تەماشای شتێکی سەیر بکەن. ساشە دەڵێ تورکیا داوای ویلایەتی موسل دەکات، بۆ ئاگاداری ولایەتی موسل " واتا موسل، هەولێر، سلێمانی و کەرکووک" بە بیانوی ئەوەی کە لە جەنگا ئەم ولایەتەی نە دۆڕاندووە. بە قسەی ئەوان بێت لە هەرێمی ئازاد کراوی کوردستان کە نزیکەی چووار ملیۆن کەس دەبن، سێ ملیۆن و بەشێکی زۆری ملیۆنەکەی تریش تورکن. لە هەمان کاتیش دا دەڵێت کەرکووک شارێکی تورکە و دەیەوێت کەرکووکیش لە ولایەتی موسل جیاکاتەوە و بە بەغداوەی بلکێنێت. ئینجا ئەگەر بەڕاستی تورکیا تورکمانەکانی شاری کەرکوکیان خۆشبوێت بۆ لە تورکمانەکانی تر جیایان دەکەنەوە؟ ساشە دەڵێت، ئەورۆپا هەرگیز تورکیا قەبوڵ ناکات بکەوێتە ناو کۆمەڵگای ئەوڕوپییەوە. بەم شێوەیە تورک کە بوو بە ئیسلام بە مەنتقی نەبێت بە ئیسلام بوو بە ئیسلام. بۆ ئاگاداریتان ئەوروپا ئەوەندە لە ئیسلام داخ دڵە هەرگیز قەبوڵ ناکات دەوڵەتێکی بە درۆش موسوڵمان ببێتە ئەندامی کۆمەڵگای ئەوڕوپییەوە. تورکیاش ئەوەندە لە دژی ئەوڕوپا داخ لە دڵە، چۆن هاتنە ناو ئیسلام و تێکوپێکیان دا دەیانەوێت بەم شێوەیەش بە هەمان ئامانجەوە بێنە ناو ئەوڕوپاوە. سەیرت پێنەێت ئەگەر پاش چەند ساڵێکی تر چۆن تورکیا داوای کەرکووک و دورگەی کریت دەکات، داوای بەرلینیش بکات کە شارێکی تورکییە. تورکیا خۆی بە هەژار و داماو و نۆکەری ئەوڕوپا پیشان دەدات. بۆ ئەوەی سەرنجی ئەوروپا بە لای

خۆی دا ڕاکێشێ دڵنیایانکات کە تورکیا دەوڵەتێکی ئیسلامی نییە، لە گەڵ ئەوروپییەکان گورزێکیان بۆ ئیسلام داتاشیوە بە ناوی پارتی عەدالەتی ئیسلامییەوە تا بە هاتنە سەر حوکمی دوایین گورز لە ئیسلام بوەشێنن. تورک وا بیردەکاتەوە، بەم شێوەیە نەبێت ئەوڕوپا تورکیا قەبوڵ ناکات بێتە ناویەوە. تورکی جاران و تورکی ئەوساکەش هەر تورکی ئێستاکەن، تورکی ئێستاکە دەڵێن بەس بکەوینە ناویانەوە ئیتر خوا کەریمە، چونکە ئێمەی تورک لە نەژادی گورگە بۆرەین بەس داوا لە خودا دەکەین دەرگای کۆزمان بۆ بکاتەوە، بزانە فەرەنسا و ئەڵمانیا بە دەردی کورد نابەین.
ئەنگێلا گوتی:
- کچی باش تۆ دەتگوت بەرخی خودایت نەتدەزانی دوو قسەی جووان بکەیت یان دوو ڕستەی ڕێکوپێک لە دووای یەک بڵێیت، ئێستەش بەو هەمووە ڕەوانبێژیەوە چۆن تووانیت باسی تورکیامان بۆ بکەیت؟
- کچینە ساشە خۆش بێت ئەوە هەموی قسەی ساشە بوو من بۆتانم کرد بە کوردی.
ئەنگێلا گوتی:
- تۆ دەڵێیت ساشە وەک پەڕۆ دەهاتە ناو جێگا، ئەی ئەم هەمووە کاتەی لە کوێ بوو باسی تورکیات بۆ بکات؟
- ئەنگێلا ئەوەندە تامەزرۆی دەنگ و باسی ناوجێیت، بۆیە هەر چۆن دەسوڕێمەوە تۆ دەگەڕێیتەوە ناو نوێنی شەوان. ئەگەر بڕوام پێناکەیت ئەوە ساشە بێ خاوەن لەم ناوە فڕێدراوە و کەوتووە، دە برۆ هەڵیگرەوە و خۆتی پێبسرەوە بزانە چۆن چۆنییە؟
ئەنگێلا گوتی:
- ئەیڕۆ دەک خۆرکت لێکەوی، چەند بێ ئەدەبی.
تەنیا گوتی:
- کچینە واز لە گاڵتە و گەپ بێنن چەند شتێکم هەیە دەمەوێت تا زووە پێتانی بڵێم. ئەویش لەمڕۆ بەولاوە ئۆتۆمۆبیلەکەی من بووە بە ئۆتۆمۆبیلی تۆ چونکە خستومەتە سەر ناوی تۆ هەر ئەوەندەت لەسە ماوە بچیت و مۆری

خۆتی بخەیتە سەر. دووەم شت، شیرین گیان من کلیلی دەرگاکەم گۆڕی و کامیرەیەکیشم بۆ لەسەر دەرگا داناویت، هەرکەسێک بێت تۆ لە ژورەوە سەیری دەکەیت و دەزانیت کێیە ئینجا دەرگای لێ دەکەیتەوە. سێیەمین شت کە ئەویش تازە بیرم لێ کردووەتەوە ئەویش من چێکێک بە پەنجا هەزار فرەنگ دادەنێم بۆ دروست کردنی پەیکەرێک لە شوێنی گۆڕەکەی تەزرە. شیرین ئەم شێکە بە ناوی تۆ دەنوسم تۆش چۆنی بە باش دەزانیت وای بەکار بێنە. ئەنگێلا گیان بۆ ئاگاداریت دەڵێیت چوار شەو لە لای تۆ خەوتووم، راسەکەیت شەوەکانی تریش من لە هۆتێل نوستووم، ئەوەت پێدەڵێم تا بیرت بۆ شتی پڕوپوچ نەچێت. تەنیا بە چاوێکی ستەم لێ کراو سەیری هەر دوو دەستە خوشکی خۆی کرد، و بە دەنگێک وەک بڵێیت نەیدەویست پێیان بڵێت بەڵام چاری ناچار بوو دەبووایە بیدرکێنێت و بە هەر شێوەیەک بێت پێیان بڵێت:

- کچینە من ماڵ ئاواییتان لێ دەکەم، گەردەنم ئازاکەن گەردەنتان ئازا بێت.

هەر سێک دەستیان لە ملی یەکتری کرد و دەستیان کرد بە گریان و داوایان لە تەنیا کرد کە نەڕوات، بەڵام بێ سوود بوو، چونکە تەنیا بڕیاری خۆی دا بوو. هەر چەند ئەنگێلا داوای لێ کرد کە ئەو بە ئۆتۆمۆبیل بیگەیەنێت بۆ ئەڵمانیا گوتی نا بە یادم دا هاتەوە کە دوکتۆر دەڵێت بۆ ژنی دوو گیان سەفەری دوور بە شەمەندەفەر لە ئۆتۆمۆبیل باشترە. بەڵام ئەگەر بمگەێننە هۆتێلەکەی خۆم پێتان ناڵێم نەء، لەوێ جانتاکەم هەڵدەگرم و دەچین بۆ وێستگەی شەمەندەفەر، نزیکەی کاتژمێری یانزەی شەو شەمەندەفەرێک دەچێت بۆ فرانکفۆرت، بەو شەمەندوفەرە سەفەرەکەم دەکەم.

****

پاش ئەوەی تەنیایان بەڕێ کرد. هەردووکیان هاتنەوە ماڵی ئەنگێلا. هەر کەسێک شارەزای پاریسبێت دەزانێت کە لە پاریس بە دەگمەن وا ڕێکدەکەوێ لە بەر دەرگای ماڵی خۆت شوێنێک بۆ ئۆتۆمۆبیلەکەی خۆت بدۆزیتەوە. بەم شەوە شوێنێک لە بەر دەرگای ماڵی ئەنگێلا چۆل بوو ئەوانیش ئۆتۆمۆبیلەکەیان لەوێ ڕاگرت. لەو کاتەی کە ئەنگێلا دەیویست دەرگای ئۆتۆمۆبیلەکەی بکاتەوە، یەکێک لە پشتەوە هات و دەرگای ئۆتۆمۆبیلەکەی بۆ کردەوە. ئەویش لە ترسا دەگاکەی داخستەوە و ماتۆڕەکەی بە گەڕ خستەوە. بەڵام کە گوێی لە دەنگی ئەلێکساندەر بوو، گوتی تەنیا مەترسە ئەوە منم. تۆزێک هێور بووەوە و هەناسەیەکی هەڵکێشا و هاتە خوارەوە. ساشە لە شەرما زمانی تێکئالا و نەیدەزانی چی بڵێ. بۆیە شیرین گوتی:

- کاک ئەلێکساندەر بەم شەوە تۆ لێرە چی دەکەیت؟

- ئەی چۆن دیار نییە! کە چاوەڕێی تەنیا دەکەم. لە ناو ئۆتۆمۆبیلی تەنیا دانیشتوون خۆ پێم ناڵێن نازانین تەنیا لە کوێیە.

ئەنگێلا گوتی:

- میسیۆ دانتۆن، ئەم ئۆتۆمۆبیلە ئۆتۆمۆبیلی منە چونکە من لە تەنیام کڕیوەتەوە. بە قسەی خۆی بێت مارسیدیسێکی کڕیوە، بەڵام نازانم ڕەنگی چۆنە.

- ئەنگێلا داوای لێ بوردن دەکەم کە ئەم قسەیەم کرد، چونکە نە تەنیا بە منی گوتوە کە ترومبێلەکەی فرۆشتووە نە تۆش پێتگوتوم کە ئۆتۆمۆبیلی تەنیات کڕیوەتەوە. بە پێکەنینێکی ساختەچییانەوەش تا هەلۆێستەکە بگۆڕێت، درێژەی بە قسەکانی خۆی دا؛ ئەنگێلا بەیانی بۆم ڕوونکەوە بۆ تۆ پارەی تکێتی میترۆی مانگانەتت لە شەریکە داوا کردووە و تۆش ئۆتۆمۆبیلت هەیە؟

- ئنجا خۆ داوای پارەی بەنزینم نەکردووە. خۆت لە من باشتر ئاگاداری یاساکانی.

- ئەنگێلا بە خوا بۆ تۆ ئامادەم پارەی بەنزین و تکێتی میترۆش بدەم. نازانم بۆ گشتتان قینچکەتان تەنگ بووە و وەک شیری سەر ئاگر هەڵدەچن. جارێکی

تریش پێمەڵێوە مسیۆ دانتۆن، من تۆ بە دۆستێکی خۆم دادەنێم نەک بە کرێکارێک، ئینجا داوات لێدەکەم تۆش لەگەڵ من بە هەمان شێوەبیت.

- ساشە دەڵێت چی بچینە ماڵەوە و قاوەیەک بخۆینەوە. تا بە هێوری پێکەوە بدوێین، ئەگەر گشت دۆستەکانت لێت نا رازی بوون دەبێت بە خۆت دا بێیتەوە.

لەو کاتەی بە هێمنی بەسەر پەیژەکان دەکەوتن، ساشە لە بەر خۆیەوە گوتی، دەزانن من هەستێکم هەیە کە ئێوە دەزانن تەنیا لە کوێیە، بەڵام ناتانەوێت پێمی بڵێن. من زۆرتان لێ ناکەم، ئەگەر پێتانبکرێت ئامۆژگاری بکەن با بچێت بۆ لای دوکتۆر چونکە تووشی شێرپەنجەی خوێن بووە، ئەگەر زوو خۆی چارەسەر نەکات دەمرێت. خۆی ئەم راستییە دەزانێت و نایەوێت بڕوای پێ بکات و سەری بۆ دانەوێنێت و خۆی چارەسەر بکات. ئەگەر بڕواشم پێ ناکەن ئەوە سەرەنجامی تاقیکردنەوەی خوێنی تەنیایە و سەیرێکی سەرەنجامەکەی بکەن دوکتۆر نووسیویەتی کە شێرپەنجەی خوێنیەتی. ئەگەر ئێوە خۆتان بە دۆستی ئەو بزانن زوو ئامۆژگاری بکەن، با ژیانی خۆی لەدەست نەدات. ساشە وەک دوکتۆرێک باسی ئەم نەخۆشییەی بۆ شیرین و ئەنگێلا دەکرد. لەبەر ئەم قسانە ئاگایان لە خۆیان نەبوو کەی دەرگایان کردەوە و کەی هاتنە ژوورەوە و دانیشتن، ساشە هەر باسی ئەم نەخۆشییەی بۆ دەکردن.

لەو کاتەی کە ساشە خەریکی ئەم قسانە بوو، ئەنگێلا خەریکی قاوە کردن بوو، لە هەمان کاتیش دا گوێی لە ساشە بوو دەڵێت چی، نەیدەزانی نە بڕوای پێ بکات نە بڕوای پێ نەکات. چونکە دەیزانی ئەلێکساندەر پیاوێکی زیرەک و تەڵەکەبازە، توانایەکی ئەوتۆی هەیە دەتوانێت زۆر بە ئاسانی یاری بە هەست و نەست بکات. لە لایەکی ترەوەش بۆی هەیە راست بکات. ئەگەر راستبێت تازە چییان لەدەست دێت؟ تەنیا رۆیشت بۆ شوێنێکی نە ناسراو، تازە کەس نایدۆزێتەوە بۆی هەیە لە نەخۆشخانەیەک، بێ کەس و کار و بێ دۆست و یاوەر سەر بنێتەوە.

- شیرین گوتی باشە سەرەنجامی پشکنینەکەم پێ بدە من دەیدەم بە تەنیا.

- دەڵێیت چی با پێکەوە بچین و من لەبەر چاوی تۆ سەرەنجامی پشکنینەکەی پێ دەدەم.

لەم مشت و مڕە دابوون تەنیا لە وێستگەیەکی شەمەندەفەر تەلەفۆنی کرد. شیرین تەلەفۆنەکەی هەڵگرت و گوتی ئەوە تۆی؟ ئەویش وەڵامی داوە، بەڵێ خۆمم چییە دەنگم گۆڕاوە یان شتێک روویداوە، توخوا چی بووە پێم بڵێ؟ ئەویش پێی گوت کە یارەکەت لەلامانە و دەڵێت لە پشکنینی خوێنەکەت وا بەدیار کەوتووە کە شێرپەنجەی خوێنت هەیە. ئەگەر وا بێت بە زووترین کات وەرەوە تا خۆت چارەسەر بکەیت. ئەویش لە وەڵام دا گوتی تۆ بە فیلێک سەرئەنجامی پشکنینەکەی لێ وەرگرە بزانە نووسراوە میسیۆ یان مەدام دانتۆن. ئەنگێلاش گوێی لەم قسەیە بوو بە تی چاوێک سەیرێکی کاغەزەکەی دەستی ساشەی کرد و دیتی کە نووسراوە مسیۆ دانتۆن. لەم کاتە دا ئەنگێلا ئەوەندە دڵی بە ساشە سووتا، بێ قسە تەلەفۆنەکەی لە شیرین وەرگرت و دای بە ساشە و گوتی فەرموو خۆت لەگەڵی بدوێ. ساشە بە هەموو هێز و توانایەوە دەیویست دان بە خۆیا بگرێت، وا دیار بوو دەسەڵاتی بەسەر خۆیا نەدەشکا. بۆیە وشەکانی بە شێوەیەکی پچڕ پچڕ، دەهاتنە دەرەوە. چکە چکی پێچکەی شەمەندەفەرەکانیش ئەوەندەی تر وشەکانیان لێکدادەبڕاند. وشەکان تێکەڵی دەروونی تەنیا دەبوون، ئەویش وشەکانی پەڕە دەکرد و دەبوون بە پیتی ئاسنین و لە سەر دەستگای دڵی تەنیا وەک پڕیشکی ئاگر هەر پیتەی بەلایەک دا دەپەڕی. تەنیا وەک لارە لاری شەمەندەفەر بەلادا دەهات و نەیدەزانی بە چ شێوەیەک لەسەر پێ بوەستێت، بۆیە خوا خوای بوو چیتر پیتە ئاسنەکان نەکەونە نێوانی کوتک و دەزگا تا بە ئاسانی لێک دا ببڕێن. ساشە دەیگوت تەنیا گیان نازانم کوڕێکمان دەبێت یان کچێک ئەوە گرنگ نییە، ئەوەی گرنگە من زۆر نەخۆشم، بۆی هەیە جارێکی تر چاوم پێت نەکەوێتەوە و تەمەنیش ڕێگام نەدات منالەکەی خۆم ببینم، بۆیە دەمەوێت باش گوێم لێ بگریت : تۆ دەزانیت من کەسم نییە تا سامانەکەمی بۆ جێبهێڵم، بۆیە هەموو شتەکانم بە ناوی تۆ دەنووسم، دەزانم ئەو کارەی من دەمکرد بە تۆ بەڕێوە ناچێت، هەر لەبەر ئەوەش بەتەمام شەریکەکەم بفرۆشم و بیکەم

به پاره. بانقەکەشم دەخەمە سەر ناوی هەردووکمان، هەر دڵنیایی ژیان "تەئمینی ژیان" دەمێنێتەوە ئەویش دەدەم بە دەستی پارێزەرەکەم کە تۆ باش دەیناسیت. ئەگەر تەلەفۆنیش بۆ من نەکەیت، ناوە ناوە تەلەفۆنی پارێزەرەکەم بکە. لە کۆتایی دا پێم خۆشە پێت بڵێم، کە بە شەو نەدەخەوتم تۆ وا تێدەگەیشتیت من کار دەکەم، بەڵام راستییەکەی من نەمدەویست بزانیت کە من نەخۆشم و دادەنیشتم تا کاتژمێری دوو و سێی بەیانی تا دەرمانەکانم بە دزی تۆ بخۆم. لەوە دەترسام بە نەخۆشی من غەمگین بیت، هەرگیز نەمدەویست و نامەویت بە پەشۆکاوی بتبینم. ئێستە لە دوورەوە لێوەکانت ماچ دەکەم. چونکە کە نزیک بوویت لەبەر بۆنی دەرمانەکان نەمدەویست لێوەکانت ماچ بکەم. پشتم تێت دەکرد خۆم بە ساختە دەخەواند، بەڵام فرمێسک بەڕاستی لە چاوەکانم دەهاتنە خوارەوە. ئیتر بۆ کوێ بچیت، کۆچ و کۆچبارت خێربێت، گەردەنم ئازاکە. ئەگەر ویستت بێیە سەر گۆڕەکەم لە پارێزەرەکەم بپرسە. تەنیا گیان ئا ئەو رۆژەی کە تۆم ناسی، ئا ئەو رۆژەی وێنەکانت یەکەم جاریان بوو بە پەڕی گۆڤارەکان ئاشنا دەبوون، ئا ئەو رۆژەی کە لەسەر شاشەی سپی سینەما دا بەدیار کەوتیت، ئا ئەو رۆژەی... ئا ئەو رۆژەی... من وامدەزانی دەستم لە نەمری گیر بووە. کە هاتمە پێشەوە و ویستم لە باوەشت کەم لێم بوویت بە سەراب. ئیتر خوات لەگەڵ. ویستی تەلەفۆنەکە بداتەوە دەست شیرین کە سەیری هۆدە بچووکەکەی کرد دیتی کەسی لەلا نەماوەتەوە بۆیە تەلەفۆنەکەی داخستەوە و هەڵسا سەر پێ و فرمێسکەکانی خۆی هەر وەک منالی بچووک بە لچکی کراسەکەی سڕییەوە. سەیرێکی تری ماڵەکەی کردەوە بۆی بەدیار کەوت کە دەرگای ئاشپەزخانەکە داخراوە، بۆیە بانگی کردن و گوتی کچینە لێرەن، و دەرگای مەتبەخەکەی کردەوە دیتی هەردووکیان بە غەمگینی پێکەوە دانشتوون. کە چاویان بە ساشە کەوت هەردووک هەڵسانەوە سەرپێ و خۆیان پێ نەگیرا دەستیان کرد بە گریان. ساشە دەستی لە ملیان کرد و دڵی دانەوە گوتی، وەک دەبینن من زۆر نەخۆش نیم و ئێستەش خۆم چارەسەر دەکەم. ئێوە هیچ غەمی منتان

نەبێت، بەڵام تا پێتان بکرێت ئاگاتان لە تەنیا بێت. خوداحافیزی کرد و ڕۆیشت.

ئەم باس و خواسە هەر بۆ بەیانی زوو، گەیشت بە سکاڵا و سکاڵاش لە لای خۆی گل نەداوە و گەیاندی بە ئازاد. ئازاد بە سکاڵای گوت ئەوەی من بیزانم مرۆڤ دەتوانێت دوو دڵ لێک بکات یان پێکەوەیان بگیرسێنێت بەڵام دڵی تۆراو وەک کڵاوی بابردوو وایە تا بە دڕکی ئەولاو ئەولا پارچە پارچە نەبێت ڕاناوەستێت. ئەگەر دەرفەت وا هات و ئەوەی بە دوای کڵاوەکە دا وێڵە کڵاوەکەی گرتەوە. کە سەیری دەکات کڵاوەکە کڵاوی خۆیەتی بەڵام بە کڵاوەکەی خۆی ناچێت. بۆیە ئەوەندەی پێیدەکرێت کڵاوەکە لە ڕانی خۆی دەدات تا لە تۆز و پیسایی پاکی کاتەوە. تا بیخاتەوە سەر سەری هێدی هێدی ئەو دڕکەکانەی لێی گیر بوون لە ناوی دەریاندەهێنێت. ئینجا کەس نازانێت ئەم دڵە بەرگەی ئەم هەموو لێدانە دەگرێت؟ ئازاد پێکەنی و گوتی کچێ سکاڵا گیان نەکەی تۆش خۆت بکەیت بە کڵاوی با بردوو تا بزانیت من تۆم خۆشدەوێت یان نەء.

****

پاش چەند رۆژێک کوردەکان خۆپیشاندانێکییان سازدا بوو دژی داپلۆسینی کورد لە رۆژئاوای کوردستان. لە مەیدانی "ترۆکادێرۆ" PLACE TROCADERO وەک هەموو جارێک دۆستەکانی ئازاد لە شوێنی کۆبوونەوەکە دا یەکە یەکە و جووت جووت بەدیار دەکەوتن. ئەم جارەیان کاک ناکام و کاک پۆلا پێکەوە گەیشتن یان پێکەوە بوون، ئەوەی گرنگە هەردووک پێکەوە هاتنە لای ئازاد. وەک ئاساییش ئەبونە و مامۆستا پێکەوە هاتن و چاویان لە ئازاد دەگێرا. هەریەکەی کە دەهات نووچەیەکی نوێی پێ بوو. کاک پۆلا هات و گوتی پێشمەرگەکانمان بۆسەییکیان بۆ سەربازە تورکەکان نابووەوە لەم بۆسەیەدا نزیکەی بیست سەرباز گیانیان لە دەست داوە، پێشمەرگەکانیشمان بێ زیان گەڕاونەتەوە بنکەکانی خۆیان.
ئەم خۆپیشاندانە لە دژی بە عەرەب کردنی ناوچە سنوورییەکانی رۆژئاوای کوردستان بوو ناویان لێناوە "الحزام العربی" واتا پشتێندی عەرەب، بۆ ئەوەی کوردستانی باکوور و رۆژئاوا لێکجیاکەنەوە، هەروەها داوایاندەکرد کە ناسنامە زەوتکراوەکان بۆ خاوەنەکانیان بگەڕێننەوە و ئازادکردنی بەندە سیاسییەکان بوو.خۆپیشاندانەکە بۆ ئەوە بوو کە بە فەرەنسا بڵێن تۆ ئەم پارچەیەت بە سووریاوە لکاند و تۆ بەرپرسیاری رەوشتی لە تێکنەدانی سنووری کوردستان و مافەڕەواکانی نەتەوەکەمان.

شیرین گوتی لەم رۆژانە سامان تەلەفۆنی بۆ کردم گوتی شیرین! داوای لێبووردن لە تۆ و لە دۆستەکانم دەکەم کە پێمگوتن چیتر چەک هەڵناگرم. چونکە ئەو رۆژە کە چوومەوە سەر شوێنی گۆڕە نەماوەکەی تەزرە. ئەم جارەیان بڕیارم دا تۆڵەی گۆڕی تەزرە بکەمەوە و ئەم بێ دینە کافرانە لەسەر خاکی پیرۆزی نوح و یونس پێغەمبەر دوورخەمەوە و دەریان کەمە دەرەوە. بۆیە لەگەڵ چەن پێشمەرگەیەکی دێرین بڕیارمان دا تا دوا تنۆکی خوێنمان لە دژی ئەم دڕندانە بجەنگێین. وەک خۆشت باش دەزانیت لە باکووری کوردستان هەر PKK لە مەیدانە، بۆیە بڕیارمان دا پشت بە PKK ببەستین و لوولەی تفەنگەکانمان ئاراستەی دوژمنانی نەتەوەکەمان کەین، چونکە ئەم دوژمنانە بە هیچ دوژمنێک ناچن، نەک هەر نایانەوێت کورد لە

سەر خاکی باب و باپیرانی بمێنێت، بەڵکو نایانەوێت گۆڕێکی کوردیش لە سەر ئەم خاکە بمێنێت. بۆیە بە هەر شێوەیەک بێت تا پێمان بکرێت ئەم گڵاوانە لەسەر خاکی کوردستان دوورکەینەوە.
مامۆستا خۆی پێنەگیرا و گوتی:
- خوشک و براینە، باش بزانن بێ خۆشەویستی ناگەین بە سەرەنجامی هیچ گیر و گرفتێک. هەر سەرەنجامێک بە خوێن دەستکەوت بناغەی بۆش دەبێت. چونکە مرۆڤ وا دروست کراوە ئەوەندە لە خوێن خۆش دەبێت تا دەست و پێی دەکرێتەوە، ئەوسا گورزی تۆڵە دەوەشێنێتەوە. سەیری ئەوروپاکەن ئەوە نزیکەی حەوت سەد ساڵ بەسەر ئازاد کردنی قودس دا تێپەڕی ئەم داخ لە دڵانە تازە تۆڵە لە کورد دەکەنەوە. من سەرم سووڕدەمێنێ کە سەیری ئۆمەتی موحەمەد "درودی خودای لەسەر بێت" دەکەم، پەیامی ئیسلام پەیامی خۆشەویستییە و موسوڵمان برای موسوڵمانە، ئەم هەموو کینە و دوژمنایەتییەیان لە کوێ پەیا کرد و لە کوێ هێنا. هەر موسوڵمانەی ئاماری کوشتاری موسوڵمانانی بەدەستەوەیە و بە نەتەوەی خۆی رادەگەیەنێ کە چەند موسوڵمانی لە نەتەوە دراوسێکانی خۆیان کوشتووە. هەر موسوڵمانە و توک لە موسوڵمانان دەکات. هەر موسوڵمانە و پشت بە کافر و بێ باوەڕان دەبەستێتەوە. هەر کچە موسوڵمانە و خۆی لە کچە کافران زیاتر رووت دەکاتەوە. هەر پیاو ماقولانی خۆمانن، بێ ئەوەی ئایەتێکی قورئانیان لەبەربێت، وتەی فەیلەسووفە بێ ئیمانەکان دەڵێنەوە. لە جیاتی ئەوەی ئیمان بە شەریعەت و زەکات و سەرفترە و رەتکردنەوەی ریبا، پەڕاوە بۆگەنەکانی ئابووری سەردەم دەخوێننەوە. لە جیاتی ئەوەی پشت بە یەک ببەستن و چەک و جبەخانەی خۆ پاراستن وەک سەردەمی پێشوو بژێننەوە، چەک لە دوژمنانی ئیسلام دەکڕن و مەشقی سەربازیش هەر لە لای ئەوان دەکەن. بە فیتی ئەوان و بە دەسیسەی ئەوان، هەر موسولمانە و سەری موسوڵمان دەپەڕێنێ. ئینجا عەرەب لە جیاتی ئەوەی خۆی بە دوژمنانی ئیسلامەوە خەریک کات، سەرنجی هەموو نەتەوەی عەرەبی راکێشاوە دژی نەتەوەی فارس کە گوایە مەجووسن. خۆ موسوڵمانێک ناپرسێت و ناڵێت ئەی ئەوانیش

وەک ئێمە شەهادە ناهێنن؟ بۆ ئێمە لەو کەسانە بترسین کە شەهادە دەهێنن، بەڵام پشتمان بەو کەسانە ببەستین کە دوژمنی شەهادەن. ئینجا پاش ئەم شتانە ئێوە خۆتان بە ئامارەکانی سەر کاغەز هەڵدەکێشن. ئێمەش،،، ئێمەش پێتان دەڵێین ئەوە یەکە یەکە دیاردەکانی ئاخر زەمانن دێنە دی.
کاک ناکام قسەی بە مامۆستا بڕی و گوتی:
- دەک خوای دەکرد ئێستە دەبوو بە ئاخر زەمان. بە دەردی موتەنەبی دەبێژێ "ئەگەر لە توێنیەتیا خنکام...... پاش مردنم با تنۆکێکش نەبارێت" .
مامۆستا گیان جەنابتان باسی نەتەوەی فارس دەکەن ئەی نابینن چی لە کورد دەکەن. نەتەوەی کورد پێی خۆشە لەگەڵیان دانشێ و وت و وێژیان دەگەڵدا بکات، بەڵام وەک خۆتان دەزانن ئێمە دەستی برایەتیمان بۆ راکێشان ئەوان دوکتۆر قاسملۆیان دا بەر گوڵەی غەدر. پاش ئەم کارەساتەش هەر دەڵێن موسوڵمانان برای یەکن؟ نا بەخوا ئیتر ئێمە چیتر برای فارس نین و نابین. گەر گورزی خۆشمان بووەشێنین هەرگیز لەگەڵیان پاکنابینەوە. با ئەوان فارسبن و لەماڵی خۆیان دانشن ئێمەش وەک کورد لە ماڵی خۆمان دادەنیشین. بە دەردی کورد گۆتەنی "برا برایە و کیسەی جودایە"
پۆڵا وەک پشتیوانێک پشتی کاک ناکامی گرت و گوتی:
- سەیدایێ مە یێ هێژا هەر ل وەختێ تورکیا چێبوویە، دەوڵەتێ عوسمانی بێ کوردا ما کارابوو ڤان گشت سەرکەتنا چێبکا؟ئەگەر کوردا پشتێن وان نەگرتبا ئەو کارابوون شەڕێ فارسا بکەن؟ ئەگەر بەدلیسی باکوورێ ئەفریقیا ب پاک و تەمیزی و ب بێ خوون لە سەر سینیکا نەئانیبا ژ بۆ سوڵتانێ عوسمانی، ما ئەو وا بە سانایی دکارا دەستێ خۆ ب سەر ڤان دەڤەرا دا بگرە؟ ئەگەر کوردا لە پاش یەکەم جەنگێ جهانێ، تورکیا لەدەست یۆنانا ئازاد نەکردبا، ئیڕۆ تورکیا نە ئەڤ تورکیای ئانها دبوو؟ پاش ئازادکرنێ دەستێن کەمال موستەفا ێ لەعنەتی ڤەبوون "بلا هەزار لەعنەت لە توربا وی بت" ئەو هات و زێدەتر لە ملیۆنێک کورد قڕ کر، سەیدا ئەڤ بەرسڤێ ئیسلامەتی ێ تورکا بوو. چما ئەم پڕ دوور بچین پاشاێ کوور خۆە دا دەستێ ڤان کافرا ئێ کو تە دبێژییە وان موسولمان، وە باش زانن چ ژ وی کرن. ئەڤ راستە ئەم هەردەم بەحسێ

پێنج هەزار گوندێن کاولکری کوردستانی باشور دکەین، لێبەلێ چما ئەم پانزە هەزار گوندی کاولکری باکووری کوردستانێ ژ بیر دکەین؟ سەرۆک دبێژە ئەم تۆڵەی کورد لە تورکیا دکەین و تورکیا بەسەر سەری تورکا دا وێران دکەین.

شیرین گوتی:

- قسەی بێ مەعنا، ئێمە دەتوانین تورکیا بەسەر تورک دا کاول کەین؟ ئەوە تورکیا کوردستانی بەسەر کوردا کاول کردوە. گەر سەرۆکێک سەرۆکبێت چۆن لە وڵاتەکەی خۆی شەڕ دەکات.

- خوشکە شیرین کورد حەیا نهاژی یەک سەرۆکێ راستی یا وی هەبوویە ئەو ژی سەرۆک ئاپۆیە و تە ژی بڤی تۆنێ بەحسا وی دکەی؟ دیارە تە نزانی سەرۆک چییە.

- کاکی خۆم سەرۆک با بچێ ئەستەمبوول و عەنقەرە و شارە تورکنشینەکان بەسەر تورکا کاولکات، نەک رێگا بدات بە تورکیا تا پانزە هەزار گوندی کوردستان کاول بکات. سەرۆک ئەو سەرۆکەیە کە بتوانێت ماڵی خۆی ئاوەدان کاتەوە نەک بە جارێ جەنگ وڵاتەکەی خۆی کاول بکات. سەرۆک دەبێت چەند شتێکی هەبێت کە لە خەڵکی تر جیای کاتەوە. ئەویش پێش هەموو شتێک بڕوابیەکی بێ کۆتایی بە خۆی هەبێت. پاش ئەوە: یەکەم شت سەرۆک دەبێت نۆکەرێکی مل کەچی گەل و نەتەوەکەی بێت. دووەم شت دەبێت رابەرێکی چالاک و بە توانا و بێ هاوتا بێت. سێیەم دەبێت، لە پێناوی بیر و باوەڕەکەی جەنگاوەرێکی چاو نەترس بێت. ئەم سێ خاڵە لە زۆربەی زۆری ئێمەمانان دا هەن. ئەوەی گرنگە مرۆڤ تا چ پلەیەک لە توانای دایە ئەم خاڵانە بەکاربێنێت، بۆ چ ئامانجێک بەکاریان بێنێت و چۆن بەکاریان دێنێت. سەرەڕای ئەمەش ئەگەر ئەم خاڵانە لە مرۆڤێک دا هەبن، بەڵام بار و دۆخێکی گونجاو بۆ ئەم مرۆیە هەڵنەکەوت، ئەم خاڵانە لە شوێنی خۆیان دادەمرکێنەوە. سەرەڕای ئەمەش ئەم سێ خاڵەش نابن بە پێوەرێکی رەهای سەرۆک. چونکە ئەم خاڵانە دەبێت بە پێنج خاڵی تر ئاوبدرێن : یەکەم زیرەکی. دووەم دانایی. سێیەم چاو قایمی، چوارەم رەوانبێژی، پێنجەم توانای

ئەوەی هەبێت کەسی گونجاو لە شوێنی گونجاو بەکاربێنێت. ئەم پێنج خاڵەش دەتوانن لە کەسێک دا سەر هەڵبدەن بەڵام ئەگەر ئەو کەسە ئازا نەبێت یان دوورە پەرێزبێت لە خەڵک، یان شەرمن و دوورپو نەبێت، هەرگیز ناتوانێت ببێت بە سەرۆک. سەرۆک میللەت دوروست ناکات. بەلام ئاپۆ دەڵێت من کوردم دروست کرد. ئەی پێشی ئەو کورد لە کوێ بوو؟ ئەی ئەو بۆخۆی چی بوو؟ بە پێچەوانەوە میللەت دەبێت سەرۆک داتاشێت. بۆی هەیە ئەم خاڵانە بۆ ماوەیەکی کورت لە یەکێک دا کۆ ببنەوە، بەڵام ئەم خاڵانە هەتا هەتایە نین و ناشتووانن بێ مەودا بن، بۆیە لە هەر دۆخێک دا نەتەوە پێویستی بە سەرۆکێکی دۆخی خۆی هەیە. بۆ نموونە لە رەوشی ئازادیی نەتەوەیی دا، نەتەوە پێویستی بە سەرۆکێکی ئازا و چالاک هەیە. شەرت نییە ئەم سەرۆکە گەلێک زیرەکبێت، یان فەیلەسووف بێت یان ئابووری زانێکی بێ هاوتا بێت...هتد. لە کاتی تەنگ و چەڵەمەی ئابووری دا نەتەوە پێویستی بە سەرۆکێک هەیە کە ئابوری زانێکی مەزن بێت، نەک جەنگاوەرێکی بلیمەت بێت. بەڵام کە نەتەوە ئازاد بوو، بوو بە دەوڵەتێکی سەربەخۆ ; ئەو سەرۆکە تا شوێنی پیرۆزی خۆی لە دڵی نەتەوەکەی ون نەکات، دەبێت سەرکردایەتی دەوڵەت وەرنەگرێت. لە کاتی دامەزراندنی دەوڵەت، واتا دامەزراندنی بناغەی دەوڵەت ئەگەر لەسەر هەڵە دامەزرا، دورمەبینە کە کارەساتی مەزنی بەدوواوە بێت، بۆیە هەر کارێک کە دەست پێکرا دەبێت بە شێوەیەکی راست و رێک و رەوان دەست پێ بکات. ئەگینا بەرەو نیشانەی خۆی ناڕوات و سەرکردەی  وێڵ باوەشی نەتەوەکەی خۆی لێ نامۆ دەبێت، بۆیە بەرەو باوەشی تر دەڕوات تا کورسی خۆی بپارێزێت. لە باوەشی نەتەوەکەی خۆیا دەردەچێت و دەکەوێتە باوەشی بێگانان. سەرۆکی دابڕاو توشی کۆمەڵە گورگێک دێت، ئەوساکە مێژووە پڕ شانازییەکەی بەهانای نایێت.

سەیرێکی نەتەوە پێشکەوتووەکان کەن، هەر چوار یان پێنج ساڵ سەرۆک دەگۆڕدرێت و بە رووالەت رامیاری گشتی ئەم نەتەوەیە دەگۆردرێت، بەڵام گۆڕانی رامیاریی زلهێزەکان وەک گۆڕانی میکیاژی ژنان وایە. بۆ هەر ئامانجێک جۆرە میکیاژێکێک دەکەن کە لەگەڵ ئامانجەکە

بگونجێ. بەم شێوەیە سیاسەتی زلهێزەکان وەک چیای لە بەفر "ئایس بێرگ" وایە سێ بەشی لە نێو ئاو ونە و بەشێکی دیارە. سێ بەشە وونەکە بڕیار دەدات کام بەش دیاربێت.

- سکاڵا گووتی، شیرین خان تا ژنێک نەبێت بە سەرۆک رەوشمان لەم رەوشە باشتر نابێت.

ئەبونە گوتی:

- خوشک و برایان ئینجا دەڵێن چی ئەگەر شیرین خانی یاخی بوو لە سەرۆکەکانمان بکەین بە سەرۆکمان؟... چی دەبێت؟

سالار گوتی:

- بەخوا هیچ نابێت کێ ناڵێت ژنێک بکەین بە شێخ لە رابیعەی ئەلعەدەوییە، زاهید تر و باشتر نابێت. بۆ ژن ناتوانێت ببێت بە سەرۆک ئەی خانزادی سۆران ژن نەبوو؟

شیرین گوتی:

- ئێوە گاڵتەتان پێ دێت، بەڵام با یەکێک بێت و شوێن بە یەکێک لەم سەرۆکانەمان لەقکات ئەوساکە تێدەگەن دەڵێن هەزار رەحمەت لە شیرین بێت. ئێوە هەر وێردێک بکەن و بڵێن خوایە دەمی هیچ سەرۆکێک لەم سەرۆکانە نەکەیتەوە. کە دەمیان دەکەنەوە بە بۆن بۆگەنی دەمیان نەتەوەکەمان کاس دەکەن. پیاوە ماقوڵەکانی خۆشمان لەترسی ژیان و ئابڕوویان بێ شەرمانە قسەکانیان دووپات دەکەنەوە.

ئەنگێلا سەیری پیاوەکانی دەکرد، ئاگای لێ بوو کەسیان پێیان خۆش نەبوو کە سەری هەموو سەرۆکەکان لە سەبەتەیەک دا کۆبکرێنەوە، بۆیە گوتی:

- شیرین گیان دەبیبڕەوە چەند سەر بە گێچەڵێت. "کاڵا بە قەدەر باڵا" سەرۆک نە دەکڕدرێ و نە دەخوازرێتەوە، گریمان کڕا یان خواستراوە، لەم سەرۆکانە هەرگیز باشتر نابن چونکە نەتەوەکەمان هەر شایەستەی ئەم جۆرە سەرۆکانەن. جگە لەمەش سەرۆک هەرگیز ناتوانێت لە نەتەوە گەورەتر بێت، چونکە نەتەوە سەرۆک دروست دەکات. سەیری جهانی سێیەم کە دەکەونە

تەنگ و چەڵەمەیەکی مەزنەوە. لەجیاتی ئەوەی باسی گیروگرفتی خۆیان بکەن گشتیان دەڕژێنە ناو شەقامەکانەوە و هاوار دەکەن "ئەم سەرۆکە شایەستەی ئێمەیە". هەر ئەوەندەی یەکێک پێیکرا سەرۆکەکە بەلاوەنێت، ئەگەر وا رێککەوت سەری نەپەڕییە سەر کورسییەکەی خۆی، ئیتر سەرۆکی رووخاو بە زندویێتی جێگای لە وڵاتەکەی خۆشی نابێتەوە، شاە مرد بژی شاە. خوشکە شیرین جیهانی سێیەم بەم جۆرەیە، تۆش بە تەمایت بە شەو و رۆژێک بیگۆڕیت؟

ئازاد ویستی هەردوو بەرە لێک جیا کاتەوە، بە هێمنی گوتی:

- هەر یەکێک لە ماوەیەکی کورت یان درێژ دا بتوانێ رابەرایەتی نەتەوەیەک بکات ئەو سەرۆکە. ئینجا ئەگەر ئەو سەرۆکە هەڵبژاردراو بێت یان نەء گرنگ نییە. بۆ نموونە بیسمارک کەس هەڵینەبژارد بوو، بوو بە ڕابەری نەتەوەی ئەڵمان. با دوور نەڕۆین هەر کوردێک دەمی دەکاتەوە بۆ شێخ سەعیدی پیران و سەید رەزا و قازی و بارزانی دەگرێ. لێتان دەپرسم کێ ئەوانەی هەڵبژارد بین بە سەرۆک؟ کە وا بێت سەرۆک ئەو کەسەیە کە بۆ ماوەەیەک بتوانێت ببێت بە دەمڕاستی نەتەوەکەی خۆی. بە باوەڕی من باشتر وایە واز لە باشوری کوردستان بێنن نەکا بکەوینە ناو یەک و دوژمنی سەرەکیمان لە یاد کەین.

سالار بە دەنگێکی بەرز وەک چەکدارەکەی جاری جاران گوتی:

- ئێمڕۆکە ئەگەر هەر دەوڵەتێک لە دەوڵەتە داگیرکەرەکانی کوردستان لاوازبێت، بۆ ئێمە ئەو دوژمنی سەرەکی ئێمەیە. ئینجا ئەوە گرنگ نییە ئەوە تورکیا بێت یان ئێران بێت یان سووریا بێت. گرنگ ئەوەیە کە دەکەونە تەنگوچەڵەمەوە، هێرشیان دەبەنە سەر ئێمەش هێرش بەرینە سەریان تا کوردستانیان لە ژێر چنگ دەربهێنین.

شیرین گوتی:

- کاک سالار ئاگات لێبێت خۆمان بۆ تورک بە کوشت دا لە ئەتا تورکیان باشتر لێ دەرنەچوو، خۆمان بۆ عەرەب بە کوشت دا لە سەدامیان باشتر لێ دەرنەچوو، خۆمان بۆ فارس بە کوشت دا لە شاهەنشاهیان باشتر لێ

دەرنەچوو. ئا ئەم جارەیان کورد نابێت هەمان هەڵە بکاتەوە و خۆی بۆ ئەمریکاییەکان بەکوشت بدات. ئەم جارەیان دەبێت کورد خۆی بۆ کورد بە کوشت بدات تا ببێت بە شتێک.
سکاڵا گوتی:
- لە یادت نەچێت گەر سودت بۆ ئەمریکا نەبێت ئەمریکا هەرگیز لێناگەڕێت بژێیت. تورکیا وەک مار دەمی کردووەتەوە هەڵتلوشێت، ئێران وەک دوپشک چزی لەسەر پشتیەتی و هەردەم ئامادەیە پێوەتبدات و بتکوژێت. عەرەبی سوونە لەگەڵ تورکیا و عەرەبی شیعە لەگەڵ ئێرانن ئەگەر وابێت بە بڕوای ئێوە دەبێت چی بکەین؟ دیسان هەر چوار لامان لێ گیراوە.
پۆلا گوتی:
- گۆتنێ وە راستن بەرێ هەر توشتەکی ئەگەر ئەم هەما وەک تورکا بکەین گەندەڵ دبین، ئەگەر ژی وەک فارسا بکەین دەروین دبین، ئەگەر ژی وەک عەرەبا بکەین پوچ دبین. میللەتێن دەوڵەتێن عەرەبا گشت زانن سەرۆکێن وان خائینن، میللەتەک ژی ژ وان میللەتا نایە سەر شەقام و سەرهەلدانکی پێکبینن. ئێ ئەگەر میللەتی تورک هینێ بەرتیل و بەرتیل خووارنێ نەبت چەوا دهێلێن بالەفرێن ئیسرائیلی یێ کو قودس خرا دکەن لەسەر وڵاتێ وان جلیتبازی بکن؟ ما ئەگەر فارس نە وەک دووپشکا بن چەوا لوەختێ وت و وێژا مرۆڤەکی وەک دوکتۆر قاسملۆ دکوژن؟
ناکام گوتی:
- بڕواتانبێت ئەم فڕۆکانە لە دژی کورد، لە ئاسمانی تورکیا جلیت بازی ناکەن. ئەوە ئیسرائیل خۆی ئامادە دەکات لە تورکیاوە بێت و لە وێسگە ناوکییەکانی ئێران بدات. بۆ ئەم مەبەستەش پێویستە ئەرمینیای دوژمنی بابە کوشتەی تورکیا بێ لایەن بکات. ئێمە تا ئێستا نازانین ئەم شتە چۆن روودەدات، بەڵام پێویستە ئاگامان لێی بێت. من تێناگەم بۆ ئێوە هەردەم ئیسرائیل بە دوژمنی خۆتان دادەنێن؟ ئێمە بە پێچەوانەوە پێویستە رێگا خۆشکەین تا ئیسرائیل بتوانێت لە وێزگە ناوکییەکانی ئێران بدات. چونکە ئەگەر ئێران پێیبکرێت چەکی ناوکی دروست بکات، ئەوساکە کەس ناتوانێت هێرش بەرێتە سەر

ئێران و کوردستانیش ئەگەر خراپتر نەبێت هەر بەم شێوەیەی ئێستا دەمێنێتەوە واتا هێدی هێدی هەموو کورد دەکەن بە فارس. ئێوەش هەر چەقەوانەی ئیسرائیلم بۆ لێدەن.
مامۆستا بە قسە هات و گوتی:
- براینە ئێوەش هەر چەقەوانەی کورد و فارس و تورک و عەرەبم بۆ لێدەن منیش پێتان دەڵێم، ئەم نەتەوانە هەتا دێن لە دین دەردەچن و دەبن بە کافر. هەر تۆزێک بە هۆش خۆتان وەرنەوە هەر ئەم چەند نەتەوەیە بوون بووبوون بە کۆڵەگەی ئیسلام، ئێستاکەش ئەم نەتەوانە تێکبەربووون هەریەکەی لە شوێنی خۆی دەڕزێتەوە. ئێمەش لەجیاتی ئەوەی بەهێزیان کەینەوە، خۆشەویستی جاری جارانیان لە ناو دا بژێنینەوە دەچین ئەوەندەی تر ژێری کۆڵەگەکان دەکۆڵین هەریەکەمان دەبینە کرمی دار و لە جگەری یەکتریی دەخۆین، تا شارستانییەتی ئیسلام بەسەرمان و بەسەر دوژمنانمان دا دەڕمێت. ئا ئەوە یەکێکە لە دیاردەکانی ئاخر زەمان.
پۆلا رووی لە مامۆستا کرد و گوتی:
- سەیدا ئەم حەبیا نهاژی خۆشەویستییێ مە ژ بۆ ڤان میللەتا هین هەیە. هەما تە قەت بهیستییە کوردەک تورکەک ل ئەستەمبولێ بکوژە؟ یان ژی عەرەبەک ل بەغدایێ گوللە باران بکە یان فارسەکی لە تارانێ بدارڤەکا؟ ما تە نزانی فارس قازییان ل کوردستانێ بدارڤەنەکر؟ تورکا شێخ سەعیدیان لە کوردستانێ بدارڤەنەکر و پاشایێ کور ل تورکیا نەکوشتن؟ ئەگەر ژی بەحسێ بەغدایێ ژ بۆ تە بکەم دار و کەڤرێن وی گەواهی ژ بۆ کوردێن هاتنە کوژتن د ناڤ بەندیخانەێن بەغدا ددەن. قەدر و حورمەتێن من ژ بۆ جەنابێ وە، تازە وە بەحسێ خۆشەویستییێن بەرێ ژ بۆ مە دکەن. وەختێ ئەم دبێژین مە ٢٢ سەربازێن وان کوشتییە، ئەم دبێژین مە مێر کوژ و زارۆک کوژ و مێرێن تەعدا ل نامووسێ ژنێن مە دکەن، مە کوشتیە. سەیدا، حورمەتێ من ژ بۆ جەنابێ وە، وە دبوو ژ بۆ مە ب دوو دەستا ل چەپکا بخینن، لێ وە دێن بەحسێ ئاخر زەمانێ ژ بۆ من دکەن. هەنەک توشت هەنە ئەز نە دبوو ببێژمە وە لێ ئانها ئەز ببێژمە وە پارتی یێ مە نامەک ژ بۆ من شاندنە و دبێژن:

راسته ئەم چەند سەربازەک ژ وان مێرکوژا کوشتییە، لێ ئەم دڤی شەڕێدا نابێژین ئەم بسەرکەتین ژ بەر کو شەرڤانەک ژ مە هاتییە شەهید کرن.

وەک ئاسایی دەسەڵاتی فەرەنسی داوایان کرد، کە نوێنەرەکانی ئەم خۆپیشاندانە ببینن. پێیانڕاگەیاندن کە داواکاریەکانیان رەوان و گوتیان ئێمەش لە لای خۆمانەوە، داواکاریەکانتان دەگەیەنین بە سەرکردایەتی لە ئێمە بەرزتر. بۆیە خۆپیشاندانەکە پەرتەیان لێکرد.

****

دۆستەکانی کاک ئازاد گشتیان پێکەوە هاتنەوە ماڵی کاک ئازاد و لە گفت و گۆی خۆیان بەردەوام بوون. وا دیار بوو وت و وێژەکە ئەوەندە توند بوو هەرکەسەی دەیویست بیری خۆی بەسەر ئەوانی تردا بسەپێنێ.

زەنگی تەلەفۆن لێی دا، سکاڵا وەک گلەیی گوتی، دە شیرین گیان بێ زەحمەت تەلیفۆنەکە لە لای خۆت هەڵگرە بزانە کێیە، بەم شەوە تەلەفۆنمان بۆ دەکات؟

- ئەلو بەڵێ شەوباش. بەڵێ ماڵی کاک ئازادە....سامان...سامان. دەسکی تەلەفۆنەکە لە دەستی شیرین کەوتە خووارەوە. بە سەرسوڕمانێکەوە سەیری گشتیانی کرد و ئیتر بێدەنگ بوو.

سکالا گوتی:

- ئەرێ شیرین خان ئەی هاوار چی بووە؟ بۆ تاسای؟ سکاڵا زوو دەسکی تەلەفۆنەکەی لە شیرین وەرگرت و گووتی بەڵێ،،،بەڵێ بەڵام تەلەفۆنەکە داخرا بوو. شیرین چی بووە کێ بوو با ئێمە تەلەفۆنی بۆ بکەینەوە.

شیرین گوتی:

- سامان شەهید بوو.

ئا ئەم جارەیان بۆ دەمێک گشتیان لە شوێنی خۆیان تاسان.

ئازاد گوتی:

- سکاڵا گیان تەلەفۆنێکی سامان بکە، لە سەدی سەد تەلەفۆنەکەی لای ماڵی مامی جێهێشتووە.

سکاڵاش بێ ئەوەی بیربکاتەوە یان ورتەی لێوە بێت یەکسەر تەلیفۆنی سامانی کرد. بەڵام گریان لە گەرویا پەنگی خواردبووەوە، نەیدەزانی ئا ئێستاکە کێ تەلەفۆنەکە هەڵدەگرێت. لە وەڵامی تەلەفۆنەکە تێگەیشتن کە سامان لەم جەنگە شەهید بووە کە بیست و دوو سەربازی تورکی تیا کوژراوە.

- شیرین سەیری ئەنگێلای کرد و دەستی لە سەر سەری خۆی دانا و گوتی:

- ئەنگێلا زۆر خەوم دێت و نامەوێت بە تەنیا بچمەوە ماڵی خۆم. ئینجا یان تۆ وەرە بۆ لام یان من دێم بۆ لات.

ـ سالاریش گوتی:
ـ بەیارمەتیتان منیش سەرم دێشێت و دەڕۆم.
کاک ناکام هەڵسا و بە دەنگێکی نزم سروودی ئەی ڕەقیبی دەست پێ کرد و گشتیان هەڵسانە سەر پێ و سرودی ئەی ڕەقیبیان گوت.
ناکام بە دەنگێکی گڕی پیاوانەوە گوتی:
ـ کورد کە ڕۆلەیەکی خۆی لەدەست دەدات، هەزاران ڕۆڵەی تر چاوی لێدەکەن و ڕێگای ئەو دەگرنەوە بەر.
هەر لەگەڵ وت و وێژ دا ئەنگێلا و شیرین و کاک سالار خۆیان ئامادە کرد و خودا حافیزییان لە گشتیان کرد. شیرین و ئەنگێلا هەمان ڕێگایان گرتەوە بەر، چونکە هیچ ڕێگایەکی تریان پێ نەدەزانی کە بەرەو ماڵەوەیان بباتەوە، لە ڕێگای ئەو شەوە بەولاوە کە لەگەڵ سامانا پێیدا تێپەڕین و گەیاندنیە بەر دەرگای ماڵی ئەنگێلا. ئەم ڕێگایە هەر وەک جاری جاران چۆن شیرین شارەزای ئەم ڕێگایە بوو، وەک پێش سەد ساڵیش چۆن پاریسییەکان ئەم کوچەیەیان دەناسی، هیچی لێ نەگۆڕا بوو، جگە لەوەی کە سامانیش کەوتە ڕێزی ئەوکەسانەی کە ڕێبوارێک بوون لەم ڕێگایە و چیتر پێیدا نەهاتنەوە و نایەنەوە.

گەیشتنە بەر دەگای ماڵی ئەنگێلا. ئەنگێلا سەیرێکی پەیژەکانی کرد و هاتەوە یادی کە سامان پێیگوتن کچینە من دڵی خۆم لاتان بەجێ دێڵم بەیانیان ئاگاتان لێی بێت لەسەر پەیژەکانی بەر دەرگاتان پێی لێ نەنێن. دەشێت سامان منی خۆشنەوستبێت؟ بەڵام تازە ئەم نهێنییەی بردە ناو گڵ. چیتر ئەوە گرنگ نییە پاش هەزار ساڵی تریش هەزارانی وەک من و سامان نە تێگدەگەن نە پێکدەگەن، هەریەکەی بە لایەک دا ڕادەکات.

لەنکاوێک بیرەوەریەکان زیندوو دەبنەوە نیگای ون بوو، وشەی لە یاد نەماو یان هەڵوێستێکی سەرپێیی، دەبن بە داستانێک بە پەیکەرێک هازارانی وەک من و سامان بە موویەکی باریک پێکەوە دەبەستێتەوە. هەرکەسەی لەلای خۆیەوە دەپرسێت، بۆچ بەم شێوەیە چاوی لێ کردم؟ بۆچ ئەم ڕستەی ئاراستە کردم؟ بۆچ بە هانام هات؟ دەشێت منی خۆشنەویستبێت؟ گشتیان

داخ بۆ شتێک هەڵدەکێشن دەشێت ئەوە بەختی خۆم نەبووبێت و لە دەستم دابێت؟ ئەو هەزارانە بێ ناونیشان دەڕۆن و سەرگوم دەبن. خوا دەزانێت چەند گولله بەر سینگی سامان کەوتووە. من دەزانم نە من نە هیچ کچێکی تر سامانی خۆشنەویستووە، ئەویش لە تەزرە و کوردستان بەولاوە کەسی تری خۆشنەویستووە. من وا دەڵێم و دەشزانم ئێستا سامان لە ژێر خاکی کوردستانا ئاسوودەیە.

نە شیرین ئاگای لە خۆی بوو دەگریا، نە ئەنگێلا هەستی بە خۆی دەکرد کە دەگریێ، چونکە هەردووک لە دەروونی خۆیانا ئاسوودە بوون کە سامان گەیشت بە ئامانجی خۆی.

شیرین زەردەخەنەیەکی هاتێ، هاتەوە یادی کە ئەو رۆژە، لە دوکانەکە شتیان رێک دەخست. سامان ویستی دەستی لەسەر مێزەکە دانێ. منیش زوو بە خێراییەکی ئەوتۆ کە خۆشم چاوەڕێی ئەوەم لە خۆم نەدەکرد، دەست پێشخەریم کرد و دەستی خۆم خستە ژێر دەستی سامانەوە، چونکە دەستی سامان زۆر زل و گران بوو، بێ ئاگاش بوو لەوەی کە من تەڵەم بۆ ناوەتەوە. هەموو بارگرانی خۆی خستە سەر پەنجەکانم، منیش زیقەم لێ هەڵسا "شیرین لەبەر خۆیەوە پێدەکەنی". ئەو رۆژە بۆ یەکەم جار سامان دەستی گرتم و بە پەنجە زلەکانی دەستمی شێلا، بەڵام بە دەست شێلانی دڵداری نەدەچوو زیاتر لەوەی دەکرد، چۆن پێشمەرگەیەک تیماری دەستی پێشمەرگەیەکی تر بکات وا بوو. منیش بە ئەسپای دەستی خۆم کێشاوە و خۆم گران کرد. چی دەبوو گەر دەستی خۆم نەکێشاباوە و بمهێشتبایە چێژ لە راگوشینی دەستم وەربگرێت. ئەوساکە دەمتوانی سامان بەلای خۆما راکێشم و بۆ من بژێت. ئاخ ئەوەی چوو،،، چوو ئیتر ناگەڕێتەوە. کێ ناڵێت ئێستاکە ئەو لە گشتمان شادومان تر نییە؟ ئەو بۆ تەزرە دەژیا، بەڵام منی بێ سەر و بەریش هیچم نەدابوو بە دەستەوە. ئیتر بۆچی دەمویست بۆ من بژێت؟ بۆی هەیە توانیبێتم شوێنێک لە دڵی ئەو دا بکەمەوە موخابن من نەمتوانی شوێنێک لە ژیانی ئەو داگیرکەم. دەبێت لەوکاتەی کە گولله ژەهراوییەکانی ئەو سەربازانە سینگی ئەویان دەسمی بیری لە کێ کردبێتەوە.

شەرت بێت گەر بیری لەمن کردبێتەوە رۆژی سێ جار بە زمانی کوردی پەتی هەر وەک چۆن زەردەشت نوێژی دەکرد منیش نوێژ بۆ کردگار بکەم و خۆشم بۆ سامان تەرخان بکەم. داخی گرانم کەس لە دەنگ و باسی ئەو دونیای تر ئاگادار نییە. ئەوەی دەیزانم ئێستاکە سامان گەلێک کامەرانە چونکە وەک دەیویست، لە پێناوی تەزرە بژیێ و لە پێناوی کوردستانا سەری دانێ.

سالاریش لە لای خۆیەوە بە هێمنی و بە کڕی بیری لە سامان دەکردەوە: ئەو رۆژە پێشی گەڕانەوەی سامان بۆ نیشتمان، چوومە لای لە دوکانەکە سەرقاڵی کارکردن بوو. خەڵکی بەڕێ دەکرد و رۆژنامەکانی رێکدەخست و ئینجا بێ ماندوو بوون قسەی خۆشی لەگەڵ کڕیارەکانا دەکرد. کە چوومە ژوورەوە پێکەنی و گوتی تازە بیرم لە تۆ دەکردەوە، یاخوا بەخێربێیت. مادام هەر لێرەیت دەبڕۆ لە پشتەوە قاوەیەکمان بۆ بکە، چونکە زۆر لەمێژە دەمەوێت قاوەیەک بخۆمەوە و کار مەودام نادات، من لە ئاسمانان لە یەکێک دەگەڕام قاوەیەکم بۆ بکات ئەوە تۆ بە پێی خۆت هاتیت. منیش پێم گوت باشە من قاوەکەت بۆ دەکەم، بەڵام دەترسم تۆ لەسەر زەمین چاوڕێی فریشتەیەکت کردبێت، بە دەست و پەنجەیەکی ناسک قاوەیەکت بۆ بکات، منی جنۆکە لێتهاتمە ژورەوە. ئەویش بە پێکەنینەوە گوتی چۆنت زانی؟ کوڕە راست دەکەیت تەنیایی هەر بۆ خوا باشە. پاش دەمێک پێکەوە کە قاوەکەمان دەخواردەوە پێیمگوت.

ـ ئەرێ بۆ ژن ناهێنیت؟ لە چیت کەمە کارت هەیە، ماڵت هەیە و سەرەڕای ئەوەش پارەیەکی باشت هەیە. ئەگەر ئێمە ژن نەهێنین و کچەکانمان شوو نەکەن دوژمنانیشمان هەر ئەوەندەیان گەرەکە. ناوپەلی دەستە زلەکانی لە یەک دا و دای لە قاقای پێکەنین، بەم شێوەیە کە دوایین کورد دەمرێت دەبێت دوژمنانمان بینێژن. ئینجا تۆ هەر ژن مەهێنە.

ناوپەلی دەستە زلەکانی لەیەک دا و دای لە قاقای پێکەنین پێیگوتم:

ـ بۆ یەخەی منت گرتووە؟ من خودا غەزەبی لێگرتووم، بۆیە بێ خۆ ئامادەکردن دەمەوێت بەسەر لووتکەی هیمالایێ کەوم. وەک خۆت دەزانیت

ئەوانەی کە باش ئامادەن بۆ ئەم سەرکەوتنە ئینجا بە سەری لووتکەکە شاد نابن، تۆش دەتەوێت من شایی بگێڕم؟
- خۆ هەموو دونیا هیمالایە نییە، بەسەر شاخێک کەوە بەسەر گردێک کەوە، چیت لە هیمالایە داوە.
- چی بکەم دڵ باڵندەیەکی باڵدارە، بەڵام هەر ئەوەندەی نیشتەوە ئیتر دەبێت بە بنێشت و بەو شوێنەوە دەنووسێت. دڵی منش فڕی و لەسەر لووتکەی هیمالایە نیشتووەتەوە.
- سامان دڵی منیش وەک پەروانە لە دەورەی ئاگرەکەی بابە گوڕ گور دەسوڕێتەوە و ئۆقرە ناگرێت. کاکە سامان ئێمە وەک برا واین تۆ بەس پێم بڵێ ئەم شاخە بەرزە کێیە؟
- بە خوا پێتی دەڵێم، گەر ئەو کچە بۆ من نە بوو و دەشزانم بۆ من نابێت. گەر پێتکرا بیهێنیت، بیهێنە. گەر پێم بڵێیت باشە من ناوی ئەو کچەت پێ دەڵێم.
- کاکە سامان دەردی دڵی من بە کچێک چارەسەر ناکرێت. تا پەڕ و باڵم بە ئاگرەکەی بابە گوڕگور نەسووتێت، دڵم ناسرەوێت و ناکەوێتە سەر هیچ کچێک.

من ئێستاکە لە خۆم دەپرسم و خۆم وەک تاوان بارێک دێتە بەر چاو. بۆچ پێمنەگوت باشە؟ لەم پاریسە من شک بۆ هیچ کچێک نابەم کە هەردووکمان ناسیبێتمان لەم دوو کچە بەولاوە. بە باوەڕی من ئەم کچە هەر دەبێت ئەنگێلا بێت. چونکە ئەنگێلا دیانە و خوێندنی باڵا دەخوێنێت و کارێکی باشی هەیە و تا بیر و باوەڕیشیان پێکەوە ناگونجێت ئەو یەکێتییە و ئەمیش کۆمونیستە. من چەند جارێک گومانم کرد کە خۆی زۆر لەم کچە نزیک دەکاتەوە، بەڵام ئەنگێلا گوێی نەدەدایە.

کە گەیشتنە بەر دەرگای ماڵی ئەنگێلا، هەرسێک لە بیر و خەیاڵاتی خۆیان داپچڕان. کەسی چوارەمیش کە لەگەڵیانا دەڕۆیشت، بێ ئەوەی خوداحافیزییان لێبکات رووی وەرگێڕا و بە خێرایی پاریسی جێهێشت و

رووی کردەوە شاخەکانی کوردستان. کە میوانی ئەندێشەیان فڕی، هەرسێک بە دیداری یەکتر شاد بوونەوە.
- کچینە هەر کەسێک کۆچی کرد و ئامادە نەبوو ئەندێشەی دۆستەکانی جێ بهێڵێت، یان لە نێو ئەندێشەی کۆمەڵێک یان کۆمەڵگایەک ژیا دیارە ئەو کەسە نەمردووە، وەک فریشتەیەک لە نێو بیرەوەری دا دەژیێت. ئێستاکەش ئەگەر خەوتان نەیەت دەتانبەم بۆ قاوەخانەیەکی هێمن پێکەوە دادەنیشین و باسی ژیان دەکەین.
کچەکان چاویان لێک کرد و ئەنگێلا گوتی:
- ئێمەی مرۆڤ تێنوی ژیانین چی تیایە گەر باسی بکەین؟ وەک خۆت تازە گوتت ئەوەی لە ئەندێشەمان دابێت دەژیێت. ژیان لە ئەندێشەی ئێمەدا دەژیێت بەڵام هیچ شتێک لە ئەندێشەی ژیانا ناژێت.
شیرین گوتی:
- من قەت بیرم لەوە نەکردبووەوە، کە ژیان بێ ئێمە لە ئارادا نییە و ئێمە لە نێو شتێکی نەبوو دا هەین. ئێمەی زیندوو لە ئەندێشەیەکی مردودا دەژین.
- شیرین گیان تۆ شتەکان تێکەڵ مەکە. ئێمە خۆمان ژیان دەژیێنین و ژیان دەکوژین.
ئەوان لە وت و وێژی خۆیان دانەپچڕان و بەرەو ئەو قاوەخانەکەی مەبەستیان ملیاننا بوو. لەنکاوێک کچێک و کوڕێک بەرانبەریان هاتن و پەنجەی ئاماژەیان بۆ درێژ کردن و هەردووک پێکەوە هاواریان کرد و گوتیان ئەوانە خۆیانن. وەک دەڵێن شیرین و ئەنگێلا هۆپێکیان لە خۆیان زانی، ئەوانە دەبێت کێبن بەم شێوەیە ئاماژەیان بۆ دەکەن.
ئەم دوو لاوە زۆر بە ریزەوە لێیان هاتنە پێشەوە و گوتیان دێتە یادتان پێشی چەند مانگێک ئێوە لەگەڵ کوڕێکی تر ئالێرانە پیاسەتان دەکرد.
- شیرین و ئەنگێلا گوتیان راستدەکەن لەگەڵ سامانا بووین.
- جووتە لاوەکە گوتیان، ئا... ئا کوڕێکی چووارشانەی باڵا بەرزی بەخۆوە بوو. دێتە یادتان ئێمەش لەگەڵ کچێکی یەکجار جوان و رووخۆش و قسەخۆشا بووین.

هەردووک بە جووتە سەریان بادا و گوتیان : بەڵێ دێتە یادمان. ئەی ئەو کچە لە کوێیە؟

ـ پێش چەند ڕۆژێک ئێمە هەرسێکمان لەسەر لێوی شۆستە دەڕۆیشتین، نادین گوتی، سوێندتان بۆ دەخۆم ئەو کوڕە باڵا بەرزە بیبانییە ساردوسووڕە هەر دەدۆزمەوە و دەستەمۆی دەکەم. لەم کاتە دا نازانین چۆن رووی وەرگێڕا سەیری ئێمە بکات، پێی خلیسکا و کەوتە سەر شەقامەکە و ئۆتۆمۆبیلێک بە تیژی دەهات و کەوتە ژێریەوە و هەر لە شوێنی خۆی گیانی لەدەست دا. ئەوە دوو یان سێ مانگە ئێمە هەموو رۆژێک بێرە دادێین و لە ئێوە دەگەڕێین. نادین زۆر بە پەرۆشەوە بوو بتان دۆزێتەوە. ئەی برادەرەکەتان لە کوێیە؟

ـ سامان... سامان پێشی سێ رۆژ "ئەنگێلا سەیرێکی گشتیانی کرد و گوتی" لە تورکیا گوللەی دوژمن ساردی کردەوە. کێ ناڵێ ئەویش بیری لە نادین نەکردووەتەوە؟

شیرین بە کوردی گوتی:

ـ نا... نا... نا هەرگیز بیری لەم کچە نەکردووەتەوە.

سالار گوتی:

ـ منیش لەگەڵ رای شیرینم.

ـ کچەکە دەستی بۆ سالار درێژ کرد و گوتی:

ـ من ناوم "سیلڤی"یە دۆستەکەشم ناوی "تیبۆ"یە.

ئەوانیش خۆیان بە وان ناساندەوە. ئینجا سیلڤی گوتی:

ئەو شەوە نەهاتن لەگەڵمان لە بارێک دانشین، با ئێستا بە یادی خوشکم نادین و سامانەوە بچین لە شوێنێک دانشین و باسیان بکەین، و لە نێو باخچەی ئەندێشەی ئێمە دا بژیینەوە.

هەر پێنج چونە بارێک و لەسەر مێزێکی خڕ حەوت کورسییان لە دەورەی دانا و دانیشتن. سێ بیرە و چوار کۆکتێلیان داوا کرد. هەر پێنج، بیرە و کۆکتێلەکانیان لێک دا، پاشان سیلڤی هەڵسا و کۆکتێلی نادینی لە پەرداخەکەی کە بۆ سامان داندرا بوو دا. دوو فرمێسک لە چاوی سیلڤی هاتنە خوارەوە و

سەیرێکی کۆکتێلەکەی کە بۆ نادین تەرخان کرا بوو کرد و گوتی نادین گەر ئەو شەوە تۆ ئازایەتی ئەوەت هەبووایە دەستی سامان بگریت و نەتهێشتبایە بەم لا و بەو لادا بچێت، نە ئێستا شوێنی تۆ لەو دونیا دەبوو نە گوللەی سەربازی دڕ سینگی سامانیان کون دەکرد. نازانم نادین بۆ من ناوی تۆ دێنم بۆ ناڵێم، گەر من ئەو شەوە ئازایەتی ئیمشۆکەم هەبوایە ئێستاکە شوێنی ئێوە چۆڵ نەدەبوو. لەم کاتە دا کچێک دەگەڕاوە پشتەوە یان بڵێین "لە قرژاڵیان پرسی بۆ خوار دەڕۆیت گوتی هیچ شتێک بۆ گەنج عەیب نییە" ئەو کچەش پشتاو پشت دەڕۆیشت و خۆی لە مێزەکەیان دا بیرە و کۆکتێلەکەی بۆ سامان و نادین داندرابوون رژان. ئەو کوڕەی کە لە خزمەتی مێزەکە بوو "گەڕسۆنەکە" هات و مێزەکەی بۆ سڕینەوە.

ئەو شەوە سیلڤی هەر باسی نادینی دەکرد کە بە منالی پێکەوە چەند خۆشیان رادەبووارد بە گەنجی لە دانیشتگا، بە قسەی سلڤی نادین ساڵێک لە پاش ئەو بووە. ئەوانیش هەرسێک باسی سامانیان دەکرد کە چەند پێشمەرگەیەکی ئازاو بە جەرگ بوو. چەند تەزرەی خوشکی خۆشدەویست، چەند دۆستەکانی خۆی خۆشدەویست. دوو دەستەی جیاواز پێکەوە دانیشتبوون: دەستەیەک باسی خۆشی و شادی و رابواردنی دەگێڕاوە، ئەوەی تریان باسی نەگبەتی و نەبوونی و غەم و پەژارەی بۆ ئەوی تریان دەگێڕاوە. سیلڤی گوتی ئیمساڵ نادین دانیشتگای پزیشکی تەواو کرد و لە نەخۆشخانە کاری دەکرد. کارەکەی خۆی ئەوەندە بە دڵ بوو وایدەزانی ئەم بیمارگەیە بێ ئەو هەڵناسووڕێت. گوتیان ئیمساڵ یەکەم ساڵ بوو کە سامان چەکی لە شان داکەندبوو. ئەویش وایدەزانی کوردستان بە بێ چەک ئازاد دەبێت. بە هەر شێوەیەک بێت باسی دوو کەسی جیاوازیان دەکرد. لەسەر ئەم مێزە چۆن بیرە تاڵەکە و کۆکتێلە شیرنەکە تێکەڵی یەک بوون، چیرۆکی هەردوو دەستەش لە دەورەی ئەم مێزە خڕە بەهەمان شێوە تێکەڵی یەکتری دەبوون. هەردوو پەرداخە بەتاڵەکەشیان دا دەستی لاوەکەی کە لە خزمەتی مێزەکە دا بوو. ئەویش بێ سەرنج و بیرکردنەوە پەرداخەکانی لەبەر چاویان ون کرد. مێزەکەش وەک ئەم دونیایە پێکەنینی بە پەرداخەکان دەهات. بەڵام

وا دیاربوو هەردوو دەستە لەسەر یەک شت پێکهاتبوون کە "خۆزیا ئەو شەوە پێکەوە دانیشتباین". ئەنگێلا لە دڵی خۆیا گوتی داری خۆزیا شین بوو بەری نەگرت.

شیرین لە دڵی خۆیا دەیگوت، خۆزیا ئەو شەوە سامانم پەلکێش نەکردبایە و رادەستی نادینم کردبا، ئێستاکە سامان دەبوو بە بەشی نادین و سینگی زەمینی نەدەدڕاند. دەبێت بەرامبەر بە سامان من تاوانبار نەبم؟ دەبێت تاوانی من چی بێت منیش وەک نادین دەمویست سامان بکەم بە هیخۆم و بە شادی پێکەوە بژین. وابزانم تاوانی من هەر ئەوەندەیە کە من چۆلەکەکەم بە باشی نەگرتبوو و لە دەستم فڕی و چوو خۆی لە تەڵەی نەمان دا.

ئەنگێلا هاتەوە یادی: ئا ئەو ئێوارەیە کە لە کار دەهاتمەوە چاوم بە سامان کەوت دەتگوت لە شتێک دەگەڕێت. بە تەکما تێپەڕی و منی نەدیت وابزانم سەیری دەم و چاوەکانی تری دەکرد. ئێستا تێگەیشتم ئەو سەرنج و بیری خۆی خستبووە سەر کەسێک و هەر لەو دەگەڕا، بۆیە دوو یان سێ جار بانگم کرد ئینجا گوێی لێم بوو گوتی، ئا خوشکە ئەنگێلا ئەوە تۆی؟ داوای لێبوردن دەکەم ، لەبەر تەزرە هیچ ئاگام لەخۆم نییە. "گەر خۆی مابایە ئێستا پێکەنینی بەم قسەیە دەهات، چونکە ئەگەر لەبەر تەزرەی با دەبوایە لە لای تەزرە دانیشێت." منیش داوام لێی کرد ئەگەر پێتخۆشبێت وەرە با بچینە لای من چایێک یان قاوەییک یان چا و قاوە دەخۆینەوە. پاش دەمێکی تر شیرینیش دێت بۆ لام یان ئێستا دەبێت لە ماڵەوە بێت. ئەنگێلا خان داوای لێبوردن دەکەم من خۆم لە چوار دیوار رادەکەم. هەر لە بەیانییەوە تا ئێوارە لە دوکان و ماڵەوە من بەندی چوار دیوارم. خوداحافیزیمان لە یەک کرد و لێک جیا بووینەوە من دەمێکی باش ئاوڕم داوە و سەیریم دەکرد بزانم چی دەکات. ئەویش وەک دێوانە بەناو خەڵکەکە کەوت و لەبەر چاوی من ون بوو. دەشێت ئەو رۆژە ئەویش لە نادین نەگەڕابێت؟

بەم شێوەیە هەرکەسەی بیرێکی بۆ دەهات و شتێکی بە یاد دادەهاتەوە. بە رووانگەی ئەوساکە و بە هەڵسەنگاندنی ئێستاکەوە رووداوەی ئەودەمایان شیدەکردەوە. کێ دەڵێ کێ راستە و کێ دەڵێ کێ چەوتە. لایەکی

تەرازوو بەتاڵە و لایەکەی تریش پڕ لە بیرەوەرییە، هەر کەسەش ئیمان بە لێکدانەوەی خۆی دێنێت، چونکە بەرامبەرەکەی لە ئارادا نەماوە.

سیلڤی و دۆستەکەی ژمارەی تەلەفۆنی خۆیان دا بە هەرسێکیان و ئەوانیش ژمارەی تەلەفۆنی خۆیان دا بەوان. سیلڤی و یارەکەی تەکسییان گرت و شیرین و ئەنگێلا هەر یەکەیان چوونەوە ماڵی خۆیان. سالاریش بە پێ بەرەو ماڵی خۆی بەڕێ کەوت. چۆن لە پێشمەرگایەتی راهات بوو بە پێ بڕوات، کە بۆی بلوابایە و کات رێگای بدایە، ئەوا هەرگیز راژەی پێیەکانی خۆی بە راژەی میترۆ و پاس نە دەگۆڕییەوە.

سالار بە تەنیا دەڕۆیشت و بیری دەکردەوە و خۆی بە خۆی دەگوت، سالار شتی خۆش چەند کەمە ئێمەش ئەوەندە زووتر دەمانەوێت تەواوی کەین. تەمەن لە چاو بوون دا چەند کورتە ئێمەش بە هەموو شێوەیەک هەوڵ دەدەین کورتتری کەینەوە. لەنکاوێک بە هۆش خۆی هاتەوە من کە باسی تەمەن دەکەم باسی تەمەنی راستی دەکەم نەک تەمەنی ترسنۆکی. پەنجەی ئاماژەی خۆی درێژ کرد و سەر زوڵفی خۆی خوراند و بە دەنگێکی بەرز گوتی، سامان پیاو بوو، یەکێک وڵاتەکەی لە ژێر دەستی دوژمن دابێت، ئاسمانی بۆ فڕۆکەی دوژمنان والابێت، رەنگی ژێرکراسی ژنانیان بۆ نەیارانیان نهێنی نەبێت، دەبێت پیاوی ئەم نەتەوەیە تەمەنی درێژیان بۆ چی بێت؟ گەر بۆ سەرشۆڕی و رسوایی نەبێت دەبێت بۆ چی بێت؟ من خۆم لە خۆم دەپرسم کەی ئەو رۆژە دێت، منیش وەک سامان ئاسوودەبم؟ هەر خۆشی وەڵامی خۆی دەداوە و دەیگوت، بەڵێ گەر لە خۆ بوردن و ئازایەتی و مەردایەتی سامانم هەبێت ئەم رۆژە زۆر دوور نییە.

سالار سەیرێکی ئاسمانی کرد و پێی لە شوێنی خۆی چەقاند و راوەستا. لەبەر خۆیەوە بیری دەکردەوە و دەیگوت من نە بۆ کوردستان دەمرم و نە بۆ خۆشم دەژیم. نە دەتوانم پێستەی زەمین بقلێشم و بچمە ناوی و خۆم حەشاردەم. نە دەشتوانم کە نەمان بە زۆرداری کێرد لە هەستۆم دەنێ درەختێک لە پاش خۆم بەجێ بێڵم. سالار خۆت باش دەزانیت لەکاتی گەنجایەتی دەتویست لە پێناوی خۆتا بژیت، بە زۆر وایان لێکردیت بۆ

کوردستان بمریت، چی بکەین قەدەر وابوو نەمردیت. سالار خۆت زل مەکە تۆ هیچت لە سیاسەت نەدەزانی، ئیستاش تۆ یەکێتیت "ی ن ک" لە ئازادی کۆمونیست پرسیار دەکەیت، چی بکەیت. من باسی ئیستا ناکەم ئەی ئەوساکە تۆ چیت دەزانی بەس بە کوردی دەدوایت و شەرواڵێکت لە پێ بوو. من لە سیاسەت تێناگەم هەر دەزانم چەک هەڵگرم، کۆمەڵە فێری سیاسەتی کردم فێری ئەلف و بێی فەلسەفەی کردم، من وامداری کۆمەڵەم چۆن وازی لێ بێنم؟ بەڵام کوا کۆمەڵە، کەرکووکیش ئازاد نەکرا، ئەی سیاسەت و فەلسەفەی کۆمەڵە بە کێ بفرۆشم تا وامەکەی بدەمەوە. ئیستا لە هەموو کوردستانا بەس پ.ک.ک تفەنگی لە شانە. کورد هەناسەی سوار بووە بێ گوشاری بۆنی بارود هەناسەی نایەتەوە بەر. گەر تفەنگەکەم لە نێو گریز دەربهێنم و بە ئاسمانی شین شادی کەمەوە. بۆی هەیە بەم تفەنگە کوردیش لە تەنگە نەفەسی رزگاربێت.

لەنکاوێک سالار لە شوێنی خۆی راوەستا و پێی لە خاک چەقاند. من لە سامانم زیاتر پێناکرێ گەر ئەو بیست و دوو سەربازی گوشت، با بڵێین من دوو ئەوەندەش بکوژم، هیچ شتێک لە هاوکێشەکە ناگۆرێت. ئەگەر وابێت بە تفەنگ هیچ شتێک چارەسەر ناکرێت. سەری خۆی بادا و دیسان ملی پێوەنا و بەرەو ماڵەوە نشێو بووەوە.

ئێستا چەرخی گفت و گۆیە. جاران چەرخی تفەنگ بوو ئێمە بە تفەنگ نەمان دەدۆڕاند بە گفت و گۆ دەماندۆڕاند. دەشێ ئیمرۆ چەرخی گفت و گۆ بێت ئێمە بە تفەنگ بیبەینەوە؟ سالار ئەوەندەی نەمابوو لووتی لە دەرگای باڵەخانەیەک بدات. سەری هەڵبڕی دیتی دەرگای باڵەخانەکەی ماڵی خۆیەتی. کلیلەکەی دەرهێنا تا دەرگاکە بکاتەوە، لەنکاوێک دەرگاکە کرایەوە. سالار هەنگاوێک پاشەوپاش گەڕاوە، دیتی کچەکەی هاوسێیەتی دەچێت بۆ کار، بە روخۆشییەوە رووی لە سالار کرد و گوتی.

- Bonjour "رۆژ باش"

سالاریش بە هەمان روخۆشی وەڵامی داوە. نزیکەی سێ ساڵە ئەم کچە هاوسێی سالارە بەڵام ئەوە یەکەم جار بوو کە سالار چاو ببڕێتە ناو

چاوی ئەم کچە. سالار  چاوی لە نێو چاوی بڕی بوو. بۆ چرکەیەکیش نەی دەتروکاند. لە بیری خۆی دا دەیگوت. سالار چەند دەبەنگیت ئەوە سێ ساڵە دیوارێک توانیویەتی لەم کچە نازدارە جیاتکاتەوە؟

ماری گوتی:

- میسیۆ کەرکووکی، تەندوروستیت باشە؟

وەک بڵێیت سالار بە هۆش خۆی هاتەوە. ماری لێ بوو بە شیرینی کچی دیتی ماری بچوک بووەوە بۆیە سەری دانەواند تا لەگەڵ شیرینی کچی بدوێت. شیرین گوتی، بابە... بابە گیان تۆ بەشداریت کرد لە ئازاد کردنی کەرکووک چیت لەدەست دێت گەر سەرکردایەتی پاشەکشەی لێکرد. سەرکردایەتی کەرکووکیان بە ئەمریکییەکان بەخشی. تۆ ویستت لە پێناوی تۆڵەی ئێمە و ئازادکردنی کوردستانا بمریت. چیت لەدەست دێت خودای گەورە نەیویست بمریت. چونکە دەیەوێت خوشکێکم بۆ بێنیت کتومت بە من بچێت. سالار سەری بەرز کردەوە ماری لێی بوو بە بەفرین و راوەستا و گوتی، سالار چیتر پێت ناڵێم سالار گیان. چونکە سالار گیان قەڵاتێک بوو بە هیچ نەدەڕوخا. ئیستا پاش کۆچی سامان تۆ بە جارێک روخایت و سالارەکەی جارانیش نیت. من تێتدەگەم تۆ پشتت بە کۆمەڵە بەست بوو کۆمەڵە نەما نازانیت پشت بە کێ ببەستیت. دەزانم دەتویست پشت بە کۆمونیستەکان ببەستیت، بەڵام ئەوانیش خۆیان کردووە بە دادوەر لە نێوانی حووکمەتی کوردستان و گەل. وەک دەزانیت دادوەر لە لای کەس خۆشویست نییە خوداش لە رۆژی قیامەت دەیان سووتێنێت. چونکە گەل ناتوانێت غەدر لە حکوومەت بکات، حکوومەتیش پارە دەدات بە داوەر و دەیژیێنێت. بەم شێوەیە داوەر هێدی هێدی لە رەوا دوور دەکەوێتەوە گەلیش ئەو دادەی ناوێت کە بە فیتی زۆردار دەجولێتەوە.

سالار من تا ئیستاش خۆشم دەوێیت، تۆ خۆت رادەستی هەست و دڵت مەکە. گەر خوشکێکت بۆ شیرینی کچمان بوێت، کچی ماری هەرگیز نایەتە سەر گۆڕی شیرین، شادی بە پەژارە ناگۆڕێتەوە.

ماری دەستی سالاری گرت و درێژەی بە قسەکانی خۆی دا و گوتی:

ـ ئەوە چەند رۆژە دەتبینم زۆر پەشۆکاویت چی بووە؟ وەرە با بچین قاوەیەک بخۆینەوە چونکە منیش قاوەی بەیانیم نەخواردۆتەوە، ئێستاش دەبێ بچم بۆ قوتابخانە، خۆشت دەزانیت کاری مامۆستایەتی ئاسان نییە. ئەم جارەیان سالار رووخا، دارِما و بە دوای ماری کەوت، ماریش وەک منالێک دەستی گرت و پەلکێشی چایخانەکەی نزیک مالەوەی خۆیانی کرد. سالار لەگەڵ ماری لەسەر کورسیە بەرزەکانی بارِەکە دانیشتن. ئەرێ مسیۆ کەرووکی تۆ ناوت چییە؟ من ناوبانگم MICHELET "میشێلێت"ە بەڵام ناوی خۆم مارییە. من دەزانم تۆ ناوبانگت کەرکوکییە بەڵام نازانم ناوت چییە؟

ـ من ناوم سالارە.

ـ سالار من وەک کچێکی فەرەنسی دەزانم لە ولاتەکەی ئێمە، بۆ ئێمەی فەرەنسی هیچ شتێک ئاسان نییە. سەرم سوورِدەمێنێ ئەی بۆ ئێوەی بیانی دەبێت چەند دژواربێت؟ ئەگەر هەر گیر و گرفتێکت هەبوو پێمی بلێ بۆی هەیە پێکەوە بتوانین چارەسەرێکی بۆ بدۆزینەوە. ئێستا من دەچم بۆ کار کلیلی مالّی خۆمت پێ دەدەم، برِۆ لە مالّەکەی من پشوو بدە تا من لە کار دێمەوە.

ـ جارێکی تریش بەفرین هاتەوە بەر چاوی سالار. بەفرین بە قسەکانی کە لە بەر دەرگا دەستی پێ کرد بوو سالاری راچڵەکاند و بە هۆش خۆی هاتەوە. وەک بلێیت جادووی لێ کرابوو، قسە کانی بەفرینی هاتەوە بەر گوێ " بۆی هەیە ماری بێتە سەر گۆرِی شیرین بەڵام کچەکەی ماری هەرگیز نایەتە سەر گۆرِی شیرین و بۆی هەیە شووش بە کورِی بکوژی شیرینیش بکات و بلێت، باوکی بکوژ بوو تاوانی کورِ چییە؟" جادووەکە بەتاڵ بوو.

ماری زۆر سوپاسی هەستی ناسکی تۆ دەکەم، زۆر لەمێژە هەستم کردووە کە تۆ هەستێکی ناسکت هەیە. داوای لێبووردنیشت لێ دەکەم کە ناتوانم کلیلەکانت لێ وەرگرم، چونکە هەر زوو زوو دەبێت بچمەوە دەرەوە جا نازانم کەی دێمەوە. ئێستا دەچمە مالّەوە و زۆر دانانیشم، بە شەویش دەچمە کار هومێدەوارم لەم زووانە کاتێکی باشترمان بۆ هەلکەوێت تا پێکەوە

دابنیشین و بیر و رامان بگۆڕینەوە. ماری سەری خۆت بە گیر و گرفتی من مەیەشێنە. چونکە گیر و گرفتی من نەک بە تۆ، بەڵکو فەرەنسا بە گەورەیی خۆیەوە ناتوانێت و نەی توانیوە چارە سەرێکی بۆ بدۆزێتەوە. ئینجا من و تۆ هەر ناشتوانین بەلای چارەسەرەکەش دا بچین.

ـ سالار فەیلەسووفێکی چینی دەڵێ "هیچ گیر و گرفتێک نییە چارە سەری نەبێت. ئەگەر چارەسەری نەبوو. کەوابوو ئەم کێشەیە لە ئارادا نییە."

ـ ماری گیر و گرفتی من دۆزێکی سیاسییە، بە من و تۆ چارەسەر ناکرێت. گەر چارەسەری لە دەستی ئێمەمانان باوایە لە مێژ بوو کوردستان دەبوو بە دەوڵەتێکی سەربەخۆ. بەڵام مەخابن ئەم کێشەیە زۆر لە ئێمە گەورەترە.

ـ سالار... سالار، ئێوەی پیاو وا دەزانن بە رامانی دەروونیی خۆتان دەتوانن چارەسەر بۆ هەموو دۆزێک بدۆزنەوە. بە داخەوەم پێتدەڵێم لەو کاتەوە کە چەرخی پیاوسالاری باڵی بەسەر مرۆڤایەتی دا کێشاوە، جەنگ و ئاشوب شوێنی وت و وێژی گرتووەتەوە. بڕواتبێ سیاسییەکان لە کۆبونەوەی بەیانیان واژۆی خۆیان لەسەر گفت و گۆی نێو نوینی شەوانیان دادەنێن. ئەوە لە کەس شارراوە نییە کە لە پاش هەر پیاوێکی گەورە ژنێک هەیە. باش بزانە ئەو سیاسیانەی کە واژۆی خۆیان دەخەنە سەر هەر بڕیارێک پیاوی گەورەن و ژنیان لە پشتە. متمانەم پێ بکە بێ راوێژی ژن هیچ گیر و گرفتێک چارەسەر ناکرێت. ئینجا پیاوینە گەر پیاوەتیتان تێدابێت، بتانەوێت چارەسەری گیر و گرفتی خۆتان بکەن، تفەنگەکانتان فڕێدەن و گوێ لە ژنەکانتان راگرن. ئێستاش بە خودات دەسپێرم تا پێککەیشتنێکی تر.

ماری دەستی لە نێو دەستی سالار نا و خوداحافیزی لێ کرد و رۆیشت. سالار لە شوێنی خۆی داما بوو. نازانم نە بیری لە قسەکانی بەفرین یان لە وانەکەی ماری دەکردەوە. ئەوەی گرنگە سامان باڵی گرتبوو، خۆشی نەیدەزانی بۆ کوێ دەفڕێ. سالار بە مێزی چایخانەکەوە فڕی و گەڕاوە کەرکووک و ماڵەکەی خۆی. بەفرین لە شوێنی ماری دانیشت بوو، شیرینیش لە تەکیەوە دانیشت بوو و ناوە ناوە شەقێکی لە رانی سامان دەدا. سامانیش پێدەکەنی و دەیگوت دە کچێ ئاقڵ دانیشە. بەفرین بە سالاری دەگوت ئافەرین

سالار، خۆت رادەستی ژنان مەکە، ژن ماری سڕن، هێند نەرم و نیان و ناسکن کە گەرم بوونەوە پێوەتدەدەن. گەر شیرینت خۆشدەوێت و هەر سووریت لە سەر ئەوەی خوشکێکی بۆ پەیداکەیت. بڕۆ لە ژنێکی کورد بگەڕێ تا هەرنەبێت کچەکەی بێتە سەر گۆڕی شیرین. شیرین شەقێکی تری لە سالار دا. سالار راچڵەکی و بە هۆش خۆی هاتەوە. دیتی ژنێکی لاو لە شوێنی ماری دانیشتووە و کچەکەی کە تەمەنی بە مەزەندە چوار ساڵ دەبێت لەسەر مێزەکە نزیک سالار دانیشتووە، بۆیە پێی بە رانی سالار دەکەوێت.

- کچە بچکۆلانەکە سەیری سالاری کرد و گوتی، مامە بۆ تۆ پێدەکەنیت؟

- لە جیاتی پەژارە و دڵتەنگی ببن بە گریان و بڕژێنە ناو دەستەسڕەکەی دەستی، بوون بە گاڵتە و گەپ و پێکەنینی دەمێکی گەلێک کەونی لە یاد چوو. ئینجا وەڵامی کیژۆلەکەی داوە و وتی، چونکە دڵم خۆشە.

# دەرگای هەشتەم

## ئەستێرە پێکدەگەن و دەشرژێن

هەمو شتێک بەرەو کۆتایی دەڕوات...
نازانین کەی کۆتایی دەست پێ دەکات.

هەر شتێک کە دەستی پێکرد وا دەزانیت دوایی نایەت. هەموو کۆتایەکیش سەرەتایەکی تایبەتی خۆی هەیە. ئەم سەرەتایەش وات لێدەکات بڕوا بکەیت کە ئەم کۆتاییەش دوایی نایەت. گەر درۆ نەبێت کاتەکەی بە تەواوی نایەتەوە یادم، بەڵام هەر سەرەتای بەهار بوو. ئەوەی دەیزانم تازە دارەکان لق و پۆخیان دەدا و هەندێکیشیان خۆیان خەمڵاند بوو. بڵێیت سەرمابێت سەرما نەبوو، بەڵام جارێ کزەیەکی ساردی هەرمابوو. شیرین بڕیاری دا جامی پەنجەرەکان پاککاتەوە. بۆ ئەم مەبەستە جلێکی وەرزشی ژنانەی لەبەر کرد. پەنجەرەکانی کردەوە سەر پشت و دەستی بە پاککردنەوەیان کرد. هەموو بیر و ئەندێشەشی لە لای نووسینی دکتۆراکەی بوو، چونکە تازە .D.E.A (دیپلۆمی توێژینەوەی قووڵ) کەی تەواو کردبوو. لەم کاتە دا دیوی دەرەوەی پەنجەرەکانی پاک دەکردەوە یەکێک بانگی کردێ
- شیرین خان.

شیرینیش لە نهۆمی چوارەمەوە سەیری خوارەوەی کرد، بە سەر سوڕمانێکەوە دیتی کە ئەوە سالارە بانگی دەکات. ئەویش بە دەست ئاماژەی بۆ کرد کە بێتە سەرەوە.

- شیرین خان ئەوە خەریکی چیت؟... بە خوا پێتخۆشبێت یان پێتناخۆشبێت دەبێت هەر یارمەتیت بدەم. دەزانم کە لە نهۆمی چوارەمەوە سەیری خوارەوە دەکەیت سەرت دەسووڕێت. بۆیە بێ بێنە و بەرە من دیوی دەرەوەی پەنجەرەکان پاک دەکەمەوە.

- گوتم بە خوا نابێت وەک بیستوومە تۆ قاوەی خۆش دەکەیت، بە دەستی خۆت قاوەیکم بۆ بکە تا من دیوی دەرەوەی پەنجەرەکان دەسڕمەوە. ئێستاش بۆی هەیە ئەنگێلا بێتە لام. ئەویش پێی خۆش دەبێت قاوەیەکی گەرم بخواتەوە.

سالار پڕی دا کەفاوەکەی دەستی شیرین و شیرین ویستی نەهێڵێت دەستی لە سەتڵەکە گیربێت. لەم کاتەدا شیرین وەک ئاسکی لە شێر هەڵاتو پێی خلیسکا، سالار ویستی بیگرێتەوە تا نەکەوێت. وەک شێری نێچیروان کەوتە سەر لەشی نێچیرەکەی. ئەمجارەیان هەردووکیان کەوتن و سالار دەستی خستە ژێر سەری شیرین تا سەری بە زەوی نەکەوێت. سالار سەیری کرد سەری شیرین لە نێو دەستییەتی، و چاوەکانی داخستووە و مووەک دەمی لە دەمی شیرین جیادەکاتەوە. ئا ئەم مووە پەردەیەکی زۆر ئەستوور بوو دەبوایە لاچێت. لای شیرین وابوو پاش شەهید بوونی سامان سەردەمێکی ڕەش لە ژیانی دەستی پێکردووە و کۆتایی نایەت. کەسەری کەوتە سەر دەستی سالارەوە، چرایەک لە بەر چاوە داخراوەکانی شیرین هەڵگیرسا. کۆتایی بە سەردەمی ڕەشهەڵگەڕاو هێنا. ئەم چرکەیە بۆ سالاریش دەتگوت سەردەمێکە و کۆتایی نایەت. سەردەمێک بوو زۆر لەمێژ بوو سەری هیچ ژنێکی لە سەر باسکی خۆی نەدی بوو. ئەم سەرەی نێو هەمێزی سەردەمێکی نوێی هێنا کایەوە. بێ ئەوەی بیر بکاتەوە وەک شێر چۆن نێچیرەکەی دەگرێت دەمی دەخاتە نێو گەردەنی، ئەویش دەمی خستە نێو دەمی شیرین و دەستی بە مژینی کرد. شیرین ئەوەندەی تر هەناسەی لە خۆی بڕی یان هەناسەی لێ بڕا، و کەوتە دونیایەکی دیکە. مێشکی تەزی بوو و موچڕک بە هەموو لەشی دا دەهات، هەر لە تاڵەی پرچییەوە دەستی پێدەکرد، بەنێو لێوەکانییەوە دادەهات و لە نووکی پەنجەی پێی دەهاتە دەرەوە. دەستەکانی کە لەسەر سینگی خۆی دانابوون تا خۆی لە سالار بپارێزێت، لە ژێر سالار دەری هێنان و باوەشی سالاری پێ گرتن.

زەنگی دەرگا هەردووکیانی بە ئاگا هێناوە. سالار دەمی لە لێوەکانی و شیرین دەرهێنا، ئینجا شیرین زوو خۆی لە ژێر سالار هێنا دەرەوە. وای

دەزانی جلە وەرزشیەکەی گەچراون، بۆیە هەر دەستی بە رانی خۆی دادەهێنا تا گەچرانی پێوە دیار نەمێنێت.
سالار گوتی:
- شیرین ببورە.
- لێت دەبورم گەر دووپاتی نەکەیتەوە.
- دەتەوێت ساڵێکی تریش چاوەڕێی ئەم رووداوە کەمەوە؟
- ئەوە ئەنگێلاش گەیشت دوایی قسەی لێدەکەین. شیرین وەک بڵێیت ماستی خواردبێت هەر لێوەکانی خۆی دەسڕییەوە تا ئەنگێلا نەزانێت کە تازە ماچی بە سالار داوە. ناوەناوەش هاواری دەکرد هاتم هاتم، تا ئەنگێلا بزانێت کە شیرین لە ماڵەوەیە و نەڕوات. بە پەلە رایکردە بەر ئاوێنەکە و بە خێرایی شانەیەکی بەسەری خۆی داهێنا و سەیری لێوە سورەکانی خۆی کرد. لەبەر خۆیەوە دەیگوت بە خوا ئێستا ئەنگێلا دەزانێت کە خۆم داوەتە دەستی سالار. هەر دوێنێکە باسی سالارمان کرد و گوتم من هەرگیز بیر لە سالار ناکەمەوە چونکە ئەم پیاوە هەر بەڵگەنامەی خوێندنی ناوەندی هەیە. ئێستاش نازانم چۆن خۆم لەم گێژاوە بێنمە دەرەوە. شیرین ناچار بوو دەرگاکە بکاتەوە. لەم کاتە دا سالار خەریکی سڕینەوەی کەفاوە رژاوەکەی سەر زەوی هۆدەکە بوو.
- ئەیەڕۆ شیرینی بێ چاوو روو ئەوە زەوی بە کاک سالار پاکدەکەیتەوە؟
شیرین یەکسەر چوو بۆ ئاشپەزخانەکە و گوتی:
- قاوەیەک ئامادە دەکەم. کە گوێی لێ بوو ئەنگێلا دەڵێت بۆ زەوی بە کاک سالار پاکدەکەیتەوە گوتی.
- نا بە خوا خلیسکام، باش بوو کاک سالار لێرە بوو سوپاس بۆ ئەو ئەگینا هەر نەمدەتوانی هەڵسمەوە.
- ئۆی چاوم کوێربێت، "ئەنگێلا دەستەسڕەکەی لە باخەڵی دەرهێنا و دەمی سالاری پێ سڕیەوە وا دیار بوو تۆزێک بە سووراو بوو. ئەنگێلا بە ئەسپایی سووراوەکەی سڕییەوە."

لەو کاتە شیرین لە ئاشپەزخانەکە خەریک بوو تۆزێک سووراو لە لێوی خۆی بدات، دیمەنی سڕینەوەی سوراوەکەی نەدیت. بەڵام سالار هەستی پێکرد کە پێکەنین و گاڵتەکەی ئەنگێلا ساختەچییانەیە. تازە کار لە کار ترازابوو هیچی لەدەست نەدەهات ئەویش خۆی نەشێواند، خەریکی کاری خۆی بوو. ئەنگێلا گوتی ئێستا بە هەرسێکمان هەرەوەزێکی لێ دەکەین، دەشبینن نیوسەعات نابات پەنجەرەکانیش پاک دەبنەوە و دەچینە دەرەوە. دەڵێن چی بچین بۆ سینەما و دوایی دەچین بۆ لای من خواردنێکی خۆشم لێناوە دڵم نەهات بە تەنیا بیخۆم.

- دەبێ ئەم خواردنە خۆشە چیبێت؟ سالار گوتی.

- پێتان ناڵێم.

- شیرین قاوەکەی ئامادە کرد و هاتەوە ناو ساڵۆنەکە و گوتی، خاتون ئینجا کەی تۆ دەزانیت خواردن لێبنێیت، توخوا خواردنەکەی خۆت چێشتووە تا دەرخواردمانی دەیت؟

ئەنگێلا قاوەکەی لە شیرین وەرگرت تا شیرین بتوانێت کولیچەکان لە سەر مێزەکە دابنێت، پاشدان بە شیرینی گوت:

- ئینجا کێ تۆی بانگ کردووە دەڵێیت ئەسکویت لە هەموو دیزەیەک دا میوانیت.

- بە خوا مادام وات گوت هەر دەبێت بێم و ئەگەر خواردنەکەت ناخۆشبێت. هەر لەم بڕوایەشدام کە ناخۆش دەبێت، لە هەموو پاریس ناوبانگی کابانیت بڵاو دەکەمەوە.

لەم کاتەدا زەنگی تەلەفۆن لێیدا و شیرین تەلەفۆنەکەی هەڵگرت، وا دیاربوو سکاڵا لەبەر شیرین دەپاڕاوە و دەیگوت گەلێک لەمێژە نەهاتونەتە لامان، بەخوا ئیمشۆکە هەر دەبێت بێن بۆ لامان. ئەنگێلاش تەلەفۆنەکەی لە شیرین وەرگرت و بە سکاڵای راگەیاند کە یاپراخێکی زۆر خۆشی کردووە و پێی خۆشە کە لەلای ئەو کۆببنەوە. وا دیاربوو سکاڵا رازی بوو، گوتی باشە. هەر بە پێکەنین و گاڵتە و گەپ، پەنجەرەکانیان سڕییەوە و کۆتاییان بە کارەکە هێنا.

شیرینی غەمبار زۆر لەمێژ بوو بەم جۆرە پێنەکەنی بوو بۆیە هەر لەبەر خۆیەوە دەیگوت خێربێت خوایە. لەم کاتە دا شیرین بیری لە هەموو شتێک دەکردەوە، تەنیا لە دوکتۆراکەی نەبێت. ناوە ناوە سالار دەستی دەگوشی، ئەویش لە جیاتی قەڵەم پەنجەی سالاری دەگرت و لە دڵی خۆیا دەیگوت دەبێت لە جیاتی پێنووس بەم پەنجانە نەخشەیەکی نوێ بۆ ژیانم بنەخشێنم؟ دیسان قسەیەکی خۆشی دەهاتەوە یاد و بۆیانی دەگێڕاوە و گشتیان بە یەک دەنگ پێدەکەنین. سالاریش زۆر قسەی خۆشی دەهاتەوە یاد و بۆیانی دەگێڕاوە. ئەوەی گرنگە ئەم سێیە بە هەندێک شت پێدەکەنین کە کەس پێکەنینی پێی نەدەهات.

ئەنگێلا گوتی:

- چەند خۆشە دڵت خۆش بێت، گەر مێشێکیش بفڕێت پێکەنیت پێی دێت، کە دڵیشت ناخۆش بوو گریانت بۆ هەموو شتێک دێت.

شیرین گوتی:

- ئێستا من بەس گریانم بۆ یاپراخە بێ تام و چێژەکەی تۆ دێت. بە تایبەتی کە کاک ئازاد لە کار دێتەوە ماندو و مردو هەرتک بێتە لای جەنابت و لە پاش یاپراخی دەستی سکالا بێت و یاپراخی تۆ بخوات دەبێت چی بەسەر بێت؟

سالار گوتی:

- ئینجا چی بەسەر دێت، ئەوەندەی تر سکاڵای خۆشتردەوێت و بەس.

ئەنگێلا گووتی:

منیش گریانم بۆ خۆم دێت، کابان یان بێ بەشە یان رورەشە. ئەرێ شیرین دە شتێکم بۆ بێنە بیخۆم، چۆنکە دەزانم بێبەش دەبم.

زەنگی تەلەفۆن بوو. هەرسێک پێکەنینی خۆیان راگرت و کڕبوون. وا دیاربوو ساشە تەلیفۆنی کرد و لە ئەنگێلای دەپرسی. شیرین پێی راگەیاند کە ئەنگێلا لەلایەتی و ئەویش دەسکی تەلەفۆنەکەی لە شیرین وەرگرت. لە وت و وێژەکەیان وا دیار بوو کە ئەلێکساندەر دەیەوێت لەگەڵ "سیلین"ی دۆستی بچێت بۆ شاری نیس و لەوێ تۆزێک پشوو بدات.

ـ ساشه سیلین لەلاته؟
ـ نەء.
ـ ئەوه چەند له مێژه دۆستی سیلینیت بۆ پێمانی ناناسێنی؟
ـ نازانم بۆ بەڵام نامەوێت.
ـ ئیمڕۆ تەنیا تەلەفۆنی بۆ کردم و گوتی که ئەسکەندەری کوڕی تا دێت گەوره دەبێت. تا دێت یاریشی خۆشتر دەبێت. به قسەی خۆی دەڵێت ئەوەندەم خۆش دەوێت نامەوێت ئەم خۆشەویستییه لەگەڵ کەس بەش بکەم.
ـ ساشه پرسی، ئەی باسی منی نەکرد؟
ـ با لێی پرسیم سیلین جوانه؟ منیش به راستی پێمگوت نازانم. گوتی وەک سەندرین ددانی گڕه؟ گوتم نازانم.
ـ ئەنگێلا هەموو کاتێک تۆ دەڵێیت ئەگەر خواردنێکی خۆش بکەم پێم خۆشه لەگەڵ دۆستەکانم بیخۆم. ئەنگێلا پیاوی وەک منیش که لەگەڵ سەد بازرگان و پیاوی گەوره کار دەکەم وەک خۆت دەزانیت پەیوەندی بێنه و بەرەی سەوداکردن وا دەکات که هەموو کاتێک نەرم بیت و چاو له سەد شت بپۆشیت. ئینجا ئەوانەی که وەک منن ئەگەر ژنەکەیان جوانبێت دڵی سەد کەسی دەچێتێ. ژنیش لەم سەد کەسه دڵی بۆ یەکێکیان تۆزێک هەر نەرم دەبێت. ئەنگێلا بۆ پیاو زۆر زەحمەته ئەگەر له ژنەکەی بورد خۆشەویستی کلاسیکی دوایی دێت. که ئەم خۆشەویستییه نوێیه واتا "خۆشەویستی سەردەم" دێته ئاراوه، دڵ نەرم بوون بۆ پیاوانی تر نابێت به خیانەت. بەڵام لێرەدا دەبێت هەردووک له پلەو پایەی خۆشەویستی سەردەم دابن. ئەگەر هەر لەسەر خۆشەویستی کلاسیکی بەردەوام بن واتا به هیچ شێوەیەک لێبووردنی تیا نەبێت، ئەوا خۆشەویستی به جارێک کۆتایی دێت. پاش چەند تاقیکردنەوەیەک که دووابیەکەیان لەگەڵ تەنیا بوو تێگەیشتم که لەگەڵ ژنی جوان من ماڵداریم پێناکرێ. بۆیه بڕیارم دا ژنێکم هەبێت تا که دێمەوه ماڵەوه به تەنیا نەبم.
ـ ساشه ئەوەی به ئێوەی رۆژئاوایی دەکرێت، ئێمەی رۆژهەڵاتی خەویشی پێوه نابینین. ئێمه و ئێوه لامان وایه ئینجیلی پیرۆز پەیڤی خودایه. ئێمه

دیانەکانی ڕۆژهەڵات کە دەیخوێنینەوە ترسێک لە تۆقی سەرمان دەنیشێت لە نووکی پێمان دێتە دەرەوە. ئێوەی ڕۆژئاواییش بە سەلیقەی خۆتان یاری پێدەکەن و بە ئێمەش دەڵێن ئێوە کەی کاسۆلیکن. ساشە تەڵاقدان لە ئایینی ئێمەدا حەرامە، کەنیسەی ئێوە تەلاقی حەلال کرد. ئێوەش نەک هەر کردتان بە پەیڕەو و حەڵاڵتان کرد، بەڵکو بێ مارەییتان بەسەر مارەیش دا زاڵ کردووە. ئێوە بە کەیفی خۆتان تاقیکردنەوەی خۆتان دەکەن. ئێمەی ژنی ڕۆژهەڵاتیش ئەگەر لە تاقیکردنەوەی یەکەممان دا سەرنەکەوتین ئیتر قوڕمان بەسەر، سەرەنجاممان لە سەرەنجامی (تەنیا) باشتر نابێت. ساشە تەنیا لە دەست تۆ و لەدەست کوردەکانی ئێرە هەڵات، چونکە لە تاقیکردنەوەی لەگەڵ تۆدا سەرکەوتوو نەبوو. بڕواتبێ دەزانم دەڵێیت گوناهی منی تیا نییە. باشە ئەوەی چوو چوو. ئێستا ئەوەی گرنگە بەیانی لە سەرکار دەبێت چی بکەم؟

- من زۆرم لە تۆ ناوێت، هەر ئەوەندە کە دەچیتە کار و من لە وێ نەبووم تۆ جێگری منیت. هەر ئەوەندە ئەو شتانەی کە من خاچێکم لەسەریان داوە تۆ واژۆی خۆتی مەخە سەر، بە گوێرەی توانا وت و وێژیان لەگەڵ درێژکەوە. خوداحافیز تا گەڕانەم بە خودات دەسپێرم.

سالار گوتی:

- کچێ ئەنگێلا ئەم باسانە لە لای ئەوڕپییەکان کات کوشتنە، بۆیە زۆر لەسەری ناڕۆن. ئەو ڕۆژە ماری هاوسێم دەیگووت، کە ڕۆژهەڵاتییەکان ئاسن و مزیان دۆزیەوە و ئەسپیان دەستەمۆ کرد و پێچکەی گالیسکەیان دوروست کرد. سەردەمی دایک سالاری بەسەرچوو و دەوری پیاو گەشەی سەند و سەردەمی باوک سالاری هاتە مەیدانەوە. دۆزینەوەی چەرخ و چەرخەڵە، یان بڵێین خولی پێچکە وای کرد کە مرۆڤ بتوانێت دەستاڕ و بەردەئاش و جەنجەر بدۆزێتەوە کە ئەوانەش هەر یەکێکیان شۆڕشێک بووە لە سەردەمی بەسەرچووی ئەوساکەدا. پاش چەند هەزار ساڵێک بە سووڕانەوەی دەروێشەکانی مەولانای بەڵخی مرۆڤایەتی ئینجا توانی واتایەکی روحی بۆ ئەم سووڕانەوە مادییە بدۆزێتەوە، مەولانا ڕۆحی خواپەرستی لە سووڕانەوەدا بەرجەستە کرد. وە هەروەها ڕۆژهەڵاتی دوور واتا چین

بارودیان دۆزییەوە. ئەم دۆزینەوانە بە هەزاران ساڵ گۆڕانێکی ئەوتۆیان بەسەر دا نەهات. لەم دوو چەرخەی دوایی دا رۆژئاوییەکان چەرخ و چەرخەڵەیان بە شێوەیەک پێشخست کە مرۆڤایەتی بە زەحمەت پێڕادەگات بەدوای پێچکەی پێشکەوتن دا بکەوێت. وەک دەبینن مرۆڤاتی بە بەرهەمەکانی مادی ئەم سووڕانەوەیە راناگات ئینجا چۆن دەتانەوێت بە رۆحی ئەم سووڕانەوەیە ڕابگات؟

کچینە ئەوە هەر قسەی (ماری)یە بۆتانی دەگێڕمەوە و دەڵێ، کە پیاو دەستی پێکرد هەست بە هێز و توانای خۆی بکات. هەستی بە بێتوانایی ژنان کرد بەرامبەر بە هێز و توانای خۆی. سەردەمێک پیاو لەخۆبایی بوونی خۆی بەرامبەر ژنان بە سەما و شایی دەردەبڕی، تا ژن بە لای خۆی دا رابکێشێ. ئا لێرانە سەردەمی دایک سالاری واتا خێزانی گەورەی بێمارەیی بەسەردەچێت و سەردەمی باوک سالاری دەست پێ دەکات. واتا سەردەمی پیشاندانی ماسولکە و هێز کە بە جەنگ و ئاشوبی گەورە کۆتاییان دەهات. ئەم جۆرە ژیانە دۆخێکی بێ ئاسایشی هێنا مەیدانەوە. وەک ئاساییش پیاو بەرامبەر بە پیاو بێ بەزەییە. لەم جەنگانەدا پیاوێکی زۆر دەکوژران و ژنیش دەبوون بە دەستکەوتێک لە دەستکەوتەکانی جەنگ. بۆیە ژن بوون بە کۆتاڵی پیاوی جەنگاوەر و بە مارەیی بە پیاوەوە بەسترانەوە. ئالێرانە دەوری خێزانی بچوک واتا خێزانێک کە بە شان و بازووی پیاوێک بەڕێوە بچێت و بپارێزرێت هاتە ئاراوە. وەک تازە پێمگووتن "کچینە ئەوە هەر قسەی مارییە"، لەم دوو سەدەی دوایی دا ئابووری ئەوەندە پێشکەوت ئیتر شان و بازووی پیاوێک پێڕاناگات خێزانەکە بەڕێوە ببات. جگە لەمەش لە توانای ماسولکەش نەماوە کە ئەم خێزانە بپارێزێت. بۆیە پیاو هانای هێنا بەر ژن تا ئەویش بەشداری بکات لە بەڕێوەبردنی خێزاندا. چەرخەڵەی سووڕانەوەی ئابووری سەردەمی نوێ پێویستی بە هەموو ماسولکەیەک هەیە، هەر بۆیەش بیری هومانیزم واتا مرۆڤدۆستی هاتە ئاراوە، واتا ئابووری دەستی پێکرد دڵی بە مرۆڤ بسووتێ نەک مرۆ دڵی بە مرۆڤ بسووتێت، چونکە ئابووری نوێ کە سەچاوەکەی سەرمایەیە پێویستی بە دەستی کرێکار و کڕیار هەیە. هێدی هێدی ئابووری

لەشی ژنی دۆزییەوە وەک بازنەیەکی بەهێز بۆ بەهێزکردنی ئابووری. جگە لەمەش ئەم بازنەیە بازنەیەکی هەرە گرینگی بێ هێزیی پیاوە، بۆیە ئابووری سەردەمی ئێمە لە دەوری لەشی ژن دەسوڕێتەوە. ئەوەش یەکە نیشانەیە کە سەردەمی باوک سالاری بەسەر دەچێ و سەردەمی دایک سالاری دەستپێدەکاتەوە.

ماری پێی گوتم سالار کەنیسەی کاسۆلیک زوو تێگەیشت، ئەگەر دەوری ژن وەک جاری جاران بێڵێتەوە ئەوا کۆمەڵگای کاسۆلیک بەرەو ئیسلام یان بودایزم دەڕۆن بۆیە زوو زوو ئازادی بە ژنان بەخشی. بۆ نموونە ژن بە سەرقۆتی و بە رووتی دەتوانن بێن بۆ کەنیسە و نوێژی خۆشیان بکەن. چونکە ئەوەی گرنگە نوێژەکەیان بکەن. تا لە کەنیسە دانەبڕێن، بەڵام بە پێچەوانەوە ئیسلام دیوارێکی دروست کردووە لە نێوانی مزگەوت و ئابووری نوێ. بۆیە ئیمڕۆکە یەکە کاری مزگەوت ئەوەیە کە نەهێڵێت لەشی ژن ئازاد ببێت تا بەدوای پێچکەی ئابووری نوێی سەردەم بکەوێت. وەک دەبینیت لە جیاتی ئەوەی ئیسلام بخشێتە ناو کۆمەڵگای دیانەکانەوە، ئیستا هێدی هێدی ئیسلامەکان دەبن بە دیان. بەم شێوەیە ئایینی ئیسلام لەجیاتی هێرش کردن خۆی لە هێرشی ئایینی مەسیحی دەپارێزێت.

شیرین گوتی:

ـ من گەر ئیمان بێنم ئەوە ئیمان بە زەردەشت دێنم و بەس. ئینجا من گوێم لە باوک سالاری و دایک سالاری نییە. بە باوەڕی من ژن یەکێکی دەوێت ببێت بە هاوسەری، ئینجا گرنگ نییە کێ سالاربێت.

سالار گوتی:

ـ شیرین ژن دەبێت رازیبن بەوەی کە یەک کەس لە کەشتییکا دەبێت سالاربێت.

ـ سالار تۆ رازیت کە پیاو لە خێزان دا سەری گەورەبێت؟

ـ ئەی چۆن، لە خێزان دا هەر پیاو سەرە.

ـ ئێستا گەیشتین بە ئەنجامێک کە پیاو دەیانەوێت لە خێزان دا سەربن. ئێمەی ژن رازین کە پیاو سەربێت ژنیش مل بێت، بەڵام پیاوینە لەیادتان نەچێت هەر مل سەر هەڵدەگرێت و دەیسووڕێنێتەوە بەو لایەی کە مل گەرەکیەتی.
سالاریش بە پێکەنینەوە وەڵامی داوە و گوتی:
ـ ئێمەی پیاویش بەوە رازین کە مل سەر بسووڕێنێت. ئینجا ژنینە چیتان گەرەکە؟ دیارە بە راستی ژن لە وت و وێژدا لە ئێمە بەتواناترن. دەبا لە ئێستەوە دایک سالاری لە وڵاتی ئێمەدا دەست پێبکات، بەڵام هەر چواردەورەمان باوک سالارن. دەترسم راوێژکارەکانمان مارە بکەن و ئێمەش هەر شەونخونی بکەین و چاوەڕوانی گفت و گۆی شەوانیانبین.
ئەنگێلا دای لە قاقای پێکەنین و گوتی:
ـ کاک سالار ئەوە دوو سەد ساڵە ژنی کورد چاوەڕوانی سەرکەوتن لە جەنگاوەرەکان دەکات و تا ئێستاش هیچتان بە هیچ نەکردوە. چەند شەوێک شەونخونی بکەن و مۆڵەتماندەن سەرکەوتنتان بۆ دێنینە ناوماڵەوە. ئەی لەمە زیاتر چیتان گەرەکە.
زەنگی تەلەفۆن لێیدا شیرین تەلەفۆنەکەی هەڵگرت، وا دیار بوو قسە لە قسە هات و تەنیا بە شیرینی گوت ئەرێ کاک سامان پەیکەرەکەی بۆ تەزرە دروست کرد؟
ـ تەنیا گیان ـ شیرین دەنگی نووسا و گوتی ـ چەند لە مێژە سامان تۆ خۆش. بۆ پەیکەرەکە کاک سالار و کاک ئازاد، کاک ناکام و کاک پۆڵا هەریەکەیان ٥٠ هەزاری دانا و بە ٥٠ هەزارەکەی تۆوە بوو بە ٢٥٠ هەزار. بەم بڕە پارەیە گۆڕێکی مەڕمەڕیان بۆ داتاشیوە و هەموو بووکە شووشەکانیان لەسەر لێوی گۆڕەکەی لە مەڕمەڕ داتاشیوە بە هەمان شێوەی کاک سامانیش دابنابوون ریزیان کردوونەتەوە. بە یارمەتی حکومەتی کوردستانیش دارگێوژێکیان لە ئاسنی بێ ژەنگ بۆ دروست کردووە و بڕیاریان داوە کە پەیکەرێکی بۆ بکەن مەشخەڵێکی لەدەست بێت و ئاگرێکی هەتا هەتاییش لە نێو ئەم مەشخەڵەش هەڵگیرسێنن تا ببێت بە هێمایەک دژی چەکی کیمیاوی.
ـ ئەی گۆڕی کاک سامان لە کوێیە؟

ـ ئێمە کەسمان گۆڕەکەیمان نەدیوە، ئەوەی بزانم لە نزیک سەربازگەیەک ناشتوویانە. چونکە لەو ڕۆژانە بیستمان کە سەربازێکی کورد چەپکێک گوڵی لە سەر گۆڕکەی سامان دانا بوو، بۆیە کە سوپاهسالارە تورکەکە ئەوەی دیتبوو، فەرمانی دا بوو کە گۆڕەکە بە بەر ئاڕپێجی بدەن. ئینجا نازانم پاش ئەم ڕووداوە چی لە گۆڕەکەی سامان ماوەتەوە.

ـ شیرین ئێرە ئەوەندە خۆشە، نازانم چۆن بۆتی باسبکەم و تێتیبگەیێنم.

ـ بۆ، چی لە فەرەنسا زیاترە؟

ـ نا هیچی لە فەرەنسا زیاتر نییە، بەڵکو شتێکی لە لای ئێوە کەمترە کە ئەویش کوردی لێ نییە و گوێم لە گیر و گرفتی کورد نییە. لێرە کەس بێگانە نییە، چونکە هەموویان لەمووڵاتە بێگانەن. منیش یەکسەر بووم بە یەکێک لەم بیانیانە. ئێوە پاش سەد ساڵی تریش نابن بە فەرەنسی.

ـ شیرین ئەوە گوێم لە دەنگ و باسە، دەڵێ لە پاریس بە سەدان هەزار فاشیست ڕژاونەتە سەر شەقامەکان، هاوار دەکەن و دەڵێن فەرەنسا بۆ فەرەنسییەکان. شیرین دەڵێن ئەوە پیاوێکی بێگانەشیان کوشتووە. ئێوەش بەیانی دەبن بە مامۆستای دانشتگا و وانەی وێژەی فەرەنسی دەدەنەوە و بیر و بۆچوونەکانی دانایان و مرۆڤ دۆستانی فەرەنسیش شیدەکەنەوە. خۆشتان بەوەش هەڵدەکێشن کە چەند ئێوە توانیوتانە لە بیری قووڵی ئەم زانایانە قووڵببنەوە و ڕاڤەی بکەن و تێبیگەن. کچێ شیرین گیان ئەگەر تۆ و ئەنگێلا و کاک سالار، وا دیار بوو تۆزێک حەپەسا و سامێک گرتی و گوتی کاک سامان بهاتبانە لای من ئەوەندەی دیکە کاری من باشتر دەبوو. شیرین ناڵێم کارم خراپە، بەڵام کەسم لە خوێن و گۆشتی خۆم لە پشت نییە، لە ئێوەش بەولاوە کەسی ترم نییە. پاش ئەوەی شیرین تەلەفۆنەکەی داناوە، بە پێکەنینەوە گوتی، دەڵێن چی بەدوای کلکی تەنیا کەوین، ئێمە هەر بێ وڵاتین، کێ ناڵێ ئەوێ لێرە باشتر نابێت. ئەنگێلا و سالار دایانە قاقای پێکەنین.

هەرسێک پێکەوە چونە ماڵی ئەنگێلا و چاوەڕوانی ماڵی کاک ئازادیان دەکرد. ماڵی کاک ئازاد دواکەوتن و هەر نەهاتن، بۆیە ئەنگێلا تەلەفۆنێکی بۆ سکاڵا کرد. لانە تەلەفۆنەکەی هەڵگرت. ئەنگێلا پێیگوت دەمەوێت لەگەڵ دایە

قسەبکەم. دایە بە گریانەوە چوو بۆ نەخۆشخانە، پۆلیس گوتیان لە بابەیان داوە و بابە ئێستا لە نەخۆشخانەیە. کاتژمێر هەشتی ئێوارە بوو سالار تەلەڤیزیۆنەکەی پێکرد، لە یەکەم دەنگ و باس دا باسی خۆپیشاندانەکەی فاشیستە فەرەنسییەکانی کرد و گوتی خۆپیشاندەرەکان پیاوێکی بیانییان کوشتووە. هەرسێک بە خێرایی سواری ئۆتۆمۆبیل بوون و چوونەماڵی کاک ئازاد. بە هەر جۆرێک بێت خواردنێکیان دا بە منداڵەکان و بۆ خۆشیان دانیشتن چاوەڕوانی سکاڵا بوون بێتەوە و راستی لە دەمی ئەو ببیستن. زۆری پێنەچوو سکاڵا وەک شێت بە ژوورەوە کەوت و دەگریا. دەستی لە ملی شیرین دەکرد و دەستی لە ملی ئەنگێلا دەکرد و دەگریا و دەیگوت، خۆ ئازادیشیان کوشت و ئازادیش نەما، هەی ڕۆ هەی ڕۆ وەی باوکی مناڵانم ڕۆ.
سالار گوتی کچینە مەگرێن شەرتبێ تۆڵەی بکەمەوە.
سکاڵا گوتی:
ـ سالار گیان ماڵی من کاول بوو چ کارم بەسەر ماڵ کاولی خەڵکی ترە. گەر فەرەنسا بنەبڕبێت تازە ئازاد بۆمن ناگەڕێتەوە. ئیتر ئومێد و لانە بە کەسی تر ناڵێن بابە، من چی لە تۆڵە بکەم جارێکی تر گوێم لێ نابێت مناڵی من بڵێن بابە. دێتە یادتان ئازاد بە پێکەنین دەهاتەوە ماڵەوە، کە میوانی دەدیت وای دەزانی هەموو دونیا هی خۆیەتی، ئێستاش ئەم دونیایە بێ ئازادە، ئەم دونیایە بێ وەفایە پێشی گلگامێشیش هەر وابووە بە گلگامێشیش چارەسەر نەکرا. من لە توانام دا نییە شتێک لەم دونیایە بگۆڕم، ئێستا ئەوەی دەمەوێت و پێم ناکرێت ئەوەیە کە بێ باوکی بە لانە و ئومێدەوە دیار دەبێت. من دەزانم جارێکی دیکە ئازاد دەرگام لێ ناکاتەوە بەڵام من هەر چاوم لە دەرگا دەبێت کەی ئازادی خۆم دەیکاتەوە.

سالار تەلەفۆنی مامۆستا و ئەبونەی کرد تا بە کوردەکان بڵێن کە ئازاد کوژراوە. کوردەکان گەلێکیان پێناخۆش بوو. هەندێکیان دەیان گوت، کەس بەبێ چەقۆ نەچێتە دەرەوە، چونکە چیتر ژیانمان لە فەڕەنسا نەپارێزراوە. سەرکەوتە لاڵ دەیگوت، کوردینە ئازاد لە وڵاتی خۆی نەکوژرا کەوابێت ئێمەش دەبێت تۆڵەی ئازاد بکەینەوە لەدەرەوەی وڵاتی ئەوانەی کە

ئازادیان کوشت. بەم شێوەیە هەریەکەی قسەیەکی دەکرد و هەریەکەی بە شێوەیەک ئەم ڕەوشەی هەڵدەسەنگاند. بەڵام وەک دەڵێن "قسە هەزارە و یەکی بەکارە" وا بزانم هەر قسەی سکاڵا بە کار بوو کە دەیگوت ئەم قسانە پوفکەی سەر ئاون، چونکە هەر کەسەی خەریکی کاری خۆی بوو، دەستی بە کڵاوی خۆیەوە گرتبوو تا با نەیبات. حکومەتی فەرەنسیش لەسە ئەرکی خۆی تەرمەکەی ئازادیان ناردەوە بۆ کوردستان، داواشیان لە کاربەدەستانی کورد کرد کە ئەم نووچەیە پشت گوێ بخەن، چونکە لە بەرژەوەندی کەس دا نییە.
چێنەر بە مامۆستای گوت:
ـ مامۆستا گەلێکم پێ ناخۆشە کە کاک ئازاد بەم شێوەیە بە دەستی ئەم نامەردانە کوژرا. بەڵام هیچمان لەدەست نایەت ئەم کۆمونیستانە لە هەموو لایەک لێیان دەکوژن و دواییان نایەت. مامۆستاش وەڵامی نەداوە، خۆی وا لێکرد کە گوێی لێنەبوو.
مامۆستا بە ئەبونەی گوت:
ـ سوید و دانیمارک و فیلاندە، ئەوەی کە ڕەوشەن بیر نەبوو کردیانن بە ڕەوشەن بیر. فەرەنسای ئێمەش ئەوەی کە ڕەوشەن بیربێت چرای مێشکی دەکوژێننەوە. کوشتن ئەگەر وانەبێت کوشتن چۆن دەبێت؟ ئینجا بە دەردی کاک ئازادیشی دەبەن.
ئەبونە لە وەڵام دا گوتی:
ـ مامۆستا بەردێکی لەسەر دانێ. هەریەکەمان لە کونجی خۆی با لە خوا بپاڕێتەوە تا خودا لەم ڕۆژئاواییانە ببورێ، بەڵکو بەزەیەکی بە سەرکردەکانی کوردیش دا بێتەوە، ئەو میلەتەیان بەم شێوەیە ڕەنجەڕۆ کردوە.
ـ سکاڵا بە ئەبونە و مامۆستای گوت، ئازاد دڵ فراوان بوو کینەی لە کەس نەبوو. بەڵام ئەم کۆمەڵگایە درۆزنەی هەرگیز خۆشنەدەویست و دەیگوت ناتوانم نە لێی جیا بمەوە نە لەگەڵیا بگونجێم، بۆیە من خۆم بە شۆڕشگێڕ دادەنێم.

شێربورگ
٢٠٠٩/١١/٣١

کچێ شیرین خان تۆ بۆ بە میللەتت گرتووە. سەرکردەکانمان خۆیان موریدن لە هەر چواردەورەمان لە دوور و نزیک دەفیان بۆ لێدەدەن ئەوانیش خولدەدەنەوە و هەڵدەپەڕن. گرنگ نییە دەفی کێیە گرینگ ئەوەیە دەف لێدەدرێت. دەنگی دەف دێت ئەوانیش هەڵدەپەڕن. کەی دەف لە لێدان وەستا سەرکردەکان بە نوزەنوز و کوڕنۆش لەم پایتەخت دەچنە پایتەختێکیتر دەستی شێخەکانیان ماچ دەکەن. دەفەکانیان بە خوێنی شەهیدانی کوردستان بۆ گەرم دەکەنەوە و چاوەڕێی جوولانەوەی دەستی شێخن کەی دەفەکەی لێدەداتەوە. تا پەککەوتە تاساوەکان بژێینەوە و جارێکی تر هەڵپەڕنەوە.



بەرگ : ئیبراهیم سالح